ISSN: 2520 - 4106





## گۆڤارێکی ئەکادیمیی و زانستیی وەرزییە

ژمارە (٤١)   ٢٧١٨ ی کوردی – ٢٠١٨ ی زایینی



http://kurdish-academy.com/index.php/gak   هەولێر – شەقامی هەڵەبجە

## لەم ژمارەیەدا

## ڕێنمایی بڵاوکردنەوە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

- گۆڤـاری ئـەکادیمیای کـوردی، گۆڤـارێکی زانسـتی وەرزییـە، بـاس و توێژینـەوەی زانستی تایبەت بە مەسەلەکانی کـورد و کوردسـتان بـڵاو دەکاتـەوە، بەمـەرجێك لـە هیچ شوێنێکی دیکە بڵاو نەکرابێتەوە یاخود بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.
- زمانی بڵاوکردنەوەی باس و توێژینەوەکان لە گۆڤارەکەدا کوردی و عەرەبییـە، ئـەو باس و بابەتانەش کەوا سەروکاریان لەگەڵ مەسەلەکانی کورد و کوردستان هـەبێت، ئەگەر بە زمانی دیکەش بن، بڵاودەکرێنەوە.
- پێویستە توێژەر لە لاپەڕەی یەکەمی توێژینەوەکەیدا، ناونیشـانی باسـەکەی، نـاو و ناسناوی زانستی، شوێنی کارەکەی، ئیمێڵ و ژمارەی تەلەفۆنی خۆی بنووسێت.
- لـە هەڵبــژاردنی ناونیشــان و نووســینەوەی توێژینەوەکانــدا، پێویســتە ڕەچــاوی بنــەماکانی میتــودی زانســتی بکرێـت. لەمەســەلەکانی پەیوەســت بــە ڕێکخســتنی سەرچاوە و چۆنیەتی سوودوەرگرتن لێیان، وەکو چۆن پێویستە نووسـینی بـاس و بابەتـەکان بـە زمـانێکی زانسـتی شـیاو بێـت، بـە پێچـەوانەوە هـەر توێژینەوەیـەك پێڕەوی لەم بنەمایانە نەکات لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە وەلادەندرێت.
- پێویسـتە توێـژەر پوختـەی توێژینەوەکـەی بـە دوو زمـانی دیکـە، جگـە لـە زمـانی نووسـینی دەقەکـەی لـە کۆتـایی توێژینەوەکەیـدا بنووسـێت، بەمـەرجێك لـە یـەك لاپـەڕەی A4 زیـاتر نـەبێت و تیایـدا گرینگـی باسـەکە و ئەنجامـە سـەرەکییەکانی توێژینەوەکەی بخاتە ڕوو.
- هـــەر بـــاس و بابـــەتێك لـــەبارەی ســـاغکردنەوەی (پەیـــدۆزی، تحقیـــق) ی دەستنووسـەکانەوە بێـت. پێویسـتە پەیدۆزییەکـە بـە گـوێرەی بنـەما زانسـتییە کارپێکراوەکانی ئەو بوارە ئەنجام بدرێت. هەروەها چەند لاپەڕەیـەکی کۆپیکراو و، زانیاری تەواو سەبارەت بە دەستنووسەکە و شوێنی هەڵگرتنی بخرێتە ڕوو.
- دەبــێ بــاس و بابەتــەکان بــەجۆری فــۆنتی یونیکــورد بنووســرێن. لەمەســەلەی بــەکارهێنان و ڕێکخســتنی سەرچــاوەکان پێــڕەوی لــە شــێوازی هارفــارد بکرێــت. ناونیشـانی بـاس و توێژینـەوەکان بـە فـۆنتی قـەبارە (١٥) بێـت، نـاوی توێـژەر و توێژەران لەگەڵ ناونیشانە لاوەکییەکان بە فۆنتی (١٤) و دەقی باسەکەش بە فۆنتی (١٣) بێت.

- لەکاتی سوود وەرگرتن لەو باس و بابەتانەی کە لە گۆڤارەکاندا بلاوکراونەتەوە، بەم شێوەیە ئاماژە بە سەرچاوەکەی دەکرێت: ناسناو و ناوی نووسەر، ڕێکەوتنی دەرچوون، ناونیشانی باسەکە، ناوی گۆڤارەکە (لەنێوان دوو کەوانەدا)، ژمارەکەی، شوێنی دەرچوون.
- هەموو باس و بابەتێك بە (٣) دانەی سەرکاغەز و دانەیەکی سەر (CD) پێشکەش دەکرێت، بەمەرجێك ژمارەی لاپەڕەکانی، بە هەموو وێنە و خشتە و سەرچاوەکانەوە لە (٢٥) لاپەڕە تێپەڕنەکات.
- دوا بەدوای پەسەندکردنی هەر توێژینەوەیەك لەلایەن هەڵسەنگێنەرانی پسپۆڕەوە، توێژەر دانەیەك لە نووسراوی پەسەندکردنی توێژینەوەکەی لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە پێدەدرێت. لەدوای ئەوە توێژەر بۆی نییە باسەکەی پێشکەش بە هیچ لایەنێکی دیکە بکات، بە بێ نووسراوێکی ڕەزامەندی لە لایەن سەرنووسەری گۆڤارەکەوە.
- دەستەی نووسەران ئەو مافەی دەبێت کەوا هەندێك برگەو دەستەواژەی توێژینەوەیەك لابدات، یا بگۆڕێت و دووبارە دایبڕێژێتەوە تاوەکو لەگەڵ ڕێنماییەکانی بلاوکردنەوە لە گۆڤارەکە دا بگونجێت.
- چۆنیەتی ڕیزکردنی باس و بابەتەکان پەیوەندی بە ڕێبازی بابەتبەندی گۆڤارەکەوە هەیە نەوەکو بابەت و بایەخی توێژینەوەکان، یاخود پلەو پایەی زانستی توێژەرەوە.
- گۆڤاری ئەکادیمیا ئەو باس و توێژینەوانەی کەوا لە نامەکانی ماستەر و دکتۆرا وەردەگیرێن، واتە (مستل) ن، بلاوناکاتەوە.
- هەرباس و بابەتێك کە ڕەزامەندی لەسەر بلاوکردنەوەی نادرێت، بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێندرێتەوە.

# سیاسەتی زمان
# چەمک و ڕێکارەکانی

**پ.ی. د. نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو**
بەشی زمانی کوردی- کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی
زانکۆی سەلاحەددین

**پێشەکی**

**١- ناونیشان و بواری لێکۆڵینەوەکە:**

ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە (**سیاسەتی زمان-چەمک و ڕێکارەکانی**)یە، بۆ باسکردنی چەمک و لایەنە گرنگەکانی سیاسەتی زمان تەرخانکراوە.

کۆزمانەوانی وەک لقێکی گرنگی زمانەوانیی کارەکی، گرنگییەکی زۆری بەو یاسایانە داوە، کە جووڵەی زمان لەکاتی ئاوێتەبوونی لەگەڵ بونیادە کۆمەڵایەتییەکاندا کۆنترۆڵ دەکەن، ئەمەش بێگومان ئامانجی بەکارهێنانی بونیادە کۆمەڵایەتییەکانە، لە کاتی پلاندانان و داڕشتنی سیاسەتە زمانییەکان، تاکو ئەم سیاسەتە زمانییە زانستی و کردەیی بێت و تەنیا ڕواڵەتی و کلێشەیی نەبێت، لێرەدا کۆزمانەوانان درکیان بەوە کردووە، کە ئەوان بەرانبەر زانستێکی تازەن، کە میتۆد و بابەتی تایبەت بە خۆی هەیە، کە ئەویش زانستی سیاسەتی زمانە.

توێژەران زوو گرنگییان بە زمان داوە و درکیان بەوە کردووە، کە زمان دیاردەیەکە، چونکە توێژینەوەی زمانەوانی لای زمانەوانان و فەیلەسوفان و زانایان زۆر بوون و چەندەها توێژینەوە دەربارەی زمان لەلایەن زانایانی سروشت و فیزیا و هتد........ئەنجام دراون، زانایان لە ئەنجامدانی ئەم جۆرە توێژینەوانەدا بەردەوامبوون و تا ئێستاش ئەو جۆرە توێژینەوانە هەر بەردەوامن، بەتایبەتی ئەو توێژینەوە زمانەوانییانەی پەیوەندییان بە کۆمەڵگەوە هەیە، ئەو توێژینەوە نوێیانەی لەم بوارەدا سازدراون، بە سیاسەتی زمان ناودەبرێن.

**٢. هۆی هەڵبژاردنی بابەتەکە:**

بەداخەوە ئێمەی کورد زۆر کەم ئاوڕمان لەم بابەتەوە داوەتەوە، بەجۆرێک کە چەند لێکۆڵینەوەیەکی کورت و ناگشتگیری لەسەر کراوە، بۆیە ئێمە ئەم هەلەمان قۆستەوە بە تەرخانکردنی کاتمان بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم لقە گرنگەی کۆزمانەوانی، بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەیەکی یاریدەدەر بۆ کتێبخانەی کوردی و لە ئایندەدا ببێتە کلیلێک و دەروازەیەک، بۆ ئەوەی چەندەها لێکۆڵینەوەی فراوانتر و گشتگیرتری لەسەر بکرێت.

**٣. ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە:**

ڕێبازی لێکۆڵینەوەکەمان، ڕێبازێکی وەسفیی شیکارییە، کە بەهۆیەوە باسی چەمک و پێناسینی سیاسەت و زمان و سیاسەتی زمان و ڕێکارەکانی دارشتنی سیاسەتی زمانی دەکات، بە وەرگرتن و پشتبەستن بە سەرچاوەی ڕەسەن و شرۆڤەکردنی ئەو دەقانەی پەیوەستن بەم بابەتەوە.

**٤. گیروگرفتی لێکۆڵینەوەکە:**

گەورەترین گیروگرفت، کە لەکاتی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکەدا تووشمان هاتبێت، وەرگێڕانی ئەو هەموو دەقە عەرەبی و ئینگلیزییانە بوون، کە پەیوەستبوون بە بابەتی سیاسەتی زمان بۆ سەر زمانی کوردی، چونکە بەڕاستی کتێبخانەی کوردی لەم بابەتە زمانەوانییە زۆر هەژارە، بەجۆرێ دەیان سەرچاوە هەن، کە تێیدا باسی زمانەوانیی کارەکی بەگشتی و کۆزمانەوانی بەتایبەتی دەکەن، کەچی بەداخەوە نەخراوەتە سەر زمانی کوردی، کە ئەمەش هەژاریی کتێبخانەی کوردی و ناوەندە زانستی و زانیارییەکانی کوردی دەگەیەنێت.

**پرسیاری لێکۆڵینەوەکە:**

ئایا سیاسەت چ پەیوەندییەکی بە زمانەوە هەیە ؟ ئایا لە زماندا سیاسەت هەیە ؟ ئایا چەمکی سیاسەتی زمانیی مانای چییە ؟ ئایا

سروشتەکەی چییە ؟ و ئەو ڕێکارانە چین، کە بەهۆیەوە زمان جووڵە دەکات و دەبزوێت؟ ئایا زمانی سیاسەت و سیاسەتی زمان جیاوازییان لەنێواندا هەیە؟ ئەمانە و چەندین پرسیاری تر لە لێکۆڵینەوەکەماندا هەن، هەوڵمانداوە وەڵامیان بدەینەوە.

**٥. ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکە:**

لێکۆڵینەوەکەمان لە پێشەکییەک و سێ بەش پێکهاتووە:

**بەشی یەکەم،** کە بە ناونیشانی (چەمک و پێناسەی سیاسەت و زمان)ە، دوو تەوەرە لەخۆ دەگرێت، تێیدا باسی (چەمک و پێناسەی سیاسەت، چەمک و پێناسەی زمان) کراوە.

**بەشی دووەم،** کە بە ناونیشانی (سیاسەتی زمان لە بواری زاراوەی کۆزمانەوانیدا)یە، سێ تەوەرە لەخۆ دەگرێت، پێکدێن لە (چەمک و پێناسەی سیاسەتی زمان، سەرهەڵدانی زاراوەی سیاسەتی زمان، پەیوەندیی سیاسەتی زمان بە کۆزمانەوانی).

**بەشی سێیەم،** کە بە ناونیشانی (ڕێکارەکانی دارشتنی سیاسەتی زمانی)یە، تێیدا باس لە گرنگترین ڕێکار و ئالیاتەکانی چۆنیەتی دارشتنی سیاسەتی زمانی کراوە.

لە کۆتاییدا ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان و پوختەی لێکۆڵینەوەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراونەتەڕوو.

## بەشی یەکەم
## چەمک و پێناسەی سیاسەت و زمان

پێش ئەوەی پێناسەی سیاسەتی زمان لە دووتوێی کۆزمانەوانیدا بکەین، پێویستە ئاماژە و ماناکانی هەموو زاراوەیەک لە بواری پسپۆڕەتییەکەیدا بزانین، ئایا پێناسەی سیاسەت و زمان لای پسپۆڕەکانی چییە؟ ئایا پێناسەی سیاسەتی زمان لە ڕووی زاراوەی کۆزمانەوانیدا چییە؟

بۆ زانینی چەمکی سیاسەتی زمان، پێویستە لە سەرەتادا باس لە هەردوو زاراوەی (سیاسەت) و (زمان) بە جودا بکەین، و بزانین لە فەرهەنگە کوردی و عەرەبی و ڕۆژئاواییەکاندا چ مانایەکیان دراوەتێ، پاشان پشت بە چەمک و مانا فەرهەنگییەکانیان دەبەستین، وەک دەروازەیەکی زمانەوانی، تاکو بتوانین زاراوەکە بە تێروتەسەلی پێناسە بکەین.

### ١ـ ١: چەمک و پێناسەی سیاسەت

سیاسەت هەموو بنج و بنەوانی ژیانی گرتۆتەوە، بۆیە بۆ پلاندانان و بەدواداچوون و بەخۆداچوونەوە، ئەوا وشەی (سیاسەت) لە بەردەم بوارەکەدا دادەنرێ. (تاریق جامباز: ٢٠١٤، ل ٨٠)، یان سیاسەت زاراوەیەکە ئاماژە بەو پرۆسەیە دەکات، کە ڕەفتاری مرۆڤایەتی بەخۆوە دەگرێت، کە ئەویش بەڕێگەی سیاسەت ململانێ لەنێوان گرووپەکان کۆتایی دێت (شێرزاد سەبری و عەبدولسەلام نەجمەددین:٢٠١١، ل٢٦).

زاراوەی سیاسەت بۆ وشەی (politics) دەگەڕێتەوە و لە وشەی(polis) داتاشراوە، کە بە ( شاری دەوڵەت) دەگوترا، دواتر ئەم وشەیە پەرەی سەند و بوو بە زاراوەیەک بۆ هونەری کارگێڕی و حوکمکردنی دەوڵەت چ لە ناوەوە و چ لە دەرەوە. (عەبدولواحید دزەیی و شێرزاد سەبری: ٢٠١٣، ل ١٥).

لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا سەرچاوەی زمانەوانی **(ساس یسوس سیاسة)**یە، کە ماددە سەرەکییەکەی (سوس)یە، کە لە (لسان العرب)دا هاتووە، سیاسەت لە کاری (السائس) وەرگیراوە، عەرەب دەڵێن (یسوس الدواب)، واتە ئاژەڵەکان دەئاژووێ، ئەویش لە حاڵەتێکدا شوانەکە چاودێریانی دەکرد و دەیانی بردە بەر لەوەڕ(لەوەڕگە). (السیاسة) لە زمانی عەرەبیدا مانای هەڵسووڕاندن و بەڕێوەبردنی کارێکە، یان شتێکە بە مەبەستی چاککردن و باشترکردنی، واتە ژێردەستانی خۆی (یسوسی) بەڕێوە دەبات. (ابن منظور: ٢٠١٤، ص٢١٤٩ ـ ٢١٥٠).

هەروەها (ئەلزوبەیدی) دەڵێت: **((فەرمانم پێیاندا و نەهیم لێکردن))** (الزبیدي:٢٠١٠، ص ١٦٩).

هەروەها فەیرۆز ئابادی لە فەرهەنگی (المحیط)دا دەڵێت: **((فلان کەس تاقیکراوەتەوە و سیاسەت بووە و سیاسەتکراوە، ئەمەش مانای (تەمێ بووە و تەمبێ کراوە) دەگەیەنێت))** (الفیروز آبادي:٢٠٠٥، ص ٥٥١). هەروەک بڵێی ماناکەی ئەوەیە مرۆڤ پاش ئەوەی ئاژەڵانی ئیدارە داوە و بەڕێیانی بردووە، ئینجا دەستی بە بەڕێوەبردن و چاودێریکردنی مرۆڤ کردووە، کە ئەمەش مانای سیاسەت دەگەیەنێت، بە واتایەکی تر لە سیاسەتکردنی ئاژەڵانەوە بۆ سیاسەتکردنی مرۆڤ پەرەی سەندووە، واش پێدەچێت کە ئەم مانایەی یەکەم بەشێوەیەکی خوازەیی بازی دابێتە سەر سیاسەتی بەڕێوەبردنی خەڵکی.

لە فەرهەنگە ڕۆژئاواییەکانیشدا زاراوەی (سیاسەت) بۆ زاراوەی (پۆلەتیک) گەڕێنراوەتەوە، کە لەم وشە یۆنانییانەوە وەرگیراوە:

١- بولیس: شارۆچکە، شار، کەرت، یان کۆبوونەوەی دانیشتوانی شارێک.

٢ـ پۆلیتایا (Politeia): دەوڵەت، دەستوور، سیستەمی سیاسی، کۆمار، هاوڵاتیبوون، واتە مافی هاووڵاتیان.

٣. پۆلەتیکا: تاکە و کۆیەکەی (پۆلەتیکۆس): مەسەلە سیاسییەکان، مەسەلە مەدەنییەکان، هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە دەوڵەت و دەستوور و سیستەمی سیاسی و بە سەروەرییەوە هەیە.

٤. پۆلەتیک (politike): زانستی سیاسی. (خلف الجراد: ٢٠٠٧، ص ٢٤ ).

سیاسەت لای ئیبن سینا (٩٨٠ - ١٠٣٧ز) بریتییە **((لە بەڕێوەبردنی خودی و کۆمەڵایەتی و چاکسازیی گەندەڵی، کە ئەویش ڕێگەی خۆشی و شادمانییە))** (علي عباس مراد:١٩٩٩، ص ٥٧).

سیاسەت بەشێکە لە کۆی سیستەمی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی مرۆییدا و چالاکییە سیاسییەکانیش بەشێکن لە چالاکییەکانی ژیانی کۆمەڵگە. (ڕەفیق سابیر: ٢٠٠٨، ل ١١٢).

هەمدیسان سیاسەت هونەری پیادەکردنی سەرکردە و دەسەڵاتە، لەگەڵ شێوەکانی پەیوەندیی نێوان دەسەڵات و جەماوەرە. (عەبدولواحید دزەیی و شێرزاد سەبری: ٢٠١٣، ل ١٥).

کەواتە ئەم زاراوەیە تەنیا موڵکی پاشا و بەرپرسان نییە، هەرچەندە پاشا و بەرپرسەکان دەبێ لە خەڵکانی دی زیاتر مانا و چەمکی زاراوەکە بزانن و لەوانی دی باشتر پیادەی بکەن، هەموو کەسێکیش لە خەڵکی پێویستە سیاسەتێک لە کاروبارەکانی خۆیدا بەکاربێنێت و بگرە هەموو تاکێکی کۆمەڵگە بە ڕێژەی پێویستی پاشا یان بەرپرس، پێویستییان بە سیاسەتکردن هەیە، هەروەها نووسەر بەردەوام دەبێت و باس لە سیاسەتی پیاو دەکات، واتە سیاسەتی داهات و خەرجییەکانی پیاو، سیاسەتی پیاو لەگەڵ خانەوادەی خۆیدا، و سیاسەتی پیاو لەگەڵ منداڵی خۆی و سیاسەتی پیاو لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا، واتە زانستی سیاسەت (سیاسەتناسی) لای (ئیبن سینا) زانستی ڕاستکردنەوەیە، ڕاستکردنەوەی یەک دەروون، کە بە (ڕەوشت) ناوزەدی کردووە، هەروەها ڕاستکردنەوەی چەندەها دەروون، کە بە ڕێکخستنی پێگەکان (ماڵەکان) ناوزەدی کردووە، یان ڕاستکردنەوەی چەندەها دەروون، کە لەناو یەک شاردا بن و ناوی نا ڕێکخستنی شار،

ڕاستکردنەوەش بە ڕێکخستنی شارستانی و زانستی شەرعی دەبێت. (علي عباس مراد:١٩٩٩، ص ٥٤ـ ٥٨).

هەروەها سیاسەت لای (ئیبن بادیس) ((**دابینکردن و هەڵسووڕانی کاروباری کۆمەڵگەیە، کە ئەویش بە گوێرەی بنەماکانی باشە و دادپەروەریی**)) (عبدالقادر فضيل و محمد صالح رمضان:٢٠٠٧، ص ٧٨). لە فەرهەنگی فەلسەفیشدا هاتووە: ((**سیاسەت لقێکە لە زانستی شارستانی و باس لە بنەماکانی فەرمانڕەوایەتی و ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەت دەکات**)) (مجمع اللغة العربية: ١٩٨٣، ص ٩٩).

چەندەها پێناسە بۆ سیاسەت لای ڕۆژئاواییەکان هەیە، لەوانە عەبدولوەهاب کیالی لە فەرهەنگە سیاسییەکەی خۆیدا زۆربەیانی باسکردووە، وا پێدەچێت جیاوازی لە پێناسەکردنیدا، بۆ ئەو جیاوازییە دەگەڕێتەوە، کە لە ئاراستەکاندا دەربارەی زاراوەکە هەیە، تەنانەت (دیزرایلی Disraeli) (١٨٠٤ ــ ١٨٨١ز)، سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتەی ئینگلترا، بەشێوەیەک پێناسەی دەکات، کە شێوازی گاڵتەجاڕی و ڕاشکاوانەی بەخۆوە وەرگرتووە و دەڵێت: ((**سیاسەت هونەری فەرمانڕەوایەتیکردنی مرۆڤە لە ڕێگای هەڵخەڵەتاندنیان**)). یەکێکی دیکەش دەڵێت: ((**سیاسەت هونەری دواخستنی ئاڵۆزبوونی گرفت و کێشەکانە**)) (عبدالوهاب الكيالي: ٢٠١٠، ص ٣٦٢). لەو پێناسانەی بۆ سیاسەت هاتوون، وتراوە، کە سیاسەت هونەری سەرکردایەتی و فەرمانڕەوایەتییە، هەروەها چالاکییەکی کۆمەڵایەتی ئەوتۆیە، کە ناوازەیە و ژیانی گشتی ڕێکدەخات و هاوسەنگی و سازان لەڕێگەی هێزی شەرعیەت و سەروەرییەوە دەپارێزێت، ئەویش لەنێوان تاکەکان و گرووپەکان و ئەو کۆمەڵانەی پێشبڕکێ و ململانێ دەکەن لەسەر یەکێتی فەرمانڕەوایەتی سەربەخۆ، لەسەر بنەمای پەیوەندییەکانی هێز، کە ڕووی بەشداریکردن لە دەسەڵاتدا بە ڕێژەی هاوبەشی دیاری دەکات و گرنگییەکەی لە بواری بەجێهێنانی پرۆسەی پاراستنی سیستەمی کۆمەڵایەتی و ڕەوشی کۆمەڵگە دیاری دەکات.

لە پێناسەیەکی دیکەشدا هاتووە سیاسەت زانستی توێژینەوەی بەرژەوەندییە هاودژەکان و ڕەنگدانەوەیان لەسەر پێکهێنانی دەستەڵات و پاراستنی جیاکارییەکانی توێژی فەرمانڕەوا. لەبەر ئەوەی وا پێدەچێت ئەم وشەیە پاش لێکدانەوەی زۆر لە پێناسەکان ـ چەمکەکەی ئەوەندە وردە بەرەو تەماوییبوون هەنگاو دەنێت، لەوەش دەچێت زاراوەکە ڕواڵەتێکی بێت، کە زاراوە و ماناگەلی دی خۆیان لەپشتییەوە حەشار دابێت، کە گرنگترینیان ئەمانەن ( عبدالوهاب الكيالي: ٢٠١٠، ص ٣٦٢ ـ ٣٩٧):

١- بەڕێوەبردن: سیاسەتی گواستنەوە و سیاسەتی دروستکردنی ئۆتۆمبێل، کە وەک سیاسەتێک بەڕێوەدەبرێن.

٢- ستراتیژ: ئەو کۆمەڵە نەخشە و پلان و ڕێکارانەی جێبەجێ دەکرێن، وەک سیاسەتی حزب یان سەندیکا.

٣- بەهای کەمزانین: هەروەها زاراوەی سیاسەت بەهای بەکەمزانین لەخۆ دەگرێت، ئەویش لە کاتی دنەدان بۆ ئەنجامدانی کاری هەڵخەڵەتێنەر و فریودەر ـ بەگوێرەی قسەکەی دیزرایل ــ کە قسەیەکی بێزەوەرە، وەک گوزارشتەکانی نیگەرانی و بێزاری، کە دەڵێن: ((**فلانە کەس سیاسییە و بە سیاسەت مامەڵەمان لەگەڵدا دەکات**))، وەک بڵێی پیادەکردنی سیاسەت تەنیا بۆ ئەو کەسانەیە، زیرەک و زرنگن و بووەتە ئامرازێک بۆ تاراندنی پیادەکردنی مافەکانی هاوڵاتیبوون، بۆیە خەڵکانی بێئاگا ئەو هەستەیان بۆ دروستبووە، کە لە سیاسەت سڵ بکەنەوە و ڕقیان لێ ببێتەوە.

٤- دانوستان و ئەنجامگەیاندن: مانای دانوستان و بەئەنجامگەیاندنیش لەخۆ دەگرێت، وەک سیاسەتی ئاشتەوایی و دراوسێیەتی و سیاسەتی ئارامکردنەوە و ڕاوێژکاریی نێوان دەوڵەتان و سیاسەتی خێرا.

٥- واقیعیبوون و ڕازیبوون بە واقیعەت: سیاسەت واقیعیبوون و ڕازیبوون بە واقیعەت دەگرێتەوە، لە حاڵەتی یاساغبوونی گۆڕانکاری لەو واقیعە، بۆیە دەڵێن (سیاسەتی بارودۆخی چەسپیو) و سیاسەتی هەژماری پێچەوانە.

٦ـ ئاراسـتە و میتـۆد و هەڵوێسـت وەرگـرتن: لە مەسـەلەیەکی دیـاریکراو دەڵێین سیاسـەتی نێوانیـان تێکبدە، تـا ببیتە سـەروەریان و سیاسەتی بەکاربردن.

لە ڕووی تیـۆرییەوە ئەمەیە مانـای سیاسـەت، بەڵام لە ڕووی کـردەیییەوە سیاسـەت بەگـوێرەی ئـارەزووی تیۆریزەکـاران بەڕێـوە ناچێت، چونکە سیاسەت لای زۆر لە سیاسییەکان بەپێی بەرژەوەندیی ڕەهـا بەڕێوە دەچێت و یەک پرەنسیپ دەگرێتەوە، کە ئەمەیە: **(ئامـانج پاساوە بۆ بەکارهێنانی هەر ئامرازێک)**، ئەویش بەگوێرەی نووسـەر و سیاسـەتمەداری ئیتـالی میکیـاڤیلی machavelli (١٤٦٩ـــ ١٥٢٧ز)، لەبەر ئەوە وشـەی سیاسـەت لەگەڵ درۆ و هەڵخەڵەتاندن و فریـودان بووەتە هاوواتـا، هەروەکو (مالیک ئیبن نـەبی) نـاوی لێدەنێت (پۆلـەتیک)، بـۆ ئەوەی لە سیاسەتێک جودای بکاتەوە، کە لەسـەر بنەمـایەکی زانستی و تیـۆری بونیـاد نرابێـت، مالیـک ئیـبن نـەبی دەڵێـت: **((ململانێـی نێـوان سیاسـەت و پۆلـەتیک زۆر کۆنە و ئەگەر خوازیـاری ئەوە ببین، کە لە ڕووی دەروونییەوە دیارییان بکەین، ئەوە دەتوانین بڵێین، کە یەکەمیان مانـای هەڵهێنجـانی بەهاکانـە، و دووەمیشـیان تـەنیا قسـە تێگـرتن دەگەیەنێت، یەکەمیان کۆششێکە بۆ بیرکردنەوە لە باشترین شێواز بـۆ خزمەتکردنی گەل، دووەمیشیان هـاوار و بزاوتێکە بـۆ هەڵخەڵەتانـدنی گەل و فریودان و بەکارهێنانیان))** (مالك بن نبي: ١٩٨٥، ص٨٥ ).

بەکورتی دەڵێین مانای زاراوەی (سیاسەت) هەروەکو هاوواتاکـەی (پۆلەتیک)، کە لە زمـانی یۆنانیدا هەیە، پێشـڤەچوونی بەخـۆیەوە بینیوە، بەڵام توێژینەوەکـانی زمـان لەمەڕ ئەم زاراوەیە لە هەمـوو وردتـر و گشتگیرترن، چونکە لە بواری ئەو توێژینەوە دەنگیانەدا باسکراون، کە لە پەیوەنـدیی سـتوونی نێـوان فەرمـانڕەوا و فەرمـانپێکراودا (خەڵکیـدا) هەن، زۆر بەوردی لێی کۆڵراوەتەوە و توێژینەوەی لەسەر کراوە، تـاکو بـگەنە بـنچەکەی خۆیـان، کە پرەنسـیپی هاریکـارییە، نەک ململانـێ و بەرژەوەندیی بژاردەیەک لە خەڵک، هەروەها لە ڕووی ئاسۆیییەوە باس

لە بواری درێژەکێشانی سیاسەت کراوە، تا لە سیاسەتی خودی تاکی پیاو و داهات و ژیانییەوە دەستپێبکات و بگاتە باڵاترین ئاستەکانی سیاسەت، کە ئەمڕۆ ناسراوە، هەروەها سیاسەتی شەرعی لە بوارێکی دیکەی گرنگدا باسکراوە و توێژینەوەی لەسەر کراوە، کە ئەویش سەنتەری هێزی فەرمانڕەوایەتییە، واتە توێژینەوە عەرەبییەکان لە بواری شەرعدا باسیان کردووە (مصطفى ديب البغا:١٩٩٨، ص٢٧٤)، کەچی ڕۆژئاواییەکان لە بواری (گەل)دا باسیان کردووە.

هەروەها چەمکی سیاسەت لە ماناکانی کارگێڕی و چاودێریکردنی کاروباری دەوڵەت لە هەردوو ڕووی دەرەکی و ناوخۆییەوە قەڵبەزەی بۆ توێژینەوەی کاروبارەکانی پەیوەست بە دەوڵەتەوە هاویشتووە، وەک دەستوور و سیستەمی حوکمڕانی. کەواتە سەیر و سەمەرە نییە بڵێین سیاسەت هونەرێکە لە بوارە پراکتیکییەکەی خۆیدا، کەچی لە لایەنەکەی دیدا، کە تیۆرییە، بە زانستێکی سەربەخۆ هەژمار دەکرێت، پاشان زاراوەی سیاسەت بەرەو بواری دی پەلی هاویشت، کە پەیوەندییان بە حوکمڕانی و کاروباری دەوڵەتەوە نییە، بەڵکو چەند بەکارهێنانێکە، زۆرجاران سیاسەتوانان بەکاریدەهێنن، وەکو ئەم گوزارشت و دەربڕینانە: سیاسەتی بەرگری، سیاسەتی نەوت، سیاسەتی ڕۆشنبیری، سیاسەتی زمانی... هتد.

هەروەها پێناسەکردنەکەی (ئەرستۆ ٣٨٤ - ٣٢٢ پ.ز) بۆ سیاسەت ڕەنگدانەوەی هەژموونی سیاسەتە لەسەر بوارەکانی ژیان، بۆیە لەبارەی سیاسەتەوە دەڵێت: **((زانستی سەروەرییە و سەروەری زانستەکانە))** (عبدالوهاب الكيالي:٢٠١٠، ص ٣٧٣)، سەروەری زانستەکانە، چونکە هەموو ئەو کارانەی پێی ناوزەد دەکرێت، پێشوەخت پلانی بۆ دادەڕێژێت، بۆ نموونە دەوترێت سیاسەتی ئابووری، کە مەبەست لێی پلانی گەشەپێدانی ئابوورییە (خلف الجراد:٢٠٠٧، ص ١٦)، بە هەمان شێوەش سیاسەتی زمانی لەم چوارچێوەیەدا جێی دەبێتەوە.

بێگومان زانستی سیاسەت یان سیاسەتناسی لە بواری توێژینەوە و تیۆریزەکـانییەوە لە هەمـوو چەرخەکانـدا چەنـدەها سـوود لە پیادەکردنی سیاسییەکانەوە دەستەبەر دەکات، ئەمەش (ئیبن خەلدوون) دەستی پێگەیشتووە، ئەویش وەکو تیۆریزەکار و خاوەن ئەزموون لە بواری کاری سیاسیدا، هەروەها جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە بابەتەکانی سیاسـەت لە چوارچێوەی کۆمەڵناسـیدا باسـدەکرێت، کە ئەمەش لەگەڵ سیاسەتی زمانەوانیدا یەکدەگرێتەوە، ئەویش لە بواری سوود وەرگرتن لە ئەزموونی زمانەوانی کۆمەڵ و گرووپ و دەوڵەتان.

**١ـ٢: چەمک و پێناسەی زمان**

زمان یەکێکە لەو کۆڵەکانەی کە نەتەوە و گەلی ڕاگرتووە. (یووسف شـەریف:٢٠١٣، ل٩٧)، هـەروەها زمـان دیاردەیـەکی کۆمەڵایەتییـە و لـە هەناوی کۆمەڵگەدا هەڵقوڵاوە و پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە سیاسەتەوە هەیە، چونکە زمان وەک هەڵگری ئەزموونی نەتەوە، کار لە سیاسەت دەکات. (ڕەفیق سابیر: ٢٠٠٨، ل ١١٢).

لە (لسان العرب)دا هاتووە: ((**خووتە خووتێی لێکرد ـ لێدەکات (وڕێنە)**))، لە فەرموودەشدا هاتووە ((**ئەگەر لە گوتاری ڕۆژی هەینیدا یەکێک وتی (سە)، مانای ئەوەیە (لەغوەی "خوتەی" کردووە)، واتە قسەی کردووە**)) (ابن منظور: ٢٠١٤، ص٤٠٥٠) .

ئەم زاراوەیە پێناسـەی زۆر و بێشوماری بۆ کراوە، بەڵام ئەوەی توێژینەوەکـان جەختـی لەسـەر دەکەنەوە ئەوەیە، کە پێناسـە زمـانییە هاوچەرخەکـان لە گوزارشـتەکەی (ئیـبن جنـی) (٣٣٢ - ٣٩٢ ک) کۆکراوەتەوە، کە لە ڕووی ناوەرۆکەوە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵدا نییە (أحمد شامیة: ٢٠٠٢، ص ١١).

- ئیبنی جنی لە پەرتووکی (**الخصائص**)دا دەڵێت: ((**سنوورەکانی پێناسەکردنی زاراوەی (زمان)، لەوەدا بەرجەستە دەبێت، کە لە چەند دەنگێک پێکدێت، کە هەر نەتەوەیەک بۆ گوزارشتکردن لە مەرام و**

**مەبەستەکانیان بەکاری دێنن))** (ابن جني: ١٩٥٧، ص٣٣). (ئیبن جنی) جەختی لەسەر دەنگبوون و ئەرکی پەیوەندیی زمان لە کۆمەڵگەدا کردووەتەوە، لەم بۆچوونەشیدا زمانەوانان لەگەڵیدا کۆک و هاوڕابوون، وەکو دادوەر عەبدولجەبار (ساڵی٤١٥ی کۆچی مردووە) و فیروزابادی (ساڵی٧٢٩ی کۆچی مردووە) و سیوتی (ساڵی٩١١ی کۆچی مردووە) (نعمان بوقرة:٢٠٠٩، ص٣).

هەروەها چۆمسکی وا پێناسەی زمان دەکات و دەڵێت: ((زمان بریتییە لە تێکەڵکردنی ڕستە و واتا لە چوارچێوەیەکی بێ کۆتایی)) (نعوم جومسكي: ١٩٩٣، ل ٧٨). هەروەها (ئیبن خلدون ساڵی ٨٠٨ی کۆچی مردووە)، زمان بەوە پێناسە دەکات، کە **((گوزارشتکردنی قسەکەرانە لە مەرام و مەبەستەکانی خۆیان، گوزارشتەکەش پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەیە، واتە مرۆڤ ئەنجامی دەدات و پێویستە ببێتە توانایەکی جێگرەوەیی ئەو ئەندامەی، ئەم کارە ئەنجامی دەدات، کە ئەویش (زمان)ە، کە لای هەر نەتەوەیەک زاراوەی خۆی هەیە))** (عبدالرحمن بن خلدون:١٩٩٠، ص ٦٠٣). ئەمەش گوزارشت لە ئەرکی پەیوەندی دەکات، کە یەکێکە لە ئەرکە سەرەکییەکانی زمان، چونکە لێرەدا زمان بە سیستەمێک بۆ پەیوەندیی کۆمەڵایەتی هەژمار دەکرێت، ئەمەش بێگومان مەسەلەیەکی مەبەستدار و ئامانجدارە، هەروەها (ئیبن جنی) بڕیار لەسەر ئەوە دەدات، کە زمان توانستێکە لە ناخی مرۆڤدا ڕەگی داکوتاوە و پەیوەندی بە ئامادەگی هزری و فیکری و زگماکیی مرۆڤەوە هەیە، هەروەها ئەم زانایە لە هەمان کاتدا ئاماژە بە فرەیی سیستەمی زمانەوانی و سروشتە عورفیەکەی دەکات (نعمان بوقرة:٢٠٠٩، ص٤).

ئەمە ئەو زمانەیە، کە لە زمانەوانیدا بەدرێژی و وردی باسکراوە و ڕوونکراوەتەوە، زمان وەکو باسکرا سروشتێکی دەنگی هەیە و ئەرکێکی پەیوەندیی ئەوتۆی هەیە، کە لە بنەڕەتەوە مەرامدارە و ئەندامێکی جەستەی مرۆڤ جێبەجێی دەکات و ئەنجامی دەدات، کە

ئـــەویش زمـــانە، و خـــودا بە مرۆڤـــی بەخشـــیوە و وردە وردە بە تێپەڕبوونی کات لە زمان و جەستەی مرۆڤ تواناکانی جێگیر دەبێت و ڕەگ دادەکوتێـت و فرەیـی وەردەگرێـت، و لە ڕووی کـۆمەڵایەتییەوە دەبێتە بەشێک لە کەسایەتی مرۆڤ، کە لەژێر کاریگەریی بارودۆخی کۆمەڵایەتیدا دەبێت و کار لە بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکە دەکات.

ئینجـا ئەم تەوەرەیە و تەوەرەکـانی دی، تـا ئێسـتا تـوێژەرە ڕۆژئاواییەکـان سـەرقاڵن پێیـان، و هەر جارەی بە پرسێک دەیانخەنە ڕوو، لەبەر ئەم هۆکـارەیە نـاتوانین پێناسـەیەکی فـراوان و گشـتگیر و دیاریکراومـان بـۆ زاراوەی زمـان لە بـواری زمـانەوانی لای تـوێژەرە ڕۆژئاواییەکـان دەسـتبکەوێت، چـونکە هەر چەمکـی زمـان تـا ئێسـتا مشتومڕی لەسەرە و لە ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکەیەوە یەکلا نەبووەتەوە.

ئەم هەموو وردەکارییە زمانەوانی و زاراوەییانەی هەردوو وشەی (سیاسـەت) و (زمان)مـان هێنـایەوە، چـونکە ڕەنگـدانەوەی ئاشـکرا و ڕوونیان لەسەر چەمک و شێوەی سیاسـەتی زمـانی لای کۆزمانـەوانان هەیە.

## بەشی دووەم
## سیاسەتی زمان لە بواری زاراوەی كۆزمانەوانیدا

### ٢ـ١: چەمک و پێناسەی سیاسەتی زمان

زاراوەی سیاسەتی زمان پێکهاتەیەکی وەسفیی سادەیە، کە لە پێکهاتەیەکی بیانیی سادەوە وەرگیراوە، دواتر بۆ زمانی کوردی وەرگێڕدراوە، ئەم زاراوەیە بەرانبەر بەم زاراوەیە لە زمانی فەڕەنسیدا (Politicue Linguisticue)، لە زمانی ئینگلیزیشدا بەم زاراوەیە گوزارشتی لێدەکرێت: (Language Policy)، هەروەها زمان بە ڕێکوپێکی لە بەکارهێنانی دەسەڵاتی سیاسیدا بەکاردێت. (ڕەحیم سورخی: ٢٠١٣، ل٣١).

یاخود سیاسەتی زمان بریتییە لە سەراپای ئەو ڕێگایانەی دەگیرێنە بەر لە بواری پەیوەندییەکانی نێوان زمان و ژیانی کۆمەڵایەتی، بەتایبەتی لەنێوان زمان و ژیان لە وڵاتدا. (ئازاد عەزیز سلێمان: ٢٠١٤، ل ١٩).

لویس جان کالفی (Louis – Jean calvet) بەم شێوەیە زاراوەکە پێناسە دەکات: **((ئێمە سیاسەتی زمانی بە کۆی ئەو بژاردە هۆشیارانە هەژمار دەکەین، کە لە بواری پەیوەندییەکانی نێوان زمان و ژیانی کۆمەڵایەتیدا کاریان پێدەکرێت، بەتایبەتی لەنێوان زمان و ژیان لە سایەی نیشتماندا))** (لویس جان کالفی:٢٠٠٦، ص١١١).

دەکرێ سیاسەت ڕامانی هەبوونی دامودەزگای مەدەنی و قەوارەی سیاسی دەدات و چەمکی سیاسەتی زمان و کلتوورێکی نوێ دەخوڵقێنێ، هەروەها سیاسەتی زمان کار لەسەر دیراسەکردنی خودی زمان نەک سیاسەت دەکات. (سەلام ناوخۆش: ٢٠١٠، ل ٥).

لێرەدا دەتوانین چەندەها تێبینی دەربارەی ئەم پێناسەیە بخەینەڕوو:

١ـ سیاسەتی زمانی لە ڕوانگەی ئەم پێناسەیەوە لە وەرگرتنی چەند بڕیارێک پێکدێت، دەربارەی ژمارەیەک لەو بژاردانەی لەئارادا

هەن، کە بۆیان هەیە جێبەجێ بکرێن، یان جێبەجێ نەکرێن، لێرەدا ئەو پرسیارانە دەمێننەوە، کە پێناسەکە وەڵام دەربارەیان پێشکەش ناکەن، کە لەمانە پێکهاتوون: ئایا کێ بڕیاری جێبەجێکردنی ئەم بژاردە هۆشیارانە وەردەگرێت؟ ئایا کێ لە تواناکانی جێبەجێکردنیان ورد دەبێتەوە؟ ئایا ئەگەر دەزگا بێت چ سروشتێکی هەیە؟ ئایا ئەگەر لە چەند تاکێک پێکهاتبوون، شوناسیان چی دەبێت؟.

٢- بڕیارەکانی بەشێوەیەکی هۆشیار و مەرامدار وەردەگیرێن، نەک بەشێوەیەکی هەڕەمەکی، چونکە ئەمە دوورە لە سیاسەت و پلاندانان، کە مانای ئامادەکردن و ئامادەسازیی پێشوەختە دەگەیەنێت، بۆیە پێویستە بە شێوازێکی زانستیی ئەنجام بدرێت، هەروەها ئەو پرسیارانەش دەمێنن، کە پەیوەستن بە شوناسی ئەو کەسەی پرۆژەکە ئامادە دەکات؟ ئایا ئەو کەسەی ئامادەکردن دەکات، هەر ئەو کەسەیە، کە خودی پرۆژەکە جێبەجێ دەکات؟ ئایا ئەو بنەما زانستییانە چین، کە بڕیار لەسەر ڕەشنووسی دەستوورەکە دەدەین؟ بەداخەوە ئەمیش شتێکە لە پێناسەکەدا وەڵامی نەدراوەتەوە.

٣ـ پێناسەکە بابەتی سیاسەتی زمانی دەکاتە بنەمایەک بۆ پەیوەندیی زمان بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە، بە تایبەتی پەیوەندیی زمان بە نیشتمانەوە، لێرەدا پێناسەکە بەکورتی و بەبێ درێژەدان و بەبێ وردەکاری دەمێنێتەوە، دەربارەی ئەو پەیوەندییەی لەنێوان زمان یان زمانەکان و ژیانی کۆمەڵایەتیاندا هەن، کە ئایا پەیوەندییەکی پێکەوەییانەیە، یان پەیوەندییەکە ململانێ لەخۆ دەگرێت؟ جگە لە هەموو ئەمانەش پێناسەکە پەیوەندیی نێوان زمان و سیاسەت بە تەمومژاوی جێدەهێڵێتەوە، چونکە ڕۆشنایی ناخەنە سەری.

٤- سیاسەتی زمانەوانی وا دەخوازێ، کۆمەڵە دەستپێکێک لە ئارادا هەبن، کە ئەمانە گرنگترینیانن:

أ/ گرووپی زمانی، یان چەند گرووپێکی زمانی.

ب/ زمان یان زمانەکان.

ج/ خواستی ڕێکخستنی پەیوەندییەکی سەرنجڕاکێش بۆ شتەکان، لەنێوان زمان و ژیانی کۆمەڵایەتی، وەک خواست و ویستی ژیاندنەوەی زمانێک لە زمانەکان، یان ئارەزووی وەرگرتن، یان وەلانان، یان هاوچەرخکردنی زمانێک، یان چەند زمانێک.

د/ ئەو بژاردانەی بە شێوازێکی زانستی داڕێژراون، بە مەبەستی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان یەک زمان، یان چەند زمانێک لەگەڵ کۆمەڵگەدا.

هـ/ بوونی دەستەڵاتێک، کە ژیان لەناو نیشتماندا ڕێکبخات، بە ڕێکخستنی بارودۆخە زمانەوانییەکەشەوە.

ئەم تێبینییانە و چەند تێبینییەکی دی، هەموو بە شێوەیەکی کردەیی بوونەتە بابەتی چەند تـوێژینەوەیەکی فراوان و قـووڵ، کە دەربارەیان چەندەها ڕووننامە و بەدواداچوون و ئامار سازدراوە، ئەویش لەپێناو بەرەسەنکردنی زیاتری ئەم زانستە تازەیە، کە ناوی (سیاسەتی زمانی)یە، چونکە ئەم وێنایە هیچ بەرچاوڕوونییەک دەربارەی بنەما ئایدۆلۆژییەکە، یان بونیادییەکەی سیاسەتی پلانڕێژی زمانی پێشکەش ناکات، بە هەمان شێوەش هیچ بەرچاوڕوونییەک بۆ پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەستەڵات و هەژموون، یان دەربارەی ڕۆڵی لە قۆرخکردن و ململانێ پێشکەش ناکات (جیمس و طولیفصون: ٢٠٠٧، ص ٢٥).

وا پێدەچێ ئەو تەمومژییەی کە پێناسەی (کالفی) بۆ سیاسەتی زمان تێیدا نغرۆ بووە، زیاتر بۆ تازەیی ئەم لقەی کۆزمانەوانی دەگەڕێتەوە.

**٢-٢: سەرهەڵدانی زاراوەی سیاسەتی زمان:**

لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەم زاراوەیە، چەندەها زاراوەی دی سەریان هەڵدا، کە بووە هۆی ئەوەی تێکەڵ و پێکەڵی یەکدی بن، لەو زاراوانەی تێکەڵی زاراوەی سیاسەتی زمان بوون، زاراوەی پلانی زمانییە، ئەم

زاراوەیە لە هەموو ئەوانی دی زیاتر بەکار دەهێنرێت، هەر چەندە ئەم زاراوەیە لە نووسینەکانی بەراییدا زۆر بەکارنەدەهێنرا، کە باسیان لەم بابەتە دەکرد، یەکەم جار زاراوەی ئەندازەسازیی زمان لە بواری توێژینەوەکانی لەمەڕ کۆزمانەوانی بەکاردەهێنرا، ئەویش لەکاتی باسکردنی چالاکییەکانی پلانی زمان، ئەمە یەکەم زاراوەیە لە بواری توێژینەوەی کۆزمانەوانیدا بەکارهێنرابێت، ئەویش لەکاتی قسەکردن لەسەر پلانی زمانیدا، لە ڕاستیدا ئەم زاراوەیە لە زاراوەی سیاسەتی زمانەوانی زیاتر بەکاردەبرا، هەروەها زاراوەی دی هەبوون، وەکو **(پێشڤەچوونی زمان)**، یان **(گەشەپێدانی زمان)** و **(فێرکردنی زمان)** (روبرت ل كوبر:٢٠٠٦، ص٦٧)، هەروەها هەندێک جار زاراوەی سیاسەتی زمان وەک هاوواتای زاراوەی پلانی زمانی و ئامادەسازیی زمانەوانی بەکارهێنراوە. (لويس جان كالفي:٢٠٠٩، ص ١١).

**٢ـ٣: پەیوەندیی سیاسەتی زمان بە کۆزمانەوانی**

دەستوەردانی مرۆڤ لە بارودۆخە زمانەوانییەکاندا، ئاکارێکی تازە نییە، کۆششەکانی خەڵکی لە کۆنەوە بۆ پاساڕێژکردنی بەکارهێنانە زمانەوانییەکانیان کۆششگەلێک بوون، کە ناتوانین نکۆڵییان لێ بکەین، هەروەها دەستنیشانکردنی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بۆ زمان و دیاریکردنی لە نێوان چەند زمانێکی دیکە، بۆ بەڕێوەبردنی بەشەکانی دەوڵەت، مەسەلەیەکی دووبارەیە و لە مێژوودا زۆر ڕوویداوە.

کەچی هەموو ئەم دەستوەردانانە لە بزاوت و جووڵەی زمان لەسەر بنەمای تیۆری و توێژینەوەی مەیدانی دانەمەزرا بوو، تاکو لێی بکۆڵرێتەوە و پەیوەندیی زمان بە کۆمەڵگە چارەسەر بکات، بەتایبەتی ئەگەر بەهۆی بڕیاری سیاسییەوە دروستبووبێت و سیاسییەکانیش خودیەتیان زۆرە، هەروەها ئەم دەستوەردانانە لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە ئەنجام نەدراوە، کە پسپۆڕی کۆزمانەوانی بن (لويس جان كالفي: ٢٠٠٩، ص٢٦).

ئەم تـوێژینەوانە گرنگـی بە داڕشـتنی میتـۆدە زانسـتییەکانی ئەو دەسـتوەردانانە دەدەن، لە بەڕێـوەبردنی ئەو فرەجـۆرییەی لە زمانێکـدا هەن، لەم چەرخەدا پەیدابوون، نەخاسـمە گرنگیدانی بـازنەی (پراگ) بـۆ پێوانەکردنی زمانی (چیکی) بە شـێوەیەکی زانسـتی، لە بواری سیاسـەت و پلانی زمانیدا پێشەنگ بوو، لێرەدا دەبینین (ئەنتوان میلیت – Antoine meillet) بەوپەڕی لێهاتووییـــەوە لـــەو یاســـایانەی کۆڵیوەتـــەوە، کە بـــارودۆخی زمـــان لە کۆمەڵگـــەیەکی فرەزمـــان کـــۆنترۆڵ دەکەن و بەڕێوەیـــان دەبەن، هەروەهـــا زمانەوانەکـــانی بەرەو دۆزیـــنەوەی ئەم یاسایانە ئاراستە کرد، هەر لە ساڵی (١٩٠٦) میتۆدێکی بۆیان داڕشت، کە تێیــدا وتــی: ((**پێویســـتە دەستنیشـــانی ئەوە بکەیـــن، کە لەگـــەڵ چ بونیـادێکی کۆمەڵایەتیـدا، بونیـادێکی زمـانی دیـاریکراو کـۆک دەبێـت، هەروەها پێویستە دەستنیشانی ئەوە بکەین، کە گۆڕانکاری لە بونیادە کۆمەڵایەتییەکانـــدا بەشـــێوەیەکی گشـــتی چـــۆن دەردەکەون لە گۆڕانکارییەکانی پەیوەست بە بونیادە زمانەوانییەکان**)) (محمود السعران: ١٩٦٣، ص٦٢)، لەبەر ئەوە نامۆ نییە، کاتێ دەبینین (ئـەنتوان میلیت) بـاس لە ئەوروپای زمانەوانی دەکات (لویس جان کالفي:٢٠٠٩، ص ١٣).

کەچــی زاراوەی پلانــی زمــان تــەنیا لەســەر زاری **ڤانــدش ـــــ** Vrielweinreich) دەرکەوت، بەڵام (ئینـار هـۆگن – Haugen)، کە پسـپۆڕی کۆزمانـەوانی بـوو، تـوانی سـاڵی ١٩٥٧ زاراوەکە بخـزێنێتە نـاو بـواری کۆزمـانەوانییەوە، ئەویـش لەڕێگـەی وتـارێکییەوە دەربـارەی بـارودۆخی زمانی نەرویجی نووسیبووی، هەروەها (فیشمان) گوزارشتی (**سیاسەتی زمـان**)ی لە پەرتـووکێکی خۆیـدا باسـکرد، کە لە سـاڵی (١٩٧٠)دا بـڵاوی کــردەوە، بەم شــێوەیە ئیــدی دووانەیــی (**سیاســەت/ پــلان**) زیــاتر بڵاوبوونەوە، بەبێ ئەوەی ماناکانیان بەوردی بزانرێت، چونکە هەردوو زاراوەکە لەناو دوو زانستدا سەریان هەڵداوە و تازە پەیدابوون، لەبەر ئەوە ئەوکـــاتە زاناکـــان لەســـەر دەستنیشـــانکردنی ناوەکانیـــان ڕێکنەکەوتبـــوون، ئەو دوو زانســـتەش بریتـــی بـــوون لـــە: **یەکـــەمیان:**

**زمانــەوانیی کــارەکی** Linguistice Appliue ((زمــانەوانیی کــارەکی، ئەم زاراوەیە لە ســاڵی ١٩٤٦ەوە ســەریهەڵداوە و بــووەتە لقێک لە لقەکـانی زمــانەوانیی گشــتی، تــاکو ئەوکــاتەی لێــی جودابــوویەوە، پاشــانیش بــۆ نــزیکەی ســی ســاڵ هاوبەشــی بــووە، چــونکە لە ڕاســتیدا زانســتێکە لــە ئەنجـامی زانسـتەکانی دیـکە بەرهەمـدێنێت، کە پەیوەنـدییان بە زمـانەوە هەیە، ئەم زانستەش بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی زمان بەکاردێت، کە لە بوارەکانی دی نازمانی ڕووبەڕووی دەبنەوە، وەک بواری فێربوونی زمانی یەکەم و فێربوونی زمانی دووەم و فرەیی زمان و پلانی زمان و چارەســـەرکردنی کێشـــەکانی ئاخـــاوتن و وەرگێـــڕان و ئامـــادەکردنی فەرهەنــگ و سیســـتەمەکانی نووســـین، ئەم زانســـتە بــۆ چەنــد لقێکــی زانســـتیی دیـــکە دابەش بوو(زمانـــەوانیی فێرکـــاری، کۆزمانـــەوانی، زمانـەوانیی دەروونـی))) (محمد فتیح:١٩٨٩، ص١٢ـ ١٥) و (صالح لعید:١٩٩٩، ص١١ - ١٩) و دووەمیــان: **کۆزمانــەوانی** Socialinguisticue ((زۆربــەی ســەرچاوەکان لەســەر ئەوە کـۆکن، کە زاراوەی بیـانی Socialinguisticue، بە زمانی کوردی پێیدەوترێت: (کۆزمانەوانی ـ زمانەوانی کۆمەڵایەتی)، فیشمان پێیوایە کۆزمانەوانی ئاوێتەبوونی دوو ڕواڵەتی ئاکاری مرۆیی لەخــۆ دەگرێــت، کە لەم دووانە پێکهــاتوون: بەکارهێنــانی زمــان و ڕێکخستنی ئاکاری کۆمەڵایەتی، کەواتە ئامـاجی کۆزمـانەوانی گەڕانە بە دوای فرەجۆری پەیوەندیی ڕواڵەتە زمانەوانییە کۆمەڵایەتییەکان، چونکە فرەجــۆری دوو بەشـــن: فرەجــۆرییەکی زمــانەوانی و فرەجۆرییــەکی کـۆمەڵایەتی و لەنێوانیشـیاندا جـۆرە پەیوەنـدییەک هەیە، کە لەوانەیە لە ڕواڵەتدا بێت، یان لە ناوەرۆکدا بێت، یان لە هەردووکیان پێکەوە بن.)) (ســـلطان ناصـــر المجیـــول:١٩٩١، ص ٦٦)، بەم شـــێوەیە توێژینەوەکـــانی بەڕێوەبردنی فرەجۆری زمان بووە لقێک لە لقەکـانی سیاسـەتی زمـانی، کە توێژینەوەکانیـان لەژێـر سـایەی هەردوو ئەم زانسـتە تـازەیە جێیـان بووەوە.

بونیادگەریی لەسەر بنەمای ڕەتکردنەوەی لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی زمان دروستبوون، کەچی کۆزمانەوانی وەکو زانستێک گرنگی بە لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی زمان دەدات، ئەم دوو تەوژمەش هەردووکیان بە شێوەیەکی سەربەخۆ پێشڤەچوونیان بەخۆوە بینی (عبدالحمید دباش:٢٠٠٤، ص ١٤).

ئەو شتە نوێیەی لە شەستەکانی سەدەی پێشوو سەری هەڵدا، لەو گرنگیدانە فراوانە بەرجەستە بوو، کە کۆزمانەوانی توانای دۆزینەوەی زۆر لەو شتانەی هەیە، کە لە سروشتی زمان و سروشتی کۆمەڵگەدا شاردراوە بوون (هدسون:١٩٩٠، ص١٢)، ئینجا لەبەر ئەوەی سیاسەتی زمان چالاکییەکی ڕاشکاوانەیە و ئاراستەی زمان دەبێت، ئەوا توێژینەوەی سیاسەت و پلانی زمانی لە بواری کۆزمانەوانیدا جێی دەبێتەوە، هەروەکو (فیشمان) ئاماژەی بۆ دەکات، تەنانەت وای لێهات پلانی زمانی بە (کۆزمانەوانیی کارەکی) ناوزەد دەکرا (روبرت ل كوبر: ٢٠٠٦، ص ٩١)، بگرە (لویس جان کافی) ئەوەی تێبینی کرد، کە پێشڤەچوونی کۆزمانەوانی بە پێشڤەچوونی سیاسەتی زمانییەوە پەیوەندی هەیە و توندبوونی ئەم زانستەش دەرەنجامی گرنگیدانە بەراییەکانی بوو بە سیاسەتی زمانی (لويس جان كالفي: ٢٠٠٩، ص ٣١).

## بەشی سێیەم
## ڕێکارەکانی دارشتنی سیاسەتی زمانی

بەرزکردنەوە و گەشەکردنی زمان پێویستی بە ئامادەکردنی پلان و سیاسەتێکی زمانی لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا هەیە. (عبدالقادر الفهري: ٢٠١٠، ص ٦٣)، میتۆدی دارشتنی سیاسەتی زمان لە میتۆدی کۆزمانەوانی دوور نییە، چونکە زادەی ئەم زانستەیە، (میشال زەکەریا) دەڵێت: ((**باشترین و باڵاترین دارشتن ئەوەیە، کە توێژینەوەی نیازمەندی و ئامانج و ئامراز و دانانی نەخشەکانی کارکردن و هەڵسەنگاندنیان ئەنجام بدەین، کەواتە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی نەخشە دادەڕێژێت، گرنگی بە پرسەکانی زمان لە کۆمەڵگەدا بدات، پێش ئەوەی دەست بەم کارە بکات، هەروەها پێویستیشە لەسەری بەدوای گرفتەکانی زماندا بگەڕێت و لەو فاکتەرە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و سیاسی و ئابووری و پەروەردەییانە بکۆڵێتەوە، کە لەگەڵ مەسەلە زمانییەکانی کۆمەڵگەدا تێکەڵ دەبن**)). (أحمد بوکوس:٢٠٠٣، ص ٢٠).

ئینجا ڕێکاری دارشتنی سیاسەتێکی زمانی بە سێ قۆناغی سەرەکیدا تێپەڕ دەبێت، کە ئەمانەن:

**یەکەم: وەسفکردنی بارودۆخی کۆزمانەوانی،** خوازیاری ئەوەین بۆ بەڕێوەبردنی، وەسفێکی زانستی وردی بدەینێ، تا بگەینە حاڵەتی تێربوون لە وەسفکردن و شیکردنەوەی، ئەمەش تەنیا بە هەژمارکردنی کێشەکان دەستەبەر دەبێت، پاشان پێویستە لە ڕووی کۆزمانەوانییەوە شیانبکەینەوە.

ئەگەر شێوازەکەی (لویس جان کالفی) لە بواری چاودێریکردنی دیاردە زمانەوانییەکان و شوێنەوارە سیاسییە کۆمەڵایەتییەکان لێکبدەینەوە، ئەوا دەبینین شێوازەکەی جەخت لەسەر دوو توخم دەکاتەوە، کە ئەمانەن(Calvet:2009, p79):

**أ/ توێژینەوەیەکی مەیدانی،** کە قوتابییەکانی ئەم زانایە ئەنجامیان داون، ئەم توێژینەوەیە لەسەر بنەمای تێبینیی ڕاستەوخۆ و کۆکردنەوە و بەدواداچوون و ڕوونخوازی و دەرخستنی ئەنجامەکان لە خشتە و

ئامارەکانــدا ئەنجــام دەدرێــت، هەروەهــا ئەم تــوێژینەوەیە پشــت بە هەڵبژاردنــی مەیـدانی توێژینەوەکـانی دەبەسـتێت. (لـویس جـان کـالفی) جەختی لەسەر بازاڕەکان کردووەتەوە، چونکە باشترین و گونجاوترین شــوێنە بــۆ ئــاڵوگۆڕی زمــانەوانی، ئەم تــوێژینەوەیەش ئەم کــاتە بە **(توێژینەوەی جەستەی زیندوو)** ناوزەد دەکرا.

ئامرازەکـانی تـوێژینەوەی مەیـدانی پشـت بە هەمـوو جۆرەکـانی تێبینیکــردن و تــوێژینەوەی حاڵەتەکــان و پرۆســەکانی ڕوومــاڵکردنی گشتی و ڕووماڵکردنی نموونەکان دەبەستێت، هەروەها پشت بە دیدار و نووسینی ڕاپۆرت و بەکارهێنانی ئامێرەکانی تۆمارکردن و وێنەگرتن دەبەستێت (عبدالفتاح عفیفي: ١٩٩٥، ص ١٨٤).

هەروەها (میشال زەکەریا) چەند هەنگاوێک بۆ چۆنیەتی پێوانەی بارستایی بەکارهێنانی زمانی فەڕەنسی لە وڵاتی لوبنان پێشنیاز دەکات، کە نەخشەیەکە دەکرێ پشتی پێببەسترێت، ئەو دەڵێت:

**((١ــ قســە بە زمــانی فەڕەنســی دەکەیــن (قوتابخــانە، ژیــنگەی کــۆمەڵایەتی، دەوروبــەر، گوێگرەکــان، بابەتەکــانی ئاخــاوتن، شــوێنی کارکردن...).**

**٢ـ گوێ لە زمانی فەڕەنسی دەگرین (وانەکان، ڕادیۆ، تەلەڤزیۆن، شانۆ، سینەما، وانەبێژی، تۆمارەکان...).**

**٣ـ بە زمـانی فەڕەنسـی دەخوێنینـەوە: (ڕۆمـان، گۆڤـار، ڕۆژنـامە، بڵاوکراوە...).**

**٤ــ بە زمــانی فەڕەنســی دەنووســین (ڕاپــۆرت، وتــار، نووســین، یاداشتنامە، نامەی تایبەت، نامەی کارکردن...).**

**٥ــ زمــانی فەڕەنســی وەک زمــانی دووەم هەڵــدەبژێرین (ئەرکــی زمــانی فەڕەنســی، کەمەندکێشــبوون بــۆی، پــۆلێنکردنی ئــابووری و پیشــەیی، سروشــتی مامەڵــەکـردن و پلەکـانی، کاردانەوەکـانی ژیـنگە، هەڵوێست وەرگرتن دەربارەی، فاکتەر، ئایدۆلۆژییەکان...).**

**٦ـ بۆ مانەوەی زمانی فەڕەنسی لە لوبناندا کار دەکەین (دووانەیی و پلەکانی زمانەوانی، زانینی زمانی دووەم، دنەدان بۆ فێربوونی بابەتە**

**پەروەردەیـی و فێرخوازییەکـان، بەرنـامە بینراوەکـان...) )).** (میشـال زكريا:١٩٩٣، ص ٤٥).

**ب / توێژینەوە لە سەنتەری بڕیاردان و سەرکردایەتی ئەرکان،** واتە تـوێژینەوەیەک لە دەرەوەی مەیـدان، بـۆ هەمـوو ئەو شـتانەی لە مەیداندا کۆکراونەتەوە.

**دووەم: دەستنیشـانکردنی ئامـانجە** مەزن و قۆناغبەنـدییەکان و ئاراسـتە گشـتییەکان، ئەمەش تەنیـا بە زانینـی ئەو ئەنجامـانە دەسـتەبەر دەبێـت، کە خوازیـاری گەیشـتنین پێیـان، لێـرەدا دەبینـین (لـویس جـان کـالفی) هەوڵـدەدات سـوود لە ئەزمـوونە زمـانەوانییە هاوچەرخەکـانی بـواری سیاسـەتی زمـان ببینێـت، تـا ئامانجەکـانی سیاسـەتی زمـان و چارەسەری گرفتەکانی فراوانتر بکات، تاکو چارەسەرکردنی هەموو ئەو گرفتـانەی دێـنە پـێش زمـان بگـرێتەوە، وەکـو دەسـتوەردان لە وێـنەی زمانەوانی بە داهێنانی نووسین، یـان بە بەرهەمهێنـانی فەرهەنگی، یـان دەستوەردان لە پلە و پایەی زمان و باسکردنی ئەرکەکانی زمان و پایە کۆمەڵایەتییەکـانی و پەیوەنـدییەکانی خـودی ئەو زمـانە بە زمانەکـانی دیـکەوە. بەم سیاسـەتە زمـانییە دەتـوانین وشـە بگـۆڕین و دروسـتیان بکەین، واتە وشەی تازە دروست بکەین و دژ بە خواستنی وشـەی دی بوەستینەوە، هەروەها دەتوانین پێگەی زمان لەڕێگەی بەرەوپێشبردنیان و گەیاندنیان بـۆ ئاسـتی زمـانە ڕەسـمییەکان بگـۆڕین (لـويس جـان كـالفي: ٢٠٠٩، ص ٢٣). ئەمە ناسـراوترین ئەو گرفتـانەیە، کـە لە کـاتی داڕشـتنیاندا سیاسـەتە زمانییەکـان بە ئامانجیـان دەگـرن، ئەمـانەش میشـال زەکـەریا بەم شێوەیە پوختیان دەکاتەوە:

١ـ داڕشـتنی پێـوەری نووسـینی ڕاسـت و دروسـت و قسـەکردنی باش.

٢ـ گونجانـدنی زمـان، وەک ئامرازێـک بـۆ گوزارشـتکردن لەلایەن تاکەکانی ئەو گەلەی بەکاریدەهێنن.

٣ـ توانای زمان لەسەر ئەوەی ببێتە ئامرازێک بۆ داهێنـانی هـزری و زانستی.

٤ـ بێتوانایی لەسەر تێگەیشتنی ئەندامانی کۆمەڵگە زمانییەکان لەناو یەک دەوڵەتدا.

٥ـ هەڵبژاردنی زمانی فێرکردن.

٦ـ وەرگێڕانی بەرهەمە ئەدەبییەکان.

٧ـ پشتبەستن بە زمانێکی گونجاو بۆ ئاڵوگۆڕکردنی بەرهەمە زانستییەکان.

٨ـ ئەو کۆت و بەندانەی لەسەر بەکارهێنانی زمانییدا لە هەندێک کۆمەڵگە دانراون.

٩ـ ململانێی نێوان زارەکان و هەوڵدان بۆ باڵاکردنی یەکێک لەو زارانە و گەیاندنیان بە ئاستی زمانی فەرمی.

١٠ـ پارێزگاریکردن لە هاوسەنگیی نێوان بەرژەوەندیی دەوڵەت و بەرژەوەندیی تاکەکان لە بواری زمانییدا. (میشال زکریا: ١٩٩٣، ص ١١).

پاش تێڕوانین لەم شتانەی وتوومانن، دەتوانین تێبینی ئەوە بکەین، کە سیاسەتی زمانی لەسەر دوو تەوەر ئامانج دەگرێت، کە ئەمانەن: کارتێکردن لە زمان، یان کارتێکردن لە زمانەکان.

کارتێکردن لەسەر زمان لەوانەیە پەیوەندی بە ڕێنووس، یان فەرهەنگ، یان شێوەی زارەکان هەبێت، لەوانەیە پێویستیمان بەوە هەبێت پیتێکی تازەی نووسین بۆ زمانێک دابهێنین، کە خاوەن ڕێنووس نەبێت، یان ئەلفوبێیەکەی سادە بکرێتەوە، یان سەرتاپا گۆڕانکارییان بەسەردا بێت، لەوانەشە پێویستی داهێنانی چەند یەکەیەکی فەرهەنگی تازە بین، بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکان لە بواری وشەکاندا، بەرانبەر پێشڤەچوونی لایەنەکانی ژیانی سیاسی و زانستی، لە هەمان کاتدا لەوانەیە زارێک لەنێو زارەکانی دیکەدا باڵاتر بچێت و بگاتە ئاستی زمانی نیشتمانی، لەم حاڵەتەدا ئەم زارە پێویستی بە پوختکردن و یەکخستنی بەکارهێنانەکانی لە هەموو خاکی نیشتماندا دەبێت. (لویس جان کالفی: ٢٠٠٦، ص ١١٢ ـ ١١٧).

بەڵام کارتێکردن لەسەر هەموو زمانەکان، بە فێرکردنی فرەیی زمانی دروست دەبێت، پاشان پێویستە زمانێک لەناو ئەو زمانانە

هەڵبژێردرێت، بۆ ڕاپەڕاندنی چەند ئەرکێکی دیاریکراو (لویس جان کالفی:٢٠٠٦، ص ١٥٧ - ١٥٨)، بۆ نموونە ئەگەر گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان بۆ سەر چینی بژاردە هەڕەشە و مەترسی بوون، ئەوا ئەم ئاگادارییە بەوەی پێویستە سیاسەتێکی زمانی هەبێت و دروست بکرێت، ئەگەر بژاردەی بەرانبەریش ئەم گۆڕانکارییانەیان داواکرد، ئەوا هەمان حاڵەت پەیڕەو دەکرێت، زۆرجار پرۆسەی کێشانی نەخشەی سیاسەتی زمانی لە هەوڵدان بووە، بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی تایبەت، لەم حاڵەتەدا پێویستییەکە بۆ ئەم زمانە زیاتر و چڕتر دەبێت، کاتێک کۆمەڵگە ئارەزووی گۆڕانکاری لە بواری ئەرکەکانی زماندا دەکات، لەبەر ئەوە ئەوانەی سیاسەتی زمانی دادەڕێژن، پێویستە لەسەریان توانای گۆڕینی هەڵسەنگاندنەکانی خۆیان بۆ زمان بۆ نموونە لە زمانی (أ) بۆ زمانی (ب) هەبێت، پێش ئەوەی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەدا بکەن. (روبرت ل کوبر: ٢٠٠٦، ص ٢١٩ ـ ٢٢٠).

هەرچەندە بارودۆخە زمانییەکان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە دەگۆڕێت، کەچی زانایان هەوڵیانداوە ئامانجەکانی داڕشتنی پلانی سیاسەتە زمانییەکان دەستنیشان بکەن، لەم پرۆسەیەدا گەیشتنە سێ ئامانجی سەرەکی، کە (میشال زەکەریا) بەم شێوەیە کورتیان دەکاتەوە (میشال زکریا: ١٩٩٣، ص ١٦):

**١. هەڵگرتنی فرەیی زمانی و دەستگرتن بە یەک زمانەوە،** کە ببێتە زمانی نەتەوەیی فەرمی، ئەمەش تەنیا بەم هەنگاوانەی خوارەوە دەستەبەر دەبێت:

أ- هەڵبژاردنی نموونەیەکی پێوەر لەنێوان ئەم زمانانەدا (قۆناغی هەڵبژاردن و نموونەگەریی).

ب- داڕشتنی شێوەی ئەو زمانەی خوازیاری باڵاکردنین.

ج- داڕشتنی یاسا و دەقی یاسایی، کە ئەرکەکانی زمان لەخۆ بگرێت (قۆناغی یاساڕێژی و فراوانکردنی ئەرکەکان).

د- وەرگرتن و پەسەندکردنی ئەم زمانە لەلایەن کۆمەڵگەوە (قۆناغی جێگیرکردنی جۆرەکەی). (میشال زکریا: ١٩٩٣، ص ١٦).

هەروەک دەردەکەوێت ئەم ئاراستەیە ئاوێتەکردنی کەمینە ئەتنیکەکان لە بۆتەیەکی ڕۆشنبیریی نیشتمانیدا بە ئامانج دەگرێت. (ڕۆشنبیری)ش وەکو زاراوە و چەمک لە دواهەمین پێناسەکانیدا، کە لە کۆنگرەی جیهانی وەزیرانی ڕۆشنبیری لە (مەکسیکۆ) ساڵی (١٩٨٢) گرێدرا، بریتییە لە: کۆی ئەو ئادگارە ڕوحی و ماددی و هزری و سۆزدارانەیە، کە کۆمەڵگەیەک لەیەکتری جیادەکەنەوە، هەروەها گرووپێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوە، هونەر و ئەدەب و شێوازەکانی ژیان دەگرێتەوە، بە هەمان شێوەش مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ و سیستەمەکانی بەها و داب و نەریت و باوەڕیش دەگرێتەوە، هەروەها ڕۆشنبیری توانای بیرکردنەوە لە خودی مرۆڤ بە مرۆڤ دەبەخشێت، ئەو توانایانەی وامان لێدەکەن ببینە کائینێکی وا، کە خەسڵەتی مرۆیی لەخۆبگرین، کە لە عەقڵانییەت و توانای ئاراستەکردنی ڕەخنە و پابەندبوونی ئاکاری پێکدێن. (أحمد بن نعمان: ١٩٩٧، ص ١٣٦).

**٢ـ پەیڕەوکردنی فرەیی زمان و دانانی پێی**، ئەویش لەپێناو پارێزگاریکردن لە زمانە سەرەکییەکان لەناو دەوڵەتدا و هەڵبژاردنی زمانێک یان زیاتر، تاکو ببێتە زمانی فەرمی. ئەم ئاراستەیە هەنگاو دەنێت بۆ جێبەجێکردنی پرۆسەی پێکەوەژیانی پرسە ڕۆشنبیرییەکانی ناو یەک دەوڵەت و بواردان بە فرەجۆری، لەجیاتی گونجانی ڕەگەزی و ئەنجامدانی گۆڕانکاری لەجیاتی چەسپاندن و جێگیربوون.

**٣ـ پەیڕەوکردنی دوو زمانی فەرمی و دانانی پێیان**، چونکە هەردووکیان لەگەڵ پێکهاتەی زمانەوانی نیشتمانیدا دەگونجێن، ئامانجی ئەم ئاراستەیە ئەوەیە، دادپەروەرانە مامەڵە لەگەڵ هەردوو ئەم گرووپە زمانییە بکرێت، کە لەناو یەک دەوڵەتدا بەکاردەهێنرێن.

ئامانجەکانی سیاسەتی زمانی وا پێدەچێت تەنیا چارەسەرکردنی گرفتە ڕەهاکانی زمانەوانی بێت، ئەمەش خاڵێکە (ئینار هۆگن) بەم وتەیە جەختی لەسەر دەکاتەوە: ((**لە کاتێکدا پلانی زمانی دەبێتە پێویستییەک، ئەگەر چەند گرفتێک لە زماندا سەرهەڵبدەن، کە تێبینی ئەوەش دەکەین زمانێک لەبەر هەر هۆکارێک بێت، ببێتە شتێکی وا، کە مەرامە**

**خوازراوەکە بەدی ناهێنێت، لەم حاڵەتەدا بوار بەرانبەر بە بەرنامەی پلانی زمانی والا دەبێت))** (روبرت ل کوبر: ۲۰۰٦، ص۷٥)، بەڵام مەسەلەکە وا نییە، چونکە تەنیا پەیوەندی بە چارەسەرکردنی گرفتەکانی پەیوەست بە کەموکوڕیی زمانێک، یان چەند زمانێکەوە نییە، چونکە مەبەست و مەرامی سیاسەتی زمانی تەنیا هەر خودی زمانەکە نییە، بەڵکو کاریگەری لەسەر ئاکاری زمانەوانی تاکەکانی کۆمەڵگەش هەیە، لێرەوە ئیدی پلانی زمانی بەرەو جێبەجێکردنی ئامانجێک ئاراستە دەکرێت، کە پەیوەندی بە زمانەوە نییە (روبرت ل کوبر: ۲۰۰٦، ص ۷۷). بەجۆرێک پەیوەندییەکانی نێوان زمان (زمانەکان) و ژیانی کۆمەڵایەتی لە یەک کاتدا لە ڕووی شوناسی ڕۆشنبیری و ئابووری و گەشەکردنیشەوە گرفتن، ئیدی بەم شێوەیە شارەزای سیاسەتی زمانی (فرانکۆفۆنی) و (ئەنگلۆفۆنی) و هتد... دەبین. (لویس جان کالفي: ۲۰۰۹، ص١٤).

لەوانەیە ئامانجەکانی سیاسەتی زمانی ڕاگەیەنراو و ڕانەگەیەنراو گوزارشت لە قەڵبەزەیەکی جۆری تویژینەوە زمانەوانییەکان بکەن، چونکە سیاسەتی زمانی لەسەر چارەسەرکردنی پرسەکانی شێوازی زمانەوانی (بونیادی) بازیدا و چووە بواری چارەسەرکردنی پرسەکانی پێگە (Staut)، ئەم پێشڤەچوونەی تویژینەوە کۆزمانەوانییەکانیش پێشڤەچوونێکی هاوتەریبە لەگەڵ پێشڤەچوونی تویژینەوە زمانەوانییە گشتییەکان، کە دەستی بەوە کردووە بەرەو گێڕانەوەی گرنگ بۆ لایەنە کۆمەڵایەتییەکەی زمان کەمەندکێش ببێت. (لویس جان کالفي:۲۰۰۹، ص۲۲).

**سێیەم: داڕشتنی ستراتیژییەت و دەستنیشانکردنی** ئەو ئامرازانەی دەتوانێت پراکتیزەیان بکات و ئامانجەکانیان جێبەجێ بکات و سیاسەتی زمانی بەجێ بهێنێت. ستراتیژییەتیش مانای زانست و هونەر و داڕشتنی ئەو هێڵە گشتییانەیە، کە تێبینیکراون و بەوردی تویژینەوەیان لەبارەوە کراوە و بەشێوەیەک داڕێژراون، کە بەدوایەکدا دێن و ئاوێتە بن و بۆ بەکارهێنانی داهاتەکان هەماهەنگ بن (هەموو جۆرەکانی سامان و هێز) بۆ بەجێهێنانی ئامانجە مەزنەکانن، ئەم زاراوەیە لەم چەند دەیەی دواییدا بەکارهێنانی تەشەنەی سەند، زاراوەکە لە بنەڕەتدا یۆنانییە و

مانای هونەری شتەکان، یان پلانە گشتییەکان دەگەیەنێت (عبدالوهاب الكيالي: ٢٠١٠، ص ١٦٩).

ڕوونترین نموونەش لەسەر ئەمە، ستراتیژییەتی دوژمنکارانەی فەڕەنسایە لەکاتی داگیرکردنی جەزائیر لە بواری سیاسەتی زمانیدا، کە لەم خاڵانەدا بەرجەستە بوو:

١- کۆگەیەکی یاسایی سیاسەتکراو، کە ئامانج لێی سەپاندنی واقیعێکی زمانەوانی کۆمەڵایەتی دیاریکراوی تازە بوو.

٢- کۆگەیەکی پڕی داهاتە نەختییەکان (بە داراییکردنی ئاراستەکراوی سیاسییانە)، ئەویش لەڕێگەی سەپاندنی بودجەیەک، بۆ زامنکردنی داراییکردنی ئەم پرۆژە زمانەوانییە.

٣- دامەزراندنی دەزگا بە سیاسەتکراوەکانی پەروەردەیی و ڕۆژنامەوانی و ئایینی و گەشتیاری، لە سەرووی هەمووشیانەوە ڕێکخراوی فرانکۆفۆنی و کەنیسەکان.

٤- کاریگەرییە دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان، ئەمەش بووە هۆی دەرکەوتنی کۆمەڵەیەک، کە بە **(کۆمەڵەی بژاردە)** ناوزەد دەکران، کە جەختیان لەسەر ڕواڵەتەکانی ژیان و ژیاری فەڕەنسی دەکرد.

فەڕەنسا لەپێناو ئەم کاریگەرییانەدا پەنای بردە بەر چەند ئامرازێک لەوانە:

١- قۆرخکردنی ڕاگەیاندنێکی پەرچەکردار و ئاراستەکراو، بۆ دروستکردنی ڕایەکی گشتی، تەنانەت بەهەڵە و چەواشەکاریش بێت، چونکە تا ئێستاکەش کەسانێک لە ئێمە هەن، وا گومان دەبەن فەڕەنسا هەڵگری ئاڵای ژیار و شارستانیەت و دادپەروەریی کۆمەڵایەتییە.

٢- بەهێزکردنی هەستکردن بە کەمی، و مەدهۆشبوون بە شارستانێتی فەڕەنسی لەلای جەزائیرییەکان، ئەویش لەڕێگەی سیاسەتی شوشتنەوەی مێشک، بە ڕێکخستنی سەردان و ناچارکردنیان بۆ فەڕەنسا، تا وای لێهات بژاردەیەکی خەڵکی دروستبوون، کە

بۆچوونێکی فرانکۆفۆنییان لە ژیاندا بۆ دروستبوو، کە بە کۆمەڵەیەکی لادەر لە کۆمەڵگە لە ڕووی زمانی و هزری و فیکرییەوە هەژماردەکران.

٣- پشتبەستن بە ئافرەت، بۆ بڵاوکردنەوەی زمانی فەرەنسی لەناو ئافرەتانی جەزائیر، ئەویش لەژێر چەتری کۆمەڵە و دەزگا خێرخوازییەکان.

قۆناغی یەکەم لای (ڕۆبیر) بە ئاستی هەڵسەنگاندنی بارودۆخەکە هەژمار دەکرێت، بەڵام دوو قۆناغەکەی دوایی گوزارشت لە ئاستی سیاسەتی زمانی دەکەن (دباش عبدالحمید:٢٠٠٩، ص ٢١٠).

کەواتە وا پێدەچێت بەپێی قسەکانی (لویس جان کالفی) لە ڕێگەی سیاسەتی زمانی فەرەنسی لە سەردەمی کۆلۆنیالیدا تەنیا ڕووی مەدەنی و شارستانی جەنگی زمانەکان بێت.

**ئەنجام:**

لێرەدا دەتوانین ئەم ئەنجامانە بخەینەڕوو:

١- سیاسەتی زمانی لقێکە لە لقەکانی زانستێکی تازە، کە کۆزمانەوانییە و بابەت و میتۆدی تایبەت بە خۆی هەیە.

٢- بۆ دارشتنی سیاسەتی زمانی، پێویستە ئەم قۆناغانە پەیرەو بکرێن:

أ- وەسفکردنی بارودۆخی کۆزمانەوانی، کە خوازیاری دەستوەردانین لێی.

ب- پاشان دەستنیشانکردنی ئامانجەکانی ئەم سیاسەتە زمانییە.

ج- لە کۆتاییشدا دارشتنی ڕێکار و ستراتیژی ئەوتۆ، بۆ جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتە زمانییە.

٣- سیاسەتی زمانی ڕووی شارستانی پێشکەوتووی جەنگی زمانەکانە، ئەمەش بۆ شەڕێکە، کە جەنگی ڕۆشنبیری و ئابووری و سیاسی پێ دادەپۆشرێت، کە لەژێرەوە بەڕێوەدەچێت.

٤- سیاسەتی زمان جیاوازە لە زمانی سیاسەت، سیاسەتی زمان کار لەسەر دیراسەکردنی خودی زمان (نەک سیاسەت) دەکات، بەڵام زمانی سیاسەت کار لەسەر سیاسەت دەکات.

## سەرچاوەکان

**بە زمانی کوردی:**

١ـ ئازاد عەزیز سلێمان (٢٠١٤)، ململانێی زمان - زمانی کوردی لە ناوچە کوردستانییەکانی دەرەوەی ئیدارەی هەرێم بە نموونە، نامەی ماستەر، کۆلێژی پەروەردە/ زانکۆی سەلاحەددین.
٢ـ تاریق جامباز (٢٠١٤)، بوونی نەتەوە و سیاسەتی زمان، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.
٣ـ ڕەحیم قادر سورخی(د.) (٢٠١٣)، مەترسییەکانی سەر زمانی کوردی وەک (زمانی زگماکی)، یادکردنەوەی ڕۆژی جیهانی زمانی زگماک، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.
٤ـ ڕەفیق سابیر(د.) (٢٠٠٨)، کولتوور و ناسیۆنالیزم، چاپی سێیەم، چاپخانەی تیشک، سلێمانی.
٥ـ سەلام ناوخۆش بەکر(٢٠١٠)، ستاندەربوونی زمانی کوردی لەنێوان زمانی سیاسەت و سیاسەتی زمان، لە بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی زمانناسی، چاپخانەی منارە، هەولێر.
٦ـ شێرزاد سەبری عەلی و عەبدولسەلام نەجمەدین عەبدوڵلا (٢٠١١)، زمانڤانییا کارەکی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای سپیریز بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپخانەی خانی، دهۆک.
٧ـ عەبدولواحید موشیر دزەیی(د.) و شێرزاد سەبری(د.) (٢٠١٣)، زمانەوانی سیاسی، چاپخانەی هێڤی، هەولێر.
٨ـ یووسف شەریف سەعید(د.) (٢٠١٣)، فێربوونی زمانی دایک و ناسنامەی نەتەوە، یادکردنەوەی ڕۆژی جیهانی زمانی زگماک، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.

**بە زمانی عەرەبی:**

٩ـ ابن جني(١٩٥٧)، الخصائص، تحقيق محمد علي النجار، المكتبة العلمية، دار الكتب المصرية، ج١.
١٠ـ ابن منظور (٢٠١٤)، لسان العرب، تحقيق عبدالله علي الكبير و آخرون، دار المعارف، مصر، ط١، ج١.
١١ـ أحمد بن نعمان(١٩٩٧)، فرنسا و الأطروحة البربرية: ، ط٢، دار الأمة، الجزائر.

١٢ـ أحمد بوكوس(٢٠٠٣)، الأمازيغية والسياسة اللغوية والثقافية بالمغرب، مركز طارق بن زياد، الرباط، ط١.
١٣. أحمد شامية(٢٠٠٢)، في اللغة، دار البلاغ للنشر، ط١.
١٤ـ جيمس و طوليفصون(٢٠٠٧)، السياسة اللغوية ـ خلفياتها و مقاصدها، ترجمة محمد الخطابي، مؤسسة العنى، الرباط، المغرب، ط١.
١٥ـ خلف الجراد(٢٠٠٧)، علم السياسة و مقدماته اليونانية، مجلة الفكر السياسي، العدد ٣١، السنة العاشرة، اتحاد الكتاب العرب، دمشق.
١٦. دباش عبدالحميد(٢٠٠٩)، مقياس التهيئة اللغوية، بيروت.
١٧ـ روبرت ل كوبر(٢٠٠٦)، التخطيط اللغوي والتغيير الاجتماعي، ترجمة خليفة أبوبكر الأسود، اصدار مجلس الثقافة العام، ليبيا.
١٨. الزبيدي(٢٠١٠)، تاج العروس، المطبعة الخيرية، مصر، ط١، ج٤.
١٩. سلطان ناصر المجيول(١٩٩١)، نقل مصطلحات اللسانيات الاجتماعية الى العربية.
٢٠. صالح لعيد(١٩٩٩)، دروس في اللسانيات التطبيقية، دار هومه، الجزائر، ط٣.
٢١ـ عبدالقادر الفاسي الفهري(د.)(٢٠١٠)، أزمة اللغة العربية في المغرب ـ بين اختلالات التعددية و تعثرات (الترجمة)، دار الكتاب الجديد المتحدة، بنغازي، ليبيا.
٢٢. عبدالحميد دباش(٢٠٠٤)، اللغويات الاجتماعية، مجلة الأثر، عدد ٣، مجلة الآداب واللغات، كلية الآداب والعلوم الأنسانية، جامعة ورقلة، الجزائر .
٢٣. عبدالرحمن بن خلدون(١٩٩٠)، مقدمة ابن خلدون، دار الجيل، بيروت.
٢٤. عبدالفتاح عفيفي(١٩٩٥)، علم الاجتماع اللغوي، دار الفكر العربي، القاهرة، مصر.
٢٥ـ عبدالقادر فضيل و محمد صالح رمضان(٢٠٠٧)، امام الجزائر عبدالحميد بن باديس، دار الأمة للطباعة والنشر والتوزيع، ط١ .
٢٦ـ عبدالوهاب الكيالي(٢٠١٠)، موسوعة السياسة، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، دار الهدى، بيروت، ج١.
٢٧ـ عبدالوهاب الكيالي(٢٠١٠)، موسوعة السياسة، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، دار الهدى، بيروت، ج٣.
٢٨. عبدة الراجحي(١٩٩٥)، علم اللغة التطبيقي وتعليم العربية، دار المعرفة الجامعية، الاسكندرية، مصر.
٢٩. علي عباس مراد(١٩٩٩)، دولة الشريعة ــ قراءة في جدلية الدين والسياسة عند ابن سينا، دار الطليعة، بيروت، لبنان، ط١ .

٣٠. على علواش(٢٠١٠)، حركة ابن باديس التربوية و أهدافها الأصلاحية، رسالة غير منشورة.
٣١. الفيروز آبادي(٢٠٠٥)، القاموس المحيط، تحقيق مكتب تحقيق التراث في مؤسسة الرسالة، اشراف محمد نعيم العرقسوسي، مؤسسة الرسالة، بيروت، لبنان، ط٨.
٣٢ـ لويس جان كالفى(٢٠٠٦)، علم الاجتماعي اللغوي، ترجمة محمد يحياتن، دار القصبة للنشر، الجزائر.
٣٣. لويس جان كالفي(٢٠٠٩)، السياسات اللغوية، ترجمة محمد يحياتن، منشورات الاختلاف، الجزائر، ط١ .
٣٤. مالك بن نبي(١٩٨٥)، بين التيه والرشاد، دار الفكر، دمشق.
٣٥ـ مجمع اللغة العربية(١٩٨٣)، المعجم الفلسفي، الهيئة العامة لشؤون المطابع الأميرية بالقاهرة، مصر.
٣٦. محمد فتيح(١٩٨٩)، في علم اللغه التطبيقي، دار الفكر العربي، القاهرة، مصر، ط١.
٣٧. محمود السعران(١٩٦٣)، اللغة والمجتمع، دار المعارف، مصر، ط٢.
٣٨ـ مصطفى ديب البغا(١٩٩٨)، نظام الاسلام في العقيدة والأخلاق والتشريع، دار الفكر، بيروت، لبنان، ط٢.
٣٩ـ ميشال زكريا(١٩٩٣)، قضايا ألسنية تطبيقية، ط١، دار العلم للملايين، بيروت، لبنان.
٤٠ـ نعمان بوقرة(٢٠٠٩)، اللسانيات ــ اتجاهاتها وقضاياها الراهنة، عالم الكتب الحديث، الأردن، ط١.
٤١. نعوم جومسكي(١٩٩٣)، المعرفة اللغوية(طبيعتها و اصولها و استخدامها)، ترجمة: محمد فتيح، الطبعة الاولى، دار الفكر العربي، القاهرة.
٤٢. هدسون(١٩٩٠)، علم اللغة الاجتماعي، ترجمة محمود عياد، عالم الكتب، مصر، ط٢.

**بە زمانی ئینگلیزی:**

43-Calvet: La Guerre des Langues, 2eme parte ((Le champ de bataille)), 3eme parte ((Dans Les etas – majors)), 2009 .
44-Louis - Jean Calvet: La Guerre des Langues et Les politiques Linguistques, Hachette Litteratures, France, 1999.

## ملخص البحث

# سياسة اللغة – المفهوم وآلياتها

**أ.م.د. نريمان عبدالله خوشناو**
قسم اللغة الكوردية – كلية التربية الأساسية
جامعة صلاح الدين

**١ـ عنوان ومجال البحث:**

**هذا البحث مخصص للحديث عن مفهوم سياسة اللغة وجوانبها المهمة.**

**علم اللسانيات الاجتماعية نشأ في العصر الحديث، وكان يهتم كثيراً بتلك القوانين التي تسيطر على حركة اللغة عند تفاعلها واندماجها مع البنى الاجتماعية، وهذا بهدف استثمار ذلك عند رسم السياسات اللغوية، حتى تكون هذه السياسة اللغوية علمية وعملية. وهنا وجد علماء اللسانيات الاجتماعية أنفسهم أمام علم جديد له منهجه وموضوعه، هو علم السياسة اللغوية.**

**٢ـ سبب أختيار الموضوع:**

**لقد التفتنا نحن الكورد قليلاً لهذا الموضوع، اذ هناك القليل من البحوث القصيرة حولها، ولذا استغلينا هذه الفرصة بتخصيص وقتنا لدراسة هذا الفرع المهم من علم اللغة، لكي تصبح مصدراً مساعداً للمكتبة الكوردية.**

**٣ـ منهج البحث:**

**هو وصفي تحليلي، وعن طريقها تحدثنا عن مفهوم وتعريف السياسة واللغة والسياسة اللغوية وآليات صياغة السياسة اللغوية عن طريق الاستيعاب والاعتماد على المصادر الأصيلة وشرح وتحليل تلك النصوص التي لها علاقة بهذا الموضوع.**

**٤ـ مشكلة البحث:**

**أكبر مشكلة واجهتنا أثناء كتابة البحث، هو ترجمة تلك النصوص العربية والانكليزية الى اللغة الكوردية، التي لها صلة بموضوع السياسة اللغوية، لأن المكتبة الكوردية في هذا الموضوع والمجال اللغوي غير غنية، حيث هناك عشرات المصادر التي تتحدث عن مواضيع علم اللغة التطبيقي بشكل عام وعلم اللغة الأجتماعي بشكل خاص، وهذا يظهر فقر حال المكتبة الكوردية والأوساط العلمية.**

**٥ـ سؤال البحث:**

**هل للسياسة علاقة باللغة؟ هل هناك في اللغة سياسة؟ هل مفهوم السياسة اللغوية له معنى؟ ما هي طبيعتها؟ و ما هي آلياتها التي تتحرك بها اللغة؟**

**٦ـ مضمون البحث:**

يتألف البحث من مقدمة وثلاثة أقسام:

القسم الأول (مفهوم وتعريف السياسة واللغة)، يتألف من محورين، تم الحديث فيهما عن (مفهوم وتعريف السياسة، وايضاً مفهوم وتعريف اللغة).

القسم الثاني: (السياسة اللغوية في مجال مصطلح علم اللغة الأجتماعي)، يتألف من ثلاث محاور، تم الحديث فيها عن (مفهوم وتعريف السياسة اللغوية، ظهور مصطلح السياسة اللغوية، وعلاقة السياسة اللغوية بعلم اللغة الأجتماعي).

القسم الثالث: (آليات صياغة السياسة اللغوية)، وفيه تحدثنا عن أهم آليات كيفية صياغة السياسة اللغوية.

Introduction

## The Concept and Procedures of Language Policy

**Asst.Prof.Dr. Nareeman Abdullah Khoshnaw**
Kurdish Language Dept. – College of Primary Education – Univ. of. Saladin

### 1- Title and Thesis Statement of The Research

The paper entitled (The Concept and Procedures of Language Policy) is devoted to explain the concept and important sides of language policy. Sociolinguistics, which has been established in modern era, cared a lot about the rules which control language moves during amalgamation with societal foundations. The purpose is to use social foundation during planning and building of language policy. The aim is to make this language policy scientific and practical and not just superficial. The sociolinguists have already realized that they are on the way of new science. The science which has its own methods and subjects is called the science of language policy.

Scholars and researchers thought about language; they realized that language is an indication since there are lots of researches and studies about language by linguists, philosophers, and scholars. Many studies and researches on language were carried out by naturalists, physicists and etc…. The scholars have been carrying out these studies continuously, especially those linguistics studies which are related to society, and these new studies on this field, are known as language policy.

### 2- Reason of Choosing the Topic

Unfortunately, we as Kurds are lagging behind studying on this topic, as there are only incomplete and short studies. For this reason, we have seized this opportunity to carry out a study on this important branch of sociolinguistics and to make it as a supportive reference for Kurdish library.

### 3- Methodology

The methodology is an analytic descriptive method through which it explains the concept and definition of policy, language, language policy, and

the procedures of language policy. Moreover this depends on authentic resources, and illustrating manuscripts related to this topic.

**4- Thesis Problem**

The most difficult problem and challenge facing us during this study was the translation of all these Arabic and English texts into Kurdish which were related to language policy. As Kurdish library is lagging behind these resources, there are tens of resources about applied linguistics in general and sociolinguistics in particular. These resources are not translated into Kurdish. This means that the Kurdish library and the science and knowledge centers are poor and deprived.

**5- Questions of the Study**

What is the relation between language and policy? Is there policy in language? What does the concept of language policy mean? What is the nature of language policy? What are the procedures by which language moves and progresses?

**6- The Content of Study**

The paper comprises of the introduction and three chapters:

Chapter one is devoted to (The Concept and The Definition of Language and Policy). There are two sections, one section is about the concept and the definition of policy, and the other section is concerned with the concept and the definition of language.

Chapter two which is entitled (Language Policy in Sociolinguistics) comprises of three sections. The first one is about the concept and the definition of language policy, the second one is concerned with the evolution of the language policy, and the third is describing the relation between language policy and sociolinguistics.

Chapter three is entitled (The Procedures of Building Language Policy). This chapter sheds a light on the most important procedures and mechanisms of building language policy.

Finally, the conclusion, list of references, and the summary of the study in Kurdish and Arabic are cited.

# واتای پێکهاتەیی و ناپێکهاتەیی لە زمانی کوردیدا

**پ.ی.د. عەبدولجەبار مستەفا مەعرووف**
بەشی کوردی/ کۆلێژی زمان
زانکۆی سلێمانی

**م.ی. بژوێن یەحیا محەمەد**
بەشی کوردی/ کۆلێژی پەروەردە
زانکۆی گەرمیان

## پێشەکی

ئەم توێژینەوەیە هەوڵێکە بۆ شیکردنەوەی واتای توخمە فەرهەنگییەکان، بۆ ئەوەش توخمە پڕۆژە سازدەرەکان (ئاوەڵناو و کردار و پێشناو) کراون بە بنەمای لێکۆڵینەوەکە. هەریەکێك لەم توخمە پڕۆژەسازدەرانە لە چێوەی پریدیکات/ئارگۆمێنتداواکەر کاریانپێکراوە، بۆیە پێکهاتەی سینتاکسیشیان خراوەتەڕوو و پەیوەست بەوەشەوە فرە نواندنی سینتاکسیی ئەو پریدیکاتانەش شیکراوەتەوە. لە ڕووی واتاوە واتای پێکهاتەیی و ناپێکهاتەیی پریدیکاتەکان شیکراونەتەوە، کە جگە لە نموونەی توخمە فەرهەنگییەکان، هەوڵدراوە هەنگاوەکانی توێژینەوەکە پەیوەست بە واتای ناپێکهاتەییەوە لەسەر ئیدیۆم و میتافۆڕ جێبەجێبکرێن. پەیوەست بە کەرەستەی لێکۆڵینەوەکەوە داتا و نموونەکان لە شێوەزاری سلێمانییەوە وەرگیراون و کاریان لەسەر کراوە.

### ١/١) پێکهاتەی سینتاکسی

ڕێزمان بۆ نواندنی زانیاریی فەرهەنگییە، چونکە وەك ئاماژەی پێدرا، زانیارییەکان لە فەرهەنگدا خەزندەکرێن و ڕێزمانیش وەك پێکهاتەیەکی دەرەکیی ئەو زانیارییانە دەنوێنێت، کە لەپێکهاتەی فەرهەنگیدان. ($X$)ەکان/ دانە فەرهەنگییەکان، کە بۆ لێکۆڵینەوەکە مەبەست لێی "ناو" و"ئاوەڵناو"و" کردار"و "پێشناو"/($X^n$)و ($X^a$)و ($X^v$)و ($X^p$)ەو لەسەر زانیارییە سینتاکسی و واتاییەکان جێبەجێدەکرێت.

دانـە پرۆژەسـازدەرەکانی زمـان ژمارەیـەکی سـنووورداری پۆلەڕەگـەزن، کـە دەتوانن فۆڕمی سینتاکسی دروست بکەن، لەبەرئەوەی لـە توانـای پرۆژەسـازداندا وەك یـەکن (Cook and Newson, (197:161، بۆیـە بەشـێوەیەکی گشـتی لـەڕووی تایبەتمەندیی سینتاکسییەوە نـاونراون ($X^0$)، کـە نوانـدنی سینتاکسـی جیاوازیـان پەیوەسـت بـەجۆری پۆلـە ڕەگەزەکانیانـەوە تێـدا هـەڵگیراوە، واتـا ئەگەرچـی ($X^0$)ەکـان لـە پرۆژەسـازداندا چـونیەکن، بـەڵام لـە زانیـاریی سینتاکسـییاندا (Syntactic information) جیادەبنـەوە. ($X^0$)ەکـان دانـەی فەرهـەنگین، بـۆ بونیادنانی سینتاکسی هەمەجۆر بەکاردەهێنرێت، بەو پێیـەی لـەتیۆری (x-bar)دا باسی لێوەدەکرێت ($X^0$)ەکان، "ناو"و "ئاوەڵناو"و "کردار"و .....نـن Cook and Newson, (197:161)، کە دێنـە نـاو پێکهاتـەی سینتاکسـییەوە بـەجۆرێك، کـە ئاستی نواندنی جیاوازیان هەیە، بڕوانە هێڵکاریی (١).

هێڵکاریی (١)

پێکهاتەی فەرهەنگ

| | |
|---|---|
| فرێز | پێکهاتەی سینتاکسی (١) |
| ڕستە | پێکهاتەی سینتاکسی (٢) |

بـەپێی نەخشـەکە ($X^0$)ەکـان بـۆ دروسـتکردنی پـرۆژەی فرێـز دەبرێنـە پێکهاتـەی سینتاکسـی یەکەمـەوە، کـە لـەڕێگای ($X^0$)ەکـانی لـەجۆری "نـاو"، "ئاوەڵناو"، "پێشناو"، "دیارخەر" دواتر لەڕێگای ($X^0$)ەکـانی لـەجۆری "تـاف" و" ڕێککـەوتن"ەوە فرێزەکـان دەگـەن بەپێکهاتـەی سینتاکسـی دووەم. ئـەوەی لێرەدا بۆ لێکۆڵینەوەکە گرنگە ئەوەیە ($X^0$)ەکانی جـۆری یەکـەم، کـە بـە ($X^0$)ی فەرهەنگی دادەنرێن، دەتوانن بۆ زمانی کوردی دوو پێکهاتەی سینتاکسی دروست بکـەن، کـە ئـەوانیش بـریتین لە"دەسـتەواژە–phrase"و "دەسـتەواژیلە– sub phrase"، بـەوەش ئـەو پێکهاتـە سینتاکسـییەی لـە هێڵکـاری (١)دا خرایـەڕوو سـەرلەنوێ دادەڕێژرێتـەوە، چـونکە بۆنموونـە ئاوەڵناوێـك لـەجۆری (/زیـرەك/،

/جوان/، /سوور/، ...) لەزمانی کوردیدا دەتوانن لەدوو پێکهاتەی سینتاکسیدا دەربکەون، بڕوانە هێڵکاریی (٢)

**هێڵکاریی (٢)**




١) أ. کوڕی زیرەك، کچی زیرەك، منالّی زیرەك ، ..................تاد[١].

ب. کوڕەزیرەك، کچەزیرەك، منالّە زیرەك، ......................تاد.

٢) أ. کچی جوان، گوڵی جوان، سەیارەی جوان، ..................تاد.

ب. کچەجوان، گوڵەجوان، سەیارەجوان،.........................تاد.

٣) أ. گوڵی سوور، بۆیەی سوور، قژی سوور، ......................تاد.

ب. گوڵەسوور، بۆیەسوور، قژەسوور، ...........................تاد.

هەروەك لەسەرەوە ئاماژەی پێدرا، ئاوەڵناوەکان دەتوانن لە دوو پێکهاتەی سینتاکسیدا دەربکەون جارێك بوونەتە هۆی دروستبوونی دەستەواژە، وەك نموونەکانی(١-أ)و (٢-أ)و(٣-أ)، هەروەها جارێکی تر توانیویانە لە دەستەواژیلەدا دەربکەون، وەك نموونەکانی (١-ب)و (٢-ب)و (٣-ب). پێکهاتەی فەرهەنگی، کە $(X^0)$ەکان دەگرێتەوە بەشداری لەدروستکردنی دەستەواژیلەکاندا دەکەن، کە بەپێکهاتەی سینتاکسی (١) دادەنرێت، دواتر دەستەواژەی فرێزی لێپێکدێت هەنگاوی (٢)ی پێکهاتەی سینتاکسییە، هەنگاوی (٣) دروستبوونی ڕستەیە، وەك لە هێڵکاریی (٣)دا خراوەتەڕوو.

**هێڵکاریی (٣)**




وەك ئاماژەی پێدرا "تاف"و "ڕێککەوتن" پێکهاتەی سینتاکسی (٢) دەگەیەنێت بەپێکهاتەی سینتاکسی (٣)، کە ڕستەیە، واتە ڕستەش نواندنی $(X^0)$ەکانە، کە دەشێت بۆ زمانی کوردی لەخوار خۆیەوە نواندنی سینتاکسی تری هەبێت، نەك پێکهاتەی سینتاکسی تر.(عەبدولجەبار مستەفا مەعرووف،٢٠١٣ :٣).

### ٢/١) پێکهاتەی سیمانتیکی

هاوشێوەی زانیارییە سینتاکسییەکان لەناو $(X^0)$کاندا زانیاریی واتایی هەن، کە دەبنە پریدیکات و هەڵاوێریی واتایی ئارگومێنتەکان دەکەن و کۆتوبەندی هەڵاوێرکردنیشیان هەیە، واتە هەر پریدیکاتێك کۆت لەسەر دەسەڵاتی واتایی لە فەرهەنگەوە بۆ دانراوە و نایبەزێنێت، ئەمە لەزماندا بە "واتای پێکهاتەیی" / "بنەڕەتی" ناودەبرێت، کە مەبەست لە واتای فەرهەنگی واتای پریدیکاتێکەیە، ئەم جۆرە واتایە لە فەرهەنگدا چەسپاوە، هەم واتای فەرهەنگی وشەکە هەم نیشانە واتاییەکانی [−،+] دیاریکراون و لە مێشکی قسەکەری زمانەکەدا بوونیان هەیە، هەموو وشەکانی فەرهەنگیی زمان واتا $(X^0)$ەکان لە بنەڕەتدا بۆ واتایەکی تایبەتی دروستبوون و چوونەتە فەرهەنگەوە، هەروەها $(A^0 ، V^0)$ بەپێی واتای پێکهاتەییان ئارگۆمێنت داوادەکەن و ئەوان بڕیار دەدەن، کە ئایا بکەری ڕستەکە یان ئەو وشەیەی، کە لەگەڵیاندا دێت سەربە چ کەتیگۆرییەکی زمان بێت؟ بەڵام وردە وردە بەپێی تێپەڕبوونی کات و چالاکبوونی وشەکان و زۆریی پێویستی

بەکارهێنانیانی واتـای داواکراوەکانیـان فـراوان بـووە. بـۆ زانیـاریی زیـاتر بڕوانـە، VYVYANEVANS(2006)، واتا ($V^0$)ێك سەرەتا تەنها لەگەڵ وشەیەکدا دەهـات بۆ نموونە [+ مرۆڤ] بێت، بەڵام لەئـەنجامی چـالاکبوونی وشـەکە ئێسـتا دەتوانێـت لەگەڵ [−مرۆڤ]یشدا بەکاربێت، ئـەم جـۆرە بەکارهێنانـە لەزمانـدا بـە فراوانبـوونی "پریدیکات" دادەنرێت و جێگرەوەی دارِشتنی پریدیکاتە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە F Recanati - academia.edu، هـەروەها هەنـدێك لـەو وشـانە توانـای ئـەوەیان هەیە لەپێکهێنانی ئیدیۆم و میتافۆڕدا بەشداری بکەن، بەڵام ئەمە دوورە لە واتـای بنەڕەتیی وشەکانەوە، بۆیە بە"واتای ناپێکهاتەیی" دادەنرێت، کە لەپاری دواتردا باسی دەکرێت. بۆنموونە کرداری/خواردن/ یەکێکە لەو کردارانەی، کە پریدیکاتێکە و ئارگۆمێنتێك داوادەکات، کە[+خۆراك] بێت و ئارگۆمێنتـە بکەرییەکەشـی دەبێـت فرێزێکی ناوی [+گیاندار] بێت. ( بێستوون حەسەن ئەحمـەد، ٢٠١١: ٢٥)، کەچـی لەئـەنجامی چـالاکبوونی واتـای ئـەم وشـەیەدا و زۆریـی پێویسـتی بـەکارهێنانی لەزماندا دەتوانرێت لەگـەڵ وشـەیەکدا بـەکاربێت، کـە[−خـۆراك]یـش بێـت، بڕوانـە نموونەی ژمارە (٤):

٤) أ. کوڕەکە/ پیاوەکە/ پشیلەکە گۆشتەکەی خوارد.
ب. منداڵەکە سوێندی خوارد.
ت. ژنەکە خەفەتی خوارد.
پ. کوڕەکە دنیای خوارد.
ج. پیاوەکە پارەکەی خوارد.

پریـدیکاتی/خواردن/ لـە نموونـەکانی (٤)دا، زانیـاریی واتاییـان پەیوەسـت بەهـــەڵاوێرکردنی واتاییـــەوە فـــراوان بـــووە، ئـــەوەش دەبێتـــە جێگـــرەوەی فۆڕمدارِشتنی فەرهەنگیی پەیوەست بـە پریدیکاتـەوە، واتـە بۆنموونـە لـە (٤/ب−ج)دا کردار یان پریدیکاتێکی ترمان بـۆ داواکردنـی ئارگۆمێنتـەکانی (/سـوێند/، /دنیا/، /پـارە/، /خەفـەت/) دانەڕشـتووە، بـەڵکو زانیـاریی واتـایی پریدیکاتـە، کـە فراوانکراوە و (بۆ زانیـاریی زیـاتر لەسـەر بـەکارهێنانی کـرداری (خـواردن) بڕوانـە، شیلان عومەر حسێن، ٢٠١٦: ٢٢). وشەکە لەگەڵ [−خواردن]یشدا هاتووە.

بەڵگـەکان بـۆ کردارێکـی وەکـو کـرداری /مـردن/یش ئـەوە بەدەسـتەوە دەدەن، چونکە یەکێکە لەو کردارانەی، کە تـەنها لەگـەڵ [+گیانـدار]دا بـەکاردێت، بـەڵام لەبەرئـەوەی کردارێکـی چـالاکە و بـەکارهێنانی زۆرە ئێسـتا دەتوانێـت ئارگۆمێنتێك بەنیشانەی [−گیاندار]یشەوە هەڵاوێر بکات، بڕوانە نموونەکانی (٥).

٥) أ. کوڕەکە /منداڵەکە /پیاوەکە /ژنەکە مردووە.
ب. پاترییەکە مردووە.
ت. بازاڕ مردووە.
پ. گەچەکە مردووە.

لە نموونەی (٥−أ)دا کرداری/مردن/ بەپێی واتـای پێکهاتـەیی بـەکارهاتووە، چونکە ئەو ئارگۆمێنتانەی لەگەڵیدا هاتوون [+مـرۆڤ]ن، بـەڵام لەنموونـەی (٥/ب−پ)دا هەمان فۆڕمی/مردن/ بەکارهاتووەتەوە، بـەڵام ئـەو ئارگۆمێنتانـەی لەگەڵیـدا هاتوون [−مرۆڤ]ن، ئەوەش لەبـەر فراوانبـوونی واتـایی ئـەو پریدیکاتەیـە، چـونکە مردنێکمان نییە تایبەت بێت بە/بازاڕ/و /پاتری/و /گەچ/ەوە، بەڵکو هـەڵاوێرکردنی واتایی کردارەکە فراوان بووە، بۆ جیاکردنەوەی نرخ و بەهای کۆتاییهاتن و لەدنیا دەرچوونی بوونەوەرەکانی تـر پریـدیکات و فـۆڕمی فەرهـەنگی بـەزانیاریی واتـایی جیاوازەوە داڕێژراوە، بڕوانە نموونەکانی (٦)و هێڵکاریی(٤)، هەروەها دەبێت ئەوە بخرێتە ڕوو، کە فراوانبوونی پریدیکاتیی(مردن)و تێکەڵبوونی بەهاکان بۆ [+مرۆڤ]و [−مرۆڤ] وای کـردووە پریـدیکاتی لـەجۆری نموونـەکانی وەك (٧) تایبـەت بـەمرۆڤ دابڕێژرێن، بە جۆرێك بەو دروستانەوە ئارگۆمێنتێك وەرناگرن، کـە[−مـرۆڤ] بێـت، بڕوانە(٨):

٦) ا. پیاوەکە مرد.
ب. سەگەکە تۆپی.
پ. مریشکەکە مردار بووەوە.
ت. دارەکە/ نەمامەکە وشکبوو.
ج. ئاگرەکە کوژایەوە.( تریفە عومەر ئەحمەد، ٢٠١٥: ٥٣).

هێڵکاریی (٤)




هەریەکـە لـە پریدیکاتـەکانی (/ تـۆپین/و /وشـکبوون/و /مرداربوونـەوە/و /کوژانەوە/) ئارگۆمێنتی تایبەت بە خۆیان هەیە و لە زمـانی کوردیـدا /تـۆپین/ بـۆ دابەزانـدنی بـەها و/وشـکبوون/یش بـۆ مردنـی بـەکارەبا، زانیارییـە واتاییەکـەی فراوانبووە، بۆ/کوژانەوە/ش بڕوانە نموونەکانی دواتر!

٧) >کۆچـی دوایـی کـردووە<، >ئـەمری خـوای بـەجێهێناوە<، >مـۆمی تەمـــەنی کوژایـــەوە<، >گـــەڵای تەمـــەنی هـــەڵوەری<، >ماڵئـــاوایی لـــە دنیاکرد<،>بەجێی هێشتین<، >چاوی لێکنا<.

٨) أ.*پاترییەکە کۆچی دوایی کرد.

ب.*بازاڕ ئەمری خوای کردووە.

ئەو دەربڕاوانەی لەنموونەی (٧)دا هـاتووە، نرخـی مرۆڤـی تێـدا دیـاریکراوە بەپێی دەربڕینەکان، هەروەها نیشانەیان لێدراوە بۆ مـرۆڤ، بۆیـە ناتوانرێت بـۆ[−مـرۆڤ] بـەکاربهێنرێت، وەك ئـەو نموونانـەی لـە (٨)دا هـاتووە، بـەڵام چـەمکی >مردن< لەبەرئەوەی پریدیکاتـە، واتـە[+مـرۆڤ]ە، دەتوانرێت بـۆ [−مـرۆڤ]یـش بەکاربێت، بڕوانە نموونەی (٥).

کرداری /کوژانەوە/، کە واتای فەرهەنگییەکەی هەڵاوێری بـەرکارێك دەکـات، کـە/ئاگر/ بێـت، بـەڵام پەیوەسـت بەسـیمانتیکی پێکهێنانـەوە فۆرمەکـە بـۆ نیشـانەکانی [ +کۆتـایی هاتن/کۆتـایی پێهێنـان ] بەکاردەهێنرێنـەوە، ئـەوەش فراوانکردنـی هێـزی پریـدیکاتێکی وەکـو کوژانەوەیـە لـە زمـانی کوردیـدا. >کوژانـدەوە<، >داگیرسـاندن< لـە پەیوەندییـە واتاییەکەیـدا پەیوەسـت بەبەرکارەوە، ئـەو ناوانـە هەڵدەبـژێرن، کـە نائـاقڵن و هـەڵاوێری بەرکارەکـەی بـۆ کەرەسـتە و ئـامێری تـر فـراوان دەبێـت، بۆیـە دەکرێـت بکەرەکـەی [ +ئـامێری کارەبـایی ] یـش بێـت، بـەوەش هێـزی وشـەی /کوژانـەوە/و /داگیرسـان/ فـراوانتر دەبێت، نەك پریدیکاتێکی تر بۆ کۆتاییهێنان بەکارکردنی یان کارپێکردنی هەریەك

لە (/ سەیارە/، /گلۆپ/، /کۆمپیوتەر/، /پانکە/، / سەلاجەکە/) داڕێژرابێت، لە نموونەی ژمارە (٩، ١٠)دا هەڵاوێری سیمانتیکیی کرداری/کوژانەوە/، /داگیرسان/هەڵکردن/ تاقیدەکەینەوە.

٩) >کۆتاییهاتن< / >کوژانەوە<
- ئاگرەکە/زۆپاکە/چراکە بکوژێنەوە.
- سەیارەکە بکوژێنەوە.
- گلۆپەکە بکوژێنەوە.
- کۆمپیوتەرەکە بکوژێنەوە.
- پانکەکە بکوژێنەوە.
- سەلاجەکە بکوژێنەوە.

١٠) >داگیرسان< / >هەڵکردن<
- ئاگرەکە/زۆپاکە/چراکە داگیرسێنە/هەڵبکە.
- سەیارەکە داگیرسێنە/هەڵبکە.
- گلۆپەکە داگیرسێنە/هەڵبکە.
- کۆمپیوتەرەکە داگیرسێنە/هەڵبکە.
- پانکەکە داگیرسێنە/هەڵبکە.
- سەلاجەکە داگیرسێنە/هەڵبکە.

پاش خستنەڕووی زانیاریی واتایی کردارەکان دەکرێت لە بەکارهێناندا یاسای واتایی فەرهەنگییان بخرێتەڕوو، کە بۆ زمانی کوردی تێڕوانینێکی تر هەڵاوێرکردنی واتایی پریدیکاتەکان دەستەبەر دەکات، ئەوەش دەبێتە هۆی نواندنی واتای جیاواز و جێگرەوەی دارشتنی کرداری نوێ، چونکە باشترین ڕێگا بۆدارشتنی دروستەی قووڵی زمانی کوردی فۆرمدارشتنە بۆ واتاکان نەك دانانی ڕاستەوخۆی ئارگۆمێنتەکە. (احمد عزوز ٢٠٠٢: ٦٥-٧٠) و Jean Aitchison (2003: 187-189)، چونکە نموونەکان ئەوەیان دەرخست، کە کردارەکان بەرەو هەڵاوێرکردنی ئازادانە دەچن و کۆتوبەندی واتاییان بەرەو کرانەوە دەچێت. (بۆ

زانیـاریی زیـاتر بڕوانـە، (٢٠٠٧: ٥٨) Tatjana tleyde – & Johannes dolling,
zybatow ، بڕوانە یاسای ژمارە (١).

١) [± (ئارگۆمێنت) ]+[ کردار (پریدیکات)]

سەبارەت بـە ($A^0$)ەکـان، زاراوەکـانی"Attributive", "Predicative" شـوێنی ئاوەڵناوەکـــــان لـــــە فرێـــــز و ڕســـــتەدا دیـــــاری دەکـــــەن (http://iasj.net/iasj?func=fulltext&aId=47133)، هـەر ئاوەڵناوێـك پریدیکاتێکـە وەك لە هێڵکاریی ژمارە (٣) خرایە ڕوو، لەپێکهاتەی دەستەواژیلە و دەسـتەواژەدا دەسەڵاتی هەیە و لە فەرهەنگەوە کۆتوبەندی واتایی بۆ دیاریکراوە، واتە زانیـاریی واتایی لە ئاوەڵناوەکاندایە و بەپێی ئـەو زانیارییـە ئارگۆمێنـت داوادەکـات، بڕوانـە ئـــەو جێبەجێکردنانـــەی ئاوەڵناوەکـــانی (/جـــوان/، /زیـــرەك/، /تەمـــەڵ/، /ڕەش/،........تـاد) دەکرێـت. جێـی سـەرنجە، ئاوەڵناوەکـان سـنووردارترین کۆتوبەندیان دەکەوێتەسەر بۆ هەڵبژاردنی ئارگۆمێنتەکانیان، بڕوانە نموونەی (١١) لە ئاوەڵناوێکی وەك /جوان/دا کۆتوبەندی واتایی بۆ ئارگۆمێنتەکەی کەمتربێت.

١١) {کچی جوان}، { کوڕی جوان}، {سەیارەی جوان}، { گوڵی جوان}، { مێـزی جـوان}، {خـانووی جـوان}، {داری جـوان}، {تەلـەفزیۆنی جـوان}، {بۆیاخی جوان}، {فەرشی جوان}....

ئـەو نموونانـەی لەسـەرەوە هێنراونەتـەوە سـەبارەت بـەئاوەڵناوی /جـوان/ ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، کە ئاوەڵناوێکی چالاکە و هەڵاوێرکردنەکەی ئازادانەیـە و وەك لە نموونەی (١١)دا خرایە ڕوو، تەنانەت لەگەڵ [–مرۆڤ] یشدا بەکارهاتووە، بۆیە ئەم ئاوەڵناوە بەپریدیکاتی فراوانکراوە. هەروەها بۆ ئاوەڵنـاوی /زیـرەك/یش بەهەمان شێوە، تەنها لەگەڵ [+مرۆڤ]دا زانیارییە واتاییەکانی بەرجەستە دەبـوو، بەڵام ئێستا بەهۆی فراوانیی بەکارهێنانیەوە لەگەڵ [–مرۆڤ]یشدا بەکاردێت بڕوانـە نموونەی (١٢).

١٢) أ. خوێندکاری زیرەك.

ب. سەرکردەی زیرەك.

پ. مۆبایلی زیرەك.

ت. شاشەی زیرەك.

ج. پێوەری زیرەك.

وەك لەنموونـــەی (١٢_أ،ب)دا دیـــارە، کـــە ئاوەڵنـــاوی زیـــرەك لەگـــەڵ ناوی/خوێندکار/، /سەرکردە/دا هـاتووە، کـە بـە واتـای پێکهاتـەیی بـەکارهاتووە، چونکە هەردووکیان [+مرۆڤ]ن، بەڵام ئەگەر بڕوانیتـە نموونـەکانی (١٢_پ، ت، ج) دەبینیت، کە هێنـدە بـەکارهێنانی فراوانبـووە لەگـەڵ نـاوی /مۆبایـل/، /شاشـە/، /پێـوەر/دا هـاتووە و پەسـنی نـاوی بێگیـان دەکـات، ئـەوەش فراوانبـوونی هەڵاوێرکردنی واتایی پریدیکە دەگەیـەنێت. بـە پێچـەوانەی ئاوەڵنـاوی /زیـرەك/، /تەمەڵ/ پریدیکاتێکە، کە دەبوو ئارگۆمێنتەکـەی نیشـانەی [+مـرۆڤ ]ی هەبوایـە، بـەڵام وەك جێگرەوەیـەکی فۆڕمداڕشـتن (واتـە لـەبری ئـەوەی پریـدیکاتێکی نـوێ دروستبکرێت)، دەشێ هاوشێوەی ئاوەڵناوەکانی سەرەوە، ئەویش بەنیشانەی [± مـرۆڤ ] کـار بکـات ، بڕوانـە نموونـەکانی (١٣). هـەر سـەبارەت بـە فراوانبـوونی بەکارهێنانی پێکهاتەی واتایی ئاوەڵناوەکان و بەکارهێنانیان بەشـێوەیەکی گشـتی لەلایەن ئاخێوەرانی زمانی کوردییەوە ئاوەڵناوی/ڕەش/بەفراوانی بەکاردەهێنرێت، بڕوانە نموونەی (١٤).

١٣) {کـوڕی تەمـەڵ}، { ژنـی تەمـەڵ}، {گسـکی تەمـەڵ}، { مـەیموونی تەمەڵ}،......تاد.

١٤){دوعـــــای ڕەش}،{ ڕۆژی ڕەش}،{ ئیشـــــی ڕەش}،{دەســـــتی ڕەش}،{چاوی ڕەش} .........تاد.

ئەوەی سـەبارەت بـە ئاوەڵناوەکـانیش خرایـە ڕوو، ئـەوەی دەرخسـت، کـە ئاوەڵناویش دەرهەق بە ئارگۆمێنتەکەی کۆتوبەندی واتـایی دەشـکێنێت، ئـەوەش وادەکات ئارگۆمێنتەکانی بە [+ و —] هەڵاوێر بکات، بەوەش ئاوەڵناوەکی ناوەخنە واتاییەکەی دەگۆڕێ و ئازادانـە پێشـبینی گـۆڕانی ئارگۆمێنتەکـەی دەکرێـت. بـۆ ئەوەش بڕوانە یاسای ژمارە (٢).

٢) [± (ئارگۆمێنت) ]+ ئاوەڵناو (پریدیکات) ]

فرێـزی پێشـناوی لـە پێشـناوێك و فرێزێکـی نـاوی پێکـدێت، پێشـناو لـەم دروسـتـەیەدا سـەرێکی حوکمکـەرە و دۆخـدەرە و ئاڕاسـتەی حوکمکردنەکـەی پێچەوانەی سەرە ڕێزمانییەکانی دیکەیە. (بێستوون حەسەن ئەحمەد، ٢٠١١: ١٤).

پێشناوەکان هەرچەندە پریدیکاتن، بەڵام ژمارەیەکی کەم لە فەرهەنگی کوردیدا تۆمارکراون، بۆیە لەزمانی کوردیدا بەهۆی تەواوکەرەکانیانەوە، نواندنی واتایی جیاوازیان دەبێت .R. Jackendoff (1992: 43) . نموونەکانی خوارەوە ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە، کە پێشناوەکان کۆتوبەندی واتاییان نییە یان هیچ نەبێت ئازادانەیە، ئەوەش وادەکات لەڕێی تەواوکەرەکانیانەوە کۆتوبەندیان بۆ دابنرێت. بەڵگەکان لە ڕێی پێشناوەکانی (لە، بە)وە تاقیدەکرێنەوە، بۆ ئەوەش بڕوانە نموونەکانی (١٥) و (١٦)، (بشرِوانە شیلان عومەر حسەین، ٢٠١١: ١٣٨)و ئەو سەرچاوانەی لەوێدا هاتوون.

١٥) / لە/ ( ناوی شوێن و جێگا ) ← من لە شار دەژیم.

/ لە/ (ناوی کەس ) ← من لە ئازادم وەرگرت.

/ لە/ ( ناوی کەرەستەی خاو) ← ماست لە شیر دروستدەکرێت.

/لە/ ( ناوی کات ) ← من لە هاویندا سەفەرمکرد.

١٦./ بە/ ( ناوی کات ) ← بەمنداڵی یاریم بە بووکەشووشە دەکرد.

/ بە/ ( ناوی جێگا ) ← کتێبەکەم بە دیوارەکەوە هەڵواسی.

/ بە/ (سەرچاوی دروستکردن) ← کێکم بە پەنیر دروستکردووە.

/بە/ ( سەرچاوەی لێنان) ← چام بە خەڵووز لێناوە.

نموونەکانی ژمارە (١٥) و (١٦) ئەوە بەدەستەوە دەدەن، کە هەژموونی واتایی لەفرێزی پێشناویدا، بە دەست ئارگۆمێنتەکانەوەیە، بۆیە پێشناوی /لە/و

/بە/ تەنها ئەرکی سینتاکسییان بەجێهێناوە، بەوەش پەیوەست بە ئارگۆمێنت و ئارگۆمێنت داواکەرەوە یاساکە بەپێی یاسای ژمارە (٣) دادەڕێژرێت:

٣) [پێشناو (پریدیکات)] + [± (ئارگۆمێنت) ]

ئەوەی لە بەکارهێنانی پێشناوەکاندا دەرکەوتووە ئەوەیە، کە یاساکە پێچەوانە بووەتەوە، وەك دەرکەوتووە پێشناوەکان پریدیکاتن، بەڵام بەهۆی کەمیی ژمارەیانەوە ئەوان ناگۆڕێن واتە جێگیرن، بەڵکو ئەوەی گۆڕانەکە دروستدەکات ئەو ئارگۆمێنتانەن، کە لەدوایاندەکات، وەك لە نموونەکاندا ڕوونبووەتەوە، کە گۆڕانی ئارگۆمێنتەکان بووەتە هۆی گۆڕانی واتایی، پێشناوەکان جێگیرن و نەگۆڕاون.

### ٣/١) ئیدیۆم و تێڕوانینی ئیدیۆمی

بەپێی ئەو لێکدانەوانەی بۆ چەمکی ئیدیۆم کراون، ئیدیۆم بە یەکەیەکی زمانیی ئاڵۆز دادەنرێت، لەبەرئەوە بەزۆر تیۆر و ڕێبازی جیاجیا لێی کۆڵراوەتەوە، بەتایبەتی دوای هاتنەکایەی زانستی "واتاسازیی فەرهەنگی– lexical semantics"یەوە، کە بایەخێکی تەواوی بەهەریەکە لە"ئیدیۆم"و "کۆلۆکەیشن" و "میتافۆڕ"و .....تاد داوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی زمانەوانان زیاتر گرنگی بەم بابەتە بدەن و بەپێی بۆچوونی تایبەتی خۆیان و بەپێی ئەو ڕێباز و تیۆرە جیاجیایانەی، کە کاریان پێکردووە، تێڕوانینی جیاوازیان بۆ ئیدیۆم و ناساندنی و چۆنێتیی مامەڵەکردن لەگەڵیدا، لەهەردوو ڕووی واتا و فۆڕمەوە بخەینەڕوو. (شیلان عومەر حسەین، ٢٠٠٩: ١٤).

ئیدیۆم بە دانەیەکی ئاخاوتن دانراوە، بەواتا ئیدیەمیش وەك دەربڕاوە ئاساییەکانی تری زمانەکە پێڕەوی یاسا و دەستووری زمانەکە دەکەن و لێی لانادەن و پێکهاتەی سینتاکسی و مۆرفۆلۆژی ئیدیەم، لەگەڵ پێکهاتەی سینتاکس و مۆرفۆلۆژی کەرەستەکانی تری زمانەکە چوونیەکە، ئەوەندە نەبێت ئەمان بەهۆی چەسپاوی فۆڕمەکەیانەوە کەمتر گۆڕانیان بەسەردادێت و سنووردارترن و مل نادەن بۆ ئەو کرانەوە فراوانەی کەرەستەکانی تر ڕێگەی پێدەدەن (بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئیدیەم و کلیتیککردنیان بە دروستە و پێکهاتەی

مۆرفۆسینتاکس و پێدانی دۆخی ڕێزمانی بڕوانە: شیلان عومەر حسەین، ٢٠١٢: ٩). ئیدیۆم وەك دانەیەکی فەرهەنگی، خاوەنی هەموو ئەو تایبەتمەندییە زمانییانەیە، کە دانەکانی دیکەی زمان هەیانە، لەڕووی زمانەوانیشەوە بەوە پێناسە دەکرێت، کە (زنجیرە وشەیەکن لە ڕووی واتایی و ڕێزمانییەوە دیاریکراون، بە شێوەیەك وەك یەکەیەکی سەربەخۆ کاردەکەن). هەر بەو پێیەی ئیدیۆم بەچەشنی یەکە واتاییەکانی دیکە، خاوەنی تایبەتمەندیی واتایی و فەرهەنگییە، بەڵام دەبێت لەڕووی واتاوە ڕەچاوی ئەوە بکەین، کە( واتای ئیدیۆم لە ڕۆنانی ڕێزمانی و ڕۆنانی واتایی کەرتەکانییەوە نایەت )، بۆیە وەك دانەیەکی فەرهەنگی دەشێت قسەی لەبارەوە بکەین.( شێروان حوسێن خۆشناو، ٢٠١١ : ٢٠٤). وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا توخمە فەرهەنگییەکان وەك بیچمێك دەردەکەون، بەجۆرێك لەڕێگای بەکارهێنانەکانیانەوە پەی بە واتاکەیان دەبرێت، ئەوە وەك ئەڵتەرناتیڤێکی مۆرفۆلۆژیانەبوو، چونکە مۆرفۆلۆژی لەڕێگەی فۆرمی جیاوازەوە واتای نوێ دێنێتە فەرهەنگەوە، بەڵام دەکرێت خودی بەکارهێنانەوەی بیچمێك بۆ واتای جیاوازبێت، ئەوەش بەخشکەیی پرۆسێسێکی نواندنەوەی $(X^0)$ەکان دەردەبڕێت. Cook & Newson, (1997:5) .

ئیدیۆم بۆ شیکردنەوەی واتا بابەتێکی گرنگە، لەبەرئەوەی بەناڕاستەوخۆیی واتایەك دەگەیەنێت، کە لە توخمە بنچینەییەکانەوە نەهاتووە و واتایەکی لەخۆیدا کۆدەکاتەوە.( شیلان عومەر حسەین، ٢٠٠٩: ٤٩).، ئیدیۆمەکان لەڕووی پێکهاتەوە جیاوازن، هەیانە وشەن و هەیانە فرێز و هەندێکیشیان ڕستەن، بەڵام لەهەر پێکهاتەیەکدا بن، تایبەتمەندیی واتاییان ناگۆڕێت. ( شێروان حوسێن خۆشناو، هەمان سەرچاوەو لاپەڕە).

$(X^0)$ەکان توخمی پرۆژەسازدەرن، کە لەڕێگای فرێزەوە دەشکێنەوە، بۆیە $(X^0)$ەکان بە"وشە خاوەن دەسەڵاتەکان–individualty word) دادەنرێن Cook & Newson(1997:5).، لە سەرەتای هەنگاوەکانی قوتابخانەی بەرهەمهێنان و گوێزانەوەدا ئیدیۆم بەدیاردەیەکی ناوازەی فەرهەنگی دادەنرا، بەڵام لە هەنگاوەکانی تردا، بەجۆرێك لە نواندنەکانی $(X^0)$ەکان، کە بریتین لە ("کردار"، "ناو"، "ئاوەڵناو"). Pual kay & Ivan A.say (2014:1)، واتە ئیدیۆمەکان گەر

وشەیی بێت یان فرێزی و ڕستەیی، هەر لەلایەن توخمێکی فەرهەنگییەوە پێشنیاز دەکرێت و سازدەدرێن، واتە ئیدیۆم جۆرێکە لەنواندنی فەرهەنگی، چونکە لەڕووی سینتاکسییەوە ($X^-$)ن و لەڕووی واتاییشەوە هەمان واتای شاراوەی توخمە فەرهەنگییەکان دەنوێنن، بۆیە ئیدیۆم فۆرمێکە بۆ نواندنی واتا شاراوەکەی توخمێکی فەرهەنگی، لەوەدا ئیدیۆمەکان دەبن بەتێڕوانینێکی چەسپاو ( fixed expression)، کە دوا پێشنیازی واتایی توخمە فەرهەنگییەکان دەکەن و مارکەیان لێدەدەن، بەجۆرێك وەك لەپاشدا ڕووندەبێتەوە، یان مەودای نێوان ئاوەڵناوەکان دەستنیشان دەکەن، یان دەبنە ئەڵتەرناتیڤی فۆرمداڕشتنی مۆرفۆلۆژیانە/ وشە دروستکردن.

زۆربەی ئەوانەی کاری لێکسیکۆگرافی دەکەن لەنێوانی ئەوەدان، کە ئایا ئیدیۆم هەمان دەروازەی فەرهەنگی (Lexical entry) یان وەچەدەروازەی (Subentry)ی هەیە، چونکە گەر وەك دانە فەرهەنگییەکان لێکبدرێتەوە، ئەوا لێکسیکە و دەبێتە دەستەیەك لە لێماکان، بەڵام ئەگەر لێمایەك بێت، ئەوا دەروازەی تایبەت بەخۆی نابێت، لێکۆڵەر لەسەر ئەو پێڕەوە دەڕوات، کە ئیدیۆم پەیوەست بەفراوانبوونی هێز و نواندنی وشەوە. (Chris mulhall (2007: 2-4، بەتایبەتی وشەکان وەك "ناو"و "ئاوەڵناو"و "کردار"، لەڕێگای ئەوانیشەوە دەروازەی فەرهەنگی بۆ دەکرێت، بۆنموونە ئاوەڵناوی/کورت/و /درێژ/ لەگەڵ کرداری /نوستن/ لە (١٧)دا پەیوەست بەپێکهاتەی سینتاکسی واتایی ئیدیۆمییەوە لێکدەدرێنەوە:

١٧)أ. داری کورت، قاچی کورت، پەتی کورت، داری درێژ .....

ب. نەوزاد لەسەربان نوستووە.

ت. دەستکورت ، زمان درێژ.

پ. نەوزاد لەگوێی گادا نوستووە.

سەبارەت بەپێکهاتەی واتایی ئیدیەم لەزماندا، وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، ئەو وشانەی، کە ئیدیەم دروست دەکەن، بەواتای پێکهاتەییەوە بەشداری پێکهێنانی ئیدیەم ناکەن، بەڵکو ئەو واتایەی، کە لە ئیدیەمدا دەیگەیەنن، بریتییە لەواتای ناپێکهاتەیی وشەکان(٢)، بڕوانە (١٧–ت) لەوێدا واتای وشەکان بریتییە

لەواتای ناپێکهاتەیی ئەو وشانە، چونکە <دەستکورت> بەواتای ئەوە نەهاتووە، کە بەشێوەیەکی فیزیکی کەسێکی دەستکورت بێت، بەڵکو واتای (هەژاری) دەگەیەنێت بۆ <زماندرێژ>یش بەهەمان شێوە، واتای (زۆر بڵێ)ی گەیاندووە، هەروەها لە (١٧-پ)دا <لە گوێی گادا نوستووە>، مەبەست لە (بێئاگایی و بێخەبەری) کەسەکەیە لە ڕووداوەکان، کەواتە هیچ یەکێك لە وشەکان بەواتای پێکهاتەییەوە بەکارنەهاتوون، بەڵکو هەڵگری واتای ناپێکهاتەیین، لەو ڕوانگەیەوە پێکهاتەی سینتاکسی و واتایی فرێز و ڕستەکان دەخرێتەڕوو.

**١-٣/١) پێکهاتەی سینتاکسیی ئیدیۆم**

پێکهاتەی سینتاکسیی ئیدیۆم، نواندنی سینتاکسی فرێز و ڕستە دەگرێتەوە، کە لەپاش پێکهاتەی واتایی دێت. پێشبینی دەکرێت پێکهاتەی سینتاکسی لە نواندنێك زیاتری هەبێت، بەڵام نواندنەکانی بۆ یەك پێکهاتەی واتاییە. بەپێی یاساکانی گوێزانەوە، هەر گواستنەوەیەك لەپێکهاتەی واتاییەوە بۆ سینتاکس ڕوودەدات گۆڕینی واتایی لێناکەوێتەوە. هەرچەندە (چۆمسکی) لە "تیۆری ستانداردی فراوانکراودا – Extended standard theory " واتای (دروستەی قووڵ/پێکهاتەی واتایی) و (واتای دروستەی ڕووکەش/پێکهاتەی واتایی) جیاکردەوە.( مازن الوعر ١٩٨٧: ٦٠). ئەویش بەو پێیەی پێشبینی دەکرێت، واتایەك لە نواندن و پێکهاتەی سینتاکسیدا ڕوودەدات، واتایەکی گۆڕاوی پێکهاتە واتاییەکە بێت.

لە ڕاستیدا ئیدیۆم لەنواندنی سینتاکسییانەی توخمە فەرهەنگییەکانە و لە فۆڕمی فرێز و ڕستەدا دەنوێنرێت، ئەمەش ئەوە دەردەبڕێت، کە ئەگەرچی ئیدیۆم لە دروستەی ڕووکەشدا دروست دەبێت و شکانەوەیەکی ($X^0$)ەکانە، بەڵام دەربڕی واتایەکی چەسپاو و فەرهەنگییە. واتا ئیدیۆم پێشنیازێکی فەرهەنگییە بەنواندن و زانیارییەکی سینتاکسییەوە، بەوەش گشت ئیدیۆمەکان (وشەیی، فرێزی، ڕستەیی) نواندنی($X^{-}$)[٣] یان هەیە، بۆیە ئیدیۆم دەبێتە نواندنی فەرهەنگی.( بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی پرۆسەی بەلێکسیمبوون بڕوانە محەمەد مەجید سەعید، ٢٠١٥: ٧٤).

**٣/١_٢) پێکهاتەی واتایی ئیدیۆم**

ڕوونکردنەوەکەی سەرەوە پەیوەست بەوەی، کە ئیدیۆمەکان پرۆژەیەکی فەرهەنگین و لە دروستەیەکی سینتاکسی واتاگۆڕاودا دەنوێنرێت، ئەوە دەردەخات، کە هەریەك لەجۆرەکانی فرێز دەرهاویشتەی پێکهاتەیەکی واتایی جیاوازن و لەئاستی جیاوازدا نواندنیان هەیە، بەڵام هەریەك لەو پێکهاتە واتاییانە لە فەرهەنگەوە بۆ نواندنی سینتاکسی دادەڕێژرێت و ویستی سینتاکسی و واتایی (X)ەکانە، بڕوانە هێڵکاریی (٥) و (٦).

هێڵکاریی (٥)




هێڵکاریی (٦)




بەوشەبووەکان (بەلێکسێمبووەکان)، لە فرێزەکانەوە بەرهەمدێن، چونکە گەر سەرنجیان بدرێت، ئەوە دەردەکەوێت، هەریەکەیان پرۆژەی ئاوەڵناو و ناو و کردارەکانن، کە ئەوانە سەری ڕێزمانین و دروستکەری پرۆژەی فرێزن، نەك وشە. بۆ نموونە ئیدیۆمەکانی وەك { زمانلووس، زماندرێژ، دەمپیس، چاوپیس، دڵپیس، دەمڕاست، دەستبڵاو، دەسترۆیشتوو، دەمدرێژ، دەستکورت،......تاد}، ئەگەرچی لەسەر بنەمای هەندێك وشە وەك {/باڵابەرز /، /چاوشین/ ،/قژکاڵ/، /دەنگخۆش/، ......تاد}دروستبوون ، کە فرێزی خستنەپاڵی ئاوەڵناوین و سەرەڕای ئەوەی بوونەتە لێکسێمی سەربەخۆ، بەڵام هەربە ئاوەڵناوی ماونەتەوە و نەبوون بە ناو، ئەگەرچی هەمان دروستەیان هەیە، بەڵام ئەوان دروستە

واتاییەکانیان بۆ ناپێکهاتەیی گۆڕاوە، بۆیە بوونەتە ئیدیۆم، هەروەها نموونەکانی لەجۆری /پیاوکوژ/، /میوەفرۆش/، /مووچەخۆر/، /ماسیگر/، /شەکرشکێن/، /قۆڵبڕ/، /دەستبڕ/، /ئاگربەست/، .....تاد)، کە هەردوو دیوی ($A^0$)و ($V^-$)یان هەیە، بەرەو فەرهەنگ ڕۆیشتوون و جگە لە دیوە سینتاکسییەکەیان بوونەتە لێکسێمی سەربەخۆ، کە دانەیەکی فەرهەنگییە، لەوەش زیاتر هەندێکیشیان، وەك (/ قۆڵبڕ/، /دەستبڕ/) لەقۆناغی پاش بەلێکسێمبووندا بوونەتە ئیدیۆم و پلەیەکی چەسپاوتریان وەرگرتووە.( محەمەد مەجید سەعید، ٢٠١٥: ٨٥). دروستبووی بەئیدیەمبوو، بریتییە لە وشە دروستکردنێك، کە ناتوانرێت لەسەر بناغەی واتای بەشە پێکهێنەرەکانی تێبگەین، واتای تەواوی ئیدیەم لەواتای پێکهێنەرەکانییەوە وەرناگیردرێت و دەستناخرێت.( محەمەدی مەحوی، ٢٠٠٩: ١٦٨). نموونەکانی سەرەوە پێکهاتەیی و ناپێکهاتەیی واتایی فۆڕمە بەلێکسێمبووەکان ڕووندەکەنەوە، کە ئەوە دەردەخەن، واتا پێکهاتەیییەکانیان ناویین و واتای ناوەوەیان بەپێی هەڵاوێرکردنی واتایی (Selectional Restrection) لێکدەدرێنەوە، هەندێکی تریشیان ناوی ئاوەڵناویین و ناپێکهاتەیین، بۆیە گەیشتوونەتە ئاستی ئیدیۆم، چونکە بۆنموونە/مێشکوژ/، /بەفرماڵ/، /دارتاش/، /سەرتاش/، /میوەفرۆش/، /شەکرشکێن/، /مەیگێڕ/، /مەیخۆر/، /سەرشکێن/،...تاد، پێکهاتەیین و ناویین، کەچی لەقۆناغی بوون بەئیدیۆمدا، دەبنە ناپێکهاتەیی و ئاوەڵناوێکی لەجۆری (/دەستبڕ/، /قۆڵبڕ/، /پیاوکوژ/[٤]، /ژێربڕ/،...تاد)ی لێدروستدەبێت، بۆیە دەوترێت ئیدیۆمەکان بە قۆناغی بەئاوەڵناوبووندا تێپەڕیون ( محەمەد مەجید سەعید، ٢٠١٥: ٨٥)، بەم جۆرە لە (١٨)دا دەخرێتەڕوو.

١٨) أ. $N^0 \longleftarrow N- \longleftarrow N^0$ ئیدیۆمن

ب. $A^0 \longleftarrow A^- \longleftarrow A^0$ ئیدیۆمن

ت. $V^0 \longleftarrow V^- \longleftarrow A^0$ ئیدیۆمن

ئەوەی لە (١٨)دا ئاماژەی بۆ کراوە، هەرئەوە دەخاتەڕوو، کە ئیدیۆمەکان لە($X^0$)دا، لە($N^0$، $A^0$، $V^0$)ەکانەوە بەرهەمدێن و جۆرێکن لە شکانەوەکانی ئەوان، هەروەها دەشێت لێکسێمەکان بەپێی ویستی قسەکەر بێت و لە جێگەو کاتێکدا

لێکسێمێك هەڵبوەشێتەوە بۆئەوەی دروستەیەکی زانیاریی تەواو بدات بەگوێگر، بەڵام ئەو لێکسێمانەی، کە گەیشتوونەتە قۆناغی دواتری لێکسێم و بە ئیدیۆم بوون، توانای هەڵوەشانەوەیان نییە، بۆنموونە وشەیەکی لە جۆری /قـۆڵبڕ/، /دەمپیس/، /زمانلووس/،....تاد، ناکرێت هەڵبوەشێتەوە و بکرێت بە/قۆڵی بڕ/، /دەمی پیس/، /زمانی لووس/، ....تاد، چونکە هەم فۆڕمیان گۆڕاوە هەم واتـا، بەڵام ئاخێوەری زمانەکە لە سەرووی واتای لێکسێم و ئیدیۆمەکەوە بیرکردنەوە و داڕشتنی نوێیان پێدەدات، بۆنموونە >نەسرین زمانی لووسە<، دەشێت فۆڕمەکەی لەڕووی سینتاکسییەوە دابڕێژرێتەوە وەك >زمانی نەسرین زۆر لووسە<، یان زیادەی بخاتەسەر و چڕتری بکاتەوە، وەك >زمانی ئەوەندە لووسە لەسەری دەخلیسکێت< (محەمەد مەجید سەعید، ٢٠١٥: ٩٧). ئەمەش ئەوە دەردەبڕێت، کە ئیدیۆم نواندنێکی تری پێکهاتە واتاییەکەیە، کە بەرەو "ناپێکهاتەیی Non–Compositional"دەڕوات. لە ڕاستیدا فرێز و ڕستە ئاساییەکانی زمانی کوردی، کە"پێکهاتەیین– Compositional"ن، هەرجۆرێکن لەنواندنی توخمێکی فەرهەنگی، بەڵام ئیدیۆمەکان نواندنێکی پاش سینتاکسیان هەیە (Post Syntactic)، چونکە لەپاش دوانواندنی سینتاکسییەوە، لە قۆناغی بەوشەبووندا (lexicalization) بەرهەمدێن، واتایەکی ناپێکهاتەیی دەبێت، بڕوانە محەمەدی مەحوی، ( ٢٠٠٩ :١٦٨). بۆنموونە، ئاوەڵناوی /کورت/، /درێژ/، /پیس/،......) بەنموونە هەموویان ئاوەڵناون ($A^0$)و واتای پێکهاتەیی دروست دەکەن، بۆنموونە {دەستی کورت، کراسی کورت، پەتی کورت، کراسی درێژ،ماڵی پیس، کراسی پیس...} ئەمانە هەموویان واتای پێکهاتەییان هەیە و هەموویان لەبنەڕەتدا لە فەرهەنگەوە هاتوون، بەهەمان شێوە هەر ئەو ئاوەڵناوانە توانای ئەوەیان هەیە واتای ناپێکهاتەیی/ ئیدیۆمیش بەرهەمبهێنن ، بڕوانە نموونەکانی (٢٠).....( بڕوانە محەمەد مەجید سەعید، ٢٠١٥: ٩٤).

لێکۆڵینەوەکە دەیەوێ پێشبینی ئەوەبکات، کە داڕشتنی ئیدیۆم لەزمانی کوردیدا پەیوەستە بەنواندن و ئەو نیشانەکردنانەی لە سیمانتیکی پێکهێناندا باسی لێوەکراوە، لەو ڕوانگەیەوە یان نواندنی نیشانەی بیچمەکە لەفۆڕمی"بەئاوەڵناوکردندا– adjectivation"، بڕوانە (١٩، ٢٠) واتا وەك چۆن لە

سـیمانتیکی پێکهێنانـدا "جیـاوازی نیشـانەیی" (feture varibal) نێـوان دانـەی فەرهەنگی و پرۆسەی ناونان ئاماژەی پێدرا، دەشـێت لـەڕێگای ئیدیۆمەکانیشـەوە نیشـانەی سـیمانتیکی بنوێنرێـت و لـەڕێگای فۆڕمداڕشـتنی ئیدیۆمیشـەوە پرۆسەی"ناونان– nominalization " جێبەجێ بکرێت. بڕوانە (٧٨)، چونکە وەك چـۆن/کوژ/، /بـڕ/ وەك کردارێـك و/درێـژ/، /کـورت/، /لـووس/، /پـیس/ وەك ئاوەڵناوێـك پێشـنیازی دروسـتەیەکی سینتاکسـیی پێکهاتـەیی دەکـەن و لـە سینتاکسـدا دەنـوێنرێن، هـەر ئـەوان دەشـتوانن بـەپێی دروسـتە و واتاکانیـان دەربڕاوێکی ئیدیۆمی دروست بکەن، بڕوانە (١٩، ٢٠، ٢١):

| ١٩) پێکهاتەیی — سینتاکسی | ناپێکهاتەیی — ئیدیۆمی |
| --- | --- |
| پیاوکوژ (فرێزی کرداری) | پیاوکوژ (ئاوەڵناو) |
| دەست بڕ ( فرێزی کرداری) | دەستبڕ (ئاوەڵناو) |
| قۆڵ بڕ ( فرێزی کرداری) | قۆڵبڕ (ئاوەڵناو) |

| ٢٠) پێکهاتەیی — سینتاکسی | ناپێکهاتەیی — ئیدیۆمی |
| --- | --- |
| دەستی کورت (ف.ئا) | دەستکورت ( بەئاوەڵناوبوو) |
| زمانی درێژ (ف.ئا) | زماندرێژ ( بەئاوەڵناوبوو) |
| دەمی پیس ( ف.ئا) | دەمپیس ( بەئاوەڵناوبوو) |
| دەستی درێژ (ف.ئا) | دەستدرێژ ( بەئاوەڵناوبوو) |

| ٢١) پێکهاتەیی — سینتاکسی | ناپێکهاتەیی — ئیدیۆمی |
| --- | --- |
| دەست لێ هەڵگرتن | دەستلێهەڵگرتن |
| سەر کەوتن | سەرکەوتن |
| چاو تێ بڕین | چاوتێبڕین |
| ئاو کردنە ژێر | ئاوکردنەژێر |

هەریەکە لە نموونەکانی (١٩، ٢٠، ٢١) ئەوە دەردەبڕن، کـە (أ) ئیدیۆمـەکان لـەڕێگای بـەناوکردن و بـە ئاوەڵناوکردنـەوە، فـۆڕم بـۆ نیشـانەی واتـایی دانـە فەرهەنگییـەکان دادەڕێـژن، بـەوەش دەبێتـە ئەڵتـەرناتیڤی مۆرفۆلۆژییانـە، واتـە جێگای فۆڕمداڕشتنی ئاسایی دەگرێتەوە، کە ناکەوێتە ژێرباری یاسـایەکی دیـار و

ئاشکرای زمانەوە، (ب) پەیوەست بە بەکارهێنانەوە و ئەو پێشنیازانەی لەڕێی تیۆری دووهێندەییەوە (Dubling) خرایەڕوو، نواندنی ئیدیۆمی لەڕێگای دووهێندەییکردنی فۆرمە سینتاکسییەکانەوە ڕوودەدەن، کە پێدەچێت هەندێك فۆرم بە سینکرۆنی لەئێستادا تەنها فۆرمە ئیدیۆمییەکەیان لە فەرهەنگدا مابێت، هەروەها ئەوەیان دەرخست، کە نموونەکان لە فۆرمدا دووهێندەیین و واتایان جیاوازە، ئەوەش پەیوەست بە ڕوونکردنەوەکەی سەرەوە و پەیوەست بەبۆچوونی توێژینەوەکەوە ئەوە دەردەبڕێ، کە هاوشێوەی فۆرمە سینتاکسییەکان، ئیدیۆمیش لەلایەن ئاخێوەری زمانەکەوە بەرهەم دەهێنرێن و ئەگەری بوون بە لێکسێم و بوون بە فەرهەنگی هەیە.

زمان دەربڕی گشتییە و فۆرمە فەرهەنگییەکانی زمانی کوردی دەربڕی گشتێتیین، واتا مەودای نێوان فۆرمە زمانییەکان و فۆرمە فەرهەنگییەکان فراوانن، کە دەشێت لەڕێی ئیدیۆمەکانەوە: (أ) دەست بخرێتە سەر وردەکاریی فۆرمێکی فەرهەنگی دەربڕی گشتێتیی، بڕوانە (٢٢، ٢٣، ٢٤):

٢٢)>هەژار<

دەستی کورتە

ئاگر لەماڵیان ناکرێتەوە

لە سەگ سواڵەکا

زادیان ئاوە

کەر لە ماڵیا بکەوێ دانی ئەشکێ

> هەژار <

٢٣)>سووتان <

کلۆکۆی دامرکا

بوو بە قەقنەس

بوو بە خۆڵەمێش

بووبە قەرەبرووت

داپلۆخا

> سووتان<

٢٤)>گەرم<
سیتکە ئەکا
داخ بووە
هاتۆتە کوڵ
>گەرم<
٢٥)>ڕووناك<
بزن و مەڕ جیا دەکرێتەوە
>ڕووناك< ( بشروانە عەبدوالواحید موشیر دزەیی، ٢٠١٥: ١٤٤).

ئـەو نموونانـەی لەسـەرەوە هـاتوون گشـتێتی و پلـەداری دەردەبـڕن، بۆیـە لەڕێگــەی میتــافۆڕ و ئیدیۆمــەوە بــەرەو تایبــەتێتی بــراون و نێوانــەکانیان پڕکراوەتـەوە، واتـە لـەنێوان (>هـەژار<.............>هـەژار<)دا پلـەی هـەژاری هەیە وەك لەنموونەی (٢٢)دا بـەمیتافۆڕ و ئیـدیۆم، مارکـە لـە ئاسـتی هەژارییەکـە دراوە، هەروەها /سـووتان/یش دەربـڕی گشـتێتییە و پلـەی سـووتانەکەی نیشـانە نـەکراوە، وەك لـە (٢٣)دا خراوەتـەڕوو، میتـافۆڕ ئـەرکی نیشـانەکردنی پلـەکانی گرتووەتـە ئەسـتۆ و بەهۆیـەوە دەتوانرێـت پلـەی سـووتانەکە نیشـانە بکرێـت، دیـاریکردنی پلـەی گـەرمی لـە (٢٤)دا دیـارە، تـوانراوە بـەمیتافۆڕ مارکـە لەپلـەی گەرمییەکە بدرێت، هەروەها لە (٢٥)دا بۆ نیشانەدان لە پلەی ڕووناکییەکە، سـوود لە ئیدیۆم وەرگیراوە، کە دەزانرێت تاریکی نەماوە و ڕەش و سپی جیادەکرێتەوە. (ب) ئیدیۆمەکان خۆیان جۆرێکن لە فۆڕمداڕشتن، کە جێگـرەوەی مۆرفۆلۆژیانـەن، چـونکە واتـای ناپێکهاتـەیی لـەڕێگای تـەرزی وشـە دروسـتکردنەوە، کەواتـە یـان ئاوەڵناو یان ناوی ئیدیۆمی دروستدەکەن، وەك (/ پیاوکوژ/، /قۆڵبڕ/، /دەسـتبڕ/، /زمانلووس/، /زماندرێژ/، /چاوپیس/، /دەمپیس/،.....).

پاش ئەوەی پێکهاتەی سینتاکسی و واتایی لەهەردوو ئاستی نواندنی فرێزی و ڕستەییدا خرانەڕوو، ئیدیۆمـەکانیش وەکـو دەرهاویشـتەی هـەمان ئـەو پێکهاتـە واتاییانە خرانەڕوو، ئەوە دەردەکەوێت، کە نواندنی ئەو پێکهاتە واتاییانە بەپێی پۆلە ڕەگەز هێنانەوە بێت بۆ نیشانەکان نـەك ڕاسـتەوخۆ لەپێکهاتـە واتاییەکانـدا

پۆلە ڕەگەزەکان دابنرێن، بەڵکو دانە فەرهەنگییەکان ئەوانەی لەجۆری ($X^0$)ن، خۆیان لەناو پێکهاتە واتاییەکاندا زانیاریی پەیوەست بەواتا و پاش واتا تیایاندا هەڵگیراوە.

**٤/١) واتای میتافۆڕی**

میتافۆڕ ئەو وشە و دەربڕینانەن، کە بەواتای فەرهەنگییان بەکارنایەن، دەبنە ئاماژە بۆ واتا و مەبەستی خوازراو. زمانی میتافۆڕی ڕێگە دەدات، کە قسەکەر واتایەك، مەبەستێك بە وشە و دەربڕینێك دەربڕن، کە واتای فەرهەنگی نەگەیەنێت[٥]. لە میتافۆڕدا دوو کەتیگۆری لەکاردان، یەکێکیان ئەوەیە کە وشەکەی لێوەرگیراوە، ئەوەی تریان ئەوەیە کە تیایدا بەکارهێنراوە (Nick Riemer (2001: 3). بۆنموونە کاتێك خوێندکارێك لە "سینتاکس" باش تێگەیشتووە ئەڵێت >سینتاکس دەخۆم<، کە بە واتای ( زاڵبوون و دەسەڵات شکانەوە دێت)، ئەمەش بەکارهێنانی واتای ناپێکهاتەیی کرداری/خواردن/ە، چونکە لەبنەڕەتدا واتای پێکهاتەیی ئەم کردارە ئەوەیە، کە ئارگۆمێنتێك داوادەکات [+خۆراك] بێت، بەڵام (سینتاکس) خۆراك نییە، کە بخورێت واتا [− خۆراك]ە ، هەربۆیە لە کەتیگۆرییەکەی خۆیەوە هێنراوەتە دەرەوە و لە کەتیگۆریی خواردندا دانراوەتەوە ( بەکر عومەر عەلی، ٢٠٠٠: ٥٦).

لە نموونەیەکی تردا >خانووەکەم خەواندووە<، لێرەدا بەواتای (لەبریدانان) هاتووە، بەهەمان شێوە بەکارهێنانی ناپێکهاتەیی کرداری /خەوتن/ە، لەبنەڕەتدا ئەم کردارە داوای پریدیکاتێك دەکات کە [+گیاندار] بێت، واتە توانای خەوتنی هەبێت، بەڵام /خانوو/ شتێکی بێگیانە و ناخەوێت، کە واتا ئەمە کردارێکی پریدیکاتە و توانای ئەوەی هەیە بەفراوانی بەکاربێت و واتای نوێ بگەیەنێت
William Marslen-Wilson, ColinM. Brown , Lorraine Komisarjevsky Tyler ,(1988:2)..

لێکۆڵینەوەکە وای بۆدەچێت، میتافۆر لەنیشانە شاراوەکانی فۆرمێکی فەرهەنگیی (X0)ە، کە زیاتر بۆ نیشانەکردنی مەوداکانە، چونکە (ا) میتافۆرەکان مارکە لێدەدەن، (ب) جێگرەوەی مۆرفۆلۆژیانەن، (ت) بەپێی سیمانتیکی پێکهێنان بۆ نیشانەیەکی سەرەکیی دەردەبڕێت، ( بەکر عومەر عەلی، ٢٠٠٠: ٥٦).

( لە تیۆری سیمانتیكیدا میتافۆر بەدیاردەیەكی نائاسایی دادەنرێت، كە پێویستە پشتگوێ بخرێت، چونكە ناچێتە ژێرباری یاسا تایبەتییەكانی ڕێزمانەوە)[٦]، واتە لە بەكارهێناندا واتاكەی ڕووندەبێتەوە و واتای پێدەردەبڕدرێت. پەیوەست بەبۆچوونی (ا)ەوە وەك لەپاری پێشوودا ئاماژەی پێدرا، مەودا فراوانی و گشتێتی لەنواندنی واتای فەرهەنگیی پۆلە ڕەگەزەكاندا وادەكات، ئاخێوەری زمانێك نیشانەی واتایی فۆرمێكی تر بۆ نیشانەكردن بەكاربهێنێت، بۆ نموونە لە/كۆمپیوتەر/ واتای (ژیری و خێرایی و وردی) بڕوانە نموونەی (٢٦ –أ)، لە/تەیارە/ واتای (خێرایی و زووگەیشتن) بڕوانە نموونەی (٢٦_ب)، لە/ شێر/ (ئازایەتی) بڕوانە نموونەی (٢٦_ت).....ئەوانە ئەو واتایانەن، كە لە نواندنی فۆرمی و واتایی پۆلە ڕەگەزە فەرهەنگییەكەدا بەدی ناكرێن، بڕوانە هێڵكاریی(٧):

٢٦) أ. خوێندكارەكە ئەڵێی كۆمپیوتەرە.

ب. وەك تەیارە هاتەوە . وەك گوللە دەرچوو.

ت. پێشمەرگەكان وەكو شێرن.

هێڵكاریی (٧)




هێڵكاریی (٧) بۆ نیشانەكردنی ئەو گشتێتی و پلەدارییەیە، كە لە ئاوەڵناوەكاندا هەن، بەڵام گەر سەرنجی بدرێت، مەوداكانی نێوان ($A^0$)ەكان بە($N^0$)و نیشانە پڕ دەكرێنەوە، هەروەها پەیوەست بە خاڵی (ب) لەبەرئەوەی میتافۆر پرۆسەی بەكارهێنانەوەی فۆرمی فەرهەنگییە بۆ نواندنی واتایی، بۆی دەبێتە جێگرەوەی یاسا مۆرفۆلۆژییەكان، كە ئەوان بە داڕشتنی فۆرمی نوێ واتای نوێ بەرهەمدێنن. واتە بۆ نموونە لەبری ئەوەی بۆ یەكێك لە پلەكانی (زیرەكی) یان (ئازایی) فۆرم دابڕێژرێت، /كۆمپیوتەر/و /شێر/ بەكاردەهێنرێتەوە. سەبارەت بەخاڵی (ت)ش لەبەرئەوەی فۆرمەكانی ناو فەرهەنگ بۆ چەمك و بیركردنەوەی پێش– فەرهەنگی و بۆ نیشانەیەكی واتایی وشەیەكی گشتیی ناو

فەرهەنگ دادەڕێژرێن، بۆیە میتافۆر لەو جۆرانەیە، کە بۆ نیشانەی واتایی وشەیەکی فەرهەنگی دادەڕێژرێن و لە هەناوی ئەوانەوە دێنە دەرەوە، بڕوانە هێلکاریی (٧).

هەندێك میتافۆر دەتوانێت بچێتە ناو بەشە تایبەتییەکانی ڕستەوە، بڕوانە نموونەی (٢٧–أ)[٧]، لە ڕاستییدا میتافۆر لەو جۆرە تەرزەی زمانە، کە ئاخێوەری زمان و بەتایبەتیش شاعیران توانای داهێنانیان هەیە تێیدا، کە لەئەنجامی بڵاوبوونەوەی دەقێك و زۆر بەکارهێنانی بڵاودەبێتەوە و وەك هەر واتایەکی تری فەرهەنگی لەلای ئاخێوەرانی زمان دەناسرێتەوە. بڕوانە نموونەی (٢٧).

٢٧) أ. لانە مانگە.

ب. نەسرین دەڵێی گوڵە.

ت. بە ڕاستی نەوزاد ڕێوییە.

پ. گۆشتەکە ئەڵێی توێی ئاوە.

لە نموونەکانی (٢٧)دا، وشەکان بۆ واتای خوازراو بەکارهاتوون، خۆیان لە بنەڕەتدا ($N^0$)ن و سەربە کەتیگۆری ناون، بەڵام لێرەدا واتای میتافۆرییان وەرگرتووە و لە جێکەوتەی ئاوەڵناودا بەکارهاتوون، بۆیە واتای بنەڕەتییان لەدەستداوە، وەك لەنموونەی (٢٧–أ)دا، /مانگ/ بەواتای بنەڕەتی نەهاتووە، چونکە لەگەڵ بکەری ڕستەکەدا ناگونجێت (لانە) تەنها ناوێکە، بۆیە دەبێت /مانگ/ واتای میتافۆرییەکەی وەربگرین، هەروەها لە کەتیگۆریی ناوەوە چووەتە کەتیگۆریی ئاوەڵناو، چونکە وەسفی ناوەکە دەکات و لە کۆی پێکهاتە واتاییەکانی وشەکە مارکە لە [+جوانی ] دراوە، لەنموونەی (٢٧/ب–ت)دا /گوڵ/و /ڕێوی/ میتافۆرن و ئاخێوەری زمانەکە وەك زانیارییەکی واتایی دەیانناسێتەوە. (بشڕوانە شیلان عومەر حسەین، ٢٠٠٩ : ٦٩). دەزانێت /گوڵ/ بۆ یەکێك لە واتاکانی [+جوانی] و /ڕێوی/ش بۆ یەکێك لەواتاکانی [+فێڵباز] نیشانەکراوە، سەبارەت بە(٢٧–پ) {توێی ئاو} بۆ نیشانەی [+ناسك] وەرگیراوە و پلەداری ناسکییەکەی نیشانەکراوە، بۆ نیشانەدان لە پلەداری ئەو ئاوەڵناوانەی لە نموونەکەدا هاتووە، بڕوانە هێلکاریی (٨).

هێڵکاریی (٨)




ئەوەی لە هێڵکارییەکەدا خراوەتەڕوو، پڕکردنەوەی نێوانی ($A^0$)ە، بە($N^0$)و میتافۆڕ و ئیدیۆم، بۆئەوەی نیشانە لە پلەی دیاریکراوی ئاوەڵناوەکان بدرێت، چونکە /جوان/، /ناسک/، /فێڵباز/ دەربڕی گشتێتین و ئاوەڵناوەکە ناتوانێت ئاستی پلەدارییەکەی دەستنیشان بکات، بۆیە ئەو وشانەی، کە نیشانەیەکی واتاییان تێدایە لەگەڵ ئاوەڵناوەکەدا یەکدەگرێتەوە، بەکارهێنراون بۆ دەستنیشانکردنی پلەی ئاوەڵناوەکە، وەك لەسەرەوە خراوەتەڕوو.

**ئەنجام**

١- هەریەك لە توخمە نەفەرهەنگییەکان لە بەرهەمهێنانی پێکهاتەی سینتاکسی و واتایی هەمەجۆردا بەشداری دەکەن، ئەگەرچی لە پێکهاتەی واتاییدا کۆتوبەندی واتایی هەیە، بەلام زمانی کوردی پریدیکاتەکانی لە هەلاوێرکردنی واتاییدا کۆتوبەندەکان دەشکێنن و ئارگۆمێنتەکان بە نیشانەی [ +/- ]ەوە هەلاوێر دەکەن، ئەوەش پەیوەست بە فۆرمدارشتنەوە بۆتە جێگرەوەی پرۆسە مۆرفۆلۆژییەکان.

٢- توانایەکی تری دانە فەرهەنگییەکان /($X^0$)ەکان ئەوەیە، کە بەرهەمهێنی دروستەی ناپێکهاتەیین (Non Compositionally)، واتە لە دەروازەی فەرهەنگیی (Lexical entry) دانە فەرهەنگییە پریدیکاتییەکاندا جگە لە واتای پێکهاتەیی (Compositionally) واتایەکی ناپێکهاتەیی خەزنکراوە، کە بەرهەمهێنی ئیدیۆمە. ئیدیۆمەکان فۆرمێکی نیشانەکراوی نێوان مەودا فراوانی دانە فەرهەنگییەکانن (بەتایبەتی ئاوەڵناوەکان)، هەروەها خۆشیان جۆرێکن لە پرۆسەی وشە دروستکردن.

٣- میتافۆرەکانیش پرکەرەوەی مەودا فراوانیی کەرەستە فەرهەنگییەکانن و بە هۆیانەوە چەمکە گشتییەکان نیشانە دەکرێت. ئەوانیش نیشانەکردنەکانیان لەرێی نیشانە فەرهەنگییەکانەوە دەبێت، واتا نیشانەی میتافۆری بەشێکە لە دەروازەی فەرهەنگیی کەرەستە فەرهەنگییەکان.

## پەراوێزەکان

١. پەیوەست بەپێکهاتەی واتایی و واتای ناپێکهاتەیی بڕوانە پاری دواتر، چونکە ئەوەی لێرەدا ئاماژەی پێدەدرێت تەنها نواندنی سینتاکسی ($X^0$)ەکانە نەك واتاکەیان.

٢. لەبەرئەوەی ئیدیۆمیش وەکو پراگماتیك پابەندی واتای فەرهەنگی نین، بۆیە دەتوانین پراگماتیکییانە لە واتای ئیدیۆم بکۆڵینەوە، بۆ زانیاریی زیاتر لەم بارەیەوە، بڕوانە: (شیلان عومەر حسەین، ٢٠١٣: ١٠٥).

٣. ($\bar{X}$) نواندنێکی سینتاکسییە، کە فرێز و ڕستەکانی زمانی کوردی ئاستێکی لەو جۆرەیان هەیە.

٤. لەو نموونەیەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە وشەی/پیاو/ لە وشەی لێکدراوی/پیاوکوژ/دا، بەواتایەکی فراوان بەکاردێت، کە (ژن، کچ، کوڕ، منداڵ) یان/مرۆڤ/ بەگشتی دەگرێتەوە.

٥. هەندێك وشە هەن لە زمانی کوردیدا ، دەتوانن واتای (میتافۆری و فەرهەنگی)یش بگەیەنن، وەك (ئاگرتێبەردان )، (ئاوکردنەژێر)، بڕوانە (بێستوون حەسەن ئەحمەد، ٢٠١١: ٩٣)

6. https://www.researchgate.net/profile/Peter_Gaerdenfors/publication/226335712 Mental

7. http://faculty.wcas.northwestern.edu/~mjg904/documents/metaphorlexsem.pdf

## سەرچاوەکان

**بەزمانی کوردی :**

١. شیلان عومەر حسەین (٢٠٠٩)، ئیدیۆم و چەشن و پێکهاتنی لە زمانی کوردیدا، چاپی یەکەم، سلێمانی.

٢. شێروان حسێن خۆشناو (٢٠١١)، تێڕوانینێکی نوێ بۆ سینۆنیم لە زمانی کوردیدا، سلێمانی.

٣. عەبدولواحید موشیر دزەیی (٢٠١٥)، زانستی سیمانتیك، چاپی یەکەم، هەولێر.

٤. محەمەدی مەحوی (٢٠٠٩)، زانستی هێما " هێما، واتا و واتا لێکدانەوە، بەرگی یەکەم و دووەم، سلێمانی.

٥. ئاوات حەمەساڵح قادر (٢٠١٥)، ڕێککەوتنی سینتاکسی لە زمانی کوردی و فارسیدا، نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی.

٦. بەکر عومەر عەلی (٢٠٠٠)، میتافۆر لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە، نامەی دکتۆرا، سلێمانی.

٧. بێستوون حەسەن ئەحمەد (٢٠١١)، کۆمەڵە وشە و پێکەوەهاتن لە زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، سلێمانی.
٨. شیلان عومەر حسەین (٢٠١١)، پەیوەندی سینتاکس و سیمانتیك لە ڕێزمای کوردیدا، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سلێمانی.
٩. محەمەد مەجید سەعید (٢٠١٥)، فەرهەنگ و پرۆسەی بەلێکسیێمبوون، نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی.
١٠. شیلان عومەر حسەین (٢٠١٦)، ئاوەزمەندی گەنجی وشە، زانکۆی سلێمانی. (لێکۆڵینەوەی بڵاونەکراوە)

**گۆڤار:**

١١. تریفە عومەر ئەحمەد (٢٠١٥)، زانیاری پراگماتیکی لەکرداردا، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، بەشی (B)، ژ٤٦.
١٢. شیلان عومەر حسەین (٢٠١٢)، مۆرفۆسینتاکسی ئیدیەم لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، بەشی (B)، ژ٣٥.
١٣. شیلان عومەر حسەین (٢٠١٣)، مۆرفۆپراگماتیکی ئیدیەم لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، بەشی (B)، ژ٣٨.

**بەزمانی عەرەبی :**

١٤. مازن الوعر (١٩٨٧)، الجهود اللسانییه، المغرب.

**بە زمانی ئینگلیزی :**

15. Aitchison, Jean (2003), Words in the Mind: An Introduction to the Mental Lexicon, 3rd edition.
16. Chris mulhall (2007), a semantic and lexical –based approach to the lemmatization of idioms, irland.
17. Cook V.J & Newson M.L (1997), Chomsky’s universal grammar, oxford.
18. Johannes dolling & Tatjana heyde –zybatow(2007),verb meaning : how much semantics is in the lexicon?, berlin
19. Jackendoff, R (1992), Languages of the Mind, Bradford.
20. Nick riemer (2001), metaphor and metanomy on different levels lexical categorization, audturalia.

21. Pual kay & Ivan A.say (2014), Lexical and phrasal approaches to argument structure: Two sides of the same coin.
22. VYVYANEVANS (2006) , Lexical concepts, cognitive models and meaning-construction .
23. William Marslen-Wilson, ColinM. Brown, Lorraine Komisarjevsky Tyler (1988), Lexical Representations in Spoken Language Comprehension, Cambridge.

**پێگەی ئینتەرنێتی :**

24. http://iasj.net/iasj?func=fulltext&aId=47133
25.https://www.researchgate.net/profile/Peter_Gaerdenfors/publication/226335712Mental_representation_conceptual_spaces_and_metaphors/links/0fcfd5093b2bdaeb2d000000.pdf
F Recanati - academia.edu
26. http://faculty.wcas.northwestern.edu/~mjg904/documents/metaphorlexsem.pdf

## الخلاصة

## المعنى التركيبي واللاتركيبي في اللغة الكوردية


**أ.م.د. عبدالجبار مصطفى معروف**
قسم اللغة الكوردية – كلية اللغات
جامعة السليمانية

**م.م. بژوين يحيى محمد**
قسم اللغة الكوردية – كلية التربية
جامعة كرميان



يبين هذا البحث المعنى التركيبي الذي يتضمن المعاني الاعتيادية للجمل والعبارات في اللغة الكوردية. ويبدأ البحث بعد ذلك بتحديد وتحليل المعاني اللاتركيبية في الجمل والعبارات المجازية (الاديوم والميتافور). وفي النتيجة نعلم بان هناك تمثيلان لمعاني المفردات المعجمية، وهما التمثيل التركيبي واللاتركيبي لنفس المفرد.


Abstract

**Compositional and non-Compositional meaning in the Kurdish**


**Asst.Prof.Dr. Abdul-Jabar Mustafa Maarof**
Kurdish Language Dept. - College of Languages- Univ. of Sulaimani

**Asst.Lecturer. Bizhwen Yahya Muhammad**
Kurdish Language Dept. - College of Education- Univ. of Garmian



language This research, "Compositional and non-Compositional meaning in the Kurdish language", shows the structural meaning that includes the usual meanings of sentences and phrases in Kurdish language. The research then begins by identifying and analyzing the non-syntactic meanings in sentences and phrases (idiom and metaphor). The result appears that there are two meanings of lexical terms, the Compositional and non-Compositional representation of the same single.

# داستانی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە

## لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی شیکارییە

**پ.د. زرار صدیق تۆفیق**

بەشی مێژوو – فاکولتی زانستی مرۆیی– زانکۆی دهۆك

### پێشەکی

سەربوردەی رۆڵە کوردی پشدەری فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەی باپیرە هەرە گەورەی بنەماڵەی هۆزی میرئاوەدەلی و بەرەبابی بابان و شێرە کچی فەرەنگی– ئەورووپی کەیخان یان کیغان یان کیگان – کە ناوی بە چەند شێوەیەکی لەیەك نزیکەوە هاتووە و لە کۆنترین دەقدا بە کەیخان نووسراوە– لەمێژەوە بووە بە هەوێنی بەسەرهاتێکی پڕ لە گیانفیدایی و پاڵەوانێتی و لە دەڤەری پشدەر و موکریان و دواتریش لە وڵاتی شارەزوور و مەملەکەتی بابان بڵاوبۆتەوە و وەك رووداوێکی راستەقینە، پشتاوپشت وەچە بۆ وەچە گێڕاویەتیەوە و شانازیی پێوەکراوە تا بووە بە گەنجینەیەکی میللی، هاوکات تا هاتووە – هاوشێوەی هەموو کارەسات و چیرۆك و بەسەرهاتە فۆلکلۆرییەکان– لە حەقیقەتەکەی دوور و دوورتر خراوەتەوە و لێی زیادکراوە و پرسی نادروستی خراوەتە سەر و کار و هەڵسوکەتی بەدەر لە مەنتقی دراوەتە پاڵ پاڵەوانەکانی تا گەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە چوارچێوەی رووداوێکی راستەقینە ببەزێنێت و بچێتە خانەی داستان و چیرۆکە ئەفسانەییەکانەوە.

ئەوەندەی من بزانم بەر لە گەشتەکەی کلودیۆس جیمس ریچ (١٧٨٧–١٨٢١) لە هیچ سەرچاوە و بەڵگەنامەیەکدا، چ عوسمانی و چ رووسی و چ ئەورووپایی داستانی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە و کەیخانی فەرەنگی تۆمار نەکراوە و باسیش نەکراوە، وەلێ لەنێو میرئاودەلییەکان و بەرەبابی بابانەکاندا زێدە بڵاوبووبۆوە وەك حەقیقەتێکی دیرۆکی چەسپیبوو و شانازیی پێوە دەکرا، ئەگەر لە ئاخافتنەکانی ریچ وردبینەوە، دەبینین گەورە و بچووك، ژن و پیاو، دەسەڵاتدار و کرمانج، هەمووان بەم بەسەرهاتەیان دەزانی و پێی ئاشنابوون، تەنانەت مەحموود پاشای بابان خۆی بەوە دەردەهێنا کە نەوەی کەیخانی

ئەوروپییە و ڕۆژێك بە ریچی گوت :"دەشێت ئێمە خزم بین"( ریچ : ٢٠٠٨، ص٢٨١)، ئەو پیرەمێردەش کەوا داستانەکەی بۆ ریچ گێڕایەوە کە زانی ئەوروپییە، یەکسەر پێی گوت :"ئێوە ئێمە خزمین، باپیرانمان خزمی یەکدی بوون"( ریچ : ٢٠٠٨، ص٢٨٤)

بێگومان لە سەدەی نۆزدەهەمەوە، بەردەوام لەمەڕ نەژاد و بنەچەیماڵباتی بابان دەنووسرێت و وەك لە لیستی سەرچاوەکان خۆیادەبێت، چەندین کتێب و نامیلکە و تۆژینەوە بڵاوکراونەتەوە، وەلێ کارێکی زانستی و قووڵی وا ئەنجام نەدراوە بۆ ساخکردنەوەی ئەم داستانەی لەمەڕ فەقێ ئەحمەد کە راستەوخۆ پەیوەستە بە سەربوردەی باب و باپیرانی بنەماڵەکەوە، ئەم لێکۆڵینەوەیە دیڤچوونێکی شیکاری مێژووییە دەربارەی ئەم بەسەرهاتە و هەوڵێکە بۆ دۆزینەوەی سەرەداوی یەکەمی و چۆنیەتی گۆڕانی لە ڕووداوێکی راستەقینەوە بۆ داستانێکی میللی.

## ناوەڕۆکی داستانەکە

ك. ج. ریچ بەخۆیشی پەرۆشی ئەوە دەبێت کە بە تەواوی گوێ لە سەربوردەی دیدار و بەیەکگەیشتنی ڕۆمانتیکیانەی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە و کچە کیگانی فەرەنجی بگرێت، لە یاداشتەکانی ڕۆژی چوارەمی مانگی تشرینی یەکەمدا دەڵێت :

"ئەمرۆ پیاوێك لە دارەشمانەوە گەیشتە سلێمانی کە دیاربوو ئاگادار و شارەزایی تەواوی لەسەر ئەم داستانە هەبوو و گفتی پێدام کە بۆ بەیانی یەکدی ببینین و داستانە ڕۆمانتیکەکەم بۆ بگێڕێتەوە دەربارەی نەژادی بنەماڵەی بابان"، ئەویش بەم شێوەیە بۆی دەگێڕێتەوە :

"کاتی خۆی فەقێ ئەحمەد و خدر دوو برا بوون لە دارەشمانە و بە دەستی بڵباسەکانەوە ئازاری زۆریان چێشتبوو کە ئەو دەمە بەهێزترین هۆزی پشدەر بوون، فەقێ ئەحمەدیش مرۆڤێکی ئازا و بەجەرگ بوو، لە کەربان گوندەکەی بەجێهێشت و سوێندی خوارد نەگەڕێتەوە تا پلەو پایەیێکی وای دەست نەکەوێت لە ڕێگایەوە بتوانێت تۆڵە لە بڵباسەکان بستێنێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە ڕوویکردە

ئەستانبوڵ و چووە ریزی سوپای عوسمانییەوە، وا رێککەوت لەو دەمەدا سوڵتانی عوسمانی لە شەڕ دابوو لەگەڵ فەرەنج– ئینگلیز دا و شەڕ و رووبەڕووبوونەوەی ئەو دەمانەش بە شێوەی رمبازی و شەڕە شمشێری تاکە کەسی بوو، یەکێك لە شاسوارانی فەرەنگ بە درێژایی چوار پێنج رۆژ دەهاتە مەیدان و دەکەوتە شمشێربازی لەگەڵ ئازاترین سوارانی تورك و بەسەریاندا زاڵدەبوو و یەك یەك دەیکوشتن.

لەم دەمەدا فەقێ ئەحمەد خۆی بەخشی و چووە مەیدان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم سوارە جەربەزەیەی فەرەنگ و لەسەر داوای سوڵتان خۆی ناساند، سوڵتانیش پاش چاوپێکەوتنی، دڵنیابوو لەوەی کە روخسار و سەروسیمای جێگای قەناعەتن و رێگەی پێدا ئەم سەرەڕۆییە بکات و ئەسپێك و چەك و تفاقی پێویستی بۆ دابینکرد، ئەویش دەمودەست چووە مەیدان و شیا بەسەر سوارچاکە فەرەنگییەکدا سەربکەوێت و گلی پێبدات، ئەمجا لە ئەسپەکەی دابەزی تا بچێت سەری ببڕێت.

لە کاتێکدا بەتەمابوو سەری ببڕێت، سەری سوڕما کە ئەو سوارچاکەی رمبازێی لەگەڵ دەکات کوڕ نییە، بەڵکو کیژۆڵەیەکی ئینگلیزە بەناوی کەیخان و وا تکای لێدەکات ئەگەر نەیکوژێت و لێی خۆشببێت، رازیدەبێت شووی پێبکات، ئەویش هێنای بۆ کەمپی تورکەکان وەك هێمای سەرکەوتن نیشانیدا، سوڵتانیش لە بەرانبەردا وەك پێزانینێك داوای لێکرد چ پاداشتێك دەخوازێت تا پێی ببەخشێت، ئەویش زۆر خۆبەکەمزان بوو لە داواکەی، یان لە راستیدا کورتبین بوو و گوتی تەنها دەخوازم نازناوی بەگم پێ ببەخشیت و بمکەیتە بەرپرسی گوندەکەم، وێڕای تاپۆکردنی یەکجاریی زەوییەکانی دارەشمانە لەسەرم، گوایە ئەگەر هەموو کوردستانی بخواستایە، ئەوە سوڵتان خواستەکەی رەتناکردەوە، ئەمجا قەناعەتی بە هاوژینە نوێیەکەی هێنا و سەرکەوتووانە گەڕایەوە نیشتمان و گوندەکەی خۆی.

پاشان خودا دوو منداڵی پێ بەخشین، بابا سولەیمان و بوداخ کیخان، ئەمجا شەڕی لەدژی بڵباسەکان هەڵگیرساند و دەسەڵاتی لێوەرگرتنەوە و سەرکوتی کردن.

تا ڕۆژێك لە ڕۆژان و لە غیابی فەقێ ئەحمەددا، چوارسەد پێنجسەد سوارەی بلّباس هەڵیانکوتایە سەر گوندی دارەشمانە، کەیخانیش بە ئەسپەکەیەوە لێیان هاتەدەست و تێکیشکاندن و ژمارەیەکی زۆری لێکوشتن، ئەمجا دانیشتوانی گوندەکەی گردکردەوە و پێیگوتن :

ئەی پیاوانی دارەشمانە، لە دەمێکدا من دیلی دەستی فەقێ ئەحمەد بووم، ئەو ژیانمی پێ بەخشیمەوە، من چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بووم کە چاکەکەی بدەمەوە، ئەوا ئێستا هێنامەدی و دوژمنەکانیم تێکشکاند، ئێستاش پێویستە فەقێ ئەحمەد لەوەی بینیتان ئاگادار بکەنەوە و ئەوا من دەگەڕێمەوە بۆ وڵاتی خۆم و جارێکی دی من نابینێتەوە و پێی بڵێن پێویست ناکات دووی من بکەوێت، چونکە هیچ سوودێکی نابێت و من سوورم لەسەر گەڕانەوە و ئەگەر ئەویش مکوڕ بێت لەسەر شوێنکەوتنم، ئەوا من هەرچەند پێم خۆش نییە بەڵام دەستی لێدەوەشێنم، ئەم قسانەی کرد و سواری ئەسپەکەی بوو و بۆی دەرچوو.

کاتێك فەقێ ئەحمەد گەڕایەوە ئاوایی، سەرسام بوو لەوەی روویداوە و زۆر دڵگران و نیگەران بوو بە لەدەستدانی هاوژینەکەی، بۆیە یەکسەر بڕیاریدا دووی بکەوێت تا لە شیوی خردانی پشدەر پێیگەیشت و تکای لێکرد پاشگەزببێتەوە و بگەڕێتەوە، کەیخانیش بەرسەڤیدایەوە و پێیگوت ئەمە کارێکی مەحاڵە، تۆ موسڵمان و من فەرەنگیم و دەگەڕێمەوە وڵاتی باوانم و بە خودات دەسپێرم، نەکەی توخنم بکەویت دەنا زیانت پێدەگەیەنم، بەڵام فەقێ ئەحمەدی خولیای کەیخان، سوور بوو لەسەر کەوتنەدووی، ئەویش رمەکەی بڵندکردەوە و شانی فەقێ ئەحمەدی سمی و پێکای و یەکسەر هەڵهات، بەڵام هەندە دوور نەکەوتەوە و هەڵوەستەیەکی کرد و هەستی کرد بە دڵڕەقی بەرانبەر فەقێ ئەحمەد جووڵاوەتەوە، ئەو کەسەی سۆز و دلۆڤانی پێبەخشی و ژیانی رزگارکرد، ئەوەشی بەبیرهاتەوە کە هەرچەند فەقێ ئەحمەد موسڵمانە، بەڵام مێردێتی و باوکی منداڵەکانێتی، بۆیە گەڕایەوە لایی و بینی هێشتا هەناسەی تێدا ماوە و رابوو مەرهەمێکی لەسەر برینەکەی دانا و فریاکەوتنی بۆ دابینکرد و بۆ جارێکی دی بەجێیهێشت، بەڵام فەقێ ئەحمەدی شەیدا بەمەندە هێور و ئارام نەبووەوە و دوای ساڕێژبوونی برینەکەی و چاکبوونەوەی، هەڵسوکەوتی توندوتیژیی ژنەکەی لەوە

ساردی نەکردەوە دووی بکەوێت و بیگەڕێنێتەوە و بەردەوامبوو لە کەوتنەدووی تا گەیشتە وڵاتی فەرەنگستان.

تا ئێوارەیەك گەیشتە بازاڕێکی گەورە و گوێی لە دەنگی دەهۆڵ و کەیف و خۆشی و بەزموڕەزم بوو و بینی مۆم هەڵکرابوو، بەمانە زانی کە ڕێوڕەسمی بووك گواستنەوەیە، بەو شەوە سەری سوڕما و سواری ئەسپەکەی بوو و سەرپشکیکرد کە بۆ کوێ دەیبات با بیبات . سەرئەنجام ئەسپەکەی لەبەر دەرگای ماڵی پیرێژنێك راوەستا و پیرێژنەکەش میوانداریکرد، دوای دوودڵییەك فەقێ ئەحمەد پرسیاری لێکرد ئەم ئاهەنگ و بەزموڕەزمە چییە؟، پیرێژنیش تێیگەیاند کە کچی شاه کە ڕۆیشتبوو بۆ شەڕی موسڵمانەکان، ئەوا لە شەڕ گەڕاوەتەوە و پاش دیارنەمانی بۆ چەند ساڵێك، شوو دەکات بە پسمامی.

فەقێ ئەحمەدیش تکای لێکرد کە هەرچۆنێك بێت کارێکی وا بکات ڕێگای پێبدەن بچێتە ژوورەوە و لەو ڕێوڕەسمە بەشداربێت و وەك تەماشاکەرێك ئامادەی ئاهەنگەکە ببێت، پیرێژنیش رازیبوو بە مەرجێك بۆ ڕێبزری جلی ژنانە بپۆشێت و لەوێ ئامادەبێت، بەم شێوەیە فەقێ ئەحمەد دزەیکرد و لە نزیك کەیخانی جوانەوە ڕۆنیشت، لەم دەمەدا بووك دەرکەوت و زاوای رەقەکاریش یەکسەر زللەیەکی کێشا بە بناگوێی کەیخاندا و پێیگوت: کچێ تۆ چەند ساڵە دیلی دەستی موسڵمانەکان بوویت و پاکیزەییت لەدەستداوە، چۆن لەرووت دێت خۆتم پیشاندەیت؟ بووکەش واتا کەیخان لە ئازاری ئەم زللەیە یەکسەر بە کوردی و بە دەنگی بڵند هاواری کرد : ئەی فەقێ ئەحمەد تۆ لە کوێی؟.

لەم دەمەدا فەقێ ئەحمەد هاتەدەست و یەکسەر کابرای زاوای کوشت و لەگەڵ بووکە نازدارەکەی گەڕایەوە ئەستانبوڵ، سوڵتانی عوسمانیش ڕێزی لێناو دیاریی زیاتری پێبەخشی، پاشان هەردووکیان گەڕانەوە بۆ پشدەر و پاشماوەی ژیانیان لەوێ گوزەراند.

فەقێ ئەحمەد پێش مردنی، توانی وێڕای ناوچەکانی پشدەر و مەرگە، ماوەتیش بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، پاش مردنیشی بابا سولەیمانی کوڕە گەورەی شوێنی گرتەوە، کە ئەویش باپیرە گەورەی میرانی بابانە لە سلێمانی، ئەمیش پاشماوەی ناوچەکانی کوردستانی کۆنترۆڵکرد و خستیە ژێر دەسەڵاتی

خۆیەوە، کوڕی دووەمیشی بوداق کیخان بە وجاخکوێری مرد" ( ریچ : ٢٠٠٨، ص٢٧٧-٢٨١).

هەر بۆ بەرچاوڕوونیی ریچ، پاشای بابان یەکێکی دیی نارد بۆ خزمەتی تا زانیاریی زیاتری بداتێ، ئەویش پیرەمێردێك بوو کە نەوەت ساڵی تێپەڕاندبوو و یاد و زاکیرەی تەواو نەبوو، وەك ریچ دەڵێت بە زەحمەت دەشیای وەڵامێکی راستەوخۆت لێ چنگکەوێت دەربارەی ئەو شتانەی کە لێت دەپرسین (ریچ : ٢٠٠٨، ص٢٨٤).

ئەویش ئەم زانیارییانەی بۆ زیادکرد، گوایە بابا سلێمان بچووکترینی دوانزە براکەیتی و ناوی باوکی میر سلێمان بووە و بۆیە بە بابا سلێمان ناسراوە، چونکە دوای مردنی باوکی لە دایك بووە و توانی هەموو وڵاتی پشدەر و بابان بگرێت دوای وەدەرخستنی تورك و ئێرانییەکان، پاشان تورك و ئێرانییەکان یەکیان گرت و ئەمیان لە کوردستانی خواروو وەدەرنا، ئەویش ناچار روویکردە رواندوز و لەوێ جێگیر بوو، پاشان ژن و منداڵەکانی بەجێهێشت و روویکردە ئەستانبوڵ، ئەمەش لە ساڵی ١١١١ك/ ١٦٩٩-١٧٠٠ز. بووە و لەوێ سەرنجی سوڵتانی راکێشا و کردیە وەزیر و پلەی پاشایەتی پێدا بە سێ نیشانە، هاوکات ژنان و خانمانی بنەماڵەی بابانیش، هەمان چیرۆکیان بۆ هاوژینەکەی ریچ گێڕابووەوە ( ریچ: ٢٠٠٨، ص٢٨١،٢٨٥ )، بابەکر ئاغای پشدەری (١٨٧٥-١٩٥٩) یش بۆ س. ج. ئیدمۆنز (١٨٨٩-١٩٧٩)ی گێڕاوەتەوە (إدمونز: ٢٠١٢، ص٣٠٦-٣٠٧).

### دەستکاریی بەسەرهاتەکە

دواتر لەو حیکایەتانەی لەبارەی بنەچەی بنەماڵەی بابانەوە دەماودەم هاتوون، زیاتر دەستکاریی ناوەڕۆکی بەسەرهاتەکە کراوە و تێکهەڵکێشی بەسەرهاتی (کاکەمیر و کاکەشێخ) کراوە کە چ پەیوەندییێکیان بەیەکدییەوە نییە و فەرەنگ و فەرەنگستان و کەیخانی فەرەنگی کراون بە رووس و رووسیا (محمد أمین زکی :١٩٥١، ص٥٩)، بەڵکو دەوڵەتی عوسمانیش کراوە بە دەوڵەتی ئێران (البابانی، سیرُ الاکراد:١٣٧٧ش، ص١٠٦-١١١، محەمەد فیدا:١٩٨٧، ل٨٦، هەروەها بڕوانە بڕگەی داهاتوو و پەراوێزەکەی)، پاساوی ئەم دەستکارییەش بە دروستی نازانرێت و

دوور نییە تەنها لەبەر نزیکی و هاوسنووریی رووسیا و شەڕ و ناکۆکیی بەردەوامی بوویێت لەگەڵ هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران.

سەبارەت بە شەڕ و پێکگەیشتنی فەقێ ئەحمەد و کەیخانیش، بە گوێرەی چەند دەستنووسێکی کوردی و فارسی کە کاتی خۆی لە مزگەوتی (گەورە)ی سلێمانی هەبوون و سەرچاوەیەکی دی، کە عەزیز یامولکی زادە لە گوتارێکی درێژیدا بە زمانی تورکی لە ژێر ناوونیشانی (کرد تاریخندن– بابان خاندانی) پشتی پێبەستوون و لە ژمارە (٩)ی گۆڤاری (ژین) کە لە رۆژی ٢٩–١–١٩١٩ دەرچووە و ژمارەکانی دواتر بڵاویکردۆتەوە، لە میانەی شەڕێکی نێوان ئێران و رووسدا بووە – سەدەی ٦ ک/١٢ ز – و فەقێ ئەحمەد ئازایەتیی خۆی سەلماندووە و کچە شازادەیەکی رووسی دیلکردووە و داوای لە بابی کردووە لێی مارە بکات و باوکیشی – یان ئێرانییەکان – دەستی بەسەردا هێناوە و گوتوویەتی: بابا بابا، لێرەوە بنەماڵەکەی بە بابان ناووبانگی دەرکرد (عبدالعزیز یامولکی: ١٩١٩، ل٢٤٩).

ئەمە لە کاتێکدا لەو دەمانە دەوڵەتێك بە ناوی ئێران یان بە ناوی رووسیا هەر بوونیان نەبوو، چ جای شەڕ لە نێوانیاندا بقەومێت.

لە لایەکی دیکەوە وا دەگێڕنەوە کە لە گەرمەی جەنگی یەکەمی جیهاندا، دەمێك رۆژهەڵاتناسی رووسی مینۆرسکی (١٨٧٧– ١٩٦٦) بەرپرسێك بووە لە کونسوڵخانەی رووسیا لە تەورێز، لە نامەیەکدا بۆ سەران و گەورە پیاوانی پشدەر، ئەوەیان بۆ ئاشکرا دەکات کە میرئاودەلی خوارزای رووسن و داوایان لێدەکات شەڕی رووس نەکەن، چونکە خاڵ و خوشکەزان، ئەم نامەناردنە لە زیاتر لە سەرچاوە و یاداشتێکدا پشتراست کراوەتەوە (موەفەق میراودەلی : ٢٠١٠، ل ٣٥–٣٦ )، بگرە دەنگۆی ئەوەش هەیە کە مینۆرسکی لە هاوینی ساڵی ١٩١٨و لە دیوەخانی میری پشدەردا، ئەم راستییەی بۆ حەوت لە نوێنەرانی میرانی پشدەر درکاندووە (محەمەد فیدا :١٩٨٧، ل٥٥–٥٦)، ئەمەو سەرباری دیدارێکی تر (موەفەق میراودەلی : ٢٠١٠، ل٣٥– ٣٦).

محەممەد فیدا (١٩٢٨–١٩٨٤) لە کتێبەکەیدا دەربارەی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە، بێ بەکارهێنانی سەرچاوە و ئاماژەکردن بۆ هیچ بەڵگە و دۆکیومێنتێك، بەدرێژی و چڕوپڕ لە فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە و شەڕی

لەگەڵ قرالّی رووسیای قەیصەری دەدوێت کە گوایە لە سەدەی حەڤدەهەم روویانداوە و دەڵێت کەیغان فەرەنگی نەبووە بەڵکو کچی قراڵی رووس بووە و بە ئارەزووی خۆی هاتووە بۆ شەڕ و مەیدانبازی و فەقێ ئەحمەد لە شەرێکی نێوان رووس و ئێران و لە ناوچەکانی سابلاغ و ورمێ دا ئەم کچە رووسەی بە دیل گرتووە و کابرای زاواشی نەکوشتووە بەڵکو پەلبەستی کردووە، رەنگە و واش پێدەچێت کە نووسەر رووداوەکانی پتر لەژێر رۆشنایی ئاخافتن و نامەکەی لەمەڕ مینۆرسکی دارشتبێت، بە بەڵگەی ئەوەی بەخۆی لە دیدارەکەی نێوان مینۆرسکی و نوێنەرانی پشدەر دواوە (محەمەد فیدا :١٩٨٧،٥٥-٥٦، ٨٦).

کەچی لە کۆنترین دەقدا کە ریچ گێڕاویەتەوە، باسوخواسی شەڕی رووس و کچە رووسی لەکن خودی پاشای بابان و مەزنانی میرئاودەلییان لە گۆڕێدا نییە، بەڵکو شەڕ لەگەڵ فەرەنگە و دیارە کەیخانیش فەرەنگییە، لای حوسێن نازم بەگیش شەڕی لەمەڕ فەقێ ئەحمەد لەگەڵ دەوڵەتێکی نەناسراوە (دولـة مجهولـة) و دواتر - وەك وەرگێڕەرانی کتێبەکەی بۆ زمانی عەرەبی لە پەراوێزا ئاماژەیان پێداوە- نووسەرێکی دی لە پەراوێزدا کردوویە بە حکومەتی رووس (حسین ناظم بیك:٢٠٠١، ص٥٧)، رەمزی قەزازیش داستانەکەی بەشێوەی شانۆگەری نووسیوە و رووداوەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ سەدەی شازدەهەم و فەقێ ئەحمەد لە سوپای عوسمانیدا دەجەنگێ وکەیخانیش کچە فەرەنگە نەك رووس (رەمزی قەزاز: ١٩٦٨،ل ١١).

### ناسنامەی فەقێ ئەحمەد

جێگەی سەرنجە، ئەوەی بابەتەکەی پتر ئاڵۆز کردووە ئەوەیە کە وەك روونە، بێئەندازە زیادەڕۆیی لە دارشتن و گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە کراوە و خەیاڵ فراوانیی بەیتبێژان و حیکاتخوانەکان فەقێ ئەحمەدیان وەك پاڵەوانێکی ئەفسانەیی پیشانداوە و وای لێکراوە-بەگوتەی محەمەد ئەمین زەکی- دەڵێی ئەفسانەی ئەفسانەکانە (زکی:١٩٥١، ص٦٠).

من بەخۆم دڵنیام لەوەی نە فەقێ ئەحمەد کەسێکی خەیاڵییە و نە سەربوردەشی لە بنەڕەتدا بەم شێوەیە بووە، بەڵکو داستانەکە لە سەر بنەمای رووداوێکی ئاسایی بنیادنراوە کە ئەمە کرۆکەکەیەتی: رۆڵە کوردێکی موجاهید لە

گەرمەی شەڕ و تێکچڕژاندا لەگەڵ فەرەنگە گاورەکانـدا، هەرچـۆنێك بێـت کچـێکی فـەرەنگی ناسـیوە و خواسـتوویەتی و منـداڵیان بـووە و هـەر لـە وڵاتـی گـاوران ماوەتەوە، دواتر تووشی کێشە و ئاریشـە بـووە و ناچـار گەڕاوەتـەوە کوردسـتان، پاشتر ئـەم بەسـەرهاتە مێژووییـە بـە تێپـەڕبوونی سـاڵان و سـەردەمان گـۆڕانی بەسەردا هاتووە و مەودای رووداوەکانی مەزن و فراوان کـراوە و ئاوێتـەی کـرداری خــەیاڵی و پـــەرجوو و هەڵســوکەتی خــارق و نامــەنتقی کــراوە و بەســەر فــەقێ ئەحمەددا سەپێندراوە، بە ئاخـافتنێکی دی بەسـەرهاتی تراجیدییانـەی بابـایێکی کورد بە زیادەڕۆییەوە بەگەڕخراوە و تێکهەڵکێشـی ئەفسـانە کـراوە و بـە بـاڵای فـەقێ ئەحمـەددا بـڕدراوە، واتـا لـە حەقیقـەتێکی مێـژوویی دێرینـەوە کـراوە بـە رەگــەزێکی ئــەدەبیی رووت، وەلێ خۆشــبەختانە نــاوی پاڵەوانەکــەی و هێڵــە گشتییەکانی پارێزراوە.

تەنانــەت بەیتبێــژ و حیکایەتخوانــەکان، لــە بەســەرهاتی دییــەوە وێنــەی هەڵسوکەوت و پاڵەوانێتییان بۆ خواستووە، بۆ نموونـە چـوونی فـەقێ ئەحمـەدی دارەشمانە بۆ وڵاتی فەرەنگستان و ئامادەبوونی لە هۆڵی زەماوەندی کـەیخان ... تــا کوشــتنی زاوا و رفانــدنی کــەیخان، هاوشــێوەی لــە ئەفســانەی ئەڤینــداریی (زاریادریس و ئۆداتیس) هەیە کە لە سەردەمانی بەر لە زایینـەوە لـە کوردسـتانی کۆندا بڵاو بووبۆوە ، ئۆداتیس کچی شاه مارتیس زاریادریس لە خەوندا دەبینێت و شـەیدای دەبێـت، ئـەم ئەفسـانەیە لەلایـەن چـارلس دیمـاترلین بڵاوکراوەتـەوە و دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی میدیای سەدەی پێنجەمی پێش زایین، لێکچوونەکە هەنـدە نزیکـە تـا ئاسـتی وەرگـرتن، لـەم ئەفسـانەیەدا هـاتووە کـە دوو بـرا هـەبوون: هیستاسبین کە بـرا گـەورە بـوو و زاریـادریس، گوایـا ئەمانـە کـوڕی ئـەفرۆدیت و ئەدۆنیس بوون، هیستاسبین فەرمانڕەوای وڵاتـی میـدیا و ناوچـەکانی دەوروبـەری بوو، زاریادریسیش فەرمانڕەوای ئەو هەرێمـە بـوو کـە دەکەوتـە سـەرووی دەریـای قەزوینەوە و تا رووباری تانـاییس و شـاهی ئـەو دەڤەرانـەی دەکەوتـە پشـت ئـەم رووبارەوە ناوی مارتیس بوو و کچێکی نازداری هەبوو کە جوانترین کچی ئاسیا بوو بەناوی ئۆداتیس و دەڵێن جارێکیان ئـەم کچـە لـە خەویـدا زاریـادریس لـە خەونـدا دەبینێت و شەیدای دەبێت، زاریادریسیش کـە کـوڕێکی پۆشـتەو پـەرداخ بـوو لای

خۆیەوە هەمان شتی بەسەردێت و لە خەونیدا شەیدای ئۆداتیس دەبێت...لە ئاهەنگی گواستنەوەیدا، ئۆداتیسی دڵشکاو و غەمبار هەر چاوەڕوانی زاریادریسی خۆشەویستی دەکرد، تا لەپڕێکدا دەرکەوت و دەستی گرت و رفاندی (بۆ درێژیی داستانەکە بڕوانە: بدرخان سندي : ١٩٨٥، ص١١-١٣).

هەروەها وا پێدەچێت کە بڕیاردانی فەقێ ئەحمەد لەسەر سەرپشککردنی ئەسپەکەی و لەنگەرگرتنی لە ماڵە پیرێژنێك، لەو هەواڵەوە وەرگیراوە کە باس لەوە دەکات کاتێك پێغەمبەر (ص) گەیشتە شاری مەدینە، هوشترەکەی سەرپشك کرد لە کوێ رابوەستێت و فەرمووی (إنها مأمورة).

ئێمە دڵنیاین لەوەی کە فەقێ ئەحمەد کەسایەتییەکی راستەقینەیە و وەك میرێکی ئاسایی حەقیقەتی هەیە و لە گوندی دارەشمانەی پشدەرایەتیەوە سەری هەڵداوە و باپیرە هەرەگەورەی ماڵباتی بابانە، هەرچەند وەك میرێکی پایەدار لە هیچ سەرچاوە و بەڵگەنامەیەکی فەرمیدا ناوی نەبراوە و بە وردی ساخ نەبووەتەوە لە چ سەردەمێك میرایەتی کردووە (بگەڕێوە بۆ سەعدی عوسمان: ٢٠٠٩، ل٩٩-١٠٨).

بە هەرحاڵ، گومانێکی وا لەوە نییە کە ئەحمەدی دارەشمانە بە هەرزەکاری شاگرد و قوتابیی قوتابخانە ئایینییەکان بووە کە لە زۆربەی ئاوەدانییەکانی شارەزوور و وڵاتی بابان کرابوونەوە، بۆیە بە فەقێ ئەحمەد ناوبانگی دەرکردووە و ئەم تەرزە قوتابیانەش شەڕی جیهادیان بە ئەرك و فرمانی پیرۆزی سەرشانی خۆیان دەزانی و پشکدارییان تێدا دەکرد (البدليسي: ٢٠٠١، ص٤٧٨)، دوور نییە فەقێ ئەحمەدیش ئەم ئەرکەی راپەڕاندبێت، نووسەرێك دەڵێت:" لەساڵی ١٦٦٣ ز. بەشداریی شاڵاوەکانی سوڵتان محەمەدی چوارەمی عوسمانی (١٦٤٨-١٦٧٨) کردووە بۆ سەر نەمسا و ئیتالیا" (عبد ربه سكران: ٢٠١٢، ص ٨٤)، سەرچاوەی ئەم زانیارییەشی مێژووی جەودەتە (تأريخ جودت پاشا)، کەچی لەو کتێبە هەرگیز ناوی فەقێ ئەحمەد نەبراوە.

بەڵام رۆژگاری فەقێ ئەحمەد وەك پاڵەوانی داستانەکە، تەواو لێڵ و ئاڵۆزە و یەکلا نەبۆتەوە (محمد أمين زكي، ١٩٥١، ص ٥٢-٥٤، موەفەق میرادەلی : ٢٠١٠،ل ٢٢-٢٣)، لە هەواڵە میللییەکانی پشدەردا، کوڕی کاکەشێخی کوڕی پیر بوداقە کە بە

دەستی کاکەمیری برای– یان ئامۆزای– دەکوژرێت، یان بەپێچەوانەوە ئەوەش هەیە کە کوڕی کاکەمیرە و کاکەشێخ بکوژەکەیە (البابـاني :١٣٧٧ش، ص ٨١، پێشەکیی وەرگێڕاوی کوردیی بە ناونیشانی رەوشی کوردان، کەریمی حیسامی: ١٩٩١) و دایکی فەقێ ئەحمەدیش هەڵدێت بۆ گوندی خدران و ئەم رووداوانە گەڕێنراونەتەوە بۆ سەدەی حەڤدەهەم (حسين ناظم بيك: ٢٠٠١، ص ٥٥–٥٦).

لە شەرەفنامەدا، حاجی شێخی کوڕی پیر بوداق بە فرمانی شا تەهماسپی صەفەوی لە دەوروبەری ساڵی ١٥٦٦ز. دەکوژرێت (البدليسي :٢٠٠١، ص٤٨٠)، ئەم حاجی شێخە لەو بەگانە بوو کە لە ژێر سایەی بێگە بەگی ئەردەڵاندا پێگەیشتووە و ولایەتی بابانی رادەستکراوە و بووە بە میرێکی پایەدار و هەڕەشە بۆ سەر قەڵەمڕەوی صەفەوی (مأمون بيك: ١٩٨٠، ص ٣٣–٣٤).

پیر بوداقیش کوڕی حاجی شێخی یەکەمە، حاجی شێخی یەکەمیش میری مەرگە و پشدەر بوو و خۆیی و ئەمیری برای کە وا دیارە ستەمکاربوونە و خەڵکیان چەوساندۆتەوە، بۆیە لە ساڵی٩٤١ ك/ ١٥٣٤ ز. لەلایەن خەڵکی مەرگەوە دەکوژرێن (البدليسي: ٢٠٠١، ص٤٧٧–٤٧٨)، بابەکر ئاغاش ئەم زانیارییەی بۆ ئیدمۆنز دووپاتکردۆتەوە (إدمونز: ٢٠١٢، ص٣٠٧)، ئەم کارەساتە دواتر بووەتە هەوێنی بەیتێکی فۆلکلۆریی ناوچەکانی مەرگە و پشدەر و موکریان و بە بەیتی (کاکەمیر و کاکەشێخ) ناودەبرێت و ئۆسکارمان (١٨٦٧–١٩١٧) بڵاوی کردووەتەوە، بەپێی بەیتەکە حاجی شێخ یان کاکەشێخ و ئەمیر– کاکەمیر دەستدرێژی و ستەمیان لە گوندنشین و جووتیارانی مەرگە دەکرد، بۆیە جەماوەری گوند بە ڕێبەرایەتی حەیدەر گۆران– گۆران لێرە بە واتای گوندنشین، جووتیار، مسکێن دێت – لە دژیان راپەڕیون و هەردووکیان کوشتوون (ئۆسکارمان: ١٩٧٥، ل ٦٨٥–٦٨٩)، هێمنی شاعیر و مەلا شوکر مستەفاش پێیانوایە بەیتەکە لەسەر ئەم رووداوە هەڵچنراوە ( ئۆسکارمان : ١٩٧٥، ل ١٣٨، مأمون بيك: ١٩٨٠، ص٣٤، هامش (٨٩)).

ئەگەر وا دابنێین کە فەقێ ئەحمەد کوڕی کاکەشێخە وەك لە بەیتە فۆلکلۆرییەکان و هەندێك سەرچاوە هاتووە، ئەوا دەبێت لە سەدەی شازدەهەم ژیابێت و میرایەتی کردبێت، لێرە ئەوە ڕووندەبێتەوە کە لە بەیتە فۆلکلۆرییەکە

حاجی شێخی یەکەم  بە هەڵە کراوە بە حاجی شێخی دووەم، ڕووداوەکەش لە سەدەی شازدەهەم بووە نەك لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەم .

لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا کە لە ڕۆژی (٨)ی جمادی دووەمی ساڵی ٩٨٧ ك/١٢-٨-١٥٧٩ ئاڕاستەی  میری میرانی شارەزوور کراوە، فرمانی پێکراوە کە بوداقی کوڕی ئەحمەدی کوڕی شێخ حەیدەری موکری بکرێت بە والیی ولایەتی هەولێر، دوور نییە پەیوەندییێك هەبێت لە نێوان (ئەحمەدی کوڕی شێخ حەیدەری موکری) و (فەقێ ئەحمەدی کوڕی حاجی شێخ) (عماد عبدالسلام رؤوف :٢٠١١، ص ١١٤-١١٥).

**- لە نێوان فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە و میر ئەحمەدی مەڕوانی دا:**

لێرە پرسیار ئەوەیە ئەرێ ئەم داستانەی وا فەقێ ئەحمەد بووەتە پاڵەوانی، تەنها ئەفسانەیەکی هەڵبەستراوە و زادەی خەیاڵی پشدەرییەکانە یان لەسەر بنەمای ڕووداوێکی ڕاستەقینە هەڵچنراوە؟ بۆچی فەقێ ئەحمەد وای لێکراوە و بە ئەفسانە دەورەدراوە و کراوەتە شۆڕەسوارێکی جەربەزە و دژی دوژمنانی ئیسلام و سوڵتانی عوسمانی دەجەنگێ؟ و بووە بە ئەڤینداریکی دڵسۆز و بەئەمەك و لەپێناو دڵبەرەکەی گیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە؟، تۆفیق وەهبی (١٨٩٠-١٩٨٤) سەرنجی ئەم  لایەنەی داوە و دەڵێت:" گشت نەتەوەیەك ئەم چەشنە لاوچاك و جوامێرانەیان هەیە و پێیانەوە دەنازن و لەبیریان دەرناکەن... بەڵام پێویستە خاتری زانستیش بگرم" (تۆفیق وەهبی: ١٩٤٤، ل٣-٦).

سەبارەت بە بنەچەی ئەم داستانە، ریچ دەڵێت : "ئەم چیرۆکە فرە گیانی پاڵەوانێتی و سوارچاکی لەخۆ دەگرێت کە هێشتا ڕۆژهەڵاتییەکان لەسەری ڕانەهاتوون و خودی ڕووداوەکەش هەتا بڵێی دوورە  لە شێوازی خەیاڵدانیانەوە، دیارە ئەم چیرۆکە لەسەر ڕووداوێکی واقیعی بنیادنراوە، ڕەنگە ڕووداوەکەش لە سەردەمێکی گەلێك کۆنتر ڕوویدابێت لەوەی کە حیکایەتخوان دیاریی دەکرد، شتێکی باڵکێش و جێگای سەرسوڕمان دەبێت ئەگەر بتوانرێت سەرەداوی پەیوەندیی نێوان ئەم چیرۆکە و چیرۆکە پاڵەوانێتی و شاسوارییەکانی سەردەمی خاچهەڵگرەکان، یان سەردەمی سوڵتان صەلاحەدینی ئەیوبی کە میرێکی کورد بوو، بدۆزرێتەوە "(ریچ: ٢٠٠٨، ص ٢٨١).

ئێمە ئەگەر ئەو قەناعەتەمان لەلا دروست و چەسپاو بێت کە سەربوردەی فەقێ ئەحمەدی و کیگان راستییەکی مێژوویی بۆ هەیە و دواتر بە بووریني ساڵ و زەمان گۆڕانی جەوهەریی بەسەر ناوەڕۆکەکەی هاتبێت و تێکهەڵکێشی رووداوی دی کرابێت و چووبێتە قالبی داستانە ئەفسانەییەکانەوە، دەبێت ببینە وێڵی دوای دۆزینەوەی سەرەداوێك و بکەوینە گەڕان و سۆراخکردن لە سەرچاوە مێژووییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، بەتایبەت ئەوانەی لە شەڕی خاچهەڵگرەکان دەدوێن، چونکە ئێمەیش هاوڕای (کلۆدیوس جیمس ریچ)ین و دەڵێین، ئەو دەمانە سەردەمی سوارچاکی و رمبازی و زۆرانبازی بوو، رۆژی رووبەڕووبوونەوەی دەستەویەخەیی بوو لە نێوان شاسوار و جەنگاوەرە چاونەترس و جەربەزەکان، سەردەمی سەلماندنی دڵسۆزی و گیانفیدایی و نواندنی کەڵەمێردی و لاوچاکی و پاڵەوانێتی بوو لە دژی دوژمنی دین و دنیای مرۆڤی موسڵمان، هاوکات دەمی تێکەڵبوون و هاتنەکایەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیش بوو، دیارە پاشتر ژمارەیەك لەم شەڕوشۆڕ و تێکچڕژان و پەیوەندییانە بوونە هەوێنی چەند داستانێکی پاڵەوانێتی و چیرۆکی ئەفسانەیی، لەم رووەوە فردریچ ڤۆن دیرلاین (١٨٧٣– ١٩٦٦) دەڵێت حەکایەتی خوراف لە سەردەمی شەڕی خاچهەڵگرەکاندا برەوی سەند و گەیشتە ئەوپەڕی گەشەکردن (ڤۆن دیرلاین: ١٩٧٣، ص١٩).

کەچی شەڕەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ دەوڵەتە ئەوروپییەکاندا، پتر شەڕی بەرەیی و گەورە بوون و سوپای نیزامیی پڕچەك، بە بەرنامە و پلان دەیکرد و جۆرەها تۆپ و چەکی پێشکەوتوو و کەشتیی جەنگیی تیایدا بەکاردەهێنرا و باوی شەڕی کلاسیکیی سەدەکانی ناڤین نەمابوو.

سەبارەت بە ناسنامەی کەیخان– کیگانیش، روون نییە و نازانرێت ئەم خانمە مەسیحییە لە چ رەگەزێکی ئەوروپی بووە، بەڵام ئەوە دەزانین کە ناوی هەرگیز لە ناوی ژنانی رووس ناچێت، دەکرێت ئەمەش بە بەڵگە دابنرێت بۆ سەلماندنی ئەوەی کە نەژادی کەیخان و بنەچەی یەکەمی داستانەکە پەیوەندیی بە رووس و شەڕەکانی رووسیا و ئێرانەوە نییە، بەڵام لە داستانەکە بە فەرەنگی دانراوە و لای حەکایەتخوێنەکەی پشدەریش فەرەنگ واتا ئینگلیز، وەلێ مەبەست لە فەرەنگ وەك روونە جگە لە ئینگلیز، ئەو نەتەوە ئەوروپییانەیە کە بەشداری شەڕی خاچهەڵگران (الحروب الصليبية)یان کرد.

لەلایەکی دیەوە ئەو پیرەمێردە پشدەرییەی کە حیکایەتەکەی بۆ ریچ گێڕایەوە، تەمەنی لە سەرووی نەوەتەوە بوو واتا بەر لە ساڵی ١٧٣٠ لەدایکبووە، ئەگەر رووداوەکە لە سەدەی حەڤدەهەم روویبدایە، ئەوا ئەوەندە لێیەوە دوور نەبوو و مێژووەکەی بەوردی لەیاد دەما .

هەروەها چ لە ناوەڕۆکی داستانەکە و چ لە سەرچاوەکاندا، تێکەڵی و پێکەڵی و دەنگوباس و زانیاریی لێکجیا و ناکۆك دەربارەی ناسنامەی فەقێ ئەحمەدی پاڵەوان و سەردەمەکەی خراونەتەڕوو، بەڵکو لە هەندێك گێڕانەوەدا، بابا سلێمانی باپیرە گەورەی میرانی بابان پاڵەوانەکەیە (ریچ: ٢٠٠٨، ص٢٨١)، ئەمەش دەشێت بەڵگەیەکی دی بێت لەسەر ئەوەی کە گەڕاندنەوەی بۆ سەردەمێکی ئەوەندە نزیك – سەدەکانی ١٦–١٧ز. بنەمایەکی پتەوی نییە.

بەپێی دەستنووسەکانی مزگەوتی سلێمانیش، فەقێ ئەحمەد کوڕی میر محەمەد ناوێکە و چەند سەدەیەك پێش سەردەمی عوسمانی دەکەوێت و لە کۆتایی سەدەی شەشەمی کۆچی/دوازدەهەمی زایینی دەرکەوتووە و بە دوو هەزار سوارەوە لە ئەردەڵانی ئەودیوەوە دەربازی دەڤەری بتوێن بووە و پاشان دەستی بەسەرداگرتووە و خێڵ و تیرەکانی ئەو ناوچانەشی خستووەتە ژێر رکێفی خۆیەوە و دارەشمانەی کردووەتە بنکە و بارەگای خۆی (عبدالعزیز یاملکی: ١٩١٩، ل٢٤٩).

ئەوەی راستی بێت لە مێژووی سەدەکانی ناڤیندا بەسەرهاتێك هەیە تا رادەیەك هاوشێوەی ئەم بەسەرهاتەیە و پاڵەوانەکەشی هەر میرێکی کوردە بە ناوی ئەحمەد، رەنگە بناغەی یەکەم و رەگی قووڵ و درێژی بێت، بەڵام بە بووریني رۆژگار وەچە دوای وەچە لێی زیادکردووە و تێکەڵ بە بەسەرهاتی کاکەمیر و کاکەشێخی سەدەی شازدەهەم کراوە، ئێمە لێرە دەکرێت بەراوردی بکەین لە نێوان میر ئەحمەدی سەدەکانی ٥–٦ ك/١١–١٢ز. و فەقێ ئەحمەدی پاڵەوانی داستانەکەی لەمەڕ بابان .

ئەحمەدی کوڕی مەروان، ناوی تەواوی وەك لە سەرچاوەکاندا هاتووە: ئەحمەدی کوڕی میر نظام الدین مەنصور (٤٧٢–٤٧٨ ك/١٠٧٩–١٠٨٥ز)ی کوڕی میر نەصر (٤٥٣–٤٧٢ ك/١٠٦١–١٠٧٩ز)ی کوڕی میری مەزن و ناودار نصر الدولـة ئەحمەدی کوڕی مەروان (٤٠١–٤٥٣ك/ ١٠١٠–١٠٦١ز)ی کوڕی کەکی چواربوختیە، لە میرانی دەوڵەتی دۆستەکی مەروانی.

لـە سـاڵی ٤٧٨ ک/١٠٨٥ز. تورکـە سـەلجووقییەکان میرنشـینی مـەروانییان لەناوبرد، ئەو دەمە ئەحمەدی کوڕە بچووکی میر مەنصور هێشـتا هـەرزەکار بـوو، کـە هـەراش بـوو لـە شـێوەی زۆربـەی میرزادەکـانی کـورد، چـووە ریـزی سـوپای سـەلجووقییەوە، نەخاسـمـە دوای ئـەوەی بـە ماوەیـەکی کـەم پـاش لەناوچـوونی میرنشینە کوردییەکان، هێرشی خاچهەڵگرەکان بۆ سەر وڵاتی شام دەسـتیپێکرد و میللـەتانی موسـڵمان خۆیـان ئامـادە و سـازکرد بـۆ شـەڕی پـیرۆزی جیهـاد و بەرەنگاربوونەوە و بەرپەرچدانەوەی شاڵاوی فەڕەنجە خاچهەڵگرەکان .

ئەحمـەدی کـوڕی مـەروان بـووە فەرماندەیـەکی سـەربازی لـە سـوپای سەرکردەی تـورکی (کـەربووقا) و بەرپرسـی قـەڵای ئـەنتاکیا لـە لێـواری کـەناری دەریای سپی، ئەوەبوو فەڕەنجە خاچهەڵگرەکان لە رۆژێکی سـاڵی ٤٩١ ک /١٠٩٨ز دا، لە پڕێکدا پەلامار و گەمارۆی قەڵاکەیان دا و لەشکری موسڵمان خراپ تێکشکا و زیـانی گیـانی و مـاڵیی بەرکـەوت، ئەحمـەدی کـوڕی مـەروانیش پـاش ماوەیـەك بەرگری، لە سەر خواسـتی خاچـهەڵگرەکان کـە بەنامـە پـەیمانیان پێـدابوو گیـانی بپـارێزن، خـۆی رادەسـتکردن، ئـەوانیش پێشـوازییان لێکـرد و خانوویـەکیان بـۆ نیشتەجێبوونی تەرخانکرد و ئەو جەنگاوەرانەی لەگەڵیدا بـوون، ئازادیـان کـردن و گەڕاندنیانەوە بۆ حەڵەب (ابن العدیم: ١٩٩٦، ص ٢٤٠-٢٤١) .

مێژوونووسێکی فەڕەنجی کـە بـەخۆی لـە دوورپێچـکردن و گـرتنی ئـەنتاکیا پشـکداربووە، ئـەویش لای خۆیـەوە باسـی ئـەم بەسـەرهاتەی کـردووە و دەڵێـت بۆهیمەندی فەڕەنجی بە هەموو داواکارییەکانی ئەحمەدی کـوڕی مـەروان رازیبـوو، ئەویش خۆی و هێزەکەی لە قەڵا هاتنـە خـوارەوە و خۆیانـدا بەدەسـتەوە و پـاش ماوەیەك ئەحمەدی کوڕی مەروان و هەڤاڵانی ئیمانیان هێنا و بوون بە مەسیحی، ئەم رووداوەش لە رۆژی (٢٨)ی تەموزی ساڵی ١٠٩٨ز. بووە (مؤلـف مجهـول :١٩٥٨، ص ٩٥-٩٦).

دەبێـت خواسـت و داواکـاریی ئەحمـەدی مـەروانی چـی بووبێـت؟، تـۆ بڵێـی خواستنی کـەیخان نـەبووبێت، دەبێـت پەیوەنـدیی خۆشەویسـتی لـە نێـوان کـوڕە موسڵمانێك و کچە فەڕەنگیێك نەهاتبێتە ئاراوە؟ ئەگەر گڕی خۆشەویسـتی نـەبێت چ پاڵنەرێکی دیـی هەنـدە بـەهێز و کایگـەر هەیـە وا لـە کـوڕە موجاهیـدێك بکـات

دەستبەرداری جیهاد و ئایینی خۆی ببێت و بچێتە سەر ئایینی دوژمنانی دین و دنیای؟ ئایە دەشێت کچێکی فەڕەنگی بدرێت بە دیلێکی موسڵمان ؟ خاوەندی کتێبی ناوبراو باسی ئەم بابەتەی کردووە بۆ ئەوەی هۆکارەکەی دەستنیشان بکات.

مێژوونووس فارقی (م: ٥٧٧ك/١١٨١ز) شارەزا لە مێژووی دەوڵەتی مەروانی، زانیاریی وردتر بەدەستەوە دەدات و دەڵێت ئەحمەدی بچووکترین کوڕی میر مەنصور، لەلایەن فەڕەنجەکانەوە بە دیل گیرا و ماوەیەك لەکن خۆیان گلیاندایەوە و لەو ماوەیدا ژنێکی لێ خواستن و لەم ژنە فەڕەنجیەی کوڕێکی بوو ناوینا محەممەد، دواتر ژن و کوڕەکەی بەجێهێشت و گەڕایەوە نیشتیمان و لەلایەن بنەماڵەی ئەرتوقیەوە پلەوپایەی لەشکریی پێبەخشرایەوە، پاشان توانی دەسەڵاتی قەڵای هەتاخ بگرێتەوە دەست کە موڵکی باب و باپیرانی بوو (الفارقي: ١٩٧٤، ص ٢٥٢-٢٥٣).

بەدوور نازانرێت ئەحمەدی کوڕی مەروان کە سوارچاکێکی دلێر و جەنگاوەرێکی چاونەترس بوو و بە قسەی فارقی" كان شهما من الرجال وفارس الخيل"، لەگەڵ کەیخان یان هەر کچە فەڕەنگییەکی دی کەوتبێتە رمبازی و شیربازییەوە و دواتر خواستبێتی .

جێگەی خۆیەتی ئەوەش بێژین کە ژنانی فەڕەنگی درێغییان ناکرد لە پشکداریی چالاك و کاریگەر لە جەنگ و رووبەڕووبوونەوەکان لەگەڵ سوپای موسڵماناندا و بە هەموو شێوازێك شانبەشانی پیاوان دەجەنگان، لەمبارەیەوە مێژوونووسانی وەك (أسامة بن منقذ) و(العماد الأصفهاني) و( ابن الأثير)...هتد، چەند جارێك ئاماژەیان بە جەنگانی ژنانی فەڕەنگی داوە، (العماد الأصفهاني) دەڵێت: " وفي الفرنج نساء فوارس، لهن دروع وقوانس، وكن في زي الرجال، ويبرزن في حومة القتال، ويعملن عمل أرباب الحجا، وهن ربات الحجال، لهن بالفرسان أسوة، وفيهن مع لينهن قسوة، وليس لهن سوى السوابغ كسوة" (العماد الأصفهاني: ٢٠٠٤، ص١١٥-١١٦).

بەڵام وا دیارە میر ئەحمەد، لە وڵاتی غەریبیدا دووچاری ئاریشە و ئاستەنگ و شەڕوشۆڕ بووە و ناچارکراوە دەستبەرداری ژن و منداڵەکەی و مەسیحییەت

ببێت و بە سەڵتی بگەڕێتەوە کوردستان، ئەم رەوشە ئاڵۆزەشی لەلای بووەتە پاڵنەرێك بۆ دانانی چەند مەقامێك، فارقی دەڵێت ئەحمەدی مەروانی چەند مەقامێکی بەناوبانگی (مقامات معروفة) هەیە (الفارقي: ١٩٧٤، ص٢٥٢).

دیارە ئەم مەقاماتە کە ناوەڕۆکیان پاڵەوانێتی و سوارچاکی بووە و هەڵگری مۆرکی جیهاد و سەرەڕۆیی رۆڵەیەکی سەرکێشی کورد بووە، هەندە بەچێژ و کاریگەر بوونە بۆ ئەو رۆژگارە، پاساوی مانەوە و لەیادنەکردنیان لەگەڵ خۆ هەڵگرتووە و بۆ سەدان ساڵ دەماودەم باسکراون و گێڕدراونەتەوە و لە کوردستاندا دەنگیان داوەتەوە.

لە بەشێکی دیکەی داستانی فەقێ ئەحمەددا کە عەبدولقادری کوڕی رۆستەمی بابانی ساڵی ١٨٧١ گێڕاویەتەوە، ئەنگوستیلە دەکرێتە بەڵگە و نیشانەی یەکدی ناسینەوەی فەقێ ئەحمەد و کەیخان (البابانی:١٣٧٧ش، ص١٠٨)، لێرە گومانێکی وا نامێنێتەوە کە ناوەڕۆکی بنج کەموزیادی داستانەکە هەر بەسەرهاتی میر ئەحمەدی کوڕی مەروانە، ئەوەتا بە هەمان شێوە ئەم و هاوژینە فەرەنگییەکەی نیشانەیەکیان کردبووە رازی نێوانیان، ئەوەبوو ماوەیەك دوای گەڕانەوەی، محەممەدی کوڕیشی دایك و خاڵوانی بەجێهێشت و گەڕایەوە و نیشانەیەکی لەکن دایکیەوە لەگەڵ خۆی هێنابوو، کە گەورە بوو و پێگەیشت ئەم نیشانەیەی دایە باوکی تا بیناسێتەوە و دڵنیابێت کوڕی ئەوە و لەوێ ماوەتەوە، ئەویش بڕوای پێکرد و لای خۆی هێشتیەوە و ژنی بۆ هێنا و دوو منداڵیان بوو بە ناوەکانی ئیبراهیم و حەسەن – لێرەش وەك فەقێ ئەحمەد دوو کوڕی لە ژنە فەرنگێکە هەبووە–، پاشان نێوانی ئەحمەدی کوڕی مەروان و محەممەدی کوڕی تێکچوو و محەممەدیش لەناکاوێکدا سەرنگون بوو و کەس نەیزانی رووی کردە کوێ و چی بەسەرهات ( الفارقي :١٩٧٤، ص ٢٥٢–٢٥٣)، کەچی لە دەستنووسەکانی مزگەوتی سلێمانیدا ناوەکان پاش و پێشن و فەقێ ئەحمەد کوڕی میر محەمەدە.

سەرەڕای ئەم لێکچوونانە، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژووی دەوڵەتی دۆستەکی– مەروانی، دەبینین میرانی مەروانی پاش لەدەستدانی دەسەڵاتیان، پەرتەوازە بوون و بڵاوبوونەوە و دیارە بەشێکیان ئاوارە و پەراگەندەی شارەزوور بوونە، ئەوەتا شەرەفخانی بەدلیسی دەڵێت بابا ئەردەڵانی باپیرە گەورەی میرانی

ئـەردەڵان لـە نـەوەی مـیر ئەحمـەدی کـوڕی مەروانـە (البدليسـي: ٢٠٠١، ص٢١١)، هەروەها چـۆن فـەقێ ئەحمـەدی نێـو داسـتانەکە لـە داخـی فشـار و زەبروزەنگـی عەشـیرەتی بلّبـاس مەرگـەی بەجێهێشـت و سـەری خـۆی هـەڵگرت و رووی کـردە ئەستانبوڵ و پشکداریی شەڕی پیرۆزی جیهادی کرد، ئاوەهاش ئەحمەدی مەروانی پاش هاتنی تورکـە سـەلجووقییەکان و داگیرکردنـی مەملەکـەتی بـاب و بـاپیرانی، رووی کردە کەنارەکانی شـام و لـە شـەڕی پـیرۆزی جیهـاددا رۆڵـی گێـڕا، ئـەوەش بلّێین کە ئەحمەدی مەروانی جگە لە محەمەد، کوڕی دیشـی هـەبوون و یـەکێکیان نــاوی عیســایە (الفــارقي: ١٩٧٤، ص ٢٥٢-٢٥٤) و بــە گــوێرەی دەستنووســەکانی مزگـەوتی سـلێمانیش پـاش فـەقێ ئەحمـەد عیسـای کـوڕی شـوێنی گرتووەتـەوە (عبدالعزيز ياملكي: ١٩١٩،ل٢٤٩).

جگە لەمانە، عەبدوڵا ئەحمەد پشدەری لە بیرەوەرییەکانیـدا وای بۆدەچێت کە بنەڕەتی میراودەلیەکان دەگەڕێتەوە بۆ جەزیرەی بۆتان (عەبدوڵا ئەحمد رەسـوڵ: ١٩٩٢، ل١١، موەفەق میراودەلی : ٢٠١٠، ل ٣٠-٣١)، باوەڕ ناکرێت لەخۆیەوە و بێ بنەما ئەم بۆچـوونەی لـەلا گەڵاڵـە بووبێـت و رەنگـە لـە بـاب و باپیرانیـەوە گوێبیسـتی بووبێـت، ئـاودەل- ئەبـدال-عەبـدال یـش کـە نـاوی بـاپیرە هـەرە گـەورەی میراودەلییەکان و بەرەبابی بابانە، لە کوردستانی خواروو دەگمەنە و ناوێکە زیـاتر لە جەزیرەی بۆتان و کوردستانی سەروو باوە و لە شەرەفنامەدا، عەبدال-ئەبدال ناوی پتر لە دە میر و بەگی کوردە و هەموویان لە کوردسـتانی بـاکورن (البدليسـي: ٢٠٠١، فهرست الأعلام، ص٧١٣) و تەنها لە سەدەی حەڤدەدا چەند میرێکی عەبداڵ ناو هەن وەك عەبداڵخانی میری بەدلیس و عەبداڵخانی میری جـەزیرەی و عەبـداڵخانی هەکاری...هتد، ئەمەش دەکرێت بۆ پشتگیریکردنی بۆچـوونەکەی عەبـدوڵا ئەحمـد رەسوڵ کەڵکی لێوەربگیرێت.

پێویستە ئەوەش بێژین کە دیارە هۆز یان بنەماڵەی میرئـاودەلی بـە نـاوی میر ئەبدالی باپیرە گەورەیانەوە ناوزەدکراون، کە رەنگە هەر ئەو میرە بێت کـە لـە شــەرەفنامەدا هــاتووە و بــاوکی مــیر بوداقــە، بــە وردبوونــەوە لــە ئاخــافتنی شەرەفخانی بەدلیسی مەزندە دەکرێت کە بەر لـە سـەدەی شـازدەهەم ژیابێـت تـا ئـەو رادەیـەی نەشـیاوە هـیچ زانیارییـەکی لەمـەڕ چـنگ بکـەوێت (البدليسـي: ٢٠٠١،

ص٤٧٤)، روونیشە کە ئەحمەدی باپیرە هەرە گەورەیانیش – کە بە هەڵە کراوە بە فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە – زووتر ژیاوە، واتا بوونی بنەماڵەی میرئاودەلی گەلێك پێش ئەم فەقێ ئەحمەدە دەکەوێت کە گوایە لە سەدەی شازدە یان حەڤدە ژیاوە.

ئەم راستییانە هانمان دەدات و پاڵپشتمان دەبێت تا بتوانین جەخت لەسەر ئەوە بکەین کە ئەحمەدی کوڕی مەروان بە کردەوە ئاوەها بووە و هاوشێوەی ئەوەی لە بەشێکی داستانی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە هاتووە.

لەلایەکی دیەوە، وا دیارە بابانەکان شانازییان بە سوڵتان صەلاحەدینی ئەیوبییەوە کردووە و بە بابانییان داناوە، شێخ رەزای تاڵەبانی (١٨٣١–١٩١٠) لەم بارەیەوە ستایشی صەلاحەدین دەکات و بەکوردی بابان دایدەنێت:

عەرەب ئینکاری فەزڵی ئێوە ناکەم ئەفزەڵن، ئەمما
صەلاحەدین کە دنیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بوو
عومومی شەهریاران و سەلاتینی فەرەنگستان
لە روعبی ئەو شێرەدا گشتی هەراسان بوو (شێخ رەزای تاڵەبانی: ٢٠٠٥،ل١٤٥) .

هەرچەند ئەمە بەدوور دەنزانرێت و باوەڕ ناکرێت خزمایەتی و پەیوەندیی خوێن لە نێوان ئەم دوو بنەماڵەیە هەبێت، بەڵام روونە ئەم بۆچوونە لەنێو سەرانی میرئاودەلییەکانیش برەوی هەبووە و لایان وابووە کە کاکەمیری باپیرە گەورەیان وەچەی صەلاحەدینی ئەیوبییە و ماڵباتی ئەیوبی لە سوریا–شامەوە روویانکردووەتە جەزیرەی بۆتان و پاشتر لە مەرگە گیرساونەتەوە (إدمونز: ٢٠١٢، ص٣٠٧).

## ئەنجام

لە ئەنجامی ئەم سۆراخ و دیڤچوونەدا، پێموایە بەیتبێژان و حیکایەتخوانانی دارەشمانە و میرئاودەلییەکان بەسەرهات و مەقاماتی کۆنی میر ئەحمەدی مەروانی باپیرە هەرە گەورەیان – هەرچەند نزیکایەتی و خزمایەتیی نێوان هەردوولا ناڕوونە و یەکلا ناکرێتەوە– و هی فەقێ ئەحمەدیان بە هەڵە و لە نەزانینەوە لەکن تێکەڵ بووە، یان رەنگە –بە گوتەی ریچ– " حیکایەتخوانە نەزانەکان ئەم ئەفسانەیان دەستکاری کردبێت و گەڕاندبێتیانەوە بۆ سوڵتانی ئیستانبوڵ کە لای ئەوان لەو بترازێت، تەصەوری هیچ سوڵتانێکی دی ناکرێت"، لەمەش زیاتر بابانییەکان " پێیان خۆشە ئەم چیرۆکە پڕپایەخ و ناوازەیە بگەڕێننەوە بۆ بابا سولەیمانی باپیرەگەورەی پاڵەوانە خۆشەویستەکەیان " (ریچ: ٢٠٠٨، ص٢٨١–٢٨٢).

دووریش نییە بە ئەنقەست سەربوردەی میر ئەحمەدی مەروانیان کە وەك چیرۆکێکی پاڵەوانی و سەرەڕۆیی لێهاتبوو و چەسپیبوو و بووبووە گەنجینە و کەلەپوورێکی میللی، قۆزتبێتەوە و ئیسقاتیان کردبێت بەسەر فەقێ ئەحمەدەکەی دارەشمانە و لەگەڵ بەسەرهاتی کاکەمیر و کاکەشێخدا لێکیان دابێت، ئەمەش هەم بۆ دڵدانەوەی خۆیان و هەم بە مەرامی سەلماندن و پیشاندانی دلێری و جەربەزەیی و چاونەترسیی رۆڵە قارەمان و شۆڕە سوارە باوك کوژراوەکەیان بۆ ناحەزان و دوژمنانیان لە هۆزی بلباس و هۆزە نەیارەکانی دیکەیان و میرانی سۆرانی هەڤرکیان لەلایەك و دەسەڵاتداران و بەرپرسانی صەفەوی و عوسمانی لە لایەکی دیەوە.

بۆ وا نەکەن کە هەردووکیان ناویان ئەحمەدە و هەردووکیانیش غازی و موجاهید بوونە و شەڕی دوژمنی ئیسلامیان کردووە، وەك چۆن دوای ئەوەی میر بوداقی کوڕی ئەبدالڵ، یەکەم میری ناسراو و دامەزرێنەری بەرەبابێکی بابان، کەوتە داوی میر سیدیی سۆرانەوە و بەکوشت چوو، ئەدیبان قەصیدەیان لەسەر ئازایەتیی دانا و بەیتبێژان و حیکایەتخوانانیش لە جڤات و کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا، بەیت و بالۆرەیان بە جوامێری و پیاوەتییدا هەڵدەدا، چونکە بەلای ئەوانەوە لە چاوتێری و نانبدەیی حاتەمئاسا و لە ئازایەتیدا رۆستەمێك بوو بۆخۆی (البدلیسي: ٢٠٠١، ص٤٧٦).

دیارە چەسپاندن و ئیسقاتکردنی صیفاتی شۆڕەسواری و مەردایەتی یان پەند و ئاخافتن و ئامۆژگاریی کەسایەتییەکی مێژوویی ناسراو، بەسەر کەسانی دیدا له لایەن هەواداران و لایەنگرانی ئەم کەسانەوە، دیاردەیەکی هەتا بڵێی باوە لە ئەدەبیات و کلتووری میللەتاندا، بۆ نموونە عەرەب گەلێك كار و کردەوەی ئاوازە و هەڵوێستی جوامێرانەی کۆن یان ئەفسانەیی و هەڵبەستراویان پەیوەستکردووە بە کەسایەتییە ناسراوەکانیانەوە، بە هەمان شێوە گەلێك نوكتە و قسەی پەند ئامێز دراونەتە پاڵ جوحا و بەهلوول و مەلای مەشهوور و سەدان چوارینە و پەندی فەلسەفی گەڕێندراونەتەوە بۆ شاعیر و حەکیم عومەری خەییام...هتد.

**سەرچاوەکان**

**أ- بە کوردی:**

- ئۆسکارمان، تحفه مظفريه، له چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد (بەغدا: ١٩٧٥).
- تۆفیق وەهبی، گۆڤاری دەنگی گێتیی تازە، بەرگ (١)، ژمارە (٥)، شوباتی ١٩٤٤.
- دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، پرۆژەی هاوسەر (سلێمانی: ٢٠٠٥).
- رەمزی قەزاز، داستانی دوو پاڵەوان، چاپخانەی الجاحظ (بەغدا: ١٩٦٨).
- د. سەعدی عوسمان حوسێن، پەیدابوونی میرنشینی بابان، توێژینەوەیەکی شیکاری لەبارەی دامەزراندنی میرنشینەکە و رەگ و ریشەی بابان، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (١٣) (هەولێر: ٢٠٠٩).
- عبدالعزیز یاملکی، کُرد تاریخندن- بابان خاندانی، گۆڤاری (ژین)، ژمارە (٩)، رۆژی ٢٩-١-١٩١٩، وەرگێڕانی شێرزاد کەریم بە ناوونیشانی (لە مێژووی کوردەوە: خانەدانی بابان)، گۆڤاری پەیڤین، ژمارە (٤) (سلێمانی: دێسەمبەری ١٩٩٨)، برای بەڕێز م. صدیق صالح لەم وەرگێڕانە ئاگاداری کردمەوە و بە سوپاسەوە بۆی ناردم .
- عبدالقادر بن رستم البابانی (سال ١٨٧١)، سیرُ الاکراد، باهتمام محمد رئوف توکلی، چاپخانه گلبانگ (تهران:١٣٧٧ش).
- عەبدوڵا ئەحمد رەسوڵ، بیرەوەرییەکانم، دار الحرية للطباعة (بەغدا: ١٩٩٢ ).
- محەمەد فیدا، فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە، مطبعة كنعان (بەغدا:١٩٨٧) .

- موەفەق میراودەلی، عەشیرەتی میراودەلی، دەزگای حەمدی (سلێمانی: ٢٠١٠).

**ب- بە عەرەبی:**

- س. ج. إدمونز، كورد وترك وعرب، الترجمة العربية جرجيس فتح الله، دار آراس (أربيل: ٢٠١٢).
- روجيه ليسكو، مَم الآلاني، الاسطورة الكردية المغناة، ترجمة د. بدرخان السندي ( بغداد :١٩٨٥).
- حسين ناظم بيك، تاريخ الإمارة البابانية، الترجمة العربية (أربيل: ٢٠٠١).
- ريج، كلوديوس جيمس، رحلة ريج سنة ١٨٢٠، ترجمة بهاء الدين نوري (بيروت: ٢٠٠٨).
- شرفخان البدليسي، شرفنامه، ترجمة محمد جميل الروزبياني، مؤسسة موكرياني (أربيل:٢٠٠١).
- عبد ربه سكران الوائلي، تاريخ الإمارة البابانية، دار الثقافة والنشر الكردية (بغداد: ٢٠١٢).
- ابن العديم، كمال الدين عمر بن أحمد بن هبة الله العقيلي (ت: ٦٦٠هـ/١٢٦٢م)، زبدة الحلب في تاريخ حلب، تحقيق خليل المنصور، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٩٦ ).
- عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث، دار الزمان (دمشق:٢٠١١).
- العماد الأصفهاني، الفتح القسي في الفتح القدسي، دار المنار (بيروت: ٢٠٠٤).
- الفارقي، أحمد بن يوسف بن علي (ت: بعد ٥٧٧هـ/١١٨١م)، تاريخ الفارقي (الدولة المروانية)، دار الكتاب اللبناني (بيروت: ١٩٧٤).
- فردريش فون ديرلاين، الحكاية الخرافية، نشأتها -مناهج دراستها- فنيتها، ترجمة د. نبيلة إبراهيم، دار القلم (بيروت: ١٩٧٣).
- محمد أمين زكي، تأريخ السليمانية، نقله الى اللغة العربية الملا جميل الروزبياني (بغداد:١٩٥١).
- مؤلف مجهول، أعمال الفرنجة وحجاج بيت المقدس، ترجمة وتعليق د. حسن حبشي (القاهرة: ١٩٥٨).

## ملخص البحث

## ملحمة فقي احمد دارشمانه

## (دراسة تاريخية تحليلية)

**أ.د. زرار صديق توفيق**
قسم التاريخ – كلية العلوم الانسانية – جامعة دهوك

تعد ملحمة الفقيه أحمد الدارشماني الجد الأعلى للسلالة البابانية الأخيرة من القصص الشائعة والشيقة في الأدب الشعبي الكوردي لما يتضمنها من روح المغامرة والإثارة وتمتزج فيها مواقف الحب والجهاد المقدس والفروسية والوفاء و تتخطى ساحة أحداثها حدود كوردستان لتصل الى بلاد الأفرنج وهي وفق ما توصلنا اليه من الحكايات القديمة وتمتد جذورها الأولى الى العصور الوسطى وأيام الحروب الصليبية، حيث تدور أحداثها حول السيرة البطولية لفتى كُردي مُجازف ومفعم بروح المثابرة والنخوة، غير انها تعرضت للتغيير والتحوير والإسقاط الزماني والمكاني وأطالتها المبالغة والإلتباس، كما أدمجت مع حكاية شعبية أخرى تعود الى القرن السادس عشر وتدعى (كاكه مير وكاكه شيخ)، حتى صارت بمرور السنوات وتوالي العصور كباقي القصص والحكايات الشعبية مشبعة بالأساطير وإختلطت بها الحقائق التأريخية بالعناصر الملحمية وغدت أشبه بقصة أسطورية منها الى حدث تأريخي بحت .

تناولت الدراسة بالتحليل النقدي نص القصة التي نقلها ك. ج. ريج وناقشت معظم المراجع ذات العلاقة والآراء والروايات المطروحة حول هوية بطل القصة في محاولة للتأصيل التأريخي للقصة وكيف تحولت بمرور الزمن الى ملحمة قومية تغنت بها الأجيال وتناقلتها عبر العصور لما تحويها من عناصر ومواقف تصلح أن تكون مادة توظف للملاحم والحكايات الأسطورية، وتوصل الى انها بالأصل تدور حول سيرة أمير كوردي يدعى أحمد بن مروان إبان بدايات الحروب الصليبية وما جرى له من مواقف مثيرة مع الأفرنج بعد أن وقع في أسرهم، ثم تصاهر معهم وانجب من إمرأة صليبية ولدا، قبل أن يعود الى موطنه تاركا وراءه زوجته وولده كما هو مثبت في المصادر التأريخية.

Abstract

**The Epic of the Jurisprudent Ahmad al- Darshmani**

**Prof. Dr. Zirar Sidiq Tawfiq**
History Dept. – College of Humanities – Univ. of Duhok

"The epic of the jurisprudent Ahmad al-darshmani" is the supreme grandfather of the last Babylonian dynasty of popular and popular stories in the Kurdish folk literature because it includes the spirit of adventure and excitement and mixed with the positions of love and Holy Jihad and equestrian and fulfilling and beyond the arena of events borders Kurdistan to reach the country of the Afrang, which we have learned from the old tales And extends its roots to the Middle Ages and the days of the Crusades, where the events revolve around the heroic biography of a Kurdish girl, a venture full of perseverance and frivolity, but it was subject to change and adjustment and temporal and spatial projection and prolongation and exaggeration until it became over the years and the succession of the ages like other stories and folk tales saturated with myths and mixed with the historical facts and elements of the epic became more like the story of a legendary them to a purely historical event.

The study dealt with the critical analysis of the text of the story, which was published by C. G.Rich and discussed most of the relevant references, opinions and stories about the identity of the hero of the story in an attempt to historical consolidation of the story and how it turned over time to a national epic sung by generations and transmitted through the ages because of the elements and attitudes that fit Which is an article used for the temples and stories of myth, and found that it originally revolves around the biography of a Kurdish prince named Ahmed bin Marwan during the beginning of the Crusades and the exciting positions with the Afrang after it occurred in their families, and then marry them and have a child of a crusader child, To his home Tar Ka was followed by his wife and son as it is fixed in historical sources.

# پیشەسازی لە شاری هەولێر ١٩٥٨-١٩٧٥
## (لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە)

**پ. د. خەلیل عەلی موراد** **م.ی. بورهان حاتەم عوسمان**
کۆلێژی ئەدەبیات - زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر

**پوختە**
لەم توێژینەوەیەدا هەوڵدراوە گرنگترین کەرتەکانی پیشەسازی لە شاری هەولێر لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٥٨-١٩٧٥ بخرێنەڕوو. دیارە پیشەسازی وەک کەرتێکی گرنگی ئابووری کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر پەرەپێدانی هەر وڵات و شار و ناوچەیەکدا هەیە، بۆیە لەم سۆنگەیەوە کەرتە جیاوازەکانی پیشەسازی لە شاری هەولێر بەتایبەتیش کەرتی پیشەسازیی خۆراک ڕۆڵی بەرچاوی لە ژیانی هاوڵاتیان و پەرەپێدانی ئابووری شارەکەدا هەبووە.
توێژینەوەکە لە پێشەکی و دەروازە و چوار تەوەرە و چەند دەرئەنجامێک پێکهاتووە کە توێژەر لەمیانەی شەن و کەوکردنی زانیارییەکاندا پێیگەیشتووە. لە دەروازەدا بەکورتی ئاماژە بە سەرهەڵدان و قۆناغەکانی پیشەسازی لە شاری هەولێر کراوە. لە تەوەرەی یەکەمدا کەرتی پیشەسازی خۆراک و تووتن خراوەتە بەرباس، کە بە گرنگترین کەرتی پیشەسازی لەماوەی توێژینەوەکە لە شاری هەولێر ئەژماردەکرێت، ئەمەش بەهۆی بوونی چەندین کارگە و دامەزراوەی تایبەت بەم کەرتە، بەتایبەتیش کارگەی شیرەمەنی هەولێر و سەمونخانەی ئۆتۆماتیکی هەولێر، کە ئەمانە ڕاستەوخۆ پەیوەست بوون بە ژیانی دانیشتوانی شارەکەوە. ئەمە جگە لە کارگەی جگەرەی هەولێر کە بەرهەمێکی باشی هەبووە و ژمارەیەکی بەرچاو لە کرێکار

لە کارگەکەدا کاریان کردووە، ئەمەش کاریگەری لەسەر کەمبوونەوەی بێکاری لە شارەکەدا هەبووە.

لە تەوەرەی دووەمیشدا تیشک خراوەتە سەر کەرتی ڕستن و چنین کە لەو ماوەیەدا زێتر خۆی لە کارگەی مافووری دەستی هەولێر بینیوەتەوە، بۆیە باس لە دامەزراندن و بەرهەمی کارگەکە کراوە، کە ساڵانە هەزاران مەتر چوارگۆشە مافووری بەرهەمهێناوە. هەرچی تەوەرەی سێیەمە تایبەتکراوە بە کەرتی بیناسازی، تیایدا باس لەو هۆکارانە کراوە کە کاریگەرییان کردووەتە سەر پەرەسەندنی کەرتی بیناسازی، هەروەها گرنگترین کارگە و پڕۆژەکانی ئەو بوارە خراونەتەڕوو بەتایبەتی کارگەی کەرپووچی هەولێر و کارگەی قیرڕی کۆنکریتی و کارگەکانی تایبەت بە کاشی و بلۆک کە لەو ماوەیەدا سەریانهەڵداوە، وێڕای ئەمانە چەندین داتا و زانیاری دەربارەی کەرتی بیناسازی و ژمارەی کرێکارانی ئەو کەرتە خراوەتەڕوو.

بەشی چوارەم و کۆتایی توێژینەوەکەش بەکورتی ئاماژە بە کەرتی چاپەمەنی لە شاری هەولێردا کراوە، سەرەتاکانی دەرکەوتنی چاپخانە و دواتریش ئەو چاپخانانەی کە لە ماوەی توێژینەوەکەدا دامەزراون باسیان لێوەکراوە، لەوانەش چاپخانەی پەروەردە و چاپخانەی شارەوانی کە لەدوای ڕێککەوتنی ۱۱ی ئاداری ۱۹۷۰ وەک دوو چاپخانەی حکومی لە شارەکەدا دامەزرێندران، کە لە ڕێگەیانەوە چەندین کتێب و گۆڤار چاپکراون و بڵاوکراونەتەوە.

**پێشەکی**

پیشەسازی بە یەکێک لە کۆڵەگە هەرە سەرەکییەکانی پەرەپێدانی ئابووری دادەنرێت، کە کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر کەرتە ئابوورییەکانی دیکەدا هەیە، بەتایبەتیش کشتوکاڵ، هەروەها کەرتە خزمەتگوزارییەکانی وەک تەندروستی و بیناسازی و گواستنەوە بەبێ پیشەسازی نایەنەدی. لەم سۆنگەیەوە سەرەتای شێستەکانی سەدەی بیستەم بە قۆناغێکی گرنگی پەرەسەندنی ئابووریی شاری هەولێر ئەژماردەکرێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی سەرەتای پیشەسازی میکانیکی لەو ماوەیەدا، چونکە لە پێشتردا ئەوەی هەبووە زێتر پیشەی دەستی بووە، کە دانیشتوانی شارەکە لە ڕێگەی چەندین پیشەی جۆراوجۆری دەستییەوە پێداویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەیان دابینکردووە.

بایەخی توێژینەوەکە لەوەدایە کە سەرەتاکانی سەرهەڵدانی دامەزراوەی پیشەسازی لە شاری هەولێر لەخۆدەگرێت، ئەمەش هاوکاتە لەگەڵ ئەو گۆڕانکاری و ڕووداوە سیاسییانەی کە باشووری کوردستان و هەولێریشی گرتەوە دوابەدوای هەڵگیرسانی شۆڕشی چواردەی تەممووزی ١٩٥٨، بۆیە سەرهەڵدان و پەرەسەندنی کەرتەکانی پیشەسازی لە شارەکەدا تێکهەڵکێش بووە بە بارودۆخی سیاسیی ناوچەکە، وێڕای ئەمانەش دامەزراندنی چەندین کارگە و دامەزراوە لە کەرتە جیاوازەکانی پیشەسازییدا، کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر پەرەسەندنی ئابووری شارەکەدا هەبووە، چونکە وەک ئاشکرایە پەرەپێدانی کەرتەکانی ئابووری زێتر بە پێشکەوتنی کەرتی پیشەسازییەوە بەستراوەتەوە و بە بەراورد لەگەڵ کەرتە ئابوورییەکانی دیکە، خاوەن دینامیکییەتێکی خێراترە لە بواری گەشەپێدانی ئابوورییدا. لەلایەکی دیکەوە ئەمە دەچێتە چوارچێوەی توێژینەوە لە مێژووی ئابووریی شاری هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٥٨-١٩٧٥ کە تا ئێستا وەک نامە و تێز و توێژینەوەی زانستی لای لێ نەکراوەتەوە، بۆیە

جێگەی خۆیەتی جگە لە مێژووی سیاسیی شارەکە، بایەخ بە مێژووی ئابووری و کۆمەڵایەتیشی بدرێت.

هەڵبەتە توێژینەوە لە بواری مێژووی ئابووری پێویستی بە ئامار و داتای تایبەت بە سەردەمەکەوە هەیە، دەستنەکەوتنی بەشێک لەو ئامارانەش کە تایبەتن بە کارگە و دامەزراوە پیشەسازییەکانی هەولێر، لە دیارترین گرفتەکانی بەردەم توێژینەوەکە بوون، بەتایبەتی تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، دەزگا فەرمییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان نەیانتوانیوە ببنە خاوەن ئەرشیفێکی دەوڵەمەند، ئەو داتا و بەڵگەنامانە بپارێزن کە پەیوەستن بە مێژووی پەرەسەندنی ئابووریی شارەکانی کوردستان، بۆیە توێژەر پێویستی بەوە دەبێ ئەو داتا و بڵاوکراوە حکومییانەی کە حکومەتی عێراق دەریکردوون بەدەست بخات کە پەیوەندییان بە بابەتەکەیەوە هەیە، هەندێک لەوانەش دەستخستنیان کارێکی زەحمەتە.

ناوەڕۆکی توێژینەوەکە لە پێشەکی و دەروازە و چوار تەوەرە لەگەڵ دەرئەنجام پێکهاتووە، لە تەوەرەی یەکەمدا باس لە کەرتی پیشەسازیی خۆراک و تووتن کراوە، لە سەرەتادا تیشک خراوەتە سەر سەرهەڵدانی پیشەسازی خۆراک لای دانیشتوانی شاری هەولێر کە لە شێوەی پیشەی دەستی وەک دروستکردنی ماست و کەرە و پەنیر و ژاژی لە بەروبوومە سپیایییەکانی ئاژەڵ دەستیپێکردووە، پاشان باس لە چۆنیەتی دامەزراندن و جۆر و چەندێتی بەرهەمی گرنگترین ئەو کارگانە کراوە کە کەوتوونەتە چوارچێوەی ماوەی توێژینەوەکە، وەک کارگەی شیرەمەنی هەولێر و سەمونخانەی ئۆتۆماتیکی هەولێر. هەروەها باس لە کارگەی جگەرەی هەولێر وەک یەکێک لە گەورەترین کارگە بەرهەمهێنەرەکانی هەولێر کراوە. لە تەوەرەی دووەمیشدا کارگەی مافووری دەستیی هەولێر وەک یەکێک لە بوارەکانی کەرتی پیشەسازیی ڕستن و چنین لێی کۆڵدراوەتەوە و زانیاری و داتای تایبەت بە بڕی بەرهەم و ژمارەی کرێکارانی کارگەکە خراوەتەڕوو.

هەرچی تەوەرەی سێیەمە، تایبەتکراوە بە کەرتی بیناسازی، تیایدا تیشک خراوەتە سەر کاریگەری کۆمەڵە هەرەوەزییەکانی خانووبەرە و بیناسازی و کردنەوەی بانکی خانووبەرە لەسەر کەرتی بیناسازی لە شاری هەولێر، هەروەها گرنگترین کارگە و دامەزراوەکانی ئەم کەرتە پیشەسازییە خراونەتەڕوو، وەک کارگەی کەرپووچی هەولێر و کارگەی قیری کۆنکریتی و کارگەی مەڕمەڕ و کارگەکانی کاشی و بلۆک. لە تەوەرەی کۆتاییشدا بەکورتی ئاماژە بە کەرتی چاپەمەنی لە شارەکەدا کراوە و دامەزراندن و کارەکانی هەردوو چاپخانەی پەروەردە و شارەوانی خراونەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

لەم توێژینەوەیەدا چەندین سەرچاوەی جۆراوجۆر بەکارهاتوون، لەپێش هەمووشیانەوە بەڵگەنامە بڵاونەکراوەکان، کە پێکهاتوون لە چوار بەڵگەنامە لە ئەرشیفی پارێزگای هەولێر و ئەرشیفی کارگەی مافووری کۆیە وەرگیراون، بڵاوکراوە حکومییەکان لەبەرئەوەی داتا و زانیاریی وردیان سەبارەت بە کارگە و دامەزراوە پیشەسازییەکان تێدایە، بۆیە بایەخێکی زۆریان بۆ توێژینەوەکە هەبووە، لەوانەش بڵاوکراوەکانی وەزارەتی پیشەسازی عێراق بەتایبەتی (المؤسسة العامة لصناعات الغزل والنسيج، التقرير السنوي الخامس لسنة ١٩٧٤-١٩٧٥) کە ڕاپۆرتی ساڵانەی دەربارەی پیشەسازیی ڕستن و چنین لە عێراقدا خستووەتەڕوو و داتای وردی تێدایە، هەروەها کتێبی (أربيل في ظلال بيان اذار التاريخي) کە لەلایەن پارێزگای هەولێرەوە ئامادەکراوە و وردەکاری ئەو پرۆژە پیشەسازییانەی تێدا تۆمارکراوە، کە لەنێوان ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٢ لە شاری هەولێر ئەنجامدراون. نامە و تێزە زانستییەکانیش سوودی گەورەیان بە توێژینەوەکە گەیاندووە بەتایبەتی نامەی ماستەری (حلاو حسين كريم/ الصناعات الغذائية في محافظة اربيل دراسة في الجغرافية الصناعية) و تێزی دکتۆرای (ياسين رسول يونس/ تحليل مسار الصناعات التحويلية في محافظة اربيل للمدة ١٩٧٥-٢٠٠٢). کتێبە چاپکراوەکانیش لە چەند لایەنێکەوە سوودیان لێ بیندراوە

بەتایبەتی کتێبی (أربيل في أربعة أعوام) کە لەلایەن کۆمەڵێک گەنجی هەولێر ئامادەکراوە و پرۆژە و دەستکەوتە حکومییەکانی نێوان ساڵانی ١٩٦٤-١٩٦٧ ی تێدا خراوەتەڕوو. جگە لەمانەش دیدار لەگەڵ ئەو کەسانەی هاوچەرخی سەردەمەکە بوون، هەروەها زانیاریی نێو لاپەڕەی بەشێک لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بەتایبەتی گۆڤاری (الحكم الذاتي/ ئۆتۆنۆمی) سەرچاوەی بایەخداری توێژینەوەکەیان پێکهێناوە.

## دەروازە: سەرهەڵدان و قۆناغەکانی گەشەکردنی پیشەسازی لە شاری هەولێر:

فەراهەمبوونی کەرەستە خاوەکان بە یەکێک لە بنەما سەرەکییەکانی دامەزراندن و پەرەپێدانی پیشەسازی ئەژمار دەکرێن، ئەم کەرەستانەش کەرەستەی خاوی کانزایی و کشتوکاڵی (ڕووەکی و ئاژەڵداری) دەگرێتەوە. سەبارەت بە کەرەستەی خاوی کانزایی، ناوچەکانی هەولێر خاوەنی سامانێکی گرنگی کانزاییە، وەک (ئاسن، مس، کرۆم، نیکڵ، مەنگەنیز، قورقوشم)، جگە لەمانەشی تێدایە، بەشێکی خاکی ناوچەکە دەکەوێتە نێو سنووری کانزایی و زۆرێک لە پێکهاتەی بەردینی تێدایە، کە مێژووەکەیان بۆ سەردەمە جیۆلۆجییە کۆنەکان دەگەڕێتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە پێکهاتەی بەردی ئاگرین و گۆڕاو و نیشتووی لێ دەست دەکەوێ (بڕوانە: حەفید، ٢٠٠٠، ل١٤٣؛ حەداد و مەحمود، ٢٠١١، ل٢٠). هەروەها هەولێر دەوڵەمەند بووە بە کەرەستەی خاوی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری، کەرەستە خاوە کشتوکاڵییەکان بنەمایەکی گرنگن لە بنەماکانی پەرەسەندنی پیشەسازی بەتایبەتی لە بواری پیشەسازییە کشتوکاڵییەکان، وەک پیشەسازی خۆراک و ڕستن و چنین و پێستە خۆشکردن. لە ناوچەکانی هەولێر بەروبوومە پیشەسازییەکان بەتایبەتی توتن و لۆکە و چەوەندەری شەکر و کونجی و گوڵەبەڕۆژە چاندراوە، جگە لەمانەش بەروبوومی دانەوێڵە و هەندێ جۆری میوە بەرێژەیەکی باش هەبووە، کە دەتوانرێت بۆ بواری

پیشەسازیی جۆراوجۆر بەکاربێت (دەربارەی بەروبوومە کشتوکاڵییەکانی هەولێر بڕوانە: الجمهورية العراقية، المجموعة الاحصائية السنوية العامة ١٩٦١، ص٦٢؛ الجمهورية العراقية، المجموعة الاحصائية السنوية العامة ١٩٦٦، ص١٥٠؛ الجمهورية العراقية، المجموعة الاحصائية السنوية ١٩٦٨، ص١٤١). هەولێر لەڕووی سامانی ئاژەڵیشەوە توانای باشی هەبووە، کە دەکرێ بەرهەمەکانی لە شیر و خوری و موو و پێستە ڕۆڵی گرنگی لە بواری پیشەسازیی خۆراک و ڕستن و چنین و پێستە خۆشکردندا هەبێت (دەربارەی سامانی ئاژەڵ لە هەولێر بڕوانە: الجمهورية العراقية، نتائج الاحصاء الزراعي والحيواني في العراق لسنة ١٩٥٨-١٩٥٩، ص٨٥-٨٦؛ الجمهورية العراقية، دليل القطاع الزراعي في العراق لعامي ١٩٦٨-١٩٦٩، ص١١٩).

بۆیە ئەمانە هەموو وایانکردووە لەڕووی فەراهەمبوونی کەرەستەی خاوەوە، هەولێر لەبار بووبێت بۆ دامەزراندن و پەرەسەندنی پیشەسازیی جۆراوجۆر.

دەکرێ سەرهەڵدان و پەرەسەندنی پیشەسازی لە هەولێر دابەشی سەر سێ قۆناغ بکەین، قۆناغی یەکەم: سەردەمی پاشایەتی (١٩٢١-١٩٥٨)، قۆناغی دووەم: ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٥٨-١٩٧٠، قۆناغی سێیەم: ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٠- ١٩٧٥. سەبارەت بە قۆناغی یەکەم بەشێوەیەکی گشتی تا کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، هیچ جۆرە پڕۆژە و کارگەیەکی پیشەسازی گەورە بە مانا ئابوورییەکەی لە باشووری کوردستاندا نەبووە (اسماعیل، ٢٠٠٥، ص٥٣)، بەڵام دوای دامەزراندنی ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوە[1]، چەند پڕۆژەیەکی پیشەسازی حکومی دامەزران، کە لە گرنگترینیان کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار بوو لە سلێمانی (لەبارەی کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار بڕوانە: مەحمود، ٢٠١٣، ل١٤٧-١٤٩). کەچی لە هەولێر بەدرێژایی ماوەی سەردەمی پاشایەتی هیچ پڕۆژەیەکی پیشەسازی حکومی گەورە دانەمەزراوە، ئەوەی هەبووە پیشەسازی بەکاربردنی سادە بووە، بۆ

پڕکردنـەوەی پێداویسـتییە ناوخۆییـەکان، ئـەو پیشەسـازییە بچـووک و سادانەش ئەهلی بوون و لەلایەن دانیشتوانی شارەکەوە دامەزرێندراون وەک ئاشی ئارد و کارگەی بەفر (حسن، ١٩٩٢، ص٦٢).

قۆناغی دووەم کە لە ماوەی ئەم قۆناغەدا بەهۆی دەرچوونی پلانە ئابوورییەکانی حکومەت، وەک پلانـی ئـابووری پێنج ساڵە ١٩٦٥-١٩٦٩ و پلانی گەشەپێدانی نەتەوەیی بۆ ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤ کە تیایاندا بایەخ بـە کـەرتی پیشەسـازی دراوە (دەربـارەی پلانـە ئابوورییـەکان بڕوانـە: الوقــائع العراقيــة، ع (١١٣٥)، ١/٧/ ١٩٦٥؛ الســامرائي، ١٩٧٧، ص١٤١-١٥٦)، لیـوای هـەولێریش کەوتـە ژێـر کاریگـەریی ئـەم ڕێکـار و پلانـە ئابوورییانـە و بـووە مایـەی دەرکـەوتنی سـەرەتاکانی پیشەسـازی نـوێی میکانیکی، کە زێتر خۆی لە پیشەسازی خۆراکدا بینییەوە وەک کارگـەی شیرەمەنی هەولێر(یونس، ٢٠٠٥، ص٩٨).

لـە قۆنـاغی سـێیەمدا پیشەسـازی لـە شـاری هـەولێر هـەنگاوی باشـتری نـا، دوای ڕێککـەوتنی ١١ی ئـاداری ١٩٧٠ و بەرقـەراربوونی ئاشـتی لـە ناوچەکـەدا، بـاری پیشەسـازی لـە شـارەکەدا وردە وردە پەرەسەندنی بەخۆیەوە بینی، بـەڵام سـەرباری ئـەوەش مۆرکی خـاو و خلیچـی و بـێ پلانـی هـەر پێـوە دیـار بـوو (حەفیـد، ٢٠٠٠، ل١٤٣). لـە سـەرەتای ئـەم قۆناغـەدا و لـە سـاڵی ١٩٧٠ ژمـارەی دامـەزراوە پیشەسـازییە گـەورەکان[٢] لـە هـەولێردا (١٥) دامـەزراوە بـووە، (٨) دامەزراوەی کەرتی حکومی و (٧) دامەزراوەی سـەر بـە کـەرتی تایبـەت (الجمهورية العراقية، أرقام...، د.س، ص٢٨)، لـە گرنگترینیشـیان کارگـەی جگـەرەی هـەولێر و کارگـەی مـافووری دەسـتی هـەولێر بـوون وەک لـە دواتـردا باسـیان دەکـەین. لـە مـاوەی لێکۆڵینەوەکـەدا چەنـدین جـۆری پیشەسـازی لـە شـاری هـەولێر دەرکـەوتوون، بۆیـە لـە خـوارەوەدا بەشێوەی کەرتی سەربەخۆ باسیان لێوەکراوە.

## تەوەرەی یەکەم: کەرتی پیشەسازیی خۆراک و تووتن:

پیشەسازییە خۆراکییەکان بەشێکن لە پیشەسازییە گۆڕاوەکان، کە مرۆڤ هەر لە کۆنەوە دەستی بە بەرهەمهێنانی کردووە، بەروبوومی کشتوکاڵی (ڕووەکی و ئاژەڵی) دەگۆڕێت بۆ شێوازێک، کە شیاو بێت بۆ بەکاربردنی مرۆیی و پێداویستییە بەردەوامەکانی دانیشتوان پڕبکاتەوە (المعيني، ١٩٨٨، ص٦). هەر لە کۆنەوە چەندین جۆری پیشەسازی سادەی ئامادەکردنی خۆراک لای دانیشتوانی هەولێر هەبووە، وەک دروستکردنی ماست و کەرە و پەنیر و ژاژی لە بەروبوومە سپیاییەکانی ئاژەڵ، کە هەندێکیان پێویستیان بە ئامرازی تایبەت بووە وەک (مەشکە)، کە بەهۆی هەژاندنییەوە کەرە و دۆیان بەرهەم دەهێنا، هەروەها بەرهەمهێنانی ساوار و هەڕشتە و داندۆک لە بەروبوومی دانەوێڵە، کە لە ڕێگەی کاری دەستییەوە ئەنجام دراون (ڕەشاش، ٢٠١١، ل٤٩-٥٤). بەروبوومە کشتوکاڵییەکانیشیان لە بواری پیشەسازی ناوخۆییدا بەکارهێناوە، بۆ نموونە ترێ یان لە کەرەستەیەکی خاوەوە گۆڕیوە بۆ دۆشاو، هەروەها لە هەنار سرکەیان بەرهەمهێناوە (بڕوانە: ساڵح، ٢٠٠١، ل١٨٤-١٨٦). زۆربەی ئەمانەش لەلایەن ئافرەتانەوە ئەنجامدراوە، لە هەمان کاتدا پیاوانیش بەشدارییەکی بەرچاویان هەبووە، بەتایبەتی لەو کارانەی، کە پێویستیان بە وزە و هێزی زیاتر هەبووە.

لە سەرەتای شێستەکانەوە بەردی بناغەی دامەزراندنی کارگەی پیشەسازییە خۆراکییەکان لە شاری هەولێر دەستیپێکرد، لە ساڵی ١٩٦١ تەنیا (٢) دامەزراوەی گەورەی پیشەسازی خۆراکی لە هەولێر هەبووە، کارگەی شیرەمەنی هەولێر و ئاشی میکانیکی هەولێر کە ئەمەی دواییان بە سەرمایەی (٥١٠٤٦) دینار لە هەمان ساڵدا دامەزراوە (کريم، ٢٠٠١، ص٢٦). لە ساڵی ١٩٧٢ ژمارەکە زیادیکردووە بۆ (٧) دامەزراوە، کە بریتی بوون لە (١) دامەزراوە لە بواری شیرەمەنی، (٣) دامەزراوە لە بواری لێکردنی دانەوێڵە و دروستکردنی بەفر، (١) نانخانە، (٢) کارگەی

شـیرنەمەنی (حبیـب، ١٩٧٥، ص٢٩٣-٢٩٦). لـە گرنگتـرین ئـەو کارگـە و پـڕۆژە پیشەسـازییانەی کـە لـە بـواری خـۆراک و تووتنـدا لـە هـەولێر دامـەزراون بـریتیین لـە کارگـەی شـیرەمەنی هـەولێر و سـەمونخانەی ئۆتۆماتیکی هەولێر و کارگەی جگەرەی هەولێر، بۆیە لە خوارەوە باسی هەر یەکێک لەمانە دەکەین:

**أ- کارگەی شیرەمەنی هەولێر:**

ئەم کارگەیە بە کۆنترین کارگە لە شاری هەولێر ئەژمار دەکرێت، بۆ کەڵک وەرگرتن لەو سامانە ئاژەڵییەی کە شارەکە هەیبوو، هـەروەها بـۆ دابینکردنـی شـیر و بەرهەمـەکانی بـۆ دانیشـتوانی شـارەکە و ناوچەکانی دیکە، بەڕێوەبەریتی خۆجێی لیوای هەولێر پارچە زەوییەکی بـە ڕووبـەری (٥٠) دۆنـم بـۆ بنیاتنـانی بینایـەی کارگـەی شـیرەمەنی تەرخانکرد کە شوێنەکەی کەوتبووە بەرامبەر گەڕەکی کوران، لە ١٤ی تەمموزی ١٩٦١ بە فەرمی کارگەکە کرایەوە (جماعة من شباب أربیل، د. س، ص٨٢)، جێگـەی ئاماژەیـە لـە توێژینەوەیەکدا بـە هەڵـە مێـژووی دامەزرانـدنی کارگەکـە بـۆ دوای ڕێککەوتننامـەی ١١ی ئـاداری ١٩٧٠ گەڕاندراوەتەوە (بڕوانە: ڕەحمان و حەسەن، ٢٠١٦، ل٢٦٧)، کۆی گشتی تێچوونی کارگەکەش (٢٩٨٣٦) دینـار بـوو (جماعـة مـن شـباب أربیـل، د. س، ص٨٢)، لـە سـاڵی ١٩٦٢ کۆمپانیـای گشـتی بـەروبوومی شـیرەمەنی (الشركة العامة لمنتوجات الالبان)[٣] کارگەکەی کردە مـوڵکی خـۆی و بۆ زیادکردنی بەرهەم هەندێ ئاڵوگۆڕی تێداکرد و ئامێر و مەکینـەی نوێی تێدا دانا (الحكم الذاتي/ ئۆتۆنۆمی، ١٩٧٨، ل٤٨).

هەر لە سـەرەتای دامەزراندنییەوە کارگەکە ڕووبـەڕووی چەنـدین گرفت بوویەوە، ئەمەش وایکرد کە بەرهەمی دوابکەوێت، لەو گرفتانـەش نـەبوونی شـارەزایانی میکـانیکی کشـتوکاڵی بـۆ ئیشـپێکردنی کارگەکـە، هـەروەها کـەمی شـیری خـاو (شـیری گـامێش و مانگـا)، کێشـەی دووەم کاریگەری گەورەی لەسەر درەنگکەوتنی بەگەڕخستنی کارگەکە هـەبوو،

گامێشەوانەکان بەهۆی کەمی ژمارەیان و قۆستنەوەی بارودۆخەکە لە بەرامبەر دابینکردنی شیر بۆ کارگەکە داوای نرخێکی زۆریان دەکرد، بەشێوەیەک نرخی هەر کیلۆیەک شیر گەیشتبووە (٢٥٠) فلس، ئەمەش وایکردبوو کە کارگەکە لەسەر نرخ لەگەڵیان ڕێک نەکەوێت (جماعة من شباب أربيل، د. س، ص٨٢)، بەڵام دواتر توانرا ئاستەنگەکانی بەردەم بەگەڕخستنی کارگەکە وەلاوەبنرێت و بۆ بەڕێوەبردن و کارپێکردنی یەکێک لە دەرچووانی کۆلێژی کشتوکاڵ دابمەزرێت، بەم شێوەیەش لە ٩ی ئاداری ١٩٦٥ دا کارگەکە بەگەڕخرا و نۆبەرەی بەرهەمەکانی گەیشتە نێو بازاڕەکان (جماعة من شباب أربيل، د.س، ص٨٣). سەبارەت بە چەندێتی بەرهەمی کارگەکە، لە ساڵی ١٩٦٢ وزەی نەخشەبۆکێشراوی بەرهەمی کارگەکە (١٠) تەن ماست و نیو تەن قەیماغ لە ڕۆژێکدا بووە (الحكم الذاتي/ ئۆتۆنۆمی، ١٩٧٨، ل٤٨)، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٠ توانای بەرهەمهێنانی (٥) تەن ماست و نیو تەن پەنیر و (٣٣٣) کیلۆ قەیماغی هەبووە (یونس، ٢٠٠٥، ص٢٠١). ئەمەش بە واتای ئەوە دێت کە کارگەکە لە سەرەتاوە نەیتوانیوە ئەو وزە نەخشەبۆکێشراوەی کە بۆی دانراوە جێبەجێی بکات و نزیکەی نیوەی بەرهەمی پێشبینیکراوی بەرهەمهێناوە.

بەمەبەستی دۆزینەوەی بازاڕێکی بەکاربردنی بەردەوام، کارگەکە هەوڵیداوە بەروبوومەکانی بەسەر دامەزراوە حکومییەکاندا دابەش بکات، بۆیە لە سەرەتای بەرهەمهێنانیدا شیر و ماست و قەیماغی بۆ نەخۆشخانەکانی ناوەندی هەولێر و زۆربەی بەشە ناوخۆییەکان دابینکردووە، هەروەها دوای شەش مانگ لە کارکردنی کارگەکە بەروبوومەکانی خۆی بەسەر نەخۆشخانەکانی ناوەندی موسڵیش دابەشکردووە، هەروەک لە هەندێ کاتدا بڕێک لە بەرهەمەکانی بۆ نەخۆشخانەی کۆماری کەرکوکیش ناردووە. لە ٩ی ئاداری ١٩٦٥ تا ١ی ئایاری ١٩٦٦ کۆی گشتی نرخی ئەو شیرەی کە بۆ کارگەکە کڕاوە گەیشتووەتە (١٤١٦٦) دینار، هەروەها خەرجییەکانی کارگەکە بە

مووچەی فەرمانبەران و کرێی کرێکاران و کارەبا و کەرەستەی کیمیایی و تاقیگەیی بڕی (٣٩٠٨) دینار بووە، واتە کۆی گشتی خەرجییەکانی کارگەکە (١٨٠٧٤) دینار بووە، لە هەمان ماوەشدا بایی (٢١٨٧٩) دینار بەرهەمەکانی کارگەکە فرۆشراوە، بەم شێوەیەش قازانجی کارگەکە لەم ماوەیەدا گەیشتووەتە (٣٨٠٥) دینار، هەروەها لە ماوەی نێوان ١ی نیسانی ١٩٦٦ تا ١ی نیسانی ١٩٦٧ قازانجی کارگەکە گەیشتووەتە (٢٩٩٧) دینار (جماعة من شباب أربيل، د. س، ص٨٤). بەمەش دەردەکەوێت کە کارگەکە بەشێوەیەکی گشتی قازانجی باشی کردووە، بەڵام لە ماوەی ساڵێکدا ڕێژەی قازانجی دابەزینی بەخۆیەوە بینیوە، بەشێوەیەک لە ساڵی ١٩٦٥-١٩٦٦ قازانجی مانگانەی (٣٨٠٥) دینار بووە، ئەمە لە کاتێکدا لە ساڵی ١٩٦٦-١٩٦٧ قازانجی مانگانەی (٢٩٩٧) دینار بووە، واتە مانگانە (٨٠٨) دینار لە قازانج کەمیکردووە، بەشێک لە هۆکاری ئەمەش وەک لە پێشتردا ئاماژەمان پێدا دەگەڕێتەوە بۆ گرانی نرخی ئەو شیرەی کە بۆ کارگەکە کڕاوە.

دەربارەی دەستەی بەڕێوەبردن و کرێکارانی کارگەکە، لە سەرەتای دامەزراندنیدا فەرمانبەرێکی تەکنیکی دەرچووی کۆلێژی کشتوکاڵ لەلایەنی کارگێڕی و تەکنیکییەوە کارگەکەی بەڕێوەبردووە، فەرمانبەرێکیش بەرپرسی کاروباری ژمێریاری بووە، ئەمە سەرباری بوونی چاودێرێکی تەکنیکی و کەسێکی دیکەی بەرپرس لە چاککردنەوەی مەکینە و ئامێرەکانی کارگەکە، هەروەها ژمارەی کرێکارانیش لە سەرەتادا (٧) کرێکار بووە (جماعة من شباب أربيل، د. س، ص٨٤)، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٥ ژمارەی کرێکارەکانی بەرزبووەتەوە بۆ (٤٨) کرێکار، کە داو و دەرمانیان بە خۆڕایی پێشکەشکراوە و ڕۆژانە پزیشک سەردانی کارگەکەی کردووە، کرێی گواستنەوە و خواردن و جلی تایبەتی کارکردن بە کرێکاران دراوە (الحكم الذاتي/ ئۆتۆنۆمی، ١٩٧٨، ل٤٨).

کارگەکـە لـە مـاوەی کارکردنیـدا ڕووبـەڕووی چەنـدین تـەنگ و چەڵەمە و گیروگرفت بووەتـەوە، لەوانـەش ڕووبـەری کارگەکە بچووک بـووە و لەبەرئـەوەی کـەوتبووە نێـو ناوچـەی سـەوز (دارسـتانی هەولێر)ەوە، بۆیە ڕێگەنەدراوە بینایەی زێتری لەسەر دروست بکرێت و ڕووبەرەکەی بەرفراوانتر بکرێت (الحكم الذاتي/ ئۆتۆنۆمی، ١٩٧٨، ل٤٨)، هەروەها وەک لە پێشتریشدا ئاماژەمان پێدا کارگەکە هەر لە سەرەتاوە گرفتی کەمی شیری خاوی هەبووە، بۆیە ناچار بووە نرخی زیاتر بۆ کڕینی شیر بدات، بەمەش بەشێک لە قازانجی لەدەستداوە، هەرچەندە کارگەکە هەوڵیداوە سوود لە پرۆژەی بەخێوکردنی ئاژەڵ لە خەبات[٤] بەتایبـەتی مانگـا و گـامێش ببینێت بۆ دابینکردنـی شـیری خـاو، بـەڵام بەرهـەمی پرۆژەکـە لـە ئاسـتێکدا نـەبووە کـە بتـوانێ پێداویسـتییەکانی کارگەکـە پڕبکاتـەوە، بۆیـە ناچـار کارگەکـە شـیری خـاوی لـە بەغداوە هاوردە کردووە (جماعة من شباب أربيل، د.س، ص٨٤؛ الحكم الذاتي/ ئۆتۆنۆمی، ١٩٧٨، ل٤٨).

دیـارە کارگەکـە ڕۆڵـی هـەبووە لـە دابینکردنـی شـیرەمەنی بـۆ دانیشتوانی هەولێر و ڕەخساندنی هەلی کار بۆ بەشێک لە دانیشتوان، بـەڵام بایەخنـەدان بـە بـەخێوکردنی گـامێش لـە ناوچەکـە لـە ڕۆڵـی کارگەکەی کەمکردووەتەوە، لەلایەکی دیکەوە ماست و پەنیر و قەیماغی خۆماڵی لە نێو هەولێردا زێتر خواستی لەسەر بووە نەک هی کارگەکە، ئەمەش بەهۆی جیاوازی لە تام و باشیی جۆرەکەی، بۆیەشە کارگەکە هەوڵیداوە زێتر بەرهەمەکانی لە دەزگا حکومییەکاندا ساغ بکاتەوە.

**ب/ سەمونخانەی ئۆتۆماتیکی هەولێر:**

دوای ئەوەی وەزارەتی دارایی پرۆژەی خۆراکی ڕۆژانە (ئیعاشـە) ی دانا بۆ دابینکردنی نان و سەمون بۆ هاوڵاتیان بە نرخێکی هەرزان، کە ساڵانە بڕێکی دیاریکراوی ئارد بەسەر شارەکاندا دابەشکراوە، تێیدا ڕەچاوی چڕی دانیشتوان و بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئاستی گوزەرانی شارەکە کراوە (أرشيف محافظة اربيل، ٦/٢١/ ١٩٦٧).

لەم چوارچێوەیەشدا لە ساڵی ١٩٦٠ سەمونخانەی ئۆتۆماتیکی هەولێر دروستکرا، کە پسپۆڕانی ئەڵمانی مەکینە و ئامێرەکانی سەمونخانەکەیان دامەزراند (درویش واخرون، ٢٠١٣، ص٣٦٧) شوێنەکەی لەنێو شاری هەولێر بوو کەوتبووە بەرامبەر مزگەوتی (صەواف) ی ئێستا، بەڕێوەبەرەکەی کەسێکی ئەڵمانی بەناوی (مان فرێد) بوو (دیدار لەگەڵ پ. د. ئەرسن موسا ڕەشید)، کۆی تێچووی پڕۆژەکە (١١٥) هەزار دینار بوو (سەمەد، ٢٠٠١، ل١٩٩) لە ساڵی ١٩٧٢ پشکی ڕۆژانەی سەمونخانەکە (٢٤) فەردە ئارد بووە و ڕۆژانە (٢٤٠٠٠) سەمونی بەرهەمهێناوە (أربيل...، ١٩٧٢، ص١٣٧)، بارستایی هەر سەمونێک (١٥٠) گرام بووە، بە نرخی (٥) فلس بەسەر دانیشتوانی شارەکەدا دابەشکراوە، لەبەرئەوەی نرخی سەمونەکانی هەرزان بووە و جۆرەکەی باش بووە، داواکاری ناوخۆیی زۆر لەسەر بووە (دیدار لەگەڵ تاهیر کەریم عەلی)، بۆیە لە ساڵی ١٩٧٢ ژمارەی بریکارەکانی فرۆشتنی سەمون لە (٣٥) بریکارەوە بۆ (٥٨) بریکار زیادیکردووە (أربيل...، ١٩٧٢، ص١٣٧).

**ج- کارگەی جگەرەی هەولێر:**

ئەم کارگەیە یەکێکە لەو کارگانەی کە سەر بە (دامەزراوەی گشتی تووتن و جگەرە) بوو، دوای دامەزراندنی (کۆمپانیای گشتی جگەرەی سلێمانی)[٥]، بەشێک لەو پارە یەدەگە کەڵەکەبووەی کۆمپانیاکە بۆ بەرژەوەندیی دامەزراندنی کارگەی جگەرەی هەولێر تەرخانکراوە (الحكم الذاتي/ ئۆتۆنۆمی، ١٩٧٨، ل٤٥) وەزارەتی پیشەسازی گرێبەستی لەگەڵ چەندین کۆمپانیا کرد بۆ دروستکردنی کارگەکە، لەوانەش لەگەڵ کۆمپانیای (ساسیب) ی ئیتاڵی بە بڕی (١٨٦١٦٢٦) دینار بۆ دروستکردن و ئامادەکردن و دانانی مەکینە و ئامێرەکانی کارگەکە و ئیشپێکردنی بەشێوەیەکی ئەزموونی، هەروەها گرێبەستێکی بە بڕی (١٠٠٠٠) دینار لەگەڵ (نووسینگەی نێودەوڵەتی بۆ پشکنینی ئەندازەیی)

کـرد بـۆ پشـکنینی مەکینـە و ئامێرەکـان لـەکاتی دروسـتکردن و ئیشپێکردندا، جگە لەمانەش وەزارەتی پیشەسازی گرێبەستێکی دیکەی بـە بـڕی (٨٥٦٩٠٨) دینـاری لەگـەڵ (کۆمپانیـای گشـتی بەڵێنـدەرانی بیناسـازی) کرد بۆ دروستکردنی کارە ئەندازەییـە شارسـتانییەکانی کارگەکە، بەمـەش کۆی گشتی تێچووی کارگەکە گەیشتە (٢٧٢٨٥٣٤) دینـار (أربیـل...، ١٩٧٢، ص١٣٢، ١٣٥). بـەم شـێوەیەش لـە ١ی نیسـانی ١٩٧٣ کارگەکە دامـەزرا و کـارکردنی ئـەزموونی خـۆی لـە ٢٥ی ئـابی هـەمان سـاڵدا دەسـتپێکرد (أرشـیف محافظـة اربیـل، ٢٥/٨/ ١٩٧٣) کـە شـوێنەکەی کـەوتبووە سـەر ڕێگـای هـەولێر- شـەقڵاوە، دوای ئـەوەی پارێزگـای هـەولێر بـووە مەڵبەنـدی ئۆتۆنـۆمی لـە ١ی ئـابی ١٩٧٤ نـاوی کارگەکـە گـۆڕا بـۆ (کۆمپانیـای گشـتی جگـەرەی نیشـتمانی هـەولێر) و کارگەکانی جگەرەی هەولێر و سلێمانی پێیەوە بەسترایەوە، هەروەها لە ١ی نیسـانی ١٩٧٥ کارگـەکانی پوختـەکردنی تـووتن لـە سـلێمانی و هەڵەبجـە و کۆیـە خرانـە سـەر کۆمپانیاکـە (الحکـم الـذاتي/ ئۆتۆنـۆمی، ١٩٧٨، ل٤٥).

دامەزرانـدنی ئـەم کارگەیـە لـە هـەولێر بـۆ چەنـدین هۆکـار دەگەڕێتەوە، لەوانەش بوونی کەرەستەی خـاوی سـەرەکی بەرهـەمهێنان کـە بریتییـە لـە تـووتن، هـەروەها ناوچەکـە کەشـوهەوایەکی تاڕادەیـەک مامناوەنـد و شـێداری ڕێژەیـی هەیـە، ئەمـەش یارمـەتی هـەڵگرتنی بەرهەمەکە دەدات بەبێ بەکارهێنانی ئامێری پێشکەوتووی پیشەسازی، چونکە پیشەسازی تووتن پێویستی بە کەشوهەوایەکی شێداری ڕێژەیی هەیە، تا پارێزگاری لە شێداریی بەرهەمەکە بکات و وشک نەبێتـەوە، لـە هەمان کاتیشدا دەستی کار لـەڕووی چەندێتی و جۆرێتییـەوە فەراهـەم بووە، لەبەرئەوەی کارگەکە پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر لە دەستی کار بـە جیـاوازیی پسـپۆری و شـارەزاییانەوە هـەبووە، لەلایـەکی دیکـەوە کارگەکـە لـە بـازاڕە نـاوخۆیی و دەرەکییەکانـدا نزیـک بـووە، ئەمـەش کاریگەری لەسەر تێچوونی گواستنەوەی بەرهـەم و هێنـانی کەرەسـتەی

سـەرەتایی و یـەدەگی دیکـە هـەبووە (یـونس، تقیـیم...، ٢٠٠٢، ص٢٠٥-٢٠٦).

جگـە لـەم هۆکـارە ئابوورییانـە کـە لـە کـاتی دامەزرانـدنی هـەر پڕۆژەیەکی ئابووریی دیاریکراودا پێویستە لەبەرچاو بگیرێن، هۆکاری سیاسی کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر دامەزراندنی کارگەکە هـەبووە، دیـارە دامەزرانـدنی کارگـەی جگـەرەی هـەولێر دوای ڕێککـەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ ی نێوان حکومـەتی عێراق و بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد هاتووە، بۆیە ئەمە جۆرێک لـە پیشـاندانی نیازباشـی حکومـەت بەرامبـەر کورد بووە، تا وەک ئاماژەیـەک نیشـانی لایەنـەکانی نـاوەخۆ و تەنانـەت دەرەوەش بدات، کە هەنگاوی کرداری نـاوە بۆ پەرەپێدان و بایەخدانی ئابووری بە ناوچە کوردستانییەکان و دامەزراندنی پڕۆژەی پیشـەسازی تیایاندا.

وزەی بەرهـەمهێنانی کارگەکـە (١٠) ملیـۆن جگـەرە بـووە لـە یـەک تاق (وجبة) ی کارکردنی (٧) کاتژمێر و نیوی لـە ڕۆژێکدا، هـەروەها لـە توانایـدا بـووە لـە ڕۆژێکدا دوو تـاق ئـیش بکـات و (٢٠) ملیـۆن جگـەرە بەرهـەم بهێنێـت، ئـەو بـڕە تووتنـەی کـە ڕۆژانـە بـۆ یـەک تـاق بەرهـەم بەکارهاتووە (١٠) تەن بووە، ئەمەش بە بـەکارهێنانی تـووتنی نـاوخۆیی یا تووتنی دەرەکی یا تێکەڵەی هەردوو جۆرەکە، دوو جۆر لـە جگـەرەی بەرهـەمهێناوە، ئـەوانیش بریتـی بـوون لـە جگـەرەی (بەغدا) و جگـەرەی (غـازی)، کـە ئەمـەی دواییـان درێژییەکـەی (٨,٥) سـم بـووە، کارگەکـە لەکاتی بەرهەمهێناندا لـە کاتژمێرێکدا پێویستی بـە (٢٥م٣) ئـاو هـەبووە (أربیـل...، ١٩٧٢، ص١٣٢). بـەگوێرەی وزەی نەخشەکێشـراو بەرهـەمی کارگەکـە لـە (٣٠%) پێویسـتییەکانی عێراقـی بـۆ جگـەرە پڕکردووەتـەوە (هاوکاری، ژ (٤١)، ١٣/١١/ ١٩٧١). هەرچەندە کارگەکە زێتر پشتی بە تووتنی ناوەخۆ بەستووە، بەڵام لە هەندێ کاتدا کێشـەی کـەمی تـووتنی هەبووە و ئەو تووتنـەی لـە نـاوەخۆدا بەرهـەمهاتووە بەشـی کارگەکـەی نەکردووە، بۆیە تووتنی جۆری (ڤێرجینی و شەرقی) لە دەرەوە هـاوردە کردووە (الحکم الذاتي/ ئۆتۆنۆمی، ١٩٧٨، ل٤٦).

کارگەکــە هەوڵیـداوە خزمەتگوزارییــە پێویســتییەکان بەتایبــەتیش خانوو بۆ کرێکاران و فەرمانبەران دابین بکات، لەم چوارچێوەیەشدا لـە ١٤ی تەممووزی ١٩٧٣ بـەردی بناغـەی دروسـتکردنی (١٣٥) خـانوو بـۆ فەرمانبــەران و کرێکــارانی کارگەکــە دانـدرا، کــە لەلایــەن وەزارەتــی پیشەسازییەوە بڕی (١٢٨٠٠٠) دیناری بۆ تەرخانکرابوو، بەڵام ژمـارەی کرێکـارانی کارگــەی جگــەرەی هــەولێر (٣٠٠) کرێکـار بـوو (التـأخي، ع (١٣٩٤)، ٢٦/٧/ ١٩٧٣) بەمەش نیوەی زیـاتری کرێکاران و فەرمانبـەران لە خانوو بێبەش بوون.

**تەوەرەی دووەم: کەرتی ڕستن و چنین (مافووری دەستی):**

هـەر لـە کۆنـەوە پیشـەی تـەونکاری و ڕسـتن و چنـین لـە هـەولێر بایـەخی پێـدراوە و دانیشـتوانی ناوچەکـە بوونەتـە خـاوەن ئـەزموون، هەروەها بوونی بەروبوومی لۆکە و خوری وەک دوو کەرەستەی خـاو، کـە دەچنـە نێـو چوارچێـوەی پیشەسـازی ڕسـتن و چنینـەوە، ئەمانـە کاریگــەرییان لەســەر بەرەوپێشــبردنی ئــەم کەرتــە پیشــەسـازییە لــە ناوچەکەدا هەبووە و بووەتە یـەکێک لـە کەرتـە پیشەسـازییە گرنگەکانی هەولێر، لـە مـاوەی لێکۆڵینەوەکەدا گرنگترین پڕۆژەی پیشەسازی ئـەم بوارە کارگەی مافووری دەستی هەولێر بووە.

دوای ئـەوەی حکومـەت بڕیاریدا لـە تـەممووزی ١٩٧٠ ژمارەیـەک مەڵبەند بۆ پیشەسازی مافووری دەستی لە هەر یەک لە بەغدا و هەولێر و موسڵ بکاتەوە، دواتریش وەزارەتی پیشەسازی بڕیـاری دامەزراندنی چەند مەڵبەندێکی دیکەی لە هەر یەک لە (سـەماوە و کۆیـە و ڕەواندز و ئامێدی و دهـۆک و مەندەلی) دەرکرد، بۆیـە دوای زیـادبوونی ژمـارەی مەڵبەندەکان و بەرفراوانبوونی پیشەسازی مافووری دەستی، وەزارەتی پیشەســازی لــە ٢٥ی کــانوونی دووەمــی ١٩٧١ (کۆمپانیــای گشــتی مافووری دەستی لە پارێزگای هەولێر) بـە سـەرمایەی نیـو ملیۆن دینـار دامەزرانـد، کـە سـەر بـە (دامـەزراوەی گشـتی پیشەسـازی ڕسـتن و

چنین)[٦] بوو، هەموو ئەو ناوەندانەی کە لە سەرەوە ئاماژەی بۆ کرا بە کۆمپانیاکەوە بەسترانەوە، کۆمپانیاکە پێکهاتبوو لە بارەگای کۆمپانیا و کارگەی مافووری دەستی و یەکەی ڕستن و چنین (أربیل...، ١٩٧٢، ص١٢٤-١٢٨).

ژمارەی کرێکارانی کۆمپانیاکە لە ساڵی ١٩٧٢ (١١٧) کرێکار و تەکنیکار بوون، ژمارەی قوتابیانی پیشەیی[٧] تیایدا (٧٠٠) قوتابی بوون، ژمارەی فەرمانبەرانیشی (٥٠) فەرمانبەر بوو (وزارة الصناعة، ١٩٧٣، ص١٢٤)، واتە (٨٦٧) کەس کاریان تێدا کردووە، لە ساڵی ١٩٧٤ ژمارەی کرێکاران و قوتابیان زیادیکردووە بۆ (١٧٨٤) کەس و ژمارەی فەرمانبەرانیش بۆ (٧٤) فەرمانبەر، واتە کۆی گشتی دەستی کار گەیشتووەتە (١٨٥٨) کەس (وزارة الصناعة والمعادن، ١٩٧٦، ص١١١)، بەمەش بە ڕێژەی (١١٤,٣%) ژمارەی دەستی کار زیادیکردووە، بێگومان ئەمەش ئاماژەیە بۆ بەرفراوانبوونی کۆمپانیاکە و ڕەخساندنی دەرفەتی کاری زێتر بۆ دانیشتوانی شارەکە و کەمبوونەوەی بێکاری. هەروەها لە ساڵی ١٩٧٣ کرێ و پاداشتی کرێکاران بڕی (٨٣٨٢٠) دینار بووە، ئەم بڕەیە لە ساڵی ١٩٧٤ زیادیکردووە بۆ (١١٦٦٥٣) دینار (وزارة الصناعة، ١٩٧٣، ص٦٠)، واتە بە ڕێژەی (٣٩,١%) کرێ و پاداشت زیادیکردووە. بەرهەمی کۆمپانیاکە دروستکردن و چنینی مافوور بووە لە ڕیسی خوری، موو، لۆکە، ئاوریشم، یان ڕیسی تێکەڵ، بە هەردوو جۆری مافووری نەخشێندراو و شوێنەواریی[٨]، قەبارەی مافوورەکانیش (٣×٣) و (٤×٤) و (٥×٥) بووە، کە بە نەخشی ناوخۆیی و جیهانی ڕازاونەتەوە و ڕکابەری مافووری بیانییان لەڕووی کوالێتی و ڕەنگ و نەخشەوە کردووە (أربیل...، ١٩٧٢، ص١٣٠؛ وزارة الصناعة والمعادن، ١٩٧٦، ص١١٢).

بەرهەمی کۆمپانیاکە لە ساڵی ١٩٧٢-١٩٧٣ (٧٥٨٦م٢) مافووری نەخشێندراو بووە، لە ساڵی ١٩٧٣-١٩٧٤ بەرهەمەکەی بووە بە (١٠٥٧٩م٢) واتە بەڕێژەی (٣٩,٤%) زیادیکردووە، هەروەها لە ساڵی

١٩٧٢-١٩٧٣ بەهای بەرهەمەکەی (٩٠٦٨٤) دینار بووە، لە ساڵی ١٩٧٣-١٩٧٤ بـووە بـە (١٢٦٩٤٨) دینـار (وزارة الصـناعة والمعـادن، ١٩٧٦، ص١١٢)، واتـە بـە ڕێـژەی (٣٩،٩%) بـەهای بەرهـەم زیـادیکردووە. لەمەشەوە دەردەکەوێت کە بەرهـەم و بەهای بەرهـەمی کۆمپانیاکـە لـە مـاوەی سـاڵێکدا زیادیـانکردووە و زیادکردنەکـەش وەکـو یـەک بـووە. سەبارەت بە وزەی بەرهەمی کۆمپانیاکە بەشێوەیەکی گشتی لە ساڵێکدا (٩٨٥٩م٢) بووە، (٨٠٤٤م٢) بۆ قەبارەی (٣×٣) و (١٦٠٧م٢) بۆ قەبارەی (٤×٤) و (٢٠٨م٢) بۆ قەبارەی (٥×٥) (وزارة الصناعة والمعادن، ١٩٧٦، ص١١٠)، بەڵام ئەگەر وزەی نەخشەکێشراوی بەرهەم لەگەڵ ئەوەی کە بـە کـردار بەرهـەم هـاتووە بـەراورد بکـەین، دەردەکـەوێت کـە جیـاوازی لـە نێوانیانـدا هەیـە، بـۆ نموونـە لـە سـاڵی ١٩٧٢-١٩٧٣ مـافووری بەرهـــەمهاتوو (٧٥٨٦م٢) بـــووە، ئەمـــە لـــە کاتێکـــدا بەرهـــەمی نەخشەبۆکێشـراوی ئـەو سـاڵە (١٠١١٠٠م٢) بـووە، واتـە ڕێـژەی وەدیهـاتووی پلانەکـە (٧٥%) بـووە (رشـید، ١٩٧٩، ص٤٤)، هۆکارەکـانی ئەمـەش بـۆ ئـەو گیروگرفتانـە دەگەڕێتـەوە کـە کۆمپانیاکـە ڕووبـەڕووی بووەتەوە وەک لە دواتردا ئاماژەی پێدەکەین.

سەبارەت بە فرۆشتنی بەرهەمـەکانی کۆمپانیاکە لـە ساڵی ١٩٧٢-١٩٧٣ بـڕی بەرهـەم (٧٥٨٦م٢) بـووە و بـڕی فرۆشـراویش (٤٦٢٢م٢) بووە، واتـە تـەنیا (٣٥،٩%) ی ئـەو مـافوورەی بەرهـەمهاتووە لـە بازاڕدا ساغ بووەتەوە و فرۆشراوە، هۆکاری ئەمەش بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کـە لـە قۆنـاغی سـەرەتای بەرهەمـدا بـووە، بۆیـە ئاسـان نـەبووە بـە زوویـی بازاڕێک بۆ سـاغکردنەوەی مافوورەکان بدۆزرێتـەوە، لەلایـەکی دیکـەوە بڕێکی زۆر لە بەرهەمەکانی وەک نۆبەرەی کارکردن بەشێوەی دیـاری پێشـکەش بـە دام و دەزگـا و کەسـایەتییەکان کـراوە. بـەڵام لـە سـاڵی ١٩٧٣-١٩٧٤ دا بـــڕی بەرهـــەم (١٠٥٧٩م٢) و بـــڕی فرۆشـــراویش (١٠٤٣٦م٢) بـووە، واتـە (٩٨،٦%) ی بەرهـەمی کۆمپانیاکـە فرۆشـراوە، بێگومان ئەمەش ڕێژەیەکی باش بووە لەلایەک ئاماژەیە بۆ سـەرکەوتنی

کۆمپانیاکـە لـە دۆزینـەوەی بـازاڕ بـۆ سـاغکردنەوەی بەرهەمـەکانی، لەلایـەکی دیکـەوە نیشـانەی بـەکاربردنی نـاوخۆیی مـافوور بـووە لـەو ساڵەدا[٩]. نرخی مافوورەکان بەپێی جۆرەکەی جیاواز بووە، بۆ نموونـە نرخی (١م٢) مافووری نەخشێنداراو (١٢) دینار و مافووری شـوێنەواری (٢٠) دینـار بـووە، بـەرزیی نرخـی جـۆری دووەمیـان وایکـردووە کـەمتر بەرهەمــەکانی لــە بــازاڕدا ســاغ ببێتــەوە، کۆمپانیاکــە بەشــێک لــە بەرهەمەکانی خۆی لە ڕێگەی ئەو پێشـانگایانەوە فرۆشـتووە کە سـاڵانە لە هەولێر و بەغدا و موسـڵ کردوونەتیـەوە، هـەروەها بەرهەمـەکانی بـە فەرمانبەرانی دەزگا حکومییەکان بەشـێوەی قیسـتی مانگانـە فرۆشـتووە، بۆ نموونە لە (١-٥٠) دینار بە (٥) قیست و لـە (٥١-١٠٠) دینـار بـە (١٠) قیست و لە (١٠١) دینار بەسەرەوە بە (١٥) قیستی فرۆشتووە (أربيل...، ١٩٧٢، ص١٣٠).

کۆمپانیاکە هەوڵیداوە خزمەتگوزارییـە پێویسـتییەکان بۆ کرێکـاران و فەرمانبــەران دابــین بکــات، لــەم چوارچێوەیەشــدا لــە ســاڵی ١٩٧٢ توانیویــەتی (٧٠) خــانوو بــۆ کرێکــاران و (٣٢) خــانوو بــۆ فەرمانبــەران (وادي، ١٩٧٦، ل٧٤) و لە ساڵی ١٩٧٤ (٢٠) خانووی دیکە بۆ کرێکـاران دروسـت بکـات (الثـورة، ع (١٧٢٦)، ١/٤/ ١٩٧٤)، بێگومـان ئـەم ژمـارە خانووەش بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی کرێکار و فەرمانبەران کەم بـووە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا بـۆ ئـەو سـەردەمە بایەخـدار و بـەرچاو بـوون، چونکە خانووی نوێ و خۆش بوون.

کۆمپانیاکە ڕووبەڕووی چەندین گیروگرفت بووەتەوە، لەوانەش لە هەندێ کاتدا بەهۆی پچڕانی کارەبا و تێکچوونی دەزگا و ئامێرەکانـەوە ماوەی کارکردن کەمبووەتەوە و پلانی بەرهـەمهێنان لـەڕووی چەندێتی و بەهاوە دابەزینی بەخۆیـەوە بینیوە (وزارة الصـناعة والمعـادن، ١٩٧٥، ص٥٨)، بەشـێکی دیکـەی گرفتـەکانی کۆمپانیاکـە پەیوەنـدییان بـە بـاری داراییــەوە هــەبووە، بــەهۆی ئــەوەی بەشــێکی زۆر لــە بەرهەمــەکانی بەشـێوەی قیسـت بـە فەرمانبـەران فرۆشـتووە، بۆیـە لـەکاتی وەرگرتنـی

قیستی مانگانە ڕووبەڕووی تەنگ و چەڵەمە بووەتەوە و بەشێک لە فەرمانبەران پارەکەیان لە کاتی خۆیدا نەداوە، کۆمپانیاکەش پێویستی بە پارەی نەختینە هەبووە تاکو پێویستییە داراییەکانی خۆی پێ جێبەجێ بکات و تێچوو و خەرجییەکانی خۆی پێ دابین بکات، هەروەها کەمی ڕیسی لۆکە کێشەیەکی دیکەی بەردەم کۆمپانیاکە بووە، کە کەرتی تایبەت نەیتوانیوە ڕیسی لۆکەی پێویست لە ناوەخۆدا دابین بکات، بۆیە پەنا بۆ هێنانی ڕیسی دیکەی وەک ڕیسی خوری بردراوە (وادی، ۱۹۷٦، ل۷۳-۷٤). لە گرفتەکانی دیکە نەبوونی کرێکاری مەشقپێکراوی باش و بەردەوام بووە، بەتایبەتی کە هەندێکیان دوای ماوەیەک لە کارکردن و فێربوونی چنینی مافوور وازیان لە کارەکە هێناوە، ئەمەش لە ئەنجامی چەندین هۆکار بووە وەک کەمیی کرێ و پاداشت یا ئەوەتا ڕوویان لە کارێکی دیکە کردووە، لەلایەکی دیکە لەبەرئەوەی قوتابییە مەشقپێکراوەکان تەمەنیان بچووک بووە، بۆیە کات و هەوڵ و کۆششێکی زۆریان ویستووە تا فێری چنینی مافوور ببن (رشید، ۱۹۷۹، ص٤٤).

کۆمپانیای مافووری دەستی هەولێر لە چوارچێوەی پارێزگای هەولێردا دوو لقی دیکەی هەبوون کە بریتی بوون لە کارگەی مافووری کۆیە و کارگەی مافووری ڕەواندز، کارگەی یەکەمیان لە حوزەیرانی ۱۹۷۰ دامەزراوە، لە ساڵی ۱۹۷۱، (۱۲۳) قوتابی کچ کە تەمەنیان لەنێوان (۹-۱۰) ساڵاندا بووە بەشێوەی گرێبەست کاریان تێداکردووە، کرێی ڕۆژانەیان (۱۰۰-۱٥۰) فلس بووە (أرشیف معمل السجاد الیدوي فـي کویسنجق، ۱۱/۲۱/ ۱۹۷۱)، لەگەڵ زیادبوونی تەمەنیان و شارەزاییان کرێی ڕۆژانەیان زیادیکردووە، بۆ نموونە لە ساڵی ۱۹۷۳ هەندێکیان کرێکەیان گەیشتووەتە (۱) دینار (أرشیف معمل السجاد الیدوي فـي کویسنجق، ۱۱ /۹/ ۱۹۷۳)، قوتابییەکان لە تەمەنی (۱۸) ساڵیدا لە کارگەکە دامەزراون. بەرهەمی مانگانەی کارگەکە لە ساڵی ۱۹۷۲ نزیکەی (۱۲۰) مەتر چوارگۆشە مافووری قەبارە (٤×۳) بووە و

بەرهەمەکەشی بۆ شاری هەولێر ڕەوانەکراوە (دیدار لەگەڵ کاوە عوسمان سەید حەمەد). کارگەی دووەمیان لە ٢٢ی نیسانی ١٩٧٢ لە ڕەواندزدا دامەزراوە، کە (١٢٠) فەرمانبەر و کرێکاری هەبووە، زۆرێک لە قوتابیانی کچ لەکاتی پشووی هاویندا کاریان تێدا کردووە (دیدار لەگەڵ خۆشەوی عەلی باویل ئاغا)، کارگەکە مانگانە ١٠-١٢ مافووری قەبارە (٣×٤) ی بەرهەمهێناوە، کە زێتر لە ناوەخۆدا بەکاربراوە، لە هەندێ کاتیشدا بەرهەمەکانی بۆ ناوچەکانی باشوور و ناوەڕاستی عێراق هەناردە کراوە، جگە لە چنینی مافوور لە کارگەکەدا تابلۆی دیوار بە قەبارەی بچووک دروستکراوە، ئەم کارگەیە لە ساڵی ١٩٧٤ بەهۆی ناسەقامگیری بارودۆخی سیاسی ناوچەکە لە کار وەستاوە (دیدار لەگەڵ فوئاد محەمەد شەریف سلێمان).

دەکرێ بڵێین کردنەوەی کارگەی مافووری دەستی لە هەولێر هەنگاوێکی گرنگ بوو، چونکە ڕستن و چنین و تەونکاری بەشێکی سەرەکی پیشە دەستییەکانی هەولێری پێکهێناوە، بۆیە ئەمە بووە مایەی برەودانی زیاتر بە دروستکردنی مافوور و لە پیشەیەکی دەستییەوە گۆڕی بۆ پیشەسازییەکی پشت بەستوو بە ئامێر و تەکنیکی نوێ، لەگەڵیشیدا شارەزایی و دەسترەنگینی ئەو کەسانەی زێتر کرد، کە بەم پیشەیەوە خەریک بوون. لەلایەکی دیکەوە هۆشیاریی پیشەیی و پیشەسازی زێتری لای جوتیاران دروستکرد، کە لە کاتی دەستبەتاڵیدا سەرقاڵی پیشەی بە کەڵک بن، هەروەها زیندووکردنەوەی ئەم پیشەسازییە لە ناوچە هەژارنشینەکانی شارەکاندا بایەخێکی گەورەی هەبوو بۆ ڕەخساندنی هەلی کار و بەرزکردنەوەی ئاستی بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتییان، ئەمە سەرباری بایەخی ئابووری ئەم پیشەسازییە کە خۆی دەبینێتەوە لە بەدەستهێنانی دراوی قورس لە ئەنجامی بەرهەمهێنانی مافوور لە ناوەخۆدا لەجیاتی ئەوەی لە دەرەوە هاوردە بکرێت.

**تەوەرەی سێیەم: کەرتی بیناسازی:**

پیشەسازی بیناسازی لقێکە لە لقەکانی پیشەسازییە گۆڕاوەکان کە بە پیشەسازی بەرهەمە نافلزییەکانیش ناسراوە، لە کۆمەڵێک پیشەسازی پێکدێت کە کەرەستەی بیناسازی وەک کەرپووچ و چیمەنتۆ و شووشە و گەچ و کاشی و چەندانی دیکە بەرهەم دەهێنێت، دامەزراندن و بڵاوبوونەوەی پیشەسازی بیناسازی لە هەر ناوچەیەکدا بەندە بە فەراهەمبوونی جۆرەکانی کەرەستەی خاو بەتایبەتی بەردی کلس و گەچ و قوڕ و چەو و لم و بەردی مەڕمەڕ، ناوچەکانی هەولێر دەوڵەمەندە بەم کەرەستانە (بڕوانە: شاوەیس، ١٩٩٨، ل٢٩؛ المحمدي، ٢٠٠٦، ص٦٢)، بەڵام وەک پێویست نەتواندراوە سوودی لێ ببیندرێت.

دامەزراندنی کۆمەڵە هەرەوەزییەکانی تایبەت بە خانووبەرە و بیناسازی لە لیوای هەولێر ڕۆڵی هەبووە لە پەرەپێدانی کەرتی بیناسازی لە لیواکەدا، هەر لە سەردەمی پاشایەتییەوە کۆمەڵەی هەرەوەزی تایبەت بە دروستکردنی خانووبەرە لە هەولێر هەبووە، لە ٣٠ی ئەیلولی ١٩٥٤ یەکەمین کۆمەڵەی تایبەت بە دروستکردنی خانووبەرە لە هەولێر لەژێر ناوی (کۆمەڵەی هەرەوەزی سنوورداری دروستکردنی خانووبەرە بۆ فەرمانبەران لە هەولێر)[١٠] دامەزراوە، لە ساڵی ١٩٧٤ جگە لەم کۆمەڵەیە (٤) کۆمەڵەی دیکەی تایبەت بە بیناسازی لە هەولێردا هەبوون کە بریتی بوون لە (کۆمەڵەی دروستکردنی خانوو لە عەنکاوە، کۆمەڵەی شۆڕش بۆ دروستکردنی خانوو، کۆمەڵەی دروستکردنی خانوو بۆ مامۆستایان لە ڕووناکی، کۆمەڵەی کانی بۆ دروستکردنی خانوو لە شەقڵاوە)، هەر کۆمەڵەیەکیش نزیکەی (٢٠٠) ئەندامی هەبووە (جماعة من شباب أربيل، د. س، ص١٦١-١٦٢؛ الجمهورية العراقية، المجموعة الاحصائية السنوية ١٩٧٤، ص٣٦٨)

کردنەوەی لقی بانکی خانووبەرە (المصرف العقاري) هەر لە ساڵی (١٩٥٧)ەوە لە شاری هەولێر، کاریگەری لەسەر گەشەسەندنی کەرتی

بیناسازیی شارەکەدا هەبوو، بانکەکە بە پێدانی قەرز هاوکاری چەندین کۆمەڵەی هەرەوەزی نیشتەجێکردنی کردووە لە دروستکردنی خانوو بۆ ئەندامانی ئەو کۆمەڵانە، هەروەها قەرزی بەو فەرمانبەرانەش داوە کە بوونەتە خاوەنی زەوی میری یا زەوی شارەوانی. بڕی ئەو پارەیەی کە سالانە وەک پێشینە بە کۆمەڵە هەرەوەزییەکان و فەرمانبەرانی داوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و زیاد و کەمیکردووە، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٥٨ (١٨٣٤٩٥) دینار بووە، بەڵام لە ساڵی ١٩٦٣ کەمبووەتەوە بۆ (٧٢٠٥٠) دینار، کەچی لە ساڵی ١٩٦٦ زیادیکردووە بۆ (١١٣٢٧٠) دینار (جماعة من شباب أربيل، د. س، ص١٦١-١٦٣). بێگومان ئەمەش ڕۆڵی هەبووە لە بووژانەوەی بازاڕی کەرەستەی بیناسازی و خانووبەرە لە ناوچەکەدا.

یەکێک لە پرۆژە پیشەسازییە گرنگەکانی بواری بیناسازی لە هەولێر دامەزراندنی کارگەی کەرپووچ بوو، بەمەبەستی زێتر پەرەپێدان بە بواری پیشەسازی بیناسازی و فەراهەمکردنی کەرەستە بیناسازییەکان بۆ هاولاتیان لە ساڵی ١٩٦٦ شارەوانی هەولێر بە هاوکاری کەرتی تایبەت (کۆمپانیای خانزاد بۆ پیشەسازی کەرەستەی بیناسازی)[١١] ی لە هەولێر دامەزراند، سەرمایەی کۆمپانیاکە (١٢٠٠٠٠) دینار بوو، کە کەرتی تایبەت بە (٦٥٠٠٠) دینار و شارەوانیش بە (٥٥٠٠٠) دینار پشکداری تێداکرد، نیاز لە دروستکردنی کۆمپانیاکە بەشێوەیەکی سەرەکی دامەزراندنی کارگەیەکی کەرپووچ بوو (جماعة من شباب أربيل، د. س، ص٥٤؛ دەرگەڵەیی، ٢٠٠٢، ل١٥٧)، بەڵام دوای تێپەڕبوونی پێنج ساڵ بەسەر دامەزراندنی کۆمپانیاکە سەرکەوتوو نەبوو لە بەجێهێنانی کارەکانی، بۆیە دوای ئەوەی شارەوانی هەولێر لە ساڵی ١٩٧١ توانی بڕی (١٧٠٠٠٠) دینار دابین بکات، لەلایەن کۆمپانیایەکی ئەڵمانییەوە دەستکرا بە دروستکردنی کارگەکە و لە ساڵی ١٩٧٤ کارەکانی تەواو بوو، شوێنی کارگەکە کەوتبووە سەر ڕێگەی مەخمور نزیک بەستی (قەتەوی)، ئەمەش دوای ئەوەی پشکنین بۆ

خۆڵی ناوچەکە کرابوو، کە جۆری خۆڵەکەی قوڕی لماوییە و (کبریت و کالیسیۆم) ی کەم تێدایە و بۆ دروستکردنی کەرپووچ شیاوە، وزەی نەخشەکێشراوی کارگەکە بەرهەمهێنانی (٢٥٠٠٠) کەرپووچ بووە لە ڕۆژێکدا، بەڵام لە ساڵی یەکەمی بەرهەمیدا ڕۆژانە (٣٥-٤٠) هەزار کەرپووچی دروستکردووە، بەمەش بەرهەمی ڕاستەقینەی لە وزەی نەخشەکێشراو زیاتر بووە. دوای ماوەیەک لە ئیشپێکردنی، فڕنی کارگەکە دەرز و داتەپینی تێکەوت، هۆکاری ئەمەش گرفت بوو لە وزەی کارەبا، کە لە کاتی جیاجیادا پچڕاوە و بەمەش پلەی گەرمیی فڕنەکە بەرزبووەتەوە و لە پڕێکدا نزم بووەتەوە، هەروەها بەکارهێنانی جۆرە کەرپووچێکی ئاگرین کە کەرەستەکانی لە ئەڵمانیەوە وەرگیرابوو و لە عێراق دروستکرابوو، جۆری ئەو کەرپووچانە بەرگەی ئەو گەرمییەیان نەگرت کە لە فڕنەکەدا هەبوو، بۆیە ئەمانە هەموو وایانکرد فڕنەکە لەکاربکەوێت، هەرچەندە بڕی (١٠٠) هەزار دینار تەرخانکرا بۆ کڕینی کەرپووچە ئاگرینەکان لە ئەڵمانیا و چاککردنەوەی فڕنەکە، بەڵام تا ساڵی (١٩٧٧)یش نەتوانرا کارگەکە بەگەڕبخرێتەوە (عمر، ١٩٧١، ل٤٨، ٥٠؛ الحكم الذاتي/ ئۆتۆنۆمی، ١٩٧٧، ل٨٢).

جگە لە کارگەی کەرپووچ، هەندێ پرۆژە و کارگەی دیکەی پیشەسازی بیناسازی لە هەولێر لە دوای ساڵی ١٩٧٠ دامەزران، بەڵام هەندێکیان پرۆژەی سەرەتایی و بچووک بوون و هەندێکی دیکەشیان لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا هێشتا نەکەوتوونەتە قۆناغی بەرهەمهێنان، لەوانەش کارگەی قیری کۆنکریتی (الاسفلت الكونكريتي) ی کە دروستکراوی ئەڵمانیای دیموکراتی بووە و لە ساڵی ١٩٧٢ لەلایەن وەزارەتی شارەوانی بڕی (٥٠٠٠٠) دیناری بۆ خەرجکراوە (أربيل...، ١٩٧٢، ص٧٣)، کارگەکە کەوتبووە سەر ڕێگای هەولێر- مەخمور، بەرهەمەکەی بۆ قیرتاوکردنی شەقامەکانی نێو شاری هەولێر سوودی لێ بیندراوە (دیدار لەگەڵ عومەر محەمەد فەرهادی). هەروەها دامەزراندنی کارگەی مەڕمەڕ (معمل رخام) ی هەولێر لە ساڵی ١٩٧٤

لەسەر ڕووبەری (١٦٠٠٠م٢) کە کارگەیەکی حکومی بووە و ئامێرەکانی لەلایەن کۆمپانیای (گریگۆری) ی ئیتاڵییەوە دروستکراوە و تێچووی دامەزراندنی زێتر لە نیو ملیۆن دینار بووە (حسین، ٢٠٠٢، ص٧٢؛ یونس، تحلیل...، ٢٠٠٥، ص١١٩)، کە کەوتبووە سەر ڕێگای هەولێر-شەقلاوە پشت کارگەی جگەرەی هەولێر (دیدار لەگەڵ عومەر محەمەد فەرهادی)، کارگەکە لە کانە بەردەکانی گەلاڵە بەردی مەڕمەڕی بەرهەمهێناوە، وزەی نەخشەبۆکێشراوی ساڵانەی بەرهەمهێنانی (١٠٠) هەزار مەتر چوارگۆشە بووە (رشدي، ١٩٧٦، ص١٩)، لە ٧ی نیسانی ١٩٧٦ دا کارکردنی ئەزموونی خۆی دەستپێکردووە و لە ساڵی یەکەمی کارکردنیدا (٧٠) هەزار مەتر چوارگۆشە بەردی مەڕمەڕی بەرهەمهێناوە و (١٠٣) کرێکار کاریان تێداکردووە (الحكم الذاتي/ ئۆتۆنۆمی، ١٩٧٨، ل٤٧-٤٨). هەروەها هەر لەو ماوەیەدا چەند کارگەیەکی کاشی و بلۆکی کەرتی تایبەت کرانەوە، بەڵام زێتر کارگەی دەستی بوون و تەکنیکی نەبوون، وەک کارگەی کاشی (هندرێن)، کارگەی کاشی (محەمەد گەلاڵی)، کە ئەمانە هەردوو جۆری کاشی سادە و مۆزایکیان بەرهەمهێناوە، هەروەها کارگەی بلۆکی (نەسرەت مەحمود حەلاق) و کارگەی بلۆکی (عەبدوڵلا فەرحان مەولود) کە تەنیا ئەمەی دواییان بەشێوەی میکانیکی بلۆکی بەرهەمهێناوە و لە تەمموزی ١٩٧٣ دامەزراوە (ژووری بازرگانی و پیشەسازی هەولێر، ناوی کارگە پیشەسازییەکانی پارێزگای هەولێر(زانیاری بڵاونەکراوە)؛ دیدار لەگەڵ ڕەشاد ئەحمەد).

لە ڕێگەی بەرهەمە ناوخۆییەکان و هاوردەکردنی کەرەستەکانی خانووبەرە لە دەرەوە، بەتایبەتی لە هەردوو لیوای موسڵ و بەغدا، شاری هەولێر لەڕووی بیناسازییەوە پەرەسەندنی باشی بەخۆیەوە بینیوە و ژمارەیەکی بەرچاو لە کرێکاران لەم کەرتەدا کاریان کردووە. بەگوێرەی ئامارە فەرمییەکان لە ساڵی ١٩٦٣ ژمارەی ئەو خانوو و بینایانەی کە لە شارەکەدا دروستکراون گەیشتووەتە (٣٩٥) خانوو و

بینا، کۆی تێچوویان (٢٢٣٨٢١) دینار بووە (الجمهورية العراقية، نتائج الاحصاء الانشائي لسنة ١٩٦٣، ص١٨٤-١٨٥)، تێکڕای ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە کەرتی بیناسازیدا کاریان کردووە گەیشتووەتە (٩٣٣) کەس، کە (٤٢١) کەس لە کەرتی حکومی بووە و کرێ و پاداشتیان (٨٣٣٦٦) دینار بووە، (٥١١) کەسیش لە کەرتی تایبەتدا بووە و کرێ و پاداشتیان (٨٩١٥٨) دینار بووە (الجمهورية العراقية، نتائج الاحصاء الانشائي لسنة ١٩٦٣، ص٩). بەگوێرەی ئاماری فەرمی ساڵی ١٩٧٢ (٥٦٣) خانوو و دوکان و شوقە دروستکراون، کۆی تێچوویان (٩٩٠٢٧٠) دینار بووە (الجمهورية العراقية، المجموعة الاحصائية السنوية ١٩٧٢، ص٤٠٥)، تێکڕای ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە کەرتی بیناسازیدا کاریان کردووە گەیشتووەتە (٣٧٩٤) کەس، کە (٣٢٣٩) کەس لە کەرتی حکومی بووە و کرێ و پاداشتیان (٧٧١٩٦٨) دینار بووە، (٥٥٥) کەسیش لە کەرتی تایبەت بووە و کرێ و پاداشتیان (١٢٦٦٧٢) دینار بووە (الجمهورية العراقية، المجموعة الاحصائية السنوية ١٩٧٢، ص٤١٨-٤١٩).

**تەوەرەی چوارەم: کەرتی چاپەمەنی:**

دەرکەوتنی یەکەمین چاپخانەی کوردی لە لیوای هەولێر دەگەڕێتەوە بۆ مێژوونووس و ڕۆژنامەنووس حوسێن حوزنی موکریانی (١٨٩٣-١٩٤٧)، لەو کاتەی موکریانی لە شاری حەڵەب گیرساوەتەوە لە ساڵی ١٩١٥ چاپخانەیەکی لە ئەڵمانیا کڕی و قاڵبی تایبەتی بۆ پیتە کوردییەکان دروستکرد و کەوتە چاپکردنی کتێب (عومەر، ٢٠٠١، ل١٤٨)، دواتر لە ساڵی ١٩٢٦ چاپخانەکەی بەناوی چاپخانەی (زاری کرمانجی) بۆ ڕەواندز گواستەوە، دوای مردنی لە ساڵی ١٩٤٧ چاپخانەکە دەبێتە موڵکی (گیوی موکریانی)[١٢] برای و ناوی چاپخانەکەی گۆڕیوە بۆ چاپخانەی کوردستان، تا ساڵی ١٩٧٥ زیاتر لە (٥٠) کتێب لە چاپخانەکە بە چاپ گەیشتوون، لەگەڵ چەندین

گۆڤاری جۆراوجۆر[١٣]. جگە لەم چاپخانەیە گیوی موکریانی لە ساڵی ١٩٦٠ چاپخانەیەکی پێشکەوتووتری لە ئەڵمانیا کڕیوە و لە شاری هەولێر دایمەزراندووە، کە جگە لە کتێب توانیویەتی کارتی پیرۆزبایی ڕەنگاوڕەنگ چاپ بکات (هەتاو، ژ (١٧١)، ١٥ی شوباتی ١٩٦٠، ل٢٥).

لەدوای ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دوو چاپخانەی حکومی لە شاری هەولێر دامەزرێندران، کە ئەوانیش چاپخانەی پەروەردە و چاپخانەی شارەوانی بوون. بیرۆکەی دامەزراندنی چاپخانەی پەروەردە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧١ کە لەو کاتەدا بە چاپخانەی خوێندنی کوردی ناونرا و ئامانجی سەرەکی دامەزراندنیشی چاپکردنی کتێبەکانی پڕۆگرامی خوێندنی کوردی قوتابخانەکان بوو (حسین، ٢٠٠٢، ص٧٠)، بەمەبەستی دابینکردنی ئامێر و بەکارخستنی چاپخانەکە وەزارەتی کاروباری باکوور (وزارة شؤون الشمال)[١٤] لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٧٣ گرێبەستێکی لەگەڵ کۆمپانیای (ئۆنیکا) ی ئەڵمانیای دیموکراتی بە گوژمەی (٣٥٠) هەزار دینار مۆرکرد، دواتر لە ١٨ی ئەیلوولی ١٩٧٤ حکومەت گرێبەستێکی دیکەی لەگەڵ کۆمپانیای (لاینۆ تایپ) ی بریتانی بە بڕی (٦٠) هەزار دینار مۆرکرد بۆ دانانی سێ ئامێری گەورەتری چاپ و زیادکردنی توانای چاپکردن، لە ٢٧ی کانوونی دووەمی ١٩٧٥ کارکردن لە چاپخانەکە تەواو بوو و کۆی گشتی تێچووەکەی گەیشتە بڕی (٦٠٣٠٠٠) دینار، بەڵام دواتر لە ٥ی کانوونی دووەمی ١٩٧٨ دا کرایەوە، چاپخانەکە کەوتبووە گەڕەکی ئازادی لەسەر ڕووبەری (١٠) هەزار مەتری چوارگۆشە بوو، وزەی چاپخانەکە چاپکردنی (٦٠) هەزار مەلزەمە بووە لە یەک تاقی ئیشکردندا، چاپخانەکە لە سێ بەش پێکهاتبوو، بەشی بەرهەمهێنان و بەشی کرێکاران و بەشی کارگێڕی و هونەری، جگە لە تەکنیکار و کارگێڕان (٤٩) کرێکار و فەرمانبەر کاریان تێدا کردووە (برایەتی، ژ (١١)، ٢٠/١/ ١٩٧٤؛ وادی، لەگەڵ چاپخانەی...، ١٩٧٨، ل٤٨-٤٩؛ جەباری، ٢٠٠٩، ل٢٤٦٧).

سەبارەت بە چاپخانەی شارەوانی لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٧٠ لەلایەن سەرۆکایەتی شارەوانی هەولێرەوە هەوڵی دامەزراندنی چاپخانەیەک درا (ئەنوەر، ٢٠١٢، ل١٠٠)، بەڵام هەوڵەکان دوای چەند ساڵێک ئینجا بە ئاکام گەیشتن، بۆیە لە ١ی حوزەیرانی ١٩٧٤ چاپخانەی شارەوانی هەولێر دامەزرا و دەستی بەکارکردووە (نەجار، ٢٠١٦، ل١٢٩)، کە لە چەند مەکینەیەک پێکهاتبوو لەوانە مەکینەی چاپکردن کە لە جۆری (هیدل بۆرک) ی ئەڵمانی بوو، لە یەک کاتژمێردا لە توانایدا بوو (٤٥٠٠) لاپەڕە چاپ بکات، مەکینەی (کۆمۆپڕا) کە لە مەکینەی چاپکردنەکە بچووکتر بووە و لە جۆری چیکی بووە و زێتر بۆ چاپکردنی کارت و کاری بازرگانی بەکارهاتووە، مەکینەی (مەکسیما) کە بۆ کاری بڕین و ڕێکخستنی چاپەمەنی بەکارهاتووە، هەروەها مەکینەیەکی تایبەت بە دوورینی تێدابووە کە لە جۆری ئەڵمانی بووە و بۆ کارپێکردنی پێویستی بە کەسانی شارەزا و پسپۆڕ هەبووە (گەلاڵی، ١/٢٧/ ١٩٧٤). لەم چاپخانەیەدا وێڕای ئەوەی کتێب و نووسراوی کاروباری حکومی پێ چاپکراوە، چەندین دیوانە شیعر و نامیلکە و کتێبی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی پێ چاپکراوە (جەباری، ٢٠٠٩، ل٢٤٦٧).

**ئەنجام**

١- دەرکەوتنی پیشەسازی میکانیکی لە سەرەتای شێستەکانی سەدەی بیستەمدا لە شاری هەولێر گۆڕانکارییەکی نوێی ئابووری بوو لە مێژووی شارەکەدا، کە کاریگەری لەسەر گەشەسەندن و بنیاتنانی ژێرخانی شارەکەدا هەبوو.

٢- لە شاری هەولێردا زێتر بایەخ بە کەرتی پیشەسازیی خۆراک دراوە بەتایبەتیش شیرەمەنی، ئەمەش لەلایەک دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەستبوونی کەرتەکە بە ژیان و بژێوی هاوڵاتیان، لەلایەکی دیکەوە بوونی کەرەستەی خاوی کشتوکاڵی (ڕووەکی و ئاژەڵی) لە شارەکە کە سەرچاوەی سەرەکی پیشەسازییە خۆراکییەکان پێکدەهێنن.

٣- بارودۆخی سیاسی و پەیوەندیی نێوان سەرکردایەتی سیاسی کورد و حکومەتی عێراق کاریگەری ڕاستەوخۆیان لەسەر دامەزراندنی دامەزراوە و کارگە پیشەسازییەکان هەبووە، بۆیە زۆربەی کارگە و پڕۆژە پیشەسازییەکان لەو کاتانەدا ئەنجامدراون کە جۆرێک لە گفتوگۆ و ڕێککەوتنی سەرکردایەتی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد لەگەڵ حکومەتی عێراقدا هەبووە.

٤- ژمارەیەک لەو کارگانەی کە لە هەولێر دامەزراون بۆ نموونە، وەک کارگەی جگەرەی هەولێر و کارگەی مافووری دەستی هەولێر وێڕای ئەوەی لەڕووی ئاستی بەرهەمەوە باش بوون و بەشێک لە پێداویستییە ناوخۆییەکانی شارەکەیان پڕکردووەتەوە و زێدەی بەرهەمیشیان بۆ دەرەوەی شارەکە هەناردەکراوە، ژمارەیەکی بەرچاو لە دەستی کاریان بەگەڕخستووە و ڕۆڵیان لە کەمبوونەوەی بێکاری لە شارەکەدا هەبووە.

٥- هەندێک کەرتی پیشەسازی بەتایبەتی کەرتی بیناسازی و چاپەمەنی لە ئاستێکی لاوازدا بووە و پێویستی بەوە هەبووە زێتر پەرەی پێبدرێت و لەڕووی چەندێتی و چۆنیەتییەوە ئاستی بەرزبکرێتەوە.

٦- لـــە مـــاوەی لێکۆڵینەوەکـــەدا هـــیچ پـــڕۆژە و کارگەیـــەک لـــە کەرتەکانی پیشەسازی کاغەز و دەرمان و جلوبەرگ و پاڵاوگەی نەوت لە شـاری هـەولێر دانەمـەزراوە، ئەمـە لـە کاتێکدا زەمینـەی سروشـتی و مرۆیی شارەکە بۆ دامەزراندنی زۆرێک لەو پیشەسـازییانە لـەبار بـووە، بێگومـان ئەمـەش بـۆ سیاسـەتی پیشەسـازی حکومەتـە یـەک لـەدوای یەکەکانی عێراق دەگەڕێتـەوە کە لـەو ماوەیـەدا لـە بەرامبـەر کوردسـتان پـەیڕەویان کـردووە و هەوڵیانـداوە ناوچەکـە نەبێتـە خـاوەن پێگەیـەکی ئابووریی بەهێز.

**لیستی سەرچاوەکان**

**یەکەم: بەڵگەنامە بڵاونەکراوەکان:**

- أرشيف محافظة اربيل، وزارة المالية، مديرية الاعاشة العامة، مديرية التجهيزات، الموضوع: كميات الطحين المخصصة للمخابز والافران، العدد/ س/ ٧٨، في ٦/٢١/ ١٩٦٧.
- أرشيف محافظة اربيل، كتاب معمل سكاير اربيل الى محافظة اربيل، سري، العدد/ ٦، في ٨/٢٥/ ١٩٧٣.
- أرشيف معمل السجاد اليدوي في كويسنجق، المؤسسة العامة لصناعات الغزل والنسيج، الشركة العامة للسجاد اليدوي في اربيل، مركز السجاد اليدوي في كويسنجق، الموضوع: تلميذات مهنيات، ع (٣١٠٠/١)، في ١١/٢١/ ١٩٧١.
- أرشيف معمل السجاد اليدوي في كويسنجق، المؤسسة العامة لصناعات الغزل والنسيج، الشركة العامة للسجاد اليدوي في اربيل، مركز السجاد اليدوي في كويسنجق، الموضوع: الأجور والمكافئات، ع (١٨١٦/٢)، في ٩/١١/ ١٩٧٣.

**دووەم: بڵاوکراوە حکومییەکان**

- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزى للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية ١٩٦٨، مطبعة الزهراء، بغداد، د. س.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، دائرة الاحصاء المركزي، نتائج الاحصاء الزراعي والحيواني في العراق لسنة ١٩٥٨-١٩٥٩، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٦١.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، دائرة الاحصاء المركزية، المجموعة الاحصائية السنوية العامة ١٩٦١، مطبعة الزهراء، بغداد، ١٩٦٢.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، دائرة الاحصاء المركزية، نتائج الاحصاء الانشائي لسنة ١٩٦٣، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٦٥.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، دائرة الاحصاء المركزية، المجموعة الاحصائية السنوية العامة ١٩٦٦، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٦٧.
- الجمهورية العراقية، وزارة شؤون الشمال، منجزات شؤون الشمال، ع (١)، ١٩٦٩.

- الجمهورية العراقية، وزارة الزراعة، مديرية الديوان العامة، دليل القطاع الزراعي في العراق لعامي ١٩٦٨-١٩٦٩، مطبعة وزارة الزراعة، بغداد، ١٩٧٠.
اربيل فى ظلال بيان اذار التاريخي، مطبعة الصباح، حلة، ١٩٧٢.
- وزارة الصناعة، مديرية الديوان، العلاقات العامة، منجزاتنا فى عام ١٩٧١-١٩٧٢، بغداد، ١٩٧٣.
- وزارة الصناعة والمعادن، قسم العلاقات العامة، منجزاتنا فى عام ١٩٧٣-١٩٧٤، مطبعة الشعب، بغداد، ١٩٧٥.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية ١٩٧٤، مطبعة الجهاز المركزي للاحصاء، بغداد، ١٩٧٥.
- وزارة الصناعة والمعادن، المؤسسة العامة لصناعات الغزل والنسيج، دائرة التخطيط والرقابة المالية، التقرير السنوي الفصلي الثالث ١/١٠/ ١٩٧٤- ١٢/٣١/ ١٩٧٤، بغداد، ١٩٧٥.
- وزارة الصناعة والمعادن، المؤسسة العامة لصناعات الغزل والنسيج، دائرة التخطيط والرقابة المالية، التقرير السنوي الخامس لسنة ١٩٧٤-١٩٧٥، بغداد، ١٩٧٦.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية ١٩٧٢، مطبعة الجهاز المركزي للاحصاء، بغداد، د. س.
- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، أرقام ومؤشرات عن منطقة كردستان للحكم الذاتي، د. م، د. س.
- ژووری بازرگانی و پیشەسازی هەولێر، تۆماری پیشەسازی، ناوی کارگە پیشەسازییەکانی پارێزگای هەولێر(زانیاری بڵاونەکراوە).

**سێیەم: دیدارەکان:**

- پ. د. ئەرسن موسا ڕەشید، ١١/١٠/ ٢٠١٧، هەولێر. نێوبراو لە ساڵی ١٩٥٥ لە شاری هەولێر لەدایک بووە، بڕوانامەی دکتۆرای لە مێژووی ئیسلامی لە زانکۆی ئەدنبەرە بەدەستهێناوە، یەکەمین سەرۆکی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری مێژوویی کوردستان بووە، ماوەی چەندین ساڵ سەرۆکی بەشی مێژوو بووە لە کۆلێژی ئەدەبیات - زانکۆی سەلاحەددین، ئێستا مامۆستایە لە هەمان کۆلێژ و لە هەولێر نیشتەجێیە.

- تاهیر کەریم عەلی ناسراو بە مامۆستا ڕەوەند، ٢٠١٧ /٦/١٢، هەولێر. نێوبراو لە ساڵی ١٩٤٦ لە هەولێر لەدایک بووە، خانەی مامۆستایانی تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٦٢ پەیوەندی بە ڕیزەکانی حزبی شیوعی عێراقییەوە کردووە، لەنێوان سالآنی ١٩٨٢-١٩٨٥ بەرپرسی نهێنی حزب بووە لە هەولێر، لەنێوان سالآنی ٢٠٠٤-٢٠٠٩ ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزب بووە، ئێستا خانەنشینە و لە هەولێر دادەنیشێت.
- خۆشەوی عەلی باویل ئاغا، ٢٠١٧ /٧/٢٣، ڕەواندز. نێوبراو لە ساڵی ١٩٦٩ لە ڕەواندز لەدایک بووە، دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی بەشی کارەبایە، ئێستا بەڕێوەبەری کارگەی مافووری ڕەواندزە.
- ڕەشاد ئەحمەد ئیبراهیم ناسراو بە (مام ڕەشاد)، ٢٠١٨ /١/١٩، هەولێر. نێوبراو لە ساڵی ١٩٤١ لە هەولێر لەدایک بووە، قۆناغی سەرەتایی تەواوکردووە، یەکێک بووە لە بازرگانەکانی هەولێر و لە ساڵی ١٩٦٧ بووەتە ئەندامی ژووری بازرگانی هەولێر، لەنێوان سالآنی (١٩٨٥-٢٠٠١) ئەندامی ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێر بووە، لەنێوان سالآنی (٢٠٠٥-٢٠٠٩) ئەندامی پەرلەمانی کوردستان بووە، ئێستا خەریکی کاری بازرگانییە و لە هەولێر ژیان بەسەردەبات.
- عومەر محەمەد فەرهادی، ٢٠١٧ /٥/٢٦، هەولێر. ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٨ لە گەڕەکی تەیراوە لە هەولێر لەدایک بووە، قۆناغی خوێندنی سەرەتایی تەواوکردووە، لەنێوان سالآنی ١٩٥٨-١٩٧٥ لە شارەوانی هەولێر فەرمانبەر بووە، لە ساڵی ١٩٨٨ خانەنشینکراوە، ئێستا لە گەڕەکی حەمرین لە هەولێر نیشتەجێیە.
- فوئاد محەمەد شەریف سلێمان، ٢٠١٧ /٧/٢٣، ڕەواندز. نێوبراو لە ساڵی ١٩٥٤ لە ڕەواندز لەدایک بووە، خوێندنی قۆناغی ئامادەیی تەواو کردووە، لە سەرەتای دامەزراندنی کارگەی مافووری ڕەواندزدا فەرمانبەری کارگەکە بووە. ئێستا خانەنشینە و لە ڕەواندز ژیان بەسەر دەبات.
- کاوە عوسمان سەید حەمەد، ٢٠١٨ /٢/٣، کۆیە. نێوبراو لە ساڵی ١٩٦٨ لە هەولێر لەدایک بووە، لە ساڵی ١٩٨٧ ئامادەیی پیشەسازی- بەشی کارەبای لە هەولێر تەواوکردووە، ئێستا بەڕێوەبەری کارگەی مافووری کۆیەیە.

**چوارەم: نامە و تێزە زانستییەکان:**

- نسرين سليمان حسين، النشاط الصناعي للمنشآت الصناعية الكبيرة للقطاع العام في محافظة أربيل (دراسة تحليلية للفترة ١٩٩٧-٢٠٠٠)، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الادارة والاقتصاد، جامعة صلاح الدين-اربيل، ٢٠٠٢.
- نوزاد محمد حسن، واقع وافاق التنمية الصناعية في منطقة كردستان للحكم الذاتي، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الادارة والاقتصاد، جامعة صلاح الدين-اربيل، ١٩٩٢.
- ياسين رسول يونس، تحليل مسار الصناعات التحويلية في محافظة اربيل للمدة ١٩٧٥-٢٠٠٢، اطروحة دكتوراه غير منشورة، كلية الادارة والاقتصاد، جامعة صلاح الدين-اربيل، ٢٠٠٥.
- عبدالكريم عبد علي عيسى المعيني، دور الصناعات الغذائية في التكامل الاقتصاد العربي (صناعات مختارة)، رسالة ماجستير غير منشورة، معهد الدراسات القومية والاشتراكية، جامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٨.
- حلاو حسين كريم، الصناعات الغذائية في محافظة اربيل (دراسة فى الجغرافية الصناعية)، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين-اربيل، ٢٠٠١.
- سلمى غازى نعمان السلطانى، التحول التكنولوجى وأثره على التنمية الصناعية في العراق "صناعة الالبان حالة دراسية خاصة"، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الادارة والاقتصاد، الجامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٨.
- ڕێبوار خالد مصطفى، پارێزگای سلێمانی (١٩٦٨-١٩٨٨) توێژینەوەیەکی مێژوویی ئابوورییە، (نامەی ماستەر- بڵاونەکراوە)، کۆلێژی ئەدەبیات، زانکۆی سەڵاحەدین-هەولێر، ٢٠١٤.
- يحيى زكريا يونس، واقع وافاق صناعة الالبان في العراق ١٩٦١-١٩٧٥، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الادارة والاقتصاد، جامعة بغداد، ١٩٧٦.
- ياسين حميد بدع المحمدي، التنمية الصناعية واتجاهاتها المكانية في محافظة أربيل دراسة فى جغرافية التنمية الصناعية، أطروحة دكتوراه غير منشورة، كلية الاداب، جامعة بغداد، ٢٠٠٦.

**پێنجەم: کتێبەکان**

**١- بە زمانی کوردی:**

- ئەسعەد جەباری، چاپخانەکانی شاری هەولێر، ئینسکلۆپیدیای هەولێر (ئەربیل)، چاپخانەی گرین گالۆری، لوبنان، ٢٠٠٩.
- بەختیار سەعید مەحمود (دکتۆر)، لیوای سلێمانی ١٩٢١-١٩٥٨ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە بارودۆخی ئابووری، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠١٣.
- حەمید ڕەشاش، ژیانی کوردەواری، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١.
- سەلاحەدین حەفید، ئابووری کوردستان ١٩٧٧-١٩٩٠، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- عەبدوڵڵا ئەنوەر (سمکۆ)، ڕۆژنامەوانیی کوردی شاری هەولێر ١٩٣٥-١٩٧٥، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٢.
- فاروق عەلی عومەر، ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا/ بەراییەکان ١٩١٤-١٩٣٩، وەرگێڕانی: تاریق کارێزی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
- کەریم شارەزا، لە یادی گیوی موکریانی دا، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧٨.
- هاشم یاسین حەمەدەمین حەداد (دکتۆر) و کامەران وەلی مەحمود، ئەتڵەسی پارێزگای هەولێر، چ٢، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١١.
- هۆشەنگ سالح نەجار، بزاڤی ڕۆشنبیری لە شاری هەولێر لە سالانی (١٩٥٨-١٩٧٥) دا لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە، چاپخانەی ڕۆژهەلات، دەزگای ڕۆسا بۆ چاپ و بلاوکردنەوەی کتێب، هەولێر، ٢٠١٦.
- یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی، مێژووی شاری هەولێر لە کۆنەوە تا سالانی شەست، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.

**٢- بە زمانی عەرەبی:**

- أحمد حبيب (دكتور)، دراسات في جغرافية العراق الصناعية، مطبعة العاني، بغداد، ١٩٧٥.
- جبار قادر (دكتور) و طارق جامباز (المحامي)، قرارات مجلس قيادة الثورة المنحل الخاصة بالكورد وكوردستان، مطبعة الحاج هاشم، اربيل، ٢٠١٣.

- جماعة من شباب أربيل، أربيل فی أربعة أعوام ١٩٦٤-١٩٦٥-١٩٦٦-١٩٦٧ بحوث عن الانجازات والمشاريع الحكومية التی تمت أو تحت الانشاء في أربيل، د. م، د. س.
- سعدية توفيق رشيد، الافاق التصديرية للسجاد العراقي، بغداد، ١٩٧٩.
- سعيد عبود السامرائي، التطور الاقتصادي الحديث في العراق، مطبعة القضاء، النجف، ١٩٧٧.
- مأمون أمين زكي (دكتور)، ازدهار العراق تحت الحكم الملكي ١٩٢١- ١٩٥٨ دراسة تاريخية سياسية اجتماعية مقارنة، دار الحكمة، لندن، ٢٠١٣.
- محمود فهمي درويش واخرون، دليل الجمهورية العراقية لسنة ١٩٦٠، ط٢، اتحاد الناشرين العراقيين، بغداد، ٢٠١٣.
- ناطق محمد رشدي، انتاج وتسويق الرخام في العراق (دراسة أولية)، بغداد، ١٩٧٦.

**شەشەم: وتار و لێکۆڵینەوەکان**

**١- بە زمانی کوردی:**

- ئاکۆ مەلا سەمەد، هەندێک لەو پرۆژە گرنگانەی کە لە ساڵی ١٩٥٩-١٩٦٢ لە شاری هەولێر ئەنجام دراون، هەولێر (گۆڤار)، ژ (٩)، زستانی ٢٠٠١.
- دلێر ئیسماعیل حەقی شاوەیس (دکتۆر)، بارودۆخی کۆمەڵایەتی- ئابووری و سیاسیی کوردستانی عێراق لە سەرەتای ساڵانی ١٩٦٠ دا، سەنتەری برایەتی (گۆڤار)، ژ (٩)، کانوونی یەکەمی ١٩٩٨.
- ریاض وادي، لەگەڵ بەڕێوەبەری گشتی مافووری دەستکرد لە هەولێر، الحكم الذاتي (ئۆتۆنۆمی/ بەشی کوردی)، ژ (٧)، ساڵی یەکەم، تشرینی دووەمی ١٩٧٦.
- ریاض وادي، لەگەڵ چاپخانەی پەروەردە لە هەولێر، الحكم الذاتي - ئۆتۆنۆمی/ بەشی کوردی (گۆڤار)، ژ (٢)، ساڵی سێیەم، ١٩٧٨.
- عومەر حەمە ساڵح، دروستکردنی دۆشاو و سرکە (لەمەڕ پیشەسازی دۆشاوی ترێ و سرکە)، ئاسۆی فۆلکلۆر (گۆڤار)، ژ (٤)، ٢٠٠١.
- قارەمان حەیدەر رەحمان و ئارەزوو یوسف حەسەن، بارودۆخی ئابووریی شاری هەولێر لە نێوان ساڵانی (١٩٧٥-١٩٩١)، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژ (٣٦)، ٢٠١٦.

- کاردۆ گەلاڵی، چاپخانەی شارەوانی هەولێر ئەو خەونەی هاتەدی، برایەتی (ڕۆژنامە)، ژ (١٧)، ١/٢٧/ ١٩٧٤.
- مەجید عمر، کارگەی کەرپووچ دروستکردن لە هەولێر (معمل الطابوق)، هەولێر (گۆڤار)، ژ (٢)، ئەیلولی ١٩٧١، ل٤٨، ٥٠؛ الحكم الذاتی (ئۆتۆنۆمی/ بەشی کوردی)، ژ (٤)، ساڵی دووەم، ١٩٧٧.

**٢- بە زمانی عەرەبی:**
- سليمان عبدالله اسماعيل (دكتور)، نشأة الصناعة وملامح تطورها في اقليم كوردستان ١-٢، سردم العربي (مجلة)، ع (٩)، صيف ٢٠٠٥.
- ياسين رسول يونس، تقييم كفاءة الاداء لمعمل السكاير في محافظة اربيل للفترة ١٩٩٠-١٩٩٨، زانكۆ (مجلة/ القسم العربي)، ع (١٥)، كانون الثاني ٢٠٠٢.

**حەوتەم: ڕۆژنامە و گۆڤارەکان**

**١- بە زمانی کوردی:**
- برایەتی (ڕۆژنامە)، بەغدا، ژ (١١)، ١/٢٠/ ١٩٧٤.
- الحكم الذاتي/ ئۆتۆنۆمی- بەشی کوردی (گۆڤار)، هەولێر، ژ (٥)، ساڵی سێیەم، ١٩٧٨.
- هاوکاری (ڕۆژنامە)، بەغدا، ژ (٤١)، ١١/١٣/ ١٩٧١.
- هەتاو (گۆڤار)، هەولێر، ژ (٢١)، ساڵی یەکەم، ١٠ی شوباتی ١٩٥٥.
- هەتاو، ژ (١٧١)، ساڵی شەشەم، ١٥ی شوباتی ١٩٦٠.

**٢- بە زمانی عەرەبی:**
- التآخي، (جريدة)، بغداد، ع (٨٦)، ٧/٢٦/ ١٩٦٧.
- التآخي، ع (١٣٩٤)، ٧/٢٦/ ١٩٧٣.
- التآخي، ع (٢٧٤٧)، ٥/ ٦/ ١٩٧٤.
- الثورة (جريدة)، بغداد، ع (١٧٢٦)، ٤/١/ ١٩٧٤.
- الوقائع العراقية (جريدة)، بغداد، ع (١١٣٥)، ٧/١/ ١٩٦٥.

**لیستی پەراوێز و سەرچاوەکان:**

[١] ئـەم ئەنجومەنــە لــە ســاڵی ١٩٥٠ دامــەزراوە، لــە (٨) ئەنـدام بــە ســەرۆکایەتی ســەرۆکی ئەنجومــەنی وەزیـران پێکهـاتبوو، بودجەیـەکی تایبـەتی بـۆ دانـرا کـە داهاتەکـەی ٧٠% ی داهـاتی نـەوت بـوو، پلانێکـی دارایـی و ئـابووری گشـتی بـۆ بەرەوپێشخستنی عێراق هـەبوو، چەندین پرۆژەی لـە بـواری ئاوەدانکردنـەوە و کشتوکاڵ و پیشەسازی و دروستکردنی بەنداودا بەئەنجام گەیاند. (زكي، ٢٠١٣، ص٢٥٣-٢٨٠).

[٢] دەزگا پیشەسازییە گەورەکان ئەو دەزگا و کارگانە لەخۆدەگرێت کە (١٠) کرێکار و زیــاتر لــەم ژمارەیــە کاریــان تێـداکردووە، هــەروەها لــە چوارچێوەیــەکی بەرفراوانـدا ئـامێری تێدا بـەکارهاتووە و هەندێکیشـیان خـاوەن سـەرمایەیێکی گەورە بوون. (حبیب، ١٩٧٥، ص٥٦-٥٨).

[٣] ئەم کۆمپانیایە لە ساڵی ١٩٥٧ وەک دامەزراوەیەکی حکومی لە بەغدا دامـەزرا، لـە سـاڵی ١٩٦٠ دەسـتی بـە بەرهـەم کـردووە و ڕۆژانـە توانـای بەرهـەمهێنانی (١٥) تــەن شــیری هــەبووە، هــەروەها ماســت و پــەنیر و قــەیماغی بەرهــەمهێناوە، کارگــەکانی شــیرەمەنی بەغــدا و موســڵ و هــەولێر و کەربــەلا و بەســرەی بەڕێوەبردووە. (یونس، ١٩٧٦، ص٢٦-٢٨؛ السلطاني، ١٩٨٨، ص١٣٧).

[٤] ئەم پرۆژەیە لە ساڵی ١٩٦٧ لە خەبات (ئاسکی کەلەک) دروستکراوە، (٢٥٠٠٠٠) دیناری بۆ تەرخانکراوە و پێکهاتبوو لە بەخێوکردنی (١٢٠٠) سەر مەڕی جۆری حەمـدانی و (٤٠٠) مانگـای جـۆری (فرزیـان) و (١٠٠٠٠) مریشـکی هێلکەکـەر و (٥٠) گـامێش و (٤٠٠) بـەران بـۆ باشـترکردنی جـۆری مـەڕ. (جماعـة مـن شـباب أربیل، د.س، ص١١٦).

[٥] ئـەم کارگەیـە لـە سـاڵی ١٩٦١ بـە بودجـەی (٥) ملیـۆن دینـار دامـەزراوە، وزەی بەرهەمهێنانی (٤) ملیۆن جگەرە بووە لە یەک تاقی کارکردنی (٨) کاتژمێریدا، لـە سـاڵی ١٩٧٠ ناوەکـەی گـۆڕاوە بـۆ (کۆمپانیـای گشـتی جگـەرەی سـلێمانی) و خراوەتـە سـەر دامـەزراوەی پیشەسـازی کیمیـاوی و خواردەمـەنی. (مصـطفی، ٢٠١٤، ل٨١-٨٢).

[٦] ئەم دامەزراوەیـە لـە ٦ی ئایـاری ١٩٧٠ دامـەزراوە کـە یەکێکـە لـە دامـەزراوەکانی سەر بە وەزارەتی پیشەسازی، ئەرکی بەڕێوەبردنی کەرتی ڕستن و چنین بووە لە عێراقدا. (وزارة الصناعة، ١٩٧٥، ص١٢٢).

[٧] ئەم قوتابیانە لە هـەردوو ڕەگـەزی نێر و مـێ بـوون و تەمـەنیان لـەنێوان (٩-١٥) سـاڵاندا بـووە، کـە ڕۆژانـە بـۆ مـاوەی (٥) کـاتژمێر مەشـقیان کـردووە لەسـەر فێربوونی دروستکردنی مافوور، لـە سـەرەتای کارکردنیانـدا کرێیـان (١٠٠) فلس بـووە، دوای سـێ مانـگ بووەتـە (١٥٠) فلـس، لەگـەڵ زیـادبوونی شـارەزایی و

چەندێتی کارکردنیاندا کرێ و پاداشتیان زیادیکردووە. (وزارة الصناعة، ١٩٧٣، ص٦٠).

[٨] مافووری شوێنەواریی چەندین نەخش و نیگار و وێنەی ڕەنگاوڕەنگی تێدابووە کە گوزارشتی لە شارستانێتی کۆنی عێراق کردووە، ئەمەش ماندووبوون و وردەکاریی زێتری ویستووە، بۆیە نرخەکەی گران بووە. (التأخي، ع (٢٧٤٧)، ٥/ ٦/ ١٩٧٤).

[٩] بەشێوەیەکی گشتی بڕی مافووری بەرهەمهێندراو لە عێراقدا کەم بووە و بەشی بەکاربردنی ناوخۆیی نەکردووە، بۆیە ساڵانە عێراق پەنای بۆ هاوردەکردنی مافوور بردووە، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٧٣ بڕی (٥٠٧٩م٢) مافووری لە دەرەوە هاوردە کردووە. بڕوانە: (رشيد، ١٩٧٩، ص٤٧).

[١٠] کۆمەڵەکە لەلایەن هەریەک لە: (محەمەد حەسەن دزەیی، عومەر ئەمین، ئەحمەد عەلی) دامەزراوە. (هەتاو، ژ (٢١)، ١٠ی شوباتی ١٩٥٥، ل٢٢).

[١١] شێخیل حاج حەسەن (١٩٢٥-٢٠٠١) ی بازرگانی هەولێر سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێڕی کۆمپانیاکە بووە. (التآخي، ع (٨٦)، ٧/٢٦/ ١٩٦٧).

[١٢] لە ساڵی ١٩٠٣ لە شاری مەهاباد لەدایک بووە، خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەکانی حەڵەب لە سوریا تەواو کردووە، لەنێوان ساڵانی ١٩٢٦-١٩٣٦ بەڕێوەبەری گۆڤاری (زاری کرمانجی) بووە لە ڕەواندز، لە نێوان ساڵانی ١٩٥٤-١٩٦٠ گۆڤاری (هەتاو) ی لە هەولێر دەرچوواندووە، خاوەنی چەندین بەرهەمە لەوانە: فەرهەنگی کۆلکە زێڕینە، ئەلف و بێی کوردی وێنەدار بە تیپی لاتینی، فێربوونی زمانی کوردی لە سێ مانگدا بەبێ مامۆستا، لە ساڵی ١٩٧٧ کۆچی دوایی کردووە و لە هەولێر نێژراوە. (شارەزا، ١٩٧٨، ل٧-٨).

[١٣] وەک گۆڤاری ڕووناکی و هەتاو و هەولێر و نووسەری نوێ و حەفت گۆڤاری دیکەی قوتابخانەیی. (شارەزا، ١٩٧٨، ل٧-٨).

[١٤] ئەم وەزارەتە لە ساڵی ١٩٦٧ دامەزراوە، کە سەرپەرشتی کاروباری ئاوەدانکردنەوەی کوردستانی دەکرد و لەم بەڕێوەبەرایەتییانە پێکهاتبوو: (بەڕێوەبەرایەتی گشتی دیوان، بەڕێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی کوردی، بەڕێوەبەرایەتی گشتی دارستان، بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئاوەدانکردنەوەی باکوور، بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئینحیساری تووتن، بەڕێوەبەرایەتی گشتی هاوینەهەوارەکانی باکوور)، وەک ڕێخۆشکردنێک بۆ دارشتنی پێکهاتەی کارگێڕی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لە ٢٧ی ئاداری ١٩٧٤ بەپێی بڕیارێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش وەزارەتەکە هەڵوەشێندرایەوە. (الجمهورية العراقية، منجزات شؤون...، ١٩٦٩، ص٣؛ قادر و جامباز، ٢٠١٣، ص٩٤-٩٥).

## ملخص البحث

## الصناعة في مدينة أربيل ١٩٥٨ – ١٩٧٥ دراسة تاريخية

**أ.د. خليل علي مراد** **م.م. برهان حاتم عثمان**
قسم التاريخ – كلية الاداب – جامعة صلاح الدين

هذا البحث محاولة لتبيان وضع الصناعة والإنتاج الصناعي في مدينة أربيل في السنوات ١٩٥٨–١٩٧٥ . وكما هو معروف تعد الصناعة من الأنشطة الاقتصادية المهمة من حيث التأثير على تطور أي دولة ، أو مدينة ، أو منطقة . وعلى هذا الأساس فقد كان للقطاع الصناعي في أربيل، وخصوصاً الصناعات الغذائية ، تأثير مباشر على حياة الأهالي ، ودور مهم في تطور المدينة اقتصادياً .

يتألف البحث من مقدمة وتمهيد وأربعة محاور ، فضلاً عن خاتمة تتضمن أهم الاستنتاجات التي توصل إليها الباحثان من خلال المعلومات المتاحة عن الموضوع . وقد تضمن التمهيد عرضاً سريعاً لنشأة الصناعة ومراحلها في أربيل ، وتابع المحور الأول الصناعات الغذائية وصناعة التبغ (السكاير) ، التي كانت من أهم الصناعات في أربيل في تلك المرحلة من حيث صلتها باحتياجات الأهالي من جهة ، وتوفيرها العديد من فرص عمل للأيدي العاملة في المدينة . وتناول المحور الثاني صناعة الغزل والنسيج في أربيل ، والذي تمثل في معمل السجاد اليدوي فيها ، وقد تتبع المحور تأسيس هذا المعمل وكمية السجاد الذي أنتجه في تلك السنوات . وخُصص المحور الثالث للصناعات الإنشائية والعوامل المؤثرة على تطور هذا القطاع، وأهم معامل المواد الإنشائية مثل معمل طابوق أربيل ، ومعمل القير الكونكريتي ، ومعامل الكاشي والبلوك التي ظهرت في تلك الفترة، ومعلومات عن القوى العاملة في هذا القطاع. أما المحور الرابع والأخير فقد تابع باختصار موضوع صناعة الطباعة في أربيل ، وقد تضمن مقدمة عن نشأة الطباعة في المدينة ، ثم أهم المطابع التي تأسست في تلك الفترة ومنها مطبعة التربية ومطبعة البلدية اللتين تأسستا كمطابع حكومية بعد صدور بيان ١١ آذار ١٩٧٠ ، والكتب والمجلات التي طُبعت في هاتين المطبعتين.

# Abstract

**Industry in Hawler (Erbil) city 1958 – 1975**
**A Historical Study**

**Prof. Dr. Khalil Ali Murad**
History Dept. – College of Arts – Univ. of Saladin

**Asst. Lecturer. Burhan Hatim Othman**
History Dept. – College of Arts – Univ. of Saladin

This research is an attempt to highlight industrial development in Hawler city during the years 1958 – 1975, its effect on the population and the economy of the city.

The research is divided into an introduction and four topics. The introduction includes an overview about the stages of industry history in Hawler. The first topic dealt with the food and cigarette industries, Which were the most important industries in that period because of its relationship with the needs of the population on the one hand and providing employing opportunities for many workers . The second topic tackled the weaving industry in the city through highlight "Hand Carpet Factory", the establishment of the factory and the quantity and quality of the produced carpets. The third topic devoted to study the construction industries, the main factories and plants, and its importance for the urban development in Hawler. The fourth and last topic highlight printing industry in the city, its history and the main press in the city, especially the "Education press" and the "Municipality press", founded after the March 11, 1970 proclamation.

# ڕۆڵی وەزیرە کوردەکان
# سەبارەت بە ناوچە کوردییەکانی کوردستانی عێراق
# لەڕووی ئابووری، کۆمەڵایەتی و تەندروستییەوە
# (١٩٤٥- ١٩٥٨)

**پ.ی.د. محەمەد عەبدوڵلا کاکەسوور** **ڕۆژگار عەبدولڕەحمان محەمەد**
بەشی مێژوو – کۆلیژی ئەدەبیات – زانکۆی سەلاحەددین

**پێشەکی**

یەکێک لە داواکارییەکانی کورد لە عێراقدا، ڕادەی نوێنەرایەتیکردنی کورد بووە لە دام و دەزگاکانی دەوڵەتدا. ئەمەش لە حکومەتێکەوە بۆ حکومەتێکی تر جیاواز بووە. هەروەها لەسەردەمی پاشایەتی بۆ کۆماری گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. بوونی وەزیری کورد لە حکومەتەکانی عێراقدا تا ڕادەیەک کوردی پێ ڕازیکراوە، لە هەمان کاتیشدا دەوڵەتی عێراق وەکو بەڵگەیەک بۆ رای گشتی ناوەخۆ و دەرەوەی پێشانداوە کە دیموکراتیەت لەو وڵاتەدا هەیە و مافی کورد پێشێل نەکراوە.

هەندێک جار لەگەڵ ئەو نەهامەتییە زۆرانەی کورد لە عێراق لە سەردەمی کۆماریدا تووشی هاتوون. هەندێک نووسەر خۆزگە بە سەردەمی پاشایەتی دەخوازن. جا بۆ ئەوەی بابەتەکە نەبێتە بە باشتر زانینی خراپ و خراپتر بە شێوەیەکی زانستی و ئەکادیمی لە لایەنە جۆربەجۆرەکانی مێژووی کورد بکۆڵینەوە، بە باشمان زانی لە ڕۆڵی وەزیرە کوردەکان سەبارەت ناوچە کوردییەکانی کوردستانی عێراق بکۆڵینەوە بۆیە ناونیشانی ئەم توێژینەوەیە بوو بە (ڕۆڵی وەزیرە

کوردەکان سەبارەت ناوچە کوردییەکانی کوردستانی عێراق لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەندروستییەوە (١٩٤٥ – ١٩٥٨)).

ئەم توێژینەوەیە یارمەتیمان دەدات لە وەڵامی ئەو پرسیارە بگەین ئایا ئەو وەزیرە کوردانەی ماوەی توێژینەوەکەمان نموونەیی بوونە لە خزمەتکردن بە ناوچەکانیان، ئەگەر لە ڕووی سیاسیشەوە نەبێت ئەوا لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەندروستییەوە لە چوارچێوەی یاسا و تواناکانی بەردەست وەزارەتەکانیان چ خزمەتگوزارییەکیان پێشکەش بە کورد کردووە.

سەرچاوەی باش بۆ ئەم توێژینەوەیە بەکارهاتوون، دیارترینیان کۆنووسی دانیشتنەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران (محاضر مجلس النواب)ی ئەوکاتی عێراق کە تیایدا ژمارەیەک وەزیر، لەوانەش وەزیرە کوردەکان بانگێشتی پەرلەمان کراون و پرسیاری تایبەت بە ئەرکی وەزارەتەکانیان لێکراوە. دەتوانین بڵێین ئەم سەرچاوەیە سەرچاوەی فەرمی و پتر جێگای متمانەیە لە سەرچاوەی تر. ئەمە سەرەڕای چەندین سەرچاوەی جۆر بە جۆری تر لە پەراوێزەکان خراونەتە ڕوو.

ئەم توێژینەوەیە بۆ باشتر ئەنجامدانی دابەشکراوەتە سەر چەند ناوونیشانێکی لاوەکی و مامەڵەی لەگەڵدا کراوە:

یەکەم لە ڕووی ئابووری ١- کشتوکاڵ، أ- کوللە و بەراز، ب- تووتن.

دووەم: لە ڕووی خزمەتگوزاری و کۆمەڵایەتی: أ- شارەوانی، ب- ڕێگاوبان، ج- نەوت، د- کارگە، هـ- کارەبا. سێیەم: لە ڕووی تەندروستی: مەلاریا، بەلهارزیا.

**یەکەم: لە رووی ئابووری**

**کشتوکاڵ**

کشتوکاڵ چالاکییەکی ئابووریی سەرەکی مرۆڤە، کە پشتی پێدەبەستێ، پاش جەنگی دووەمی جیهانی حکومەتی عێراق پرۆژەیەکی سەرەکی دانا بۆ پرۆگرامی کشتوکاڵی هانی جووتیارانی دەدا زیاتر بایەخ بە کشتوکاڵ بدەن، لادێکان چۆڵ نەکەن. هەندێ ئامێر و کەلوپەلی کشتوکاڵی بەسەر دابەشکردن (لونکریک و ستوکس، ١٩٨٥،ص .)، داوای لێکردن گرنگییەکی زۆر بەلایەنی بەرهەمهێنانی گەنم بدەن (HRAOOF,1985,P262.). گەورەترین کێشەی سەرەکی لە سەردەمی پاشایەتی کە ڕووبەڕووی جووتیاران بووبووەوە کێشەی زەوی بوو لە نێوان جووتیاران و دەرەبەگەکاندا، ناوچە کوردییەکانیش بەدەر نەبوون لەو کێشەیەدا (الجواهری، ١٩٨٢، ص ص ١٣٣-١٤٣؛ مظهر، ١٩٨٤،ص ص ٤٩-٥٥.). لە دانیشتنێکی پەرلەمانیدا لە ڕۆژی ١٩٤٧/٦/٢٥. گفتوگۆ لەسەر کەمتەرخەمی حکومەت کرا کە بایەخ بەلایەنی کشتوکاڵی نادا، تیایدا بانگێشتی (جەمال بابان) (جەمال رەشید بابان (١٨٩٤-١٩٦٥) لە بەغداد لە دایک بووە ساڵی ١٩٤١کۆلیژی مافی لە بەغداد تەواو کردووە، ڕۆژنامەنووس و پارێزەرو ئەندام پەرلەمان و وەزیر بووە لە عێراق بۆ نموونە ١٩٤٧-١٩٤٨ وەزیری دادو وەکیلی وەزارەتی ئابووری و جارێکی تر ساڵی ١٩٥٢ وەزیری داد بووە و لە بەیروت مردووە. الصویرکی،٢٠٠٨ص ص٤١٧-٤١٨). کرابوو، کە بریکاری وەزیری ئابووری بوو لە حکومەتەکەی ( ساڵح جەبر) (ساڵح جەبر (١٨٩٥-١٩٥٧) یەکەم سیاسەتمەداری شیعە بوو، بوو بە سەرۆک وەزیران لە عێراق لە ماوەی ١٩٤٧-١٩٤٨. الزبیدی، ٢٠١٣، ص ص ٣٣٥-٣٣٦.)دا، لە لایەن ئەندامە کوردەکان و عەرەبەکانەوە ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی زۆر بووەوە ، رەخنەکانیش لەسەر ئەوەبوو وەزارەتی ئابووری لایەنی کشتوکاڵی و جووتیاری پشتگوێ خستووە. جەمال بابان بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە گوتی (گوێم لێبگرن لە سەرەتای دامەزراندنی حکومەتی یەکەمی عێراقەوە تا ئەمرۆ وەزارەتی ئابووری پشتگوێ خراوە، ئەم حکومەتەی

عێراق تەنیا گرنگی بە وەزارەتی دارایی و ناوەخۆ و پەروەردە داوە بێ ئەوەی ئاوڕ لەم وەزارەتە بداتەوە) ( مجلس النواب، ١٩٤٧،ص ١٢٣.). ساڵی ١٩٤٧ بابا عەلی (بابا عەلی شێخ مەحموودی حەفید (١٩١٢-١٩٩٦): کوڕی دووەمی شێخ مەحموود بووە، قۆناغی سەرەتایی لە بەغداد تەواو کردووە، ئینجا بۆ خوێندن چووەتە ئەسکەندەرییە لە میسر و دواتر بەشی ئابووری لە زانکۆی کۆلۆمبیا لە نیۆرک تەواو کردووە . ماوەی ١٩٤٦-١٩٤٧ وەزیری ئابووری بووە دواتر ١٩٤٧-١٩٤٨ ئەندامی پەرلەمانی عێراق بووە. لە سەردەمی کۆماری دوو جار بووە بە وەزیر دواتر بووە بە وەزیرو دواتر چووەتە دەرەوەی عێراق و لە لەندەن کۆچی دوایی کردووە. الصویرکی، ٢٠٠٨، ص ص ٢٩٠-٢٩١. ) وەزیری ئابووری بوو لە وەزارەتەکەیدا گرنگییەکی زۆری بەلایەنی کشتوکاڵی دەدا بە تایبەتی ناوچە دارستانەکانی کوردستان و بڕیارێکی دەرکرد، ئەم بڕیارەش لە لایەن سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران پشتگیری لێکرا و ڕازیبوونی خۆیان دەرخست لەسەر بڕیارەکەی وەزیری ئابووری بڕیارەکەش ئەمە بوو ڕێگا، نەدەدرا چیتر دارستانەکانی کوردستان ببڕدرێتەوە (البلاط الملکی، ١٩٤٦). هەموو ئەو دەسەڵاتانەی ڕەتکردەوە کە حکومەت ڕێی پێدا بوو بۆ بڕینەوەی دار بۆ بازرگانی خەڵووز لە کاتێکی چاوەڕوان نەکراودا بڕیاری قەدەغە کردنی بڕینی داری دا (البلاط الملکی ، ١٩٤٦). برووسکەی بۆ متەسەرفی هەولێر و سلێمانی و موسڵ نارد و داوای لێکردن نابێ چیتر دارستانەکان ببڕنەوە بۆ خەڵووز ، بەم شێوەیە بازرگانی خەڵووزی قەدەغە کرد (البلاط الملکی، ١٩٤٦؛ وزارەت الاقتصاد ،١٩٤٦.).

**ب- گیروگرفتەکانی بەرهەمی کشتوکاڵی**

**أ- کولله (الجراد) و بەراز:**

گرینگترین کێشە کە ڕوو بەڕووی بەروبوومی کشتوکاڵ دەبووەوە هاتنی ئافاتی (کوللە) و( بەراز) بوو لە هەندێ وەرزدا و زیانێکی زۆری بەم لایەنە گەیاندبوو کاردانەوەیەکی خراپیشی لەسەر ژیانی ئابووری وڵات بەجێ دەهێشت (لونکریک و ستوکس، ٢٠٠٨، ص ص

١١٥-١١٩.). لە سالانی ( ١٩٤٤-١٩٤٥) توفیق وەهبی (لە سلێمانی لە دایک بووەو خوێندنی لە سلێمانی و بەغدادو ئەستەمبۆل تەواو کردووە. لە زۆر بواری ئیداری و ڕۆشنبیری کاری کردووە. چەند جارێک بووە بە وەزیر ١٩٤٤-١٩٤٦ وەزیری ئابووری، ١٩٤٧-١٩٤٨ وەزیری مەعارف و لە ساڵی ١٩٥٠ وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی بووە . الصویرکی، ٢٠٠٨، ص ص ٣٥٩-٣٦٢؛ حەیدەری و ئەوانی تر، ٢٠١٤،ل ل ٢٦-٢٨.) کرا لە دانیشتنی پەرلەماندا تووشی ڕەخنەیەکی زۆر بووەوە لە لایەن ئەندام پەرلەمانەکان (مجلس النواب ١٩٤٧ ص ٢١.). لەساڵی (١٩٤٧) بۆ جارێکی تر کشتوکاڵ تووشی ئافاتی (کوللە) بۆوە و باباعەلی وەزیری ئابووری بوو، لە وەزارەتەکەیدا بانگێشتی پەرلەمان کرا و کۆبوونەوەیەکی پەرلەمانی کرا، ئەندام پەرلەمانەکان داوایان لێ کرد ئەم کێشەیان بۆ چارەسەر بکات. بەڵام لەم دانیشتنەدا بابا عەلی ئەمەی لەسەر خۆی لابرد و هاتنی کوللەی خستەسەر بەڕێوەبەری فەرمانگەی کشتوکاڵی و بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵ (مدیریة زراعة)، گوتی: (بەڕێوەبەری کشتوکاڵ بەرپرسە لە کەمتەرخەمی هاتنی ئافاتی کوللە ئەم بەڕێوەبەرە (ژەهر و نەوت) بۆ جووتیاران دابین ناکات بۆ لەناوبردنی ئەم ئافاتە) (مجلس النواب، ١٩٤٧ ص ٢١.). جەمال بابان بریکاری وەزیری ئابووری بوو لە سەردەمی وەزارەتەکەیدا، کشتوکاڵی ناوچەی مووسڵ و سنجار تووشی ئافاتی کوللە بوو، جووتیارانی ئەم ناوچەیە تووشی زەرەرێکی زۆر بوون، زۆربەی زۆری دانیشتووانی ئەم دوو ناوچەیە بەکاری کشتوکاڵی خەریک بوون، بژێویی ژیانی ڕۆژانەیان لەسەر بەروبوومی کشتوکاڵی بەڕێوە دەچوو، جووتیارانی ئەم ناوچەیە داوایان لە حکومەت کرد یارمەتییان بدات و چارەسەری ئەم کێشەیان بۆ بکات، بە تایبەتی ناوچەی سنجار کە لەسەر سنووری عێراق و سوریایە بەهۆی ئافاتی کوللەوە بەهای نرخی گەنم زۆر بەرز ببووەوە، گەیشتە (٣٤) دینار لە ناوچەی سنجار، واتە نرخی یەک تەن گەنم گەیشتە (٣٠) دینار، بەڵام لە مانگی تەمووزدا نرخی گەنم لە سنجار گەیشتە ( ٥،١٢) دینار واتە نرخی یەک تەن گەنم گەیشتە (٤١) دینار (الریکانی، ٢٠١٢، ص ٥٦.). لە

دانیشتنێکی پەرلەمانیدا جەمال بابان ئاماژەی بەوەدا سەردانی موسڵ و سنجاری کردووە و کۆبوونەوەیەکی لە ناکاوی لەگەڵ فەرمانبەرانی ژووری بازرگانی ئەم دوو ناوچەیەدا ئەنجام داوە (مجلس النواب، ١٩٤٧، ص ١٤٤) . لەهەمان کاتدا هێرشی ئافاتی کوللە ناوچەی خانەقین و مەندەلی گرتبۆوە، لەدانیشتنی پەرلەماندا ئەندام پەرلەمانانی ناوچەی دیالە داوای چارەسەریی ئەم گیروگرفتەیان دەکرد کە ڕووبەڕوی کشتوکاڵی ئەم ناوچەیە ببووەوە ، جەمال بابان وەک بریکاری وەزیری ئابووری بەڵێنی پێدان یارمەتییان بدات (مجلس النواب، ١٩٤٧ ص ٩٣). لە کۆبوونەوەیەکی پەرلەمانیدا جەمال بابان ئاماژەی بەوەکرد کە ئەمساڵ زۆربەی ناوچەکانی عێراق بە تایبەتی ناوچەی باکوور و ناوەڕاست بەروبوومە کشتوکاڵییەکانیان بەر ئافاتی کوللە کەوتن. وەزارەتی ئابووری پێویستی بۆ ئەو گیروگرفتە دابینکردووە، بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێبدەم ئەوەیە ئەمساڵ ئافاتی کوللە (٢٥) ڕۆژ زیاتر هاتووەتە پێش، لەلایەکی تر پلەی گەرمای ئەمساڵ زۆر بەرز بووەتەوە ئەمەش کاریگەری هەبووە لەسەر زووتر هاتنی کوللە، حکومەتی عێراق هیچ کەمتەرخەم نەبووە، بەهەموو شێوەیەک بودجەی دارایی بۆ ئەم ئافاتە تەرخان کردووە (مجلس النواب، ١٩٤٧ ، ص ٩٣.). لە ١٩ی نیسانی ١٩٤٧ لە دانیشتنێکی پەرلەمانیدا جەمال بابان وەک بریکاری وەزیری ئابووری ئاماژەی بەوە کرد هاتنی کوللە لەم ساڵدا دەگەڕێتەوە بۆ سێ هۆکار: هۆکاری یەکەم پشتگوێ خستنی بەڕێوەبەرایەتی فەرمانگەی کشتوکاڵی، ئەم بەڕێوەبەرایەتیانە نەیانتوانیوە دەرمان و پێداویستی بۆ ئەم جووتیارانە دابین بکات تا ئەم هێلکانە بنبڕ بکەن، هۆکاری دووەم کەمتەرخەمی وڵاتانی دراوسێ بەتایبەتی سوریا و ئێران، هۆکاری سێیەم کەش و هەوای ئەمساڵ گۆڕانکاری بەسەرداهات بەتایبەتی لە ناوچەکانی کوردستان. حکومەتی عێراقی نزیکەی (٥٠٠) تەن ژەهری نوێی لە ئینگلتەرا هێناوە بۆ نەمانی ئەم ئافاتە (مجلس النواب ، ١٩٤٧، ص ١٥٧. ).

لە دانیشتنێکی پەرلەمانیدا ئەندامە کوردەکانی ئەنجومەنی نوێنەران بەتایبەتی ئەندامانی ناوچەی سلێمانی داوایان لە جەمال بابان کرد، جووتیارانی ناوچەی شارەزوور کە ناوچەیەکی چیاییە هەموو ساڵێک جووتیارانی ئەم ناوچەیە، زەرەرمەند دەبوون لە هاتنی هێرشی بەراز بۆ ناوچەکەیان کە هێرش دەکاتە سەر مەڕو ماڵاتیان. جەمال بابان لە وەڵامدا ئاماژەی بەوەدا نەک ناوچەی باکوور بەڵکو جووتیارانی ناوچەی باشووریش زەرەرمەند بوونە لە هێرشی بەراز، ئێمە هەوڵی ئەوەماینداوە چارەسەری ئەم گیروگرفتە بکەین (المجلس النواب، ١٩٤٧، ص ٦٢٧.).

**ب– تووتن:**

بەشێکی زۆری جووتیارانی کوردستان تووتنیان دەچاند، چونکە ئاو و هەواکەی لەبار بوو بۆ چاندنی تووتن، ناوچەی سلێمانی بە یەکەم ناوچە دادەنرا لەچاندنی تووتن، لە کۆی هەموو پارێزگاکانی عێراق (٨٠%) سلێمانی بوو، واتە لە (٦٠%) ڕووبەری زەوی کشتوکاڵی تووتن بوو (خصباک، ١٩٧٣، ص ص ٣٧١-٣٧٣.). بابا عەلی وەزیری ئابووری بوو لەساڵانی (١٩٤٦- ١٩٤٧) گرنگییەکی زۆری بە تووتن دا، داوای لە بەڕێوەبەرایەتیی کشتوکاڵی کرد گرینگی زیاتر بە کشتوکاڵی تووتن بدەن. وەزارەتی ئابووری لە سەردەمی بابا عەلی هەندێ یاسای دەرکرد لەهەموویان گرینگتر ئەوەبوو کە ژووری بازرگانی دانا لە هەندێ ناوچەی عێراق، کە پێشتر ژووری بازرگانی تەنیا لە ناوچەی مووسڵ و بەغدا و بەسرە هەبوو، بەڵام دانانی ژووری بازرگانی لە سەردەمی بابا عەلی لە شارەکانی تر بۆ ئەوە بوو بازرگانی کشتوکاڵ فراوان بکات (بلاد، (جريدة)، العدد (٢٨٥٤)، ١٨ حزيران ١٩٤٦، ص ٣). کۆگای (مخزن) لە شارەکانی تر دروستکرد بەتایبەتی لە ناوچەی کوردستان، ئەم کۆگایانە بۆمەبەستی هەڵگرتن و پاراستنی بەرهەمی کشتوکاڵی بوو داوای لە بەڕێوەبەرایەتیی کشتوکاڵی کرد گرینگیی زیاتر بە

کشتوکاڵی تووتن بدەن (بلاد، (جریدة)، العدد(٢٩١٧)، ١٤ ایلول ١٩٤٦، ص ٥؛ البلاط الملکی، رقم الملف ٣١١/٥٣٨٤، وزارة الاقتصاد، ١٦ تشرین الاول ١٩٤٦.).

**ج- سایلۆ ( شوێنی کۆکردنەوەی دانەوێڵە، عەمبار):**

ئاو و هەوای عێراق لەبار بوو بۆ کشتوکاڵ، زۆربەی دانیشتووانی بەکاری کشتوکاڵی خەریک بوون، لەدوای جەنگ حکومەت هەندێ گرینگی بە کشتوکاڵدا و پێداویستی و کەلوپەل و ئامێری کشتوکاڵی بۆ جووتیاران دابینکرد، تارادەیەک باش بوو، بەوهۆیەوە بەرهەمی کشتوکاڵی زۆرتر بوو پێداویستی ناوەخۆی لە گەنم و جۆ پڕ کردەوە ، زیادەی ئەم بەرهەمانەش بۆ ناوچەکانی عێراق دەچوو، ئەم بەرهەمانە پێویستیان بە شوێنێک هەبوو بۆ هەڵگرتنیان. لە هەندێ ناوچە شوێنی کۆکردنەوەی دانەوێڵە دروست کرابوو بۆ هەڵگرتنی ، بەڵام لە هەموو ناوچەکانی عێراق شوێنی کۆکردنەوەی دانەوێڵە نەبوو، ئەمەش کێشەی بۆجووتیاران دروست کردبوو (سلمان، ١٩٩٤، ص ص ١٣٥-١٤١؛ خصباک، ١٩٧٣،ص ص ٣٤٨-٣٥٢.). نەبوونی شوێنی کۆکردنەوەی دانەوێڵە لە شارەکانی عێراق ، ئەم گرفتە گوازرایەوە بۆ پەرلەمان تاوەکو گفتوگۆی لەسەر بکرێ. لە ڕێکەوتی ( ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٤٧) لە دانیشتنێکی پەرلەمانیدا ئەندام پەرلەمانێکی ناوچەی (منتفک) کە ناوی (موحان خیرالله) بوو داوای شوێنی کۆکردنەوەی دانەوێڵەی کرد بۆ هەڵگرتنی بەرو بوومی کشتوکاڵی بەتایبەتی گەنم، لەم دانیشتنەدا جەمال بابان بانگێشتی پەرلەمان کرابوو کە وەزیری داد (عدل) بوو، لە هەمان کاتدا بریکاری وەزیری ئابووری بوو لە حکومەتەکەی صالح جەبردا ، لەوەڵامدا ئاماژەی بەوەدا وەزارەتی ئابووری لیژنەیەکی پێکهێناوە بۆ دروستکردنی شوێنی کۆکردنەوەی دانەوێڵە و ئاماژەی بە دروستکردنی عەمباری کۆکردنەوەی دانەوێڵەی بەغدا کرد کە (٢٠٠) هەزار دیناری تێ چووە، و عەمباری کۆکردنەوەی دانەوێڵەی بەسرەش بەهەمان شێوە، حکومەت لەساڵی (١٩٤٧) لە میزانیەی

دەوڵەتدا خەرجی تایبەتی بۆ پرۆژەی کۆکردنەوەی دانەوێڵە دانایەوە، بۆ زۆربەی ناوچەکانی عیراق، بۆ ئەم میزانیە کە حکومەت دایناوە لە (ملیۆن) دینار کەمتر نییە. لەو کۆبوونەوەیەدا ئەندامە کوردەکانی هەولێر و سلێمانی داوای شوێنی کۆکردنەوەی دانەوێڵەیان کرد و ئاماژەیان بەوەدا پێویستە لەسەر حکومەت لە ناوچەی لیوای هەولێر و سلێمانی شوێنی کۆکردنەوەی دانەوێڵە دروست بکات، جەمال بابان لەو دانیشتنەدا وەڵامی ئەندامە کوردەکانی دایەوە گوتی حکومەت لەپرۆگرامیدایە لە لیواکانی ناوچە کوردییەکان شوێنی کۆکردنەوەی دانەوێڵە دروست بکات (مجلس النواب، ١٩٤٧، ص ص ٦٢٢-٦٢٤.). دواتر ئەم سایلۆیە لە سەردەمی کۆماری ١٩٥٩ دروست کرا.

**دووەم: لە ڕووی خزمەتگوزاری و کۆمەڵایەتی**

**أ- شارەوانی:**

لە دانیشتنێکی پەرلەمانیدا (عەلی کەمال) کە ئەندام بوو لە ئەنجومەنی نوێنەران لەسەر لیستی سلێمانی ، داوای لە (سەعید قەزاز) (سەعید قەزاز، ١٩٠٤-١٩٥٩؛ ساڵی ١٩٥٢ وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی، ساڵی ١٩٥٣ وەزیری ناوەخۆ و دواتر لە چەند وەزارەتێکی عێراق تاکو ١٩٥٨ هەر وەزیری ناوخۆ بووە. دوایی ١٤ ی تەمووزی ١٩٥٨ لە سێدارە دراوە. یەک کچی هەبووە بە ناوی پەری: عبود، ٢٠٠٨، ص ص ٨٧-١٢١.) کرد، کە وەزیری ناوەخۆ بوو، دەبێ حکومەت گرینگی بە شارەوانی بدات و بودجەی تایبەتی لە نەوت بۆ پرۆژەی (ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوە) دابین بکات بۆ ئەوەی باشترین پرۆژە و خزمەتگوزاری بۆ میللەت بکەن، بەتایبەتی بۆ ناوچە کوردییەکان، پرۆژەی شارەوانی پشتگوێ خرابوون، لیوای سلێمانی وهەڵەبجە و شارەزوور ، ئەم ناوچانە هەموو پێویستییان بە پرۆژەی خزمەتگوزاری نوێ هەیە (مجلس االنواب، ١٩٥٦، ص ٤٤٥.). لە دانیشتنی (١٩٥٦\٤\٢٣) دا ( عیزەدین مەلا فەندی)، ئەندام بوو لەسەر ناوچەی هەولێر لە ئەنجومەنی نوێنەران، ڕەخنەی لە (سەعید قەزاز)

گرت لەسەر لایەنی شارەوانی ئاماژەی بەوەدا (وەزارەتی ناوەخۆ یەکێکە لە وەزارەتە گرینگەکان، بەڵام ڕەخنەی کورتم هەیە لەسەری، ئەویش لایەنی شارەوانییە و دەمەوێ بپرسم لە وەزیری ناوەخۆ بۆچی شارەوانی بێبەش کراوە لە بودجەی دەوڵەت؟ بۆچی بودجەی نەوتی بۆ تەرخان ناکرێ؟ بۆچی پارە بۆ ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوە (مجلس الاعمار) خەرج ناکرێ؟ شارەوانی لیوای هەولێر و سلێمانی چەند پرۆژەیەکیان هەیە، بەڵام ئەم پرۆژانە بەهۆی خەرج نەکردنی پارە لە کارەکانیان وەستاون ، بۆ نموونە ڕێگای هەولێر و مەخموور ڕێگایەکی سەرەکی و گرینگە (دوو) ساڵە لە کارەکانی وەستاوە. ئایا ئەمە پارەی بۆ خەرج ناکرێ هۆکارەکەشی خەرج نەکردنی پارەیە؟ یان حکومەت ناوچە کوردییەکانی پشتگوێ خستووە) سەعید قەزاز وەڵامی دایەوە و ئاماژەی بەوەدا هەوڵدەدەم وەڵامتان بدەمەوە، گوتی: (یاسای بودجەی ساڵی ١٩٥٦ حکومەت بڕی بودجەی بۆ شارەوانی هەموو ناوچەکانی عێراق تەرخان کردووە ئەو پڕۆژانەی لە کار وەستاون دەست بەکار دەبنەوە) (مجلس النواب، ١٩٥٦، ص ص ٤٤٦-٤٤٧.).

### ب- ڕێگاوبان:

عەلی حەیدەر سلیمان (عەلی حەیدەر سلێمان (١٩٠٥-١٩٩١) لە زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت خوێندنی تەواو کردووە، ئەندامێکی باڵای کۆمەڵەی (الأهالی) بوو، ١٩٤٩-١٩٥٠ وەزیری ئەشغال و هاتوچۆ بوو، ١٩٥٣-١٩٥٤ وەزیری ئاوەدانکردنەوە بوو: الزبیدی، ٢٠١٣، ص ٤٣٤.) وەزیری ئاوەدانکردنەوە بوو لە وەزارەتەکەی یەکەمی فاضل جەمالی، لە هەمان کاتیشدا ئەندام بوو لەئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوە لەگەڵ بابا عەلی و جەلال بابان لەسەر لیستی لیواکانی ناوچە کوردییەکان، کرابوون بەئەندام لەم ئەنجومەنە (عبهول، ١٩٨٣، ص ٨٨). گرنگییەکی زۆری بە ریگاوبان و پرد دابوو، ریگای رانیە و کۆیە لە سەردەمی وەزارەتەکەی عەلی حەیدەر سلیمان چووەتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە، داوای بودجەی لە وەزارەتی دارایی کردووە بۆ ئەم پرۆژەیە، وەزارەتی دارایی نزیکەی (٧٠٠٠٠٠)

هـەزار دینـاری بـۆ دابـین کـردووە (وزارة المواصـلات والأشـغال رقـم الملـف ٣٢٠٢١/٢٦). لـە دانیشـتنێکی پەرلەمانیـدا ئەندامـە کوردەکـان داوایـان لـە عەلـی حەیـدەر سـلیمان کـردووە دەسـت بکـات بـە پـڕۆژەی ڕێگـای (کەرکوک – هەولێر – کۆیە) لە وەڵامدا ئەماژەی بەوەدا ئەم پرۆژەیە چووەتـە قۆنـاغی جێبەجێکردنـەوە و بـودجەکەی بـڕی (٥٠٠) هـەزار دینارمان بۆ تـەرخان کردووە، بەفڕۆکە وێنەی ئـەم ڕێگایانـە گیراوە و ڕووپێوی بـۆکراوە، وەک وەزیـری ئاوەدانکردنـەوە بڕیـارم لەسـەر ئـەم وێنانـەدا کـە بەفڕۆکـە گیرابوو، لێکۆڵینـەوەی هونـەری زیـاترم لەسـەر ئـەم وێنانـە کـرد، بـۆ ئـەوەی وەزارەتـی دارایـی بـودجەی زیـاتر بـۆ خەرجی ئەم ڕێگایانە تەرخان بکات (مجلس النواب، ١٩٥٣، ص ١٨٦.). ڕێگای ( طاسـلوجە - دووکـان) یـش دراوەتـە دەسـت کۆمپانیـای ( ئینشـائات العراق )، بڕی خـەرجی میزانییەکـەم لـە وەزارەتـی دارایـی و ئینشـائات وەرگرتـووە نزیکـەی ( ٨٣١.٢٨٩) هـەزار دینـاری بـۆ تـەرخان کـراوە (الأخبار، (جریدة)، العدد (٣٩١٣)، ١ کانون الأول ١٩٥٣، ص ٧.). پرۆژەی ڕێگای (سەعدییە و – جەلەولا)- دراوەتە دەست کۆمپانیەکی بەریتانی بەناوی – (جـورج ومبـی ) بـودجەکەی نزیکـەی ( ١١٥.٧٩١) دینـاری بۆتـەرخان کـــراوە (عبهـــول، ١٩٨٣، ص ٩٥.). ڕێگـــای ( کـــەرکووک - ســـلێمانی – دەربەندیخان) پرۆژەی ئەم ڕێگایە پلانی هونەری بۆدانراوە بۆ ئەوەی بکەوێتە بواری جێبەجێکردنەوە (مجلس الأعمار، ١٩٥٤، ص ٢٣٤.).

لە سەردەمی وەزارەتەکەی عەلی حەیدەر سلیمان لە ساڵی (١٩٥٣ – ١٩٥٤) دەسـتکرا بەهەنـدێ پـرۆژە لەوانـە چاککردنـەوە و دووبـارە قیرتاوکردنەوەی هەندێ ڕێگاوبان (کەرکوک - بەغدا – کووت (الشعب، (جریـدة)، العـدد (٢٨)، ٢٠ کـانون الأول ١٩٥٣، ص ٤.). پـردی (تـەق تـەق) لەسەردەمی وەزارەتەکەی عەلی حەیدەر سلیمان پلانی بۆدانرا کە بچێتە بـواری جێبەجێکردنـەوە ئـەم پرۆژەیـە دراوەتـە دەسـت کۆمپانیـەکی بەریتانی بەناوی (فیلبس هولمز) (الدلیمی، ٢٠٠٢، ص ١٢٢.). کـە گرنگترین پـرۆژەی ئەنجامـدا پـرۆژەی (بەنـداوی سەرسـار) (بەنـداوی رومـادی) بـوو

(بەنداوی دووکان) داوەتە دەست کۆمپانیەکی (فەرەنسی – ئەلمانی) بەناوی (دیکن و کورلی) (مجلس النواب، ١٩٥٣، ص ٣٥؛ عبهول ، ١٩٨٣، ص ٩٤). پرۆژەی (دەربەندیخان و بێخمە) بودجەی بۆدانرا نزیکەی ( ٢٠٠) ملیون دیناری بۆ تەرخان کرابوو، کۆمپانیای (هارزا) وێنە ئەندازەییەکەی پرۆژەی (دەربەندیخان) دەرهێنا (مجلس الآعمار، ١٩٥٤، ص ٤٥٦). کۆمپانیای (کود)ی بەریتانی پرۆژەکەی تەواو کرد (عبهول، ١٩٨٣، ص ٩٤) پرۆژەی (ئاوی دووکان) درایە دەست کۆمپانیای ( دیمیز) ی فەرەنسی و میزانییەی بۆ دابینکرا (مجلس الأعمار، ١٩٥٤، ص ١٢٣). وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە لە سەردەمی عەلی حەیدەر سلیمان گرنگیەکی زۆریشی بە ئاوی ژێر زەوی دا بەتایبەتی لەناوچەی باکوور، ژمارەیەکی زۆر بیری ئیرتوازی ژێر زەوی لێدرا ، بۆ لێدانی هەر بیرێکی ئیرتوازی نزیکەی (١٥٠) دیناری بۆ خەرج کرابوو ئەم پرۆژەیە درابووە دەست کۆمپانیایەکی تایبەتی بیرلێدان (الدلیمی، ٢٠٠٢، ص ١٢٣).

**ج- نەوت:**

یەکەم بەرهەمهێنانی نەوت لە عێراق ساڵی (١٩٢٧) بوو (سلیمان، ١٩٧٩، ص ص ٢٦٤-٢٦٨). بەڵام ئەو بەرهەمهێنانە لەلایەن کۆمپانیا ئینگلیزەکانەوە قۆرغ کرابوو زۆربەی بودجە و داهاتی ئەم نەوتەیان بۆ خۆیان دەبرد، حکومەتی عێراق هەر پرۆژەیەکی پێشکەشکردبا دەبوایە یەکەم جار بەرژەوەندیی کۆمپانیا بیانییەکانی لەپێش چاو بێ ئینجا میللەتەکەی خۆی، ئیمتیازاتی کۆمپانیای بیانی لە دەرهێنانی نەوتی عیراق زۆر زیادی کردبوو، بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا هەستی پێدەکرا (خلیل، ١٩٨٠، ص ٢٦٤). لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی حکومەتی عێراق هەندێ گۆڕانکاری کرد لە بەرهەمهێنانی نەوت و ڕێژەی ناردنە دەرەوەی زیاتر کرد بۆ ئەوەی باری ئابووری وڵات بەرەو باشتر ببات، سەرەتا دەستی کرد بە جێبەجێکردنی هەندێ پرۆژە کە پێشتر گفتوگۆی لەسەر کرابوو، بەڵام نەچووبووە بواری جێبەجێکردنەوە، لەوانە پرۆژەی پاڵاوگەی نەوت، ئەم پرۆژەیە کە لە

سەردەمی مەلیک فەیسەڵی یەکەم (١٩٢١ – ١٩٣٣) پلانی بۆ داندرابوو بەڵام جێبەجێ نەکرابوو، لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی بڕیاری لەسەر درا بودجەی دەوڵەتی بۆ تەرخان کرا (سلیمان، ١٩٧٩، ص ٢٩٤.). لە دانیشتنێکی ئەنجومەنی نوێنەراندا (جەمال بابان) بانگێشت کرابوو کە وەزیری داد بوو لەهەمان کاتیشدا بریکاری وەزیری ئابووری بوو ئاماژەی بەوەدا پرۆژەی پاڵاوگەی نەوتی (بێجی)مان لە ژێر دەستدایە و بودجەی بۆ دابینکراوە، وەک بریکاری وەزیری ئابووری بڕیارم لەسەرداوە بۆ ماوەی (دوو) هەفتەی تر لە ئەنجومەنی وەزیران ئەم پرۆژەیە دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە (مجلس النواب، ١٩٤٧، ص ٨٥.) لە دانیشتنێکی ئەنجومەنی نوێنەران لە ساڵی (١٩٤٩) ئەندامە کوردەکانی (هەولێر و سلێمانی) داوایان لە حکومەت کرد هەردوو ناوچەی (هەولێر و سلێمانی) لەلایەن حکومەتەوە هیچ گرینگییەکی پێنادرێ لەچاو ناوچەکانی تری عێراق، هیچ کۆمپانیایەکی نەوتی لێ نییە کەچی ئەمانە ناوچەیەکن دەوڵەمەندن بە زێڕی رەش (مجلس النواب، ١٩٥٠، ص ٩١.) لە ساڵی (١٩٥٣) عەلی حەیدەر سلیمان وەزیری ئاوەدانکردنەوە پرۆژەی پاڵاوگەی (ئەڵوەندی) لە خانەقین خستە بواری جێبەجێکردنەوە (الدليمي، ٢٠٠٢، ص ١١٥).

**د- کارگە:**

وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە گرنگییەکی زۆری بە غازی سروشتی داوە کارگەیەکی دامەزراند نزیکەی (٢١٨٠٠٠٠٠) دینار بودجەی بۆ دانا کارگەی وەبەرهێنانی غازی سروشتی لە کەرکوک نزیکەی (٦٨٢٠٠٠)- یەک ملیۆن تەن غازی سروشتی دەهێنێتە بەرهەم لەگەڵ (٥٠٠) هەزار تەن ئەمۆنیا، ئەم کارگەیە پێداویستی ناوەخۆو پێداویستی دەرەوەی پڕدەکردەوە (الحوادث، (جريدة)، العدد (٣٣١٠)، ٢٣ كانون الثاني ١٩٥٤، ص ٥.). عەلی حەیدەر سلیمان وەزیری ئاوەدانکردنەوە بوو بانگهێشتی (استدعا) ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوە کرا و ئەوەی ئاشکرا کرد لەگەڵ هەندێ کۆمپانیای بیانی رێککەوتوونە مۆڵەتیشمان پێداون بەدوای (ئاسن)دا

بگەڕێن له ناوچەی باکوور، ئاسنی خاوی زۆر لێیە بەتایبەتی ناوچەی چیایی، دەرگای ئابووری وڵات لەڕووی جیهان دەکاتەوە، باری ئابووری ناوچەی باکووریش بەرزدەکاتەوە بەگشتی، ئێمە نابێ بەتەنیا پشت بە نەوت ببەستین کەچی ناوچەی باکوور ئاسنی خاوی زۆرلێیە (مجلس الأعمار، ١٩٥٤، ص ٢١٨.). عەلی حەیدەرسلیمان ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ کۆمپانیای (لوموس) ی ئەمەریکی بەست بەدامەزراندنی (دوو) کارگەی چیمەنتۆ یەکێکیان لە مووسڵ نزیک (حەمام عەلیل ٢٥ کلم لە باشووری موسڵەوە دوورە) ئەوی تریش لە (سەرچنار) لە سلێمانی(الدليمي، ٢٠٠٢، ص ١٢٤.). جەلال بابان ئەندام بوو لە ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوە لەسەر لیستی ناوچە کوردییەکان، هەڵبژاردرابوو لە ساڵانی ( ١٩٥٥-١٩٥٨) وەک ئەندام، نەک وەک وەزیر، داوای هەندێ پڕۆژەی گرنگی کردووە لە وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە بۆ ناوچە کوردییەکان (عبهول، ١٩٨٣، ص ص ٨٨-٩١.). ئەم پڕۆژانەش تەنیا توێژینەوەیان لەسەر کراوە لەساڵی (١٩٥٧) لەسەر داواکاری جەلال بابان پڕۆژەی (ئاوی کەڵەک – خەبات) توێژینەوەی لەسەر کراو، درایە دەست کۆمپانیایەکی بیانی بەناوی (کولیجان)، بەڵام نەچووە بواری جێبەجێکردنەوە (شۆڕشی ١٤ی تموز ١٩٥٨ بەسەرداهات ئەم پڕۆژەیە مایەوە (مجلس الأعمار، ١٩٥٧، ص ٤٥٤.). لە (٢٩- ئایار-١٩٥٨)، توێژینەوە لەسەر پڕۆژەی (ئاوی کەرکووک) کرا ئەمە پڕۆژەیەکی گەورە بوو، بەڵام بەهۆی بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی - تموز ١٩٥٨) جێبەجێ نەکرا. لە سەرەتای ساڵی (١٩٥٦) وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە لەگەڵ ئەندامانی ئەنجومەن کۆبۆوە و گەورەترین پڕۆژەی دانا بۆ هەندێک پارێزگای عێراق وەک (بەغداد – بەسرە – موسڵ – سلێمانی – کوت ) ئەویش پڕۆژەی نیشتەجێکردن بوو لە ساڵانی پێشوو ئەم پڕۆژەیە تەنیا (مجلس الأعمار، ١٩٥٧، ص ٣٤٥.)، بودجەی بۆ تەرخان کرا بەڵام لە ساڵی (١٩٥٦) چوارهەندەی زیاتریان

بۆدانا واتە (٢٤) ملیۆن دینار، ئەم پرۆژەیەش درا بە کۆمپانیایەکی یۆنانی بەناوی (دوکسیادس) (عبهول، ١٩٨٣، ص ص ١٣٢-١٣٣).

**هـ- کارەبا:**

وەکو هەموومان دەزانین کارەبا ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤدا، لە سەردەمی پاشایەتی گیروگرفتی کەمیی کارەبا هەبووە ئەم برە کارەبایە کە هەبوو نەیدەتوانی پێداویستی هەموو دانیشتوانی عێراق پڕبکاتەوە. لە دانیشتنێکی ئەنجوومەنی نوێنەراندا ئەندامانی ئەنجوومەن داوای زیادکردنی وزەی کارەبایان دەکرد، لە دانیشتنی (٤ شبات\ ١٩٥٢) خولی (١٢) ئەندامە کوردەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران (داوای زیادکردنی وزەی کارەبایان دەکرد بە هۆی زۆربوونی دانیشتووانی شار ئەم – وزەی کارەبایە بەشی هەموو دانیشتووان ناکات هێزی کارەباکەش کۆنە، لە ناوچەی باکوور تەنیا یەک مەکینەی کارەبا هەیە، ئەویش هەموو ناوچە کوردییەکانی لەسەرە، لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی عیراق گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و دانیشتووانی زۆر بووە و پێویستە حکومەت دارایی تایبەت بۆ بودجەی کارەبا دابنێ تا مەکینەی نوێی کارەبا بکڕێ بۆ ناوچەی باکوور)، بەڵام ئەم داواکارییەی ئەندامە کوردەکان لەلایەن وەزیری ناوەخۆ عومەر نەزمی (عومەر نەزمی (١٨٩١-١٩٧٨) لە کفری لەدایک بووە. لەساڵی ١٩٣٤ بووەتە وەزیری ئابووری و هاتوچۆ، ساڵی ١٩٣٩ بووەتە وەزیری ناوەخۆ، و ساڵی ١٩٤٦ وەزیری داد بووە، چەند جارێکی تریش بووەتە وەزیر لەم وەزارەتانە. چەندین پۆستی ئیداری گرنگی تری لە عێراق هەبووە. ساڵی ١٩٧٨ لە لبنان مردووە : الزبیدی، ٢٠١٣، ص ص ٤٣٩ -٤٤٠؛ طوبان، ٢٠١٢، ص ص ١٧-٢٥٤.) پشتگوێ خراوە (مجلس النواب، ١٩٥٢، ص ٣٤٥.). لە دانیشتنێکی ئەنجوومەنی نوێنەرانی لە (٢٣\شبات\١٩٥٣) عومەر نەزمی وەزیری ناوەخۆ بوو، بانگێشتی ئەنجومەن کرابوو، لەم دانیشتنەدا ئاماژەی بەوەدا پڕۆژەیەکمان لە ژێر دەستە بۆ زیادکردنی وزەی کارەبا لە عێراق پڕۆژەکەش ئامادە کراوە، دراوەتە دەست کۆمپانیایەکی ئەمریکی بەناوی (وایت ئەندازەی ڕاوێژکاری

الامريكية) ئەم زیادکردنەش شارەکانی ( بەغداد و بەسرە و کەرکووک) دەگرێتەوە، لە سەرەتاشدا ئەوەی کەرکووک دەچێتە بواری جێبەجێ کردنەوە (مجلس النواب، ١٩٥٣، ص ١٣٨.). لە ڕێکەوتی (٢٧- تشرینی دووەمی ١٩٥٤) کۆمپانیای وایت ئەندازەی ڕاوێژکاری) دەستی کرد بە دروستکردنی وێستگەی کارەبای کەرکوک (مجلس الأعمار، ١٩٥٤، ص ١٢٩.). زۆربەی لادێیەکان و قەزاکانی عێراق بەتایبەتی ناوچە کوردییەکان گیروگرفتی کەمیی کارەبایان هەبوو، هەندێ لادێش کارەبای نەبوو لەوانە قەزای (هەڵەبجە و قەڵادزێ) لەدانیشتنی (١٩\٢\ ١٩٥٢) ئەندامانی ناوچەی سلێمانی (داوای وزەی کارەبایان دەکرد بۆ ئەم دوو ناوچەیە) ، بەڵام هیچ وەڵامیان نەدراوە (مجلس النواب، ١٩٥٢، ص ١٣٢.). گرفتی نەبوونی کارەبا بۆ ئەم دوو ناوچەیە وەک خۆی مایەوە تا ساڵی (١٩٥٧)، ئەندامانی ناوچەی سلێمانی لەدانیشتنێکی پەرلەمانی لەساڵی ١٩٥٧ داوایان لە سەعید قەزاز کرد ئەم گرفتەیان بۆ چارەسەر بکات سەعید قەزاز ئاماژەی بەوەدا کە پڕۆژەی (وێستگەی کارەبای قەڵادزێ لەبەردەستدایە و بودجەی دارایی بۆ دابینکراوە و دراوەتە دەست یەکێک لە کۆمپانیایە بیانییەکان لەمانگی ئایاری ١٩٥٧ دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە)(مجلس النواب، ١٩٥٧، ص ٣٤٥.).

**سێیەم : لە ڕووی تەندروستییەوە**

**تەندروستی:**

گومانی تێدانییە کە تەندروستی پەیوەستە بەباری ئابووری و کومەڵایەتی و سیاسی، ئەگەر سەیری بارودۆخی ناوەوەی عێراق بکەین لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کومەڵایەتییەوە نالەبار بووە، ڕووداوە دەرەکییەکانیش کاردانەوەیەکی خراپیان لەسەر باری ناوەخۆی عێراق بەجێهێشتووە (رشید، ٢٠٠٧، ص ٢٨.). لەدوای جەنگ، حکومەت گرینگییەکی زۆری بەنەوتدا و ڕێژەیەکی زیاتری ناردە دەرەوە، بەنرخێکی گرانتر، بودجەی نەوت زیادی کرد کاردانەوەیەکی باشی لەسەر ئابووری و خەرجی وەزارەتەکان بەجێهێشت (سامی

سلیمان، ١٩٥٨، ص ص ١٠٥-١١٦.). بودجەی وەزارەتی تەندروستی لەدوای جەنگی جیهانی دووەم گەیشتە (٥٠٣) ملیون دینار، وەزارەتی تەندروستی و وەزارەتی کارو باری کۆمەڵایەتی گرینگیی زۆریان بەلایەنی تەندروستی وڵات دا (رشید، ٢٠٠٧، ص ٥٣). ڕێکخراوی تەندروستی نێودەوڵەتی ساڵی (١٩٤٧) لە میسر کۆنگرەیەکی بەست (ماجد مستەفا) (ماجد مستەفا (١٨٦٩-١٩٧٤) لە سلێمانی لە دایک بووە، خوێندنی لە سلێمانی و ئەستەنبۆڵ تەواو کردووە، بووە بە ئەفسەر لە سوپای عوسمانی، ماوەیەک لەگەڵ شێخ مەحمود بووە بە پچڕ پچڕ زۆر پۆستی ئیداری لە عێراق وەرگرتووە. ساڵی ١٩٤٣-١٩٤٤ وەزیری بێوەزارەت بووە و ١٩٥٠-١٩٥٢ وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی بووە و ساڵی ١٩٥٢ وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی بووە لە هەمان کات وەزیری ئابووری بووە بە وەکالەت. ساڵی ١٩٥٤جارێکی تر بووەتە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی لە ساڵی ١٩٧٤ لە بەغداد کۆچی دوایی کردووە. النادي الكردي، الكورد في العراق، http://www.kurdclub.com.) وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی بوو، وەک نوێنەری عێراق بەشداریی ئەم کۆنگرەیەی کرد، ڕێککەوتنامەیەکی مۆرکرد لەگەڵ ئەم ڕێکخراوە بۆ ئەوەی کادیرانی وەزارەتی تەندروستی و وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی بنێرێتە دەرەوەی وڵات و بەشداری لە خولی نوێی تەندروستی بکەن. لەڕێکەوتی (٢٥-٣-١٩٥٢)، ماجد مستەفا وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی بوو سەردانی وڵاتی (میسری) کرد لە شاری (ئەسکەندەرییە) و چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ دکتۆر (شوشە) ئەنجام دا، کە بەڕێوەبەری (مەکتەبی ڕێکخراوی ناوچەی دەریای ناوەڕاست ) بوو ڕێککەوتنامەیەکی لەگەڵی مۆر کرد بۆ ئەوەی ئەم ڕێکخراوە لەڕووی تەندروستییەوە یارمەتی عیراق بدات (صوت الأهالي، (جريدة)، العدد (٥)، ١٩٥٢/٣/٢٣، ص ٤.). پاش ئەم ڕێککەوتنە دکتۆر (شوشە) دەرمانی ناردە عێراق کە کوتانی (تلقیح) (بی سی جی) بوو، ئەم دەرمانە بەکار دەهات بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشی ( وەرەمی سینگ)، خەڵکانێکی زۆر تووشی ئەم نەخۆشییە ببوون بەتایبەتی ناوچە چیاییەکانی

باکووری عیراق، بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە ئەو ڕێکخراوە ژمارەیەکی زۆر کادیری تەندروستی خۆی ناردە بەغداد پاشان سەردانی شارەکانی (هەولێر و سلێمانی و موسڵ)یان کرد، لە هەمان کاتیشدا پەرستیارانی نەخۆشخانەکانی (هەولێر و سلێمانی و موسڵ)یان فێرە راهێنانی نوێی پزیشکی دەکرد لەسەر ئەم نەخۆشییە لەهەمان کاتدا لە سلێمانی پەتای مەلاریا بڵاوبووەوە و ژمارەیەک لە کادیرانی ئەم ڕێکخراوە چارەسەری ئەم پەتایەیان کرد لە سلێمانی(رشید، ٢٠٠٧، ص ص ١٢٩-١٣٣).

لە سەردەمی مەلەکی وەزارەتی تەندروستی هەندێ کێشەی هەبوو لەڕووی کەمیی نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستی، چونکە تا ساڵی (١٩٥٠) بودجەی دارایی کە بۆ وەزارەتی تەندروستی دانرابوو، زۆر کەم بوو، نەیدەتوانی لە هەموو ناوچەیەک نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستی دروست بکات، ناچار بوو خانووی لە شارەوانی بەکرێ دەگرت ئەم خانووانەش هیچ مەرجێکی تەندروستییان نەبوو، تەنها خانوویەکی ئاسایی بوون، هەروەها ناوچە کوردییەکانیش بەدەست نەبوونی بنکەی تەندروستییەوە دەیانناڵاند (رشید، ٢٠٠٧، ص ص ١٨٤-١٨٥). لە ڕێکەوتی (١٤ ئازاری ١٩٤٢) لە دانیشتنێکی پەرلەمانیدا ئەندامێکی ئەنجومەنی نوێنەرانی سەر بەلیوای موسڵ ناوی ( برکات ناصر)(بەرەکات شێخ ناسر، ساڵی ١٩٠٢ لە گوندی کورسی لە دایک بووە لە ساڵی ١٩٤٨ بووە بە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، لە ساڵی ١٩٧٩ مردووە، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: بازوو، ٢٠١٢، ص ٥٢.) بوو داوای لە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی کرد کە (تۆفیق وەهبی) بوو لە وتەکانیدا ئاماژەی بەخانووی بنکەی تەندروستی ناوچەی سنجاری کرد، کە زۆر بچووکە و هیچ مەرجێکی تەندروستی تیا نییە و نەخۆش ناتوانێ تیا بخەوێ و بمێنێتەوە چارەی ئەمە چییە؟ وەزارەتی تەندروستی ئەم خانووەی بەکرێ گرتووە لە شارەوانی، توفیق وەهبی لەوەڵامدا وتی ئێمەش

ئەزانین ئەو خانووەی بنکەی تەندروستی سنجار بچووکە و ئەم گرفتە نەک هەر لە سنجار هەیە، بەڵکو لە زۆربەی ناوچەکانی عێراق ئەم گرفتەیان هەیە، ئەو بنکە تەندروستیانەی کە هەنە لە شارەوانی بەکرێمان گرتووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ وەزارەتی دارایی کە بودجەی کەمی بۆ وەزارەتی تەندروستی داناوە (مجلس النواب، ١٩٥٠ ص ١٤٦).
لە سەردەمی پاشایەتی کێشەی کەمی بنکەی تەندروستی هەبوو لە ناوچەکانی باکووری عیراق .

لە هەندێ لیوا بنکەی مەرکەزی تەندروستی لە شارەکانی کوردستان ساڵی ١٩٥٧ (وزارة الصحة، نشرة الآحصاء العام لسنة ١٩٥٧).

| شارەکان ١٩٥٧ | |
|---|---|
| هەولێر | ٢ بنکەی لێ بوو |
| کەرکووک | ١ |
| سلێمانی | ٣ |
| موسڵ | ٤ |

خشتەی سەرژمێری پزیشکی دەرمانسازی شارە کوردییەکانی عیراق (مديرية الصحة العامة،١٩٥١،ص ٤٢).

| لیوا | ژمارەی دەرمانسازی | المراجعون |
|---|---|---|
| موسڵ | ١٧ | ٢٠٥٩١ |
| هەولێر | ٣ | ٣٣٤٩ |
| کەرکووک | ٥ | ١٣٢٣ |
| سلێمانی | ٢ | ٥٢٥٧ |

خشتەی دابەشکردنی پزیشکە تایبەتەکانی عێراق ١٩٥٤ – ١٩٥٨
(وزارة الصحة، ١٩٥٨، ص ٦٧).

| لیوا | ١٩٥٤ | ١٩٥٥ | ١٩٥٦ | ١٩٥٧ | ١٩٥٨ |
|---|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٦٦ | ٨٧ | ٨٤ | ٨٠ | ٨٠ |
| هەولێر | ١٥ | ٢٢ | ٢٠ | ٢٢ | ٢١ |
| کەرکووک | ٥٤ | ٦٠ | ٢١ | ١٦ | ١٨ |
| سلێمانی | ١١ | ١٦ | ٢١ | ١٦ | ١٨ |

**أ- مەلاريا:**

ئەم نەخۆشییە یەکێکە لە نەخۆشییە ترسناکەکان کە ڕاستەوخۆ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگوازرێتەوە و ئەم پەتایە بەماوەیەکی زۆر خێرا بڵاو دەبێتەوە (عسیران، ١٩٨٤، ص ٢٣؛ الفكيكي، ١٩٨٩، ص ص ٢٦٠-٢٦١). هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئەم پەتایە لە عێراق بۆ چەن هۆکارێک دەگەڕێتەوە، لەوانە بۆ خراپی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی، ناجێگیری کەش و هەوا لەلایەکی ترەوە، پیسبوونی ئاوی خواردنەوە هۆکارێکی ڕاستەوخۆ بوو بۆ سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی ئەم پەتایە (الموسوي، ٢٠٠٣، ص ١٥٦ ). ئەم پەتایە سەرەتا لە بەغدا بڵاو بووەوە و ئینجا بۆ ناوچەکانی تر(شط العرب و بەسرە، . کوت، عمارە) تەشەنەی کرد (المظفر، ١٩٧٩؛ رشيد، ٢٠٠٧، ص ٣٤٥)، (لجنە القضاء على الملاريا) بۆناوچەکانی باکووریش لە (هەولێر و کەرکووک، سلێمانی) بڵاو بووەوە، بەڵام لە ناوچەی سلێمانی ڕێژەی تووشبووانی زۆر زیاتر بوو وەک لە ناوچەکانی تر. ژمارەیەک کارمەندی تەندروستی نێودەوڵەتی هاتنە عێراق بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەی کە (ماجد مستەفا) لەگەڵ دکتۆر (شوشە) و پسپۆرانی تەندروستی نێودەوڵەتی مۆری کردبوو، ئەو کارمەندە تەندروستییانە هاتنە عیراق و دەستبەجێ لێژنەیەکیان پێکهێنا بە ناوی (لیژنەی لەناوبردنی مەلاريا) (الحكومة العراقية، مديرية الصحة العامة ١٩٥٠، ص ٦٧). کارمەندانی ئەم لیژنەیە سەردانی ناوچەی (زاخۆ و سەرسەنگ و دهۆک و شێخان و ئامێدی و

ئاکرێ)یان کرد (الحكومة العراقية، وزارة الصحة، نشرة الإحصاء الصحی لسنة ١٩٥٤؛ شیخو، ٢٠١٢، ص ص ١٠٥-١٠٦). لیژنەیەکی تر سەردانی لیوای (سلێمانی تانجەڕۆ و چوارتا و شارەزوور و ماوەت) یان کرد (الموسوی، ٢٠٠٣، ص ٢١٥). لیژنەیەکی تر سەردانی لیوای (هەولێر و شەقڵاوە) یان کرد لەساڵی (١٩٥٥) وەزارەتی تەندروستی عێراقی ڕێککەوتنامەیەکی لەگەڵ وەزارەتی تەندروستی ئێرانی مۆرکرد، بۆ ئەوەی کادیرانی وەزارەتی تەندروستی ئێرانی سەردانی ناوچە سنوورییەکان بکەن بەتایبەتی ناوچەی (مقدادیە و خانەقین و لیوای دیالە "بعقوبە") بۆ بنەبڕ کردنی ئەم پەتایە (المظفر، ١٩٧٩، ص ص ٢٤٩-٢٥٠). بەڵام ناوچەی سلێمانی لە هەموو ناوچەکانی تر ڕێژەی دانیشتووانی زیاتر بوو بەپێی ڕاپۆرتی کارمەندانی تەندروستی نێودەوڵەتی (المظفر، ١٩٧٩، ص ٢٥١).

**ب- بەلهارزیا:**

دووەم نەخۆشی لە عێراق سەری هەڵدا نەخۆشی (بەلهارزیا) بوو، ئەم کرمە لەناو ئاو دەژی لە ڕێگای مەلەوانی دەچێتە ناو میزڵدانی لەشی مرۆڤ (دکتۆرێکی ئەڵمانی ناوی (تیۆدۆر بەلهارز) بوو یەکەم کەس بوو ئەم نەخۆشییەی لە ساڵی (١٨٥١) دۆزییەوە، نەخۆشییەکە بە ناوی ئەو ناسرا. لە ڕێگەی پێست یان لە ڕێگەی دەمەوە دەچێتە لەشی مرۆڤ، ئەم کرمە لە ئاوی دەریا دەژی بە هۆی مەلەوە مرۆڤ تووشی ئەم نەخۆشییە دەبێت، دەچێتە جگەر یان گورچیلە یان میزڵدانی مرۆڤ. بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم نەخۆشییە بڕوانە: الفكيكی ، ١٩٨٩، ص ١٢٢). لە سەرەتای ساڵانی پەنجاکان (٢٠%) ی دانیشتووانی عێراق تووشی ئەم نەخۆشییە بوون لە ناوچەکانی (بەسرە و عمارە و بەغدا) بڵاو بووەوە دواتر تەشەنەی کرد بۆ ناوچەکانی تر (الموسوی، ٢٠٠٣، ص ص ١٦٤- ١٦٥)، بەڵام لە ناوچەی (هەولێر و کەرکووک و سلێمانی) ڕێژەی تووشبووان بەم نەخۆشییە کەمتر بوو (رشید، ٢٠٠٧، ص ص ١٨٦-١٩١؛ عسیران، ص ٩١). وەزارەتی تەندروستی و وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی لە ساڵی (١٩٥٢) گرینگییەکی زۆریان بەو نەخۆشییانە دا، ڕێنمایی تەندروستییان لە شار و گوندەکان و ناو

خەڵک بڵاو کردەوە، مەترسی بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییە گوازرایەوە ناو ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی پیران، لە دانیشتنێکی ئەنجومەنی پیران بانگێشتی (ماجد مستەفا) وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی کرابوو، کە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی کەمتەرخەمە لە ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییە، (ماجد مستەفا) ئاماژەی بەوەدا داوامان لە ڕێکخراوی نێودەوڵەتی کردووە لەسەر ئەو نەخۆشییە پسپۆری تایبەتمان بۆ بنێرێ بۆ ئەوەی چارەسەری ئەم نەخۆشییەمان بۆبکەن (مجلس الأعيان، ١٩٥٢، ص ٢٣٦).

**ئەنجام:**

ئەم توێژینەوە بە ناوونیشانی ((ڕۆڵی وەزیرە کوردەکان سەبارەت ناوچە کوردییەکانی کوردستانی عێراق لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەندروستییەوە (١٩٤٥ – ١٩٥٨)) ئەم ئەنجامانەی پێداین:

ژمارەی وەزیرە کوردەکان لەو ماوە مێژووییيە و جۆری وەزارەتەکانیان لەگەڵ قورسایی کورد لە کوردستانی عێراق نەدەگونجا و ئەوەی پێشان دەدا کورد لە زۆر ماف لە عێراق بێ بەش بوو. بەشێوەیەکی گشتی وەزیرە کوردەکان چەند ناوێک بوون لە وەزارەتە جۆربەجۆرەکاندا ناویان دووبارە دەبووەوە. هەروەها پتر خەڵکی سلێمانی بوون واتە ڕەچاوی ئەوە نەکرابوو شار و شارۆچکەکانی کوردستانی عێراق بە گشتی بە گوێرەی توانا و بڕوانامە لەبەر چاو بگیرێن.

گلەیی زۆر لەو وەزیرانە هەبوو، تەنانەت ئەندامە کوردەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق ڕەخنەی زۆریان لەم وەزیرانە هەبووە، کە لە ڕێگای وەزارەتەکانیان نەیانتوانیوە وەکو پێویست خزمەت بە ناوچە کوردییەکان بکەن. بە گوێرەی ئەو داتایانەی لە بەردەست بوون عەلی حەیدەر سلیمان زیاترین خزمەتی لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی پێشکەش بە کورد کردووە لە ڕێگای ئەو وەزارەتانەی

کاری تیادا کردوون وەزیرەکانی تریش هەریەک بە ڕادەی جیاواز خزمەتیان بە ناوچە کوردییەکان کردووە.

لە هەمان کات دەبێت هەندێک هۆکار لەبەرچاو بگرین بۆ زیاتر تێگەیشتن لەو بابەتە لەوانە ئەو وەزیرە کوردانە بە پلەی یەکەم وەزیری دەوڵەتی عێراق بوون و دڵسۆزی حکومەتەکانیان بوون ئینجا بە پلەی دووەم نەتەوەکەیان کورد. هەروەها عێراق وەکو دەوڵەتێکی مەرکەزی زۆربەی تواناکانی بۆ پرۆژەکانی پایتەخت بەغدا تەرخان کرابوو بە ڕادەی کەمتر بۆ شارەکانی تری عێراق لەوانەش ناوچە کوردییەکان. لە هەمان کاتدا ئەگەرچی داهاتی عێراق دوای شەڕی دووەمی جیهان تاڕادەیەک زیادی کردبوو بەڵام هێشتا ئەو داهاتە زۆرەی لەبەردەستدا نەبوو هەموو پێداویستییەکانی وڵات کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زیادبووندا بوو دابین بکات.

ئەم وەزیرانە وەزارەتی خزمەتگوزارییان وەردەگرت نەک وەزارەتی سەروەری زۆریان دووربوون لە مەسەلەی کورد وەکو نەتەوەپەروەری کورد نەناسرابوون.

**پەراوێزەکان**

**الوثائق غير المنشورة:**

- د. ك. و، البلاط الملكي، ملفات ، (٤ \حزيران\ ١٩٤٦ )، رقم الملف ١٧،٣٢١٣١، الاضبارة الغابات، التشجير، رقم الاضبارة ٢١-١١،٢٨، وزارة ألاقتصاد .
- د . ك . و، ملفات البلاط الملكي، (١٦\تشرين الاول\١٩٤٦)، رقم الملف ٣١١/٥٣٨٤، بلا رقم، وزارة الاقتصاد، بلا رقم.

**چاپکراوە حکومییەکان:**

- مجلس الاعمار، محاضر جلسات ،( بتاريخ ٣٠ \كانون الثاني \١٩٥٤)، الجلسة رقم ( ٣٠)، المنعقدة.
- مجلس الاعمار، محاضر جلسات ، (بتاريخ ٣\شباط \١٩٥٤)، الجلسة رقم (٩٢)، المنعقدة ، القرار (٥).
- مجلس الاعمار، محاضر جلسات ،( بتاريخ ١٦\شباط \١٩٥٧)، الجلسة رقم (١٨)، المنعقدة.
- مجلس الاعيان، محاضرجلسات ،(٢١ \نيسان \١٩٥٢)، **الاجتماع العادي، لسنة ١٩٥١- ١٩٥٢** ، الجلسة (١٠).
- مجلس الاعمار، محاضر جلسات ،( تاريخ ٤\تموز\١٩٥٤)، الجلسة رقم (٣٦) المنعقدة.
- مجلس الاعمار، محاضر جلسات ،( بتاريخ ١٩\اب\١٩٥٤)، الجلسة رقم (١١٦) المنعقدة، القرار رقم ( ٢).
- مجلس الاعمار، محاضر جلسات ، (٢٧- تشرين الثاني ١٩٥٤)، الجلسة رقم (١٢٦)، المنعقدة بتاريخ .
- مجلس الاعمار، محاضر جلسات ،( بتاريخ ١٤- كانون الاول ١٩٥٧)، الجلسة رقم (٣٩)، المنعقدة.
- مجلس النواب، محاضر، (٢٤ \نيسان\١٩٤٥)، **الدورة الانتخابية العاشرة، الاجتماع الاعتيادي سنة ١٩٤٤،** الجلسة (٣٣).
- مجلس النواب، محاضر، (٤\شباط\ ١٩٤٧)، **الدورة الانتخابية الحادى عشرة، الاجتماع غيرالاعتيادى، لسنة ١٩٤٧ – ١٩٤٨.**
- مجلس النواب، محاضر، (٢٦\ اذار\١٩٤٧)، **الدورة الانتخابية الحادى عشرة، الاجتماع الاعتيادى، سنة ١٩٤٧** .

- مجلس النواب، محاضر، (٨\انيسان ١٩٤٧\)، **الدورة الانتخابية الحادى عشرة ، الاجتماع غير الاعتيادي، لسنة ١٩٤٧ – ١٩٤٨.**
- مجلس النواب، محاضر، (١٤\ نيسان ١٩٤٧\)، **الدورة الانتخابية الحادي عشرة، الاجتماع الاعتيادي**، الجلسة (٨).
- مجلس النواب، محاضر ،( في ١٧ \نيسان ١٩٤٧\)، **الدورة الانتخابية الحادي عشرة، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة ١٩٤٧ – ١٩٤٨**، الجلسة (١١) .
- مجلس النواب، محاضر، (١٩ \نيسان ١٩٤٧\)، **الدورة الانتخابية الحادي عشرة، الاجتماع الاعتيادي** جلسة (١٣).
- مجلس النواب، محاضر، (٢٥\حزيران\١٩٤٧)، **الدورة الانتخابية الحادي عشرة، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة ١٩٤٧**، الجلسة (٣٤).
- مجلس النواب، محاضر، (٢٥\٦ \ ١٩٤٧)، **الدورة الانتخابية الحادي عشرة ، الاجتماع غير الاعتيادي** الجلسة (١٨).
- مجلس النواب، محاضر، (٢٥ \حزيران ١٩٤٧\)، **الدورة الانتخابية الحادي عشرة، الاجتماع غير الاعتيادي، لسنة ١٩٤٧.**
- مجلس النواب، محاضر، (٢٠ شباط ١٩٥٠\)، **الدورة الانتخابية الثانيةعشرة، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٤٩ – ١٩٥٠** ، الجلسة ( ١٦) .
- مجلس النواب ، محاضر، (١٤ اذار ١٩٥٠)، **الاجتماع غير الاعتيادي، سنة ١٩٤٩-١٩٥٠**، الجلسة ( ٢٤).
- مجلس النواب ، محاضر ، ( سنة ٤ شباط ١٩٥٢)، الدورة الانتخابية الاجتماع الاعتيادي، الجلسة (١٣).
- مجلس النواب، محاضر ، (٢٣ شباط ١٩٥٣)، الدورة الانتخابية الثالثة عشرة ، الاجتماع الاعتيادي ،الجلسة(١٨).
- مجلس النواب، محاضر، (١٩ نيسان ١٩٥٢)، **الدورة الانتخابية الجلسة (٢٤)، الاجتماع الاعتيادى سنة ١٩٥١ -١٩٥٢.**
- مجلس النواب،محاضر،(١\كانونى الاول ١٩٥٣\)، **الدورة الانتخابية الثالثة عشرة، الاجتماع الاعتيادي**، الجلسة (٣).
- مجلس النواب، محاضر، (٣٠\كانون الاول ١٩٥٣\)، **الدورة الانتخابية الرابعة عشرة، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٥٣-١٩٥٤** الجلسة (٨).
- محاضرمجلس النواب، (١٩\٤\١٩٥٦)، **الدورة الانتخابية الخامسة عشرة ، الاجتماع الاعتيادي**، الجلسة (١٢)، سنة ١٩٥٦.

- مجلس النواب، محاضر، (٢٣ \٤\١٩٥٦)، **الدورة الانتخابية الخامسة عشرة الاجتماع الاعتيادي**، الجلسة (١٣).
- مجلس النواب ، محاضر ، (١٧ نيسان ١٩٥٧)، **الدورة الانتخابية الخامسة عشرة، الاجتماع الاعتيادي سنة ١٩٥٦- ١٩٥٧**، الجلسة (١٦ ).
- الحكومة العراقية ، وزارة الشؤون الاجتماعية ، مديرية الصحة العامة ١٩٥٠.
- ملفاة وزارة الداخيلية الرقم ملف: ٣٨/ف ملاريا الصحة لواء السليمانية متصرفية لواء السليمانية وزارة الصحة، الرقم ٧٣٧ ، ٢٨ – ٣-١٩٥٣.
- الحكومة العراقية، وزارة الصحة نشرة الاحصاء الصحي، لسنة ١٩٥٤.
- مدير الصحة العامة، نشرة ألاحصاء الصحي العام ،لسنة ١٩٥١.
- وزارة الصحة، نشرة الاحصاء العام الصحة، لسنة ١٩٥٥ ، نشرة الاحصاء العام، لسنة ١٩٥٦.
- وزارة الصحة، نشرة الاحصاء العام، لسنة ١٩٥٧.
- وزارة الصحة نشرة ،الاحصاء العام الصحة، لسنة ١٩٥٨ .

### سەرچاوە بە زمانی عەرەبی:

- بازوو، شكر خضر مراد ، (٢٠١٢)، **شنگال خلال العهد الملكي ١٩٢١-١٩٥٨، دهوك**، مطبعة جامعة دهوك.
- الجواهري، عماد احمد ،(١٩٨٢)، **تاريخ مشكلة اراضي الاصلاح الزراعي في العراق ١٩٣٣-١٩٧٠**، رسالة ماجستير، غيرمنشورة، مقدمة الى قسم التاريخ، كلية الآداب، جامعة بغداد.
- خصباك، شاكر، (١٩٧٣)، **العراق الشمالي**، ط١، بغداد.
- خليل ، نورى عبدالحميد، (١٩٨٠)، **التاريخ السياسي لامتيازات نفط العراق ١٩٢٥-١٩٥٢**، ط١، بغداد .
- الدليمى ، محمود شكحان مصلح ، (٢٠٠٢)، **علي حيدر سليمان نشاطه الثقافي و دوره السياسي في العراق حتى عام ١٩٦٨**، رسالة ماجستير، غير منشورة، مقدمة الى قسم التاريخ، كلية التربية، جامعة بغداد.
- رشيد، حيدر حميد ، (٢٠٠٧)، **الاوضاع الصحية في العراق ١٩٤٥ – ١٩٥٨**، اطروحة دكتوره، غير منشورة، مقدم الى قسم التاريخ، كلية التربية ، جامعة بغداد.

- الريكاني ، محمود شيخ سين حسو ، (٢٠١٢)، **شنگال سنجار في العهد الملكي ١٩٢١-١٩٥٨**، مطبوعات الاكاديمية الكوردية ، اربيل.
- الزبيدي، د. حسن لطيف كاظم ، (٢٠١٣)، **موسوعة السياسة العراقية**، بيروت، العارف للمطبوعات، ط٢.
- سلمان، سهيل، (١٩٩٤)، **التطورات الاقتصادية والاجتماعية في العراق١٩٤٥-١٩٥٨**، اطروحة دكتوراه، غير منشورة، جامعة بغداد، مقدمة الى قسم التاريخ، كلية اداب؛ شاكر خصباک، العراق الشمالي .
- سليمان ، حكمت سامی ، (١٩٧٩)، **نفط العراق دراسة أقتصادية سياسية**، دار الرشيد للنشر، بغداد .
- سليمان، حكمت سامی ، (١٩٥٨ )، **النفط في العراق**، بغداد.
- الصويريكي ، د. محمد علي ، (٢٠٠٨)، **الموسوعة الكبرى لمشاهير الكورد عبر التاريخ**، بيروت، الدار العربية للموسوعات، المجلد الأول.
- طوبان ، حيدر علی ، (٢٠١٢)، **أسرة عمر نظمي دورها السياسي واتجاهاتها الفكرية في العراق المعاصر**، بغداد مكتبة عدنان للطباعة و النشر و التوزيع.
- عبهول، عبدالله شاتی ، (١٩٨٣)، **مجلس عمار العراق ١٩٥٠-١٩٥٨، رسالة ماجستير**، غيرمنشورة، مقدمة الى قسم التاريخ، كلية الاداب، جامعة بغداد..
- عبود ، زهير كاظم ، (٢٠٠٨)، **لمحات عن سعيد قزاز**، اربيل، مطبعة اراس، ط٢.
- عسيران ، الشريف ، (١٩٨٤)، **الاحوال الصحية في العراق** ، ط١، بغداد .
- الفكيكی ، اديب توفيف ، (١٩٨٩)، **تاريخ اعلام طب العراق** الحديث ج١ ، بغداد.
- لونكريک، ستفن، همس و ستوكس، فرانک ، (١٩٨٥)، **العراق منذ التاريخ حتى ثورة تموز ١٩٥٨**،ت: مصطفی نعمان، بغداد.
- المظفر ، محسن عبدالصاحب ، (١٩٧٩ )، **التحليل المكاني للامراض المتوطنة في العراق دراسة في الاسس الجغرافية والتخطيط**، بغداد ، الرقم ملف ٣٨/ق الصحة لواء السلمانية ،١٥\ كانون أول ١٩٥٤\.
- مظهر، كمال ، (١٩٨٤)، حول مسألة الاقطاع بين الكرد، بغداد.
- الموسوي، عباس فرحان ظاهر علي الشبر ، (٢٠٠٣)، **الحياة الاجتماعية في مدينة بغداد ١٩٣٩-١٩٥٨دراسة تاريخية**، اطروحة دكتوراه، غيرمنشورة، مقدمة الى قسم التاريخ، كلية التربية ابن رشد، جامعة بغداد .

**سەرچاوە بە زمانی کوردی:**

- حەیدەری و ئەوانی تر ، مومتاز ، (٢٠١٤)، **قامووسی ناوە نەمرەکان**، بەرگی یەکەم ئامادەکردن و سەرپەرشتی ، هەولێر چاپخانەی ڕۆژهەڵات.

**سەرچاوە بە زمانی ئینگلیزی:**

- HRAOOF,ABDUL,( 1985) **IRAQ POLITICAL SYSTEM.1920-1958**, NEWYORK UNIVERSTY.

**ماڵپەڕی ئەلیکترۆنی:**

- النادي الكوردي، الكورد في العراق، http://www.kurdclub.com.

**ڕۆژنامە و گۆڤارەکان:**

- بلاد ، (جريدة )، العدد (٢٨٥٤ )، ١٨\حزيران\١٩٤٦.
- بلاد (جريدة )، العدد (٢٩١٧) ، ١٤\ايلول ١٩٤٦.
- صوت الاهالى (جريدة )، العدد ( ٥ )، ١٩٥٢\٣\٢٣.
- الاخبار(جريدة )، العدد (٣٩١٣)، ١\ كانون الاول\١٩٥٣.
- الشعب (جريدة )، العدد (٢٨ ) ،٢٠\ كانون اول \١٩٥٣.
- الحوادث (جريدة )، العدد (٣٣١٠) ،٢٣\كانون الثانى \١٩٥٤.

## ملخص البحث

## دور الوزراء الكورد فيما يتعلق بالمناطق الكوردية في كوردستان العراق من الجوانب الاقتصادية والاجتماعية والصحية ١٩٤٥ – ١٩٥٨

**أ.م.د. محمد عبدالله كاكه سوور     روژگار عبدالرحمن محمد**

قسم التاريخ – كلية الاداب – جامعة صلاح الدين

ان نسبة تمثيل الكورد في مؤسسات الدولة كانت احدى مطالب الكورد في العراق . وقد اختلفت هذه النسبة من حكومة الى أخرى، وتغيرت في العهد الجمهوري بالمقارنة مع العهد الملكي.

ان وجود وزراء الكورد في الحكومات العراقية ادى الى ارضاء الكورد الى حد ما واستفادت منه الدولة العراقية كدليل أمام الرأي العام المحلي والخارجي على وجود الديمقراطية وعدم حرمان الكورد لحقوقهم في العراق.

في بعض الاحيان ومع الأوضاع المأساوية التي تعرض له الكورد في العراق في العهد الجمهوري، ادى الى تفضيل بعض الكتاب للعهد الملكي . ولكي لا يصبح الأمر مفاضلة بين سيء واسوء منه، ولكي ندرس بشكل علمي واكاديمي الجوانب المختلفة من التاريخ الكوردي، قمنا بأختيار هذا العنوان لبحثنا والذي هو: ( دور وزراء الكورد بالنسبة للمناطق الكوردية في كوردستان العراق من الجوانب الاقتصادية، الاجتماعية, والصحية ١٩٤٥-١٩٥٨) وقد وجهت انتقادات كثيرة لهؤلاء الوزراء. حتى ان اعضاء مجلس النواب العراقي وجهوا انتقادات كثيرة لهم لأنهم لم يستطيعوا ان يقوموا من خلال وزاراتهم بخدمة المناطق الكوردية كما ينبغي.

وحسب المعلومات المتوفرة فان (علي حيدر سليمان) قدم اكثر خدمة اقتصادية واجتماعية للمناطق الكوردية من خلال وظيفته بالمقارنة مع وزراء الكورد الآخرين, غير ان هذا لا ينفي ان الآخرين ايضا خدموا المناطق الكوردية وبدرجات مختلفة.

ان عدد وزراء الكورد ونوعية وزاراتهم بصورة عامة لم يكن يتفق مع وزن الكورد في العراق. وكان دليلا على حرمان الكورد من كثير من حقوقهم في الدولة. وبصورة عامة ان هؤلاء الوزراء كانوا مجموعة قليلة من الاسماء التي تتكرر في الوزارات المختلفة. ولم يتم مراعاة التوزيع الجغرافي للألوية الكوردية حيث كان اغلب الوزراء من لواء السليمانية.

وقد كان هؤلاء الوزراء الكورد يشغلون وزارات خدمية لا وزارات سيادية، ومعظمهم غير محسوبين على الحركة القومية الكوردية.

Abstract

## The Role of Kurdish Ministers in Kurdish Areas of Iraqi Kurdistan in the Economic, Social and Health Fields 1945-1958

**Asst. prof. Dr. Mohammad Abdullah Kakasoor**

History Dept. – College of Arts – Univ. of Saladin

**Rozhkar Abdul-Rahman Muhammad**

History Dept. – College of Arts – Univ. of Saladin

One of the requirements of the Kurds in Iraq was the number of representatives in government institutions and departments. This was different with different governments. The difference between the royal government and the republican government and the existence of Kurdish ministers in the government was for the Kurds' consent. The Iraqi governments used this to satisfy international public opinion at home and abroad that democracy exists in this country and the rights of Kurds are preserved.

Some times with all these problems and difficulties experienced by the Kurds in the time of republican governments some of the writers wished the time of royal governments In order to know the subject and the differences between all the time and study the subject in an academic and scientific and we study different areas in the history of Kurds, and we wanted to study the conditions of Kurdish ministers in the regions of Kurdistan so we have chosen the title of this topic:

Role of the Kurdish Ministers in Kurdish Areas of Iraqi Kurdistan in the Field of Economic, Social and Health (1948-1958).

Members of the Kurds in the parliament of Iraq, they had comments on the ministers because they did not develop the Kurdish areas and did not benefit any area of them, according to the information available in the database (Ali Haider Suleiman) the most ministers, which benefited the Kurds Economic and social development through ministries in which the ministers and other ministers were individually different in different areas.

The number of Kurdish ministers in this historical period and the various ministries and the weight of Kurds in Iraq shows that the Kurds did not get their legitimate rights. In general, the number of ministers and their names were specific in different ministries and their names were repeated.

# ئاستی ڕۆشنبیریی مەلیکەکانی ئەییوبیی و ڕۆڵ و پێگەیان لە بنیاتنانی دامەزراوە فێرکارییەکان لە وڵاتی شام دا

## (٥٨٩-٦٥٨ ک/ ١١٩٣-١٢٦٠ز)

پ. د. ئاکۆ بورهان محەمەد م. ی. محسن مامل محەمەد

بەشی مێژوو/ کۆلێژی ئەدەبیات/ زانکۆی سەلاحەددین _ هەولێر

**پێشەکی**

کاتێک باس و خواز لە دەوڵەتی ئەیوبی دەکرێت وێنەی ئەوە دێتە بەرچاو کە قۆناغەکانی پەرەسەندنی ئەو دەوڵەتە تەنها بریتی بووە لە شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی بەرامبەر بەو هێز و لایەنانەی کەوا ڕوویان لە ناوچەکانیان کردووە، لە سەرووی هەمووشیانەوە خاچییەکان ئینجا هێز و لایەنەکانی دیکە، بەڵام لە ڕاستیدا سەردەمی ئەیوبییەکان تەنیا گوزارشت نەبووە لە ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی، بەڵکو سەردەمێکی گەشاوە بووە لە ڕووی زانست و زانیاری و برەودان بە لایەنی ڕۆشنگەری، ئەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە سەرمەشق و ڕێبەرانی ئەو دەوڵەتە خۆیان کەسانی ڕۆشنبیر بوون و قەڵەم بە دەست و زانستخوازانیان خۆشدەویست و بەردەوام لە خۆیانیان نزیک دەکردنەوە، هەموو ئەوانەش زیاتر لەوەدا گەلاڵە بووە کە خودی مەلیکەکان خۆیان باوەڕی تەواویان بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەبووە بەوەی بەردەوام جەختیکردۆتەوە لەسەر فێربوون و گەڕان بە دوای زانست و زانیاری (الاتروشي، ٢٠٠٧، ص٧)، لەم سۆنگەیەشەوە دەکرێت ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئەوان بە سەردەمی زیوی ناوزەند بکرێت بەراورد لەگەڵ سەردەمی زێرینی عەبباسییەکان، لە قۆناغی یەکەمی دەوڵەتمەدارییان.

هەڵبەتە ئەو بزاڤە ڕۆشنبیری و هزرییەی کە لە ئارادابوو شتێکی سروشتی و خۆڕسک نەبوو، بەڵکو درێژکراوەی پێشکەوتنەکانی قۆناغەکانی پێش خۆی بوو ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەش دەگەڕێتەوە بۆ هەنگاو و سیاسەتەکانی مەلیک و کەسە باڵا دەستەکانی کە بەشێکی زۆریان ڕۆڵی کارایان هەبوو لە دروستکردن و فەراهەمکردنی کەش و فەزایەکی لەبار بۆ چالاککردن و گەشەسەندنی جووڵانەوەی ڕۆشنبیری لە ڕێگای بنیادنانی دامەزراوە فێرکارییەکان و دابینکردنی سەرجەم پێداویستیەکانی، لە بەر ئەوەی درکیان بەو ڕاستییە کردبوو کە لە هەموو کات و سەردەمێکدا ئەو لایەنە یەکێکە لە بنەما و کۆڵەگە سەرەکییەکانی گەشەسەندن و پێشکەوتن.

لەبەر ڕۆشنایی ئەمەش، ئەگەر زانست و زانیاری بۆ خەڵکە ئاساییەکە گرنگی و بایەخی هەبووبێ، ئەوا بۆ مەلیک و دەسەڵاتداران خۆراکی بیر و هزریان بووە، لەم سۆنگەیەوەش جەخت لەوە دەکرێتەوە کەوا ((زانست مەلیکەکان جوانتر دەکات زۆر زیاتر لەوەی خەڵکە ڕەشۆکییەکە جوان بکات)) (ابن الطقطقي، ١٩٩٧، ص١٣)، بەمەش وا دەخوازێت لە سەر مەلیکەکان کە هۆشیاری و درکیان بۆ هەندێ بابەتی تایبەتمەند زۆر لە خەڵکانی دیکە زیاتر بێ.

لە لایەکی دیکەش، ئەو پەرەسەندن و گەشەسەندنانەی دەهاتە ئاراش، پەیوەندیی ڕاستەوخۆی هەبوو بە کەسێیەتی و ئاستی مەعریفی مەلیکەکانی ئەیوبی، بە جۆرێک پەروەردە و نەریتی ئەو سەردەمە وا باو بوو لە نێو ماڵباتە دیار و دەست ڕۆیشتووەکانی مێژووی ئیسلام منداڵەکانیان پەروەردەکراون و جۆشدراون بە زانست و زانیارییەکانی سەردەم، ئەوەش ڕاستەوخۆ کاریگەری هەبووە لە سەر ئاستی مەعریفی و ڕۆشنبیرییان، بەشێوەیەک شارەزاییەکی باشیان پەیداکردووە لە سەرجەم بوارە زانستییە جۆراو جۆرەکانی سەردەم و دواجار لێزانی و لێوەشاوەیی خۆیان تیایدا نیشانداوە.

**یەکەم:**

**ئاستی ڕۆشنبیری و بایەخدانیان بە زانست و زانیارییەکانی سەردەم**

**١- گرنگیدانیان بە زانستە شەرعی و ئایینییەکان:**

**أ- قورئانی پیرۆز**

هەروەک ڕوون و ئاشکرایە قورئانی پیرۆز وتە و فەرمایشتی خوای گەورەیە کە هاتووە بۆ پێغەمبەرەکەی محمد (د.خ) بۆ ئەوەی ببێتە دەستوور و بەرنامە بۆ تەواوی موسڵمان و باوەڕداران، بە جۆرێک یەکەم سەرچاوەیە کە بنەما و ئاداب و ڕێنماییە سەرەکییەکانی ئیسلامی لێوەردەگیرێت، هەربۆیە لێرەدا پێویستە لە سەر تەواوی موسڵمانان بێ جیاوازی بە دروستی بیخوێننەوە و لێی تێبگەن لە ڕێگای تێگەیشتن و شرۆڤە و ڕاڤەکردنی، بەمەش قورئانی پیرۆز لە پێشەوەی هەموو ئەو زانستە ئایینیانە دێت گرنگی و بایەخی زۆری پێدراوە لە تەواوی قۆناغەکانی مێژووی ئیسلام.

لەم نێوەندەشدا ماڵباتی ئەیوبییەکان لە سۆنگەی هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی و شارەزابوون لە بنج و بنەوانی ئایینەکەیان ئەوا گرنگی و بایەخی زۆریانداوە بە خوێندنەوە و لەبەرکردن و ڕاڤەکردن و بەدواداچوونی، لەم نێوەندەشدا مەلیک الافضل خاوەنداری دیمەشق، بایەخی زۆری داوە بە زانستەکانی قورئان، بە تایبەتی دوای ئەوەی وازی لە ژیانی دونیایی هێنا و گەڕایەوە بۆ ڕیزی باوەڕداران بە تەواوی خۆی تەرخانکرد بۆ خواپەرستی، لە میانەشیدا قورئانی پیرۆزی بە دەس و خەتی خۆی نووسییەوە (ابو شامة، ١٩٩٧، ٢٤/٤؛ ابن تغري بردي، د.ت، ١٢٣/٦)، لەبەر ئەوەی خۆی بەوە ناسرابوو کە خۆشنووسێکی چاک و باش بووە و بە ڕێک و ڕەوانی دەینووسی (ابن الاثير، ١٩٩٧، ٣٩١/١٠؛ ابن واصل، ١٩٥٧، ٤٠/٣).

هەرچی مەلیک الاعز یعقوب کوڕی سەلاحەددینە، ئەوا لەسەر دەستی زانا هەرە دیارەکانی وەک محمد بن حمد بن حامد الارتاحي (م: ٦٠١ک/١٢٠٤ز) فێری خوێندنەوەی بووە، بەمەش ڕووناکی قورئانی

پیـرۆز لـە دڵ و دەروونیـدا چەسـپابوو، هەربۆیـە بـەردەوام خـەریکی خوێندنەوەی قورئان بووە (الذهبي، ٢٠٠٣، ٧٨٥/١٣).

یـەکێکی دیکـە لـەو مەلیکانـەی کـەوا مـەیلی زۆری بـەلای قورئـانی پیرۆزدا هەبووە، ئەویش مەلیک الناصر یوسفی دووەم خاوەنداری شام کە زۆربەی کات لە دەرباریدا گوێیدەگرت لە قورئان بە دەنگی قورئان خوێنە دەنگ نەوازەکان، تەنانەت بەشێکی زۆری لەبەر کردووە، ئەوەش ڕەنگدانــەوەی زۆری بەســەردا هــەبووە کاتێـک ڕووداو و پێشــهاتێک دەهاتـە ئـارا هێنـدە زۆر قورئـانی لەبـەر بـوو بـە وتـە و فەرمایشـتەکانی خــوای گــەورە وەڵامــی دەدایــەوە، هــەروەک دەگوترێــت کاتێــک موسـڵمانەکان سـەرکەوتن بەسـەر خاچپییـەکان و شـاری صـیدایان لـە کـەناراوەکانی شـام گێڕایـەوە ژێـر قەڵـەمڕەوی خۆیـان، ئـا لـەو کاتـەدا سـەربازەکانی دوژمـن لـە ترسـی گیـان و ژینیـان خۆیـان دەخسـتە نێـو دەریـا نـەوەک بکـوژرێن یـاخود بـە دیـل و بەنـدی بکەونـە دەسـت موسـڵمانەکان (الصـفدي، ٢٠٠٠، ١٤٠/٢٩)، لێـرەدا کاتێـک مـەلیک الناصـر یوسـف ئـەو بارودۆخـەی بینـی بـە بـەڵێن و قسـەکانی خـوای گـەورە گوزارشتی لێکرد بەوەی بێباوەڕان لـە ئەنجامی گوناهـ و تاوانـەکانیان نغرۆی دەریاکان کران، پاشان خرانە ناو ئاگرەوە و کەسیشیان دەست نەکەوت کە لە تووڕەیی و سزای خوا پەنایان بدات، لە میانەشیدا گوتی خوای گەورە دەفەرمووێت: [مِمَّا خَطِيئَـاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَـارًا فَلَمْ يَجِدُوا لَهُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْصَارًا] (سورة نوح، الاية/٢٥).

مەلیک المعظم عیسـی لـە هـەموو کوڕەکـانی دیکـەی مـەلیک العـادل پەیوەسـت بـووە بـە قورئـانی پیـرۆزەوە، ئـەوەش لـەوەدا سـەرچاوەی گرتووە لە تەمەنی منداڵییـەوە تـەواوی قورئـانی پیـرۆزی لـەبـەرکردووە، ئەوەش دوا بەدوای ئەوەی بەردەوام دەچووە کۆڕ و کۆبوونەوەی زانـا و شـەرعناسە گەورەکان بۆ ئەوەی لەسەر دەستیان قورئان لەبەر بکـات (الذهبي، ٢٠٠٦، ١٢٣/١٦)، جگە لەوەش بایەخی زۆری داوە بـە شـێوازەکانی خوێندنــەوەی قورئــان، لــەم ڕووەوەش کتێبــی (الحجــة فــي القــراءات

السـبع)ی زانـای گـەورە ابـو علـي الفارسـي (م: ٣٧٧ک/٩٨٧ز) خوێندۆتەوە و کاریگەری زۆری بەسەریەوە هەبووە و ئاشنایی جۆر و شـێوازەکانی خوێندنـەوە بـووە و بـەوەش شـارەزای زۆری پەیـدا کـردووە لـە شـێوازەکانی خوێندنـەوەی قورئـان (سـبط ابـن الجـوزي، ١٩٥١،ج٨،ق٦٤٥/٢).

بـە هـەمان شـێوە مـەلیک الاشـرف زۆر حـەزی بـە گـوێگرتن لـە قورئان کردووە لە دانیشتنەکانیدا، بەڵام جارێکیان زۆر تووڕە بووە لە یـەکێک لـە قورئـان خوێنـەکان بـە نـاوی الضـیاء بـن الـزراد الدمشـقي (م:٦٢٠ک/١٢٢٣ز) دەنگ خۆشێکی نەوازە و زانایەکی لێهاتوو و شارەزا بـووە لـە شـێوازەکانی خوێندنـەوەی قورئـان، ئـەوەش دوا بـەدوای ئەوە هات لە یەکێک لە دانیشتنەکانی پەرداغێک مەی پێدا و هەر سەیری دەکرد بۆ ئـەوەی بزانێ دەیخواتـەوە، دواجـار ئـەویش خواردیـەوە، لـە بەرامبەر ئەو ڕەفتارەی مەلیک الاشرف بە تووڕەییەوە پێیگوت: ((مـەی خواردنەوەت پێش هەر سەد و چوارده سورەتی قورئان خست، سوێند بە خوا ئەگەر بێتو سەرپشکم بکەن لە نێوان لەبەرکردنی قورئان وەکو ئەوەی تۆ لەگەڵ تەواوی موڵک و سامانم، ئەوا لەبەرکردنی قورئانم هەڵدەبژارد)) (الذهبي، ٢٠٠٣، ٦٠٠/١٣). ئەوەش ئەو ڕاستییەمان بۆ بەدیار دەخـات کـەوا نـاوبراوی تاقیکردۆتـەوە بـەوەی چەنـدە بـە ئەمـەک و پەرۆشـە بـۆ دەسـتوور و بەرنامـەی ئاینەکـەی، لەبـەر ئـەوەی خـۆی پەرۆشـییەکی بێسـنووری هـەبووە بـۆ خوێندنـەوە و بـەدواداچوون و تێگەشتن لە قورئانی پیرۆز.

بەدەر لەوەش، هەندێک لە مەلیکەکان هەر لە تەمەنی منداڵییەوە ئاوێتە ببوون لەگەڵ لەبەرکردنی قورئان و خۆشەویستییەکی زۆریان بۆ هەبووە، ئەوەشیان بە ڕوونی ڕەنگیداوەتەوە لەسەر مەلیک المجاهد شێرکۆی دووەم خاوەنداری حمص، بە جۆرێک پاش مردنی باوکی لە ساڵی ٥٨١ک/١١٨٥ز. کە ئەوکاتە تەمەنی لە دوانزە ساڵ تێنەدەپەڕی لە یەکێک لە دانیشتنەکان لە شاری حمص سەلاحەددین پرسیاری ئەوەی

لێکرد لە لەبەرکردنی قورئان بە کویَ گەیشتووە، ئەویش بە یەکێک لە وتە و فەرمایشتەکانی خوای گەورە وەڵامی دایەوە کە دەفەرموێت: [ إِنَّ الَّذينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا] (سورة النساء، الاية/١٠)، بەمەش سەلاحەددین و سەرجەم دانیشتوانی تووشی شۆک کرد لەگەڵ ئەوەی تەمەنی بچووک بوو، بەڵام زیرەکی و لێهاتوویی خۆی بەدیار خست (ابن الاثیر، ١٩٩٧، ١١/١٠؛ ابن واصل، ١٩٥٧، ١٧٦/٢).

**ب_ زانستی فەرموودەناسی:**

یەکێکی دیکە بووە لە زانستە پایە بەرز و دیارەکان لە نێو زانستە ئایینییەکان، لەبەر ئەوەی دووەم سەرچاوەیە لە سەرچاوەکانی شەریعەتی ئیسلام لە دوای قورئانی پیرۆز، ئەوەش وایکردووە ببێتە جێگای بایەخ و تێڕامانی مەلیکەکانی ئەیوبی و لەم نێوەندەشدا هەندێکیان پسپۆڕی و شارەزایی تەواویان تێدا هەبووە، ئەوەش دوا بەدوای ئەوەی لە لایەن زانا و مامۆستا دیارەکانی شارەزا لە بواری فەرموودەناسی بڕوانامەی زانستی و ڕێپێدانی گێڕانەوەی فەرموودەیان پێدراوە. بە شێوەیەک مەلیک الافضل یەکێک بووە لەو مەلیکانەی بە پەرۆشەوە بەدواداچوونی زۆری بۆ زانستی فەرموودە کردووە، لە ڕێگای وەرگرتنی زانیاری لە لای زانا هەرە دیارەکانی شام و مصر لە دیارترینیان الحافظ السلفي (م: ٥٧٦ک /١١٨٠ز) و محمد بن صدقة الحراني (ابن شداد، ٢٠٠٥، ص ص٦٠-٦١؛ ابن خلكان، ١٩٩٠، ٤١٩/٣-٤٢٠)، دوای شارەزابوونی لەو بوارەش بڕوانامەی زانستی و ڕێپێدانی گێڕانەوەی پێدراوە. جگە لەوەش مەلیک الظاهر غازی خاوەنداری حەڵەب لە کۆڕ و دانیشتنەکانیدا زۆر ئارەزووی گوێگرتن لە فەرموودەی هەبووە و لەم ڕووەشەوە ئەزموونی باشی هەبووە، تەنانەت حەز و خولیای گوێگرتنی لە ناوەڕۆکی ئەو جۆرە کتێبانە هەبووە کە تایبەت بە فەرموودە نووسراون، لەم نێوەندەشدا لە ساڵی ٦١٢ک/١٢١٥ز. نێردراوی الناصر

لدين الله (٥٧٥-٦٢٢ك/١١٨٠- ١٢٢٥ز) خەلیفەی عەبباسی هاتە حەلەب بە مەبەستی پێدانی ڕێزلێنان بە مەلیک الظاهر کە لە نێو دیاریەکاندا کتێبێک هەبوو بە ناوی (روح العارفين)[1] تایبەت بوو بە فەرمووده، لە دانیشتنێکدا بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە گەورە پیاوانی دەوڵەت خوێندرایەوە، لەم نێوەندەشدا مەلیک الظاهر غازي بەوپەڕی تامەزرۆییەوە گوێی گرتبوو لە نێردراوی خەلیفە بۆ ئەوەی لە کرۆک و ناوەڕۆکی کتێبەکە تێبگات (الذهبي، ٢٠٠٣، ٦٩٠/١٣). لەوەشەوە بۆمان بە دیار دەکەوێت ئاشنایەتی و شارەزایی زۆری لە بواری فەرمووده هەبووە. بێگومان ئەوەش لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە لەلایەن لێهاتووترین زاناکانی وەک ابو طاهر بن عوف وابو المجد الفضل بن حسين البانياسي بڕوانامەی زانستی پێدراوە (المنذري،١٩٨٤، ٣٦٨/٢).

هەرچی مەلیک المحسن بوو ئەوا لە هەموو براکانی زیاتر پەرۆشی کۆکردنەوەی فەرمووده و نووسینەوەی بووە، ئەوەش وایکردووە بەدواداچوونی زۆری بۆ بکات و لەو پێناوەشدا گەشتیکردووە بۆ شاری مەککەی پیرۆز بۆ ئەوەی لە نزیکەوە چاوی بەو زانایانە بکەوێت کە فەرموودەیان کۆکردۆتەوە و بۆ ئەوەی زانیارییان لێ وەدەست بخات، بۆ ئەو مەبەستەش چۆتە خزمەتی الحافظ ابو الفتوح الحصري (م:٦١٩ك/١٢٢٢ز)، لەبارەی ئەو زانایەش لە گێڕانەوەیەکدا ئاماژە بەوە دەکات (( کەسم نەبینیوە هێندەی ئەو پایە بەرزە ملکەچ و گوێڕایەڵی خوای گەورە بێت، بەجۆرێک لە مانگی ڕەمەزاندا سێ جار عومرەی دەکرد لە ڕۆژ و سێ جاریش لە شەودا)) (زين الدين الحنبلي، ٢٠٠٥، ٢٧٠/٢-٢٧٣)، ئەوە لە کاتێکدا بەهرەمەند و سوودمەندیش بووە لە زانا دیارەکانی شام وەک محمد بن صدقة الحراني لەسەر دەستی ئەو بڕوانامەی گێڕانەوەی فەرموودەی بە دەستهێناوە و بگرە لەوەش زیاتر دوای ئەوەی ئەزموونی زۆریشی لەو بوارە دەستخستووە بۆتە کانگایەک و ژمارەیەکی زۆر لە زانایان

فەرموودەیان لە سەر زاری ئەو گێڕاوەتەوە ( الحنبلي، ١٩٧٨، ص ص٢٦٧-٢٦٨).

لە لایەکی دیکەش، مەلیک العادل هاوشێوەی براکەی مەیلی زۆری بەلای فەرموودە و زانایانی ئەو بوارە هەبووە، بەجۆرێک گوێبیستی فەرموودە بووە لە زانای دیاری مصر الحافظ السلفي، بۆ ئەو مەبەستەش چەندین جار خۆی و سەلاحەددینی برای لە شاری ئەسکەندەریە چوونەتە خزمەتی بۆ گوێگرتن لە فەرموودە، لەم ڕووەشەوە باس لەوە دەکرێت جارێکیان هەردووکیان بەیەکەوە ئامادەبوون لە یەکێک لە دانیشتنەکانی و لە نێوان خۆشیاندا قسەیان دەکرد، لە بەرامبەر ئەوەشدا زانای گەورە سەرکۆنە و سەرزەنشتی کردوون بەوەی ئەو باسی فەرموودە دەکات و ئەوانیش قسە دەکەن (ابن کثیر، ١٩٩٣، ص٧٩٢)، ئەوەش ئەو ڕاستییەمان بۆ بەدیار دەخات کەوا ئەوانیش هاوشێوەی گوێگرو قوتابی و خەڵکانی دیکە دانیشتبوون وەکو تەواوی ئامادەبووان مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە و تەنانەت لەگەڵ ئەو پلەو پایە و دەسەڵاتەی هەیانبووە هیچ جۆرە پەرچە کردارێکیان نەبووە بەرامبەر ئەو شێوە مامەڵەی مامۆستاکە لە بەرامبەریان، ئەوەش ڕێز و پایەی زانیارییان نیشاندەدات لە لای مەلیکەکانی ئەیوبی هەمیشە لە نزیکەوە بەڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵ کردوون.

وێڕای ئەوەش، مەلیک العادل وەکو کانگایەک بووە بۆ فەرموودە، هەربۆیە تێبینی ئەوە دەکرێت چەندان کەسایەتی فەرموودەیان لە زاری ئەو گێڕاوەتەوە، لەوانە مەلیک الصالح ئیسماعیلی کوڕی لەگەڵ ئیسماعیل کوڕی حامد القوصي (م:٦٥٣/١٢٦٤ز) (ابن کثیر، ١٩٩٣، ص٧٩٢).

سەبارەت بە کوڕەکانیشی، ئەوا مەلیک الکامل لە هەموویان پەرۆشتر بووە بۆ بەدواداچوون و گوێگرتن لە فەرموودە، تەنانەت ژمارەیەکی زۆری لەبەر بووە و گێڕاویەتیەوەش، ئەوەش دوای ئەوە هات کە لە پێشتردا سوودی زۆری وەرگرتووە لە زانایانی گەورەی بواری فەرموودە الحافظ السلفي و ابوالقاسم هبة الله البوصیري

(٥٩٨ک/١٢٠١ز) و لەسەر دەستیان بڕوانامەی زانستی و گێڕانەوەی فەرموودەیان پێدراوە ( ابن تغري بردي، د. ت، ٢٢٨/٦)، هاوکات دوای شارەزابوون و پەیداکردنی زانیاری لەبارەی زانستی فەرموودەناسی ئەوا ئاستی هزری گەیشتە ئەو قۆناغەی کە شرۆڤە و ڕوونکردنەوەی گونجاو و باش لە بارەی (صحيح مسلم) بدات (سبط ابن الجوزي، ١٩٥١، ج٨، ق٧٠٥/٢)، ئەوە لە کاتێکدایە دەیتوانی گفتوگۆ و دیبەیت لەگەڵ زانایانیشدا بکات کە لێهاتوو بوون لەو بوارە، بەشێوەیەک یەکێک لەو زانایانەی کە شارەزای زۆری هەبووە لە بارەی فەرموودە بە ناوی ابو الخطاب بن دحية الاندلسي (م: ٦٣٣ک/١٢٣٥ز)، بەڵام لە ڕاستیدا کەسێکی خۆشەویست و پەسند نەبووە لە لای خەڵک، لەبەر ئەوەی لە گێڕانەوەکانی زێدەڕۆیی قسەی نا ڕاستی دەکرد هەر بۆیە متمانەیان پێ نەبوو، لەم سۆنگەیەش مێژوونووسان زۆر شت لە بارەیەوە دەڵێن، ئەوەتا دەگوترێت: ((لەگەڵ ئەوەی زانیارییەکی زۆری هەبوو لە بارەی فەرموودە، بەڵام لە گواستنەوەی فەرموودەکان سەرکەشیی زۆری دەکرد)) (ابن واصل، ١٩٥٧، ١٦٧/٥)، هاوکات جەخت لەوە دەکرێتەوە کە ((کانگایەکی گەورەی زانیاری بوو لە بارەی فەرموودە، بەڵام هەندیک شتی دەگوت هیچ بنەمایەکی ڕاستی تێدا نەبوو)) (ابن نقطة، ١٤١٠هـ ٦٠/٢)، لەبەر ڕۆشنایی هەموو ئەمانە مەلیک الكامل هەوڵیدا بە زانست و زانیارییەکانی تاقیبکاتەوە لە ڕاستی و دروستی ئەو قسانەی کە لە بارەیەوە دەگوترێت، دواجار کاتێک ڕووی ڕاستەقینەی بۆ بەدیار کەوت پشتی تێکرد و لە خانەی فەرموودەش وەدەری نا (ابن واصل، ١٩٥٧، ١٦٧/٥). ئەوەشیان ئاستی ڕۆشنبیری و لێهاتوویی مەلیک الكامل بەدیار دەخات بەوەی چەندە بە بایەخەوە لە فەرموودەی ڕوانیوە بۆ ئەوەی هیچ جۆرە گومان و تارماییەک لەسەر وتە و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (د.خ) نەبێت و ڕاستی و دروستی و گێڕانەوەکان وەک خۆی بێت.

ئەوەی پەیوەستە بە مەلیک المعظم، ئەوا لە ئاستێکی بەرزی ڕۆشنبیری بووە و لە زۆر بواردا شارەزا بووە، یەکێک لەوانەش

فەرموودە بووە، لەم نێوەندەشدا نێوانی خۆش بووە لەگەڵ زانایانی ئەو بوارە و بەردەوام هاموشۆی کردوون، بە شێوەیەک دوای هاتنی زانای گەورە حنبل کوڕی عبداللە کوڕی فرج (م: ٦٠٤/١٢٠٧ز) بۆ دیمەشق بەردەوام کۆڕ و وانەکانی قەرەباڵغی زۆری پێوە دیار بووە لە مزگەوتی ئومەوی و خۆی بەردەوام دەچووە دانیشتنەکانی و کەڵکی لێوەردەگرت، هاوکات یارمەتی و کۆمەکی زۆری ئەو زانایەی کردووە، لەبەرئەوەی لە شاری بەغداد زۆر هەژار بووە و بۆ وەدەست خستنی بژێوی ژیان ڕووی لە شام کرد، ئەویش لەبەرامبەر ئەو زانست و زانیارییەی هەیبووە سەرجەم پێداویستیەکانی ژیانی بۆ دابینکردووە (ابو شامة، ٢٠٠٢، ص٩٣). جگە لەوەش بۆ وەدەست خستنی زانیاری و پتر شارەزابوون لە بارەی ناوەڕۆکی کتێبی (المسند)ی پێشەوا ئەحمەد کوڕی حنبل، ئەوا بەدواداچوون و خوێندنەوەی بۆ کردووە لە لای چەند زانایەکی دیاری وەک،: محمد بن عبدالغني الجماعيلي الدمشقي (م:٦١٣ک/ ١٢١٧ز) و عبداللە بن الحافظ عبدالغنى (م: ٦٢٩ک/١٢٣٢ز)، پاشان داوای لێکردن ئەو کتێبەی دووبارە بۆ ڕێکبخەنەوە و دابەشی بکەن بۆ چەند بەشێک، هەر فەرموودەیەک بخرێتە ئەو بەشەی کە لەگەڵ واتاکەیدا دەگونجێ، بەجۆرێک ئەوەی پەیوەستە بە پاک و خاوێنی بەشێکی بۆ تەرخان بکرێت یاخود نوێژ یاخود شەڕەکان، وە بەو شێوەیە هەتاوەکو دوایی (سبط ابن الجوزي، ج٨، ق٦٤٣/٢-٦٤٤).

مەلیک الاشرفیش لە لایەن خۆیەوە، شارەزایی باشی لە فەرموودەدا هەبووە، ئەوەش دوا بەدوای ئەوەی کە بۆ ماوەیەک (صحيح البخاري) خوێندووە ئەزموونی باشی دەست خستووە، بە جۆرێک ئەوانەی ئامادە دەبوون لە دانیشتنەکانی چەندین فەرموودەیان لە زاری ئەو گێڕاوەتەوە (ابن خلكان، ١٩٩٤، ٣٣٤/٥).

جگە لەوەش مەلیک مجیرالدین یعقوب کوڕی مەلیک العادل وەکو کەسایەتییەکی دیار شارەزایی باشی هەبووە لە بارەی فەرموودە، لەبەر ئەوەی لە چوارچێوەی ئەو زانستە ئایینیانە بوو کە پەرۆشیی زۆری

بۆ هەبووە و لێبڕاوانە بەدواداچوونی بۆ کردووە، تا دواجار بە شایستەی بڕوانامەی زانستی و گێڕانەوەی فەرموودەی لە لای زانا پایە بەرزەکان پێدراوە (الذهبي، ٢٠٠٣، ٧٦٦/١٤). ئەوە لە کاتێکدایە مەلیک الامجد عباس کوڕی مەلیک العادل شارەزایی زۆری هەبووە لە بواری فەرموودە، هەربۆیە وەکو خەزێنە و کانگایەک ژمارەیەک زانای گەورەی وەک الدمیاطی (م:٧٠٥ک/١٣٠٥ز) و ابن الخباز (م: ٧٠٣ک/١٣٠٣ز) و چەندان پایە بەرزی دیکە فەرموودەیان لەسەر زاری گێڕاوەتەوە (الذهبي، ٢٠٠٣، ١٦٧/١٥).

لەلایەکی دیکەش، مەلیکەکانی حمص ئەزموون و شارەزایی باشیان هەبووە لە زانستی فەرموودەناسی، بەتایبەتی مەلیک المجاهد شێرکۆی دووەم، ئەوەش دوا بەدوای ئەوەی ئەزموونی زۆری وەرگرتووە لە زانا دیارەکانی شام، هەربۆیە تێبینی ئەوە دەکرێت چەندین فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە حمص و دیمەشق (المنذري، ١٩٨٤، ٥٣٦/٣).

**ج_ زانستی شەرعناسی (فقه):**

یەکێکی دیکە بووە لەو زانستانەی کە لە نێو موسڵمانان تێکڕا بە گرنگییەوە لێیان ڕوانیوە، لەبەر ئەوەی شرۆڤە و چارەسەری هەموو ئەو کێشانەی تێدا هەڵدەهێنجرێت کە لە ژیانی ڕۆژانە ڕووبەڕووی موسڵمانان دەبێتەوە چ ئەوانەی پەیوەستن بە کاروباری ئایینی یاخود ئەوانەی پەیوەستن بە لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە (الحسيني، ١٩٧٢، ص١٩٠)، لەبەر ڕۆشنایی ئەمەدا ئەگەر زەین بدەین ئەو زانستە گەر بۆ زانا و خەڵکە ئاساییەکە بایەخی هەبووبێ، ئەوا بۆ کاربەدەست و دەسەڵاتداران دوو هێندە گرنگی و بایەخی هەبووە، لەبەر ئەوەی چەندە پتر شارەزاییان هەبوایە لە کرۆک و ڕێبازەکانی ئەو زانستە ئەوا زیاتر یارمەتیدەر دەبوو بۆ هێنانەدی دادگەریی زیاتر لە ڕێگای دەرکردنی بڕیارە ڕاست و دروستەکان لە خانەی دادوەری، بەتایبەتی

ئەوەی پەیوەست بووە بە کاروبار و کێشە و ئاریشەکانی نێوان خەڵک (الاتروشي،٢٠٠٧، ص٥٧).

بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەمانە، هەندێک لە مەلیکەکانی ئەیوبی شارەزاییەکی بێهاوتایان هەبووە لەو زانستە، لە پێشەوەی هەموویان مەلیک المعظم، بە تایبەتی لە مەزهەبی پێشەوا ئەبو حەنیفە، دیارە ئەوەش لە خۆڕا نەهاتۆتە ئارا، بەڵکو دوای قووڵبوونەوە و بەدواداچوون لە بواری شەرعناسی، دوا جار لە ژێر کاریگەری زانای پایەدار جمال الدين محمود الحصيري ڕێبازی ئەبو حەنیفەی وەرگرت (القرشي، د. ت، ٤٠٢/١؛ الحنبلي، ١٩٧٨، ص٢٧٦)، بگرە لەوەش زیاتر ئەو زانایە بووە سەرمەشق و ڕێنیشاندەری لە بواری فیقهی ئیسلامی (الدواداري، ١٩٧٢، ٢٨٨/٧؛ النعيمي، ١٩٩٠،١/٤٧٧).

ئەوەی لێرەدا ناوبراو جیا دەکاتەوە لە ئەندامانی دیکەی خانەوادەکەی ئەوەیە بە تەنیا لە سەر مەزهەبی ئەبو حەنیفە بووە، تەواوی ماڵباتەکەی لەسەر مەزهەبی شافعی بوون و تەنانەت پێچەوانەی بەشێکی زۆری بنەماڵەکەی دەمارگیر بووە بۆ ڕێبازەکەی (ابن خلكان، ١٩٩٠، ٣،٤٩٢؛ المدرس، ١٩٨٣، ص٤٢٠). ئەوە لە کاتێکدایە جارێکیان مەلیک العادلی باوکی بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری ئەوەی لێکردووە کە بۆچی ئەو ڕێبازەی هەڵبژاردووە، لە کاتێکدا تەواوی خێزانەکەی شافعین، ئەویش لە بەرامبەردا بۆ خۆشی بە گاڵتە ئامێزەوە وەڵامیداوەتەوە و گوتوویەتی: (( ئایا ئێوە ڕازی دەبن گەر لە نێو ئێوەدا موسڵمانێک هەبێت)) (ابن واصل، ١٩٥٧، ٢١١/٤؛ الحنبلي، ١٩٧٨، ص٢٧٦).

لەلایەکی دیکە پەرۆشبوونی زۆری بۆ ئەو مەزهەبە وایکردووە داوا لە زانایان بکات کەوا تەواوی زانیارییە پەیوەستەکان بەو ڕێبازە بۆی کۆبکەنەوە، لە بەرامبەریشدا ئەوان بۆیان کۆکردۆتەوە لە دە بەرگدا و ناویان ناوە (التذكرة)، مەلیک المعظم بەردەوام خەریکی خوێندنەوەی ئەو کتێبە بووە تەنانەت لە کاتی گەشت و گەڕانە فەرمییەکانیشی لە لای بووە، هەر کاتێک یەکێک لە بەرگەکانی تەواو

دەکرد لە سەر پشتی دەینووسی خوێندراوەتەوە لە لای ئەو (سبط ان الجوزي، ج٨، ق٦٤٧/٢؛ بدوي، ١٩٧٢، ص٨).

دوای شارەزابوونی تەواویش لەو بوارە، هەڵسا بە دانانی کتێب لە بارەیەوە، ئەوەش دوا بەدوای ئەوە هات کە کتێبی (تاريخ بغداد)ی الخطيب البغدادي (م: ٤٦٣ک/١٠٧٢ز) خوێندەوە و لەوەوە بۆی بە دیارکەوت ڕەخنەی زۆر لە مەزهەبی ئەبو حەنیفە گیراوە، ئیتر ئەوەش پاڵی پێوە نا بۆ ئەوەی شرۆڤە و بەدواداچوون بۆ ئەو کتێبە بکات، دواجار ئەو شتانەی شێوێندراون دووبارە دایانبرێژێتەوە لە کتێبێکدا بە ناونیشانی (السهم المصيب في الرد على الخطيب) (ابن قطلوبغا، ١٩٩٢، ص٢٢٦؛ الهسنياني، ٢٠١٢، ص٣٤٠). نەک هەر ئەوە، بەڵکو شارەزاییە زۆرەکەی لە بارەی فقە وایکردبوو زۆر تامەزرۆی گفتوگۆ و دیبەیت و ڕووبەڕوو بوونەوە بێت لەگەڵ زانایانی ئەو بوارە، لەم نێوەندەشدا ابن واصل لە گێڕانەوەیەکدا ئاماژە بەوە دەکات کاتێک مەلیک المعظم لە ساڵی ٦٢٣ک/١٢٢٥ز هاتە شاری قودس بانگهێشتی ژمارەیەک لە شەرعناسەکانی کرد کە لە نێویشیاندا یەکێکیان باوکم بوو، بەمەبەستی دیڤچوون و ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا لە بارەی بابەتە زمانەوانی و شەرعییەکان (ابن واصل، ١٩٥٧، ٢١٣/٣).

بە هەمان شێوە مەلیک الناصر داود هاوشێوەی باوکی ئەزموون و شارەزایی باشی هەبووە لە بواری فقە، لەم چوارچێوەیەشدا کاتێک لە ساڵی ٦٢٩ک/١٢٣١ز مەلیک الکاملی مامی هاتە لای لە قەڵای کەرک، ئەویش لە بەرامبەردا لەبەر شکۆ و خانەدانیەکەی کۆبوونەوەیەکی گەورەی ڕێکخست بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە زانا و شەرعناسەکان کە تیایدا گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە دەکرا لەبارەی بابەتە شەرعییەکان، ئیتر لەو کاتەشدا زیرەکی و شارەزایی ناوبراو بەدیارکەوت، کاتێک مەلیک الکامل و تەواوی ئامادەبووانی دیکە چوونە بەرەیەک و هەموویان لە سەر ڕێبازی شافعی بوون، ئەوە لە کاتێکدا بەرەکەی دیکەیان بە تەنیا مەلیک الناصر داود بوو کە هەروەک باوکی

لـە سـەر ڕێبـازی ئـەبو حەنیفـە بـوو بەرامبـەر هـەموویان وەسـتابوو بـەرگری لـە خـۆی و بیرۆکـەکانی دەکرد بـە بێ ئـەوەی هـیچ کامێکیـان پشتگیری بکەن (ابن واصل،١٩٥٧، ٥/١٤).

هاوکـات مـەلیک المنصـور محمـد خاوەنـداری حمـاە، لـە ئاسـتێکی بەرزی ڕۆشنبیریی ئیسلامی بووە، بە تایبەتی لە بواری فقهی ئیسلامی، هەر ئەوەش وایکردووە کار لەسەر بەرهەمـەکانی ئـەو بـوارەدا بکات تـا دواجـار کتێبـی (الشـامل)ی ابـن الصـباغ البغـدادي (م:٤٧٧ک/١٠٨٤ز) کورتکردۆتەوە و دووبارە دایڕشتۆتەوە (ابن الشعار، ٢٠٠٥، مج٥، ج٦/٢٠٣).

**٢- گرنگیدانیان بە زانستە عەقلییەکان:**

هەڵبەتـە زانسـتە عەقلییـەکان [٢] ئـەو جـۆرە زانسـتانەن کـە زیـاتر زادەی عـەقڵ و ژیریـی مرۆڤـە و بـەراورد بـە زانسـتە شـەرعی و ئایینییەکان زۆر کەمتر بایەخی پێدراوە لە لایـەن مـەلیک و دەسـەڵاتدارە ئەیوبییـە کوردەکـان، ئـەوەش لەبـەر چەنـد هۆکارێکەوەیـە دەکرێت لـەو خاڵانەدا بخرێتە ڕوو:

١- هەموو ئەو بابەتانەی دەکەونە چوارچێوەی زانستە عەقلییەکان بـە یـەک ئاسـت چـالاکی زۆریـان بـە خـۆوە نـەبینیوە لـە سـەردەمی ئەیوبییـەکان، ئـەوەش زیاتر پەیوەندی هەیـە بـە هەڵوێست و تێڕوانینی مەلیکـەکانی ئـەیوبی بۆ لقەکانی ئـەو زانستەوە، بـە تایبـەتی فەلسـەفە و لۆژیک، ئەستێرەناسی، گەردوونناسی، ئەندازەزانی، پزیشکی ... هتد.

٢- هەڵوێسـتی زانـا و شـەرعناسـەکان بەرامبـەر بـە زانـا و فەیلەسـوف و بیرمەنـدەکانی ئـەو زانسـتانە زیـاتر بەرهەڵسـتی و دوژمنکارانە و دژایەتیکردن بوو، ئەوەش زیاتر لە بەر بیر و بۆچوون و بیرۆکـە تایبەتیـەکانیان زیـاتر بـە زەنـدیق و بێبـاوەڕ نـاو دەبـران (یاقوت الحموي، ١٩٩٣، ٦/٢٠٨٦-٢٠٨٩).

٣- ئەگەر سـەیری ئەو قۆناغـە بکرێت، ئـەوا زیاتر شەڕوشـۆڕ لـە ئارادا بـووە بەرامبـەر بـە خاچییـەکان و ئـەو هێز و لایەنانـەی دیکە کـە

ڕوویان لە ناوچەکانیان دەکرد، هەربۆیە لێرەدا دەسەڵاتدارانی ئەیوبی زیاتر بەلای ئەو زانستانە هەنگاویان ناوە کە کاریگەری هەبووە لە سەر وروژاندنی هەست و سۆز و پەرۆشی خەڵک بۆ لای ئیسلام، بۆ ئەوەی بەردەوام لە ئامادەباشیدابن بۆ خۆبەختکردن لە پێناوی خودا (حمزة، ١٩٤٧، ص ص٨١-٨٢).

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا تێبینی ئەوە دەکرێت هەندێ لە مەلیکەکانی ئەیوبی بەپێی ئاستی ڕۆشنبیریی خۆی جۆرێک لە تێکەڵاوی و نزیکی هەبووە لەگەڵ ئەو زانستانە و هەوڵیانداوە کەڵک و سوود لە بەهرە و توانا و ئەزموونی بیرمەندەکانیان وەربگرن، لە دیارترین ئەو زانستانەش بریتین لە:

### أ_ فەلسەفە و لۆژیک:

فەلسەفە و لۆژیک لە چوارچێوەی ئەو زانستانەن کە پشت ئەستوورن بە هێزی عەقڵ، واتە لە کاتی گەڕان و بەدواداچوون بە دوای ڕاستییەکان یاخود بە دوای ناوەڕۆکی شتە نادیار و شاراوەکانی دواوەی دیاردە سروشتییەکان، یاخود ئەوەی پەیوەستە بە مرۆڤەکان لە ڕەوشت، ڕۆح، شوناس و بابەتەکانی دیکە عەقڵ و لۆژیک و ژیری تیایدا سەنتەرە، ئەوە لە کاتێکدایە بابەتە ئایینییەکان لە دیارترین ئەو ئارێشانە بووە کە فەلسەفەی ئیسلامی هەوڵیداوە زیاترین تیشکی بخاتە سەر، لەبەر ئەوەی ئایین بەگشتی پایەیەکی بەرزی هەبووە لەلای تەواوی چین و توێژەکانی کۆمەڵگا، هەربۆیە زانا و بیرمەندە موسڵمانەکانی ئەو بوارە هەوڵ و کۆششی زۆریانداوە بۆ ئەوەی جۆرێک لە یەکانگیری لە نێوان ئایین و فەلسەفەی ئیسلامی ڕێک بخرێت (الكروي و عبدالتواب،١٩٨٧، ص٢٨١). بەڵام ئەوەی لێرەدا جێگای تێڕامانە ئەو هەوڵانە نەبوونە جێگای ڕەزامەندیی تەواوی خەڵک، لە بەر ئەوەی بەدواداچوون و بابەتە فەلسەفییەکان جۆرێک لەگومانی لە بارەی باوەڕ و پیرۆزی ئایین دروست دەکرد، ئەوەش کاریگەری

زۆری هەبووە بەسەر لایەنی هزریی هەندێک لە مەلیکەکان بەوەی حەزیان بەو بوارە نەکردووە و بەڵکو لە ژێر کاریگەری دەوروبەر هەڵوێستێکی ناحەزانە و جۆرێک لە چەوسانەوەیان بەرامبەر خولیایانی گرتۆتە بەر، بە شێوەیەک مەلیک الظاهر غازي مەیلی زۆری بەلای فەلسەفە و لۆژیکدا چووە، لەم نێوەندەشدا نزیکی و پەیوەندیی زۆری هەبووە لەگەڵ بیرمەندەکانی لە دیارترینیان شمس الدين ابو محمد الموصلي (م: ٦١٧ک/١٢٢٠ز) ، پاش ئەوەی سەرسام بوو بەزیرەکی و لێهاتوویییەکەی دواجار بووە یەکێک لە کەسە نزیکەکانی چەندین ئەرکی بەڕێوەبردنی پێسپارد کە یەکێکیان پایەی وەزیر بوو لە حەڵەب، ئەویش لە لایەن خۆیەوە بووە جێگای بڕوا و متمانەی مەلیک و بە باشترین شێوە ئەرکەکانی سەرشانی ڕادەپەڕاند و ببووە جێگای ڕەزامەندی خەڵک (سبط ابن الجوزي، ج٨، ق٥٨٠/٢). ئەوە لە کاتێکدا لە ڕابردووش پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ فەیلەسوفی هەڵکەوتوو شهاب الدين السهروردي[٣] هەبووە و زۆر لە خۆی نزیک کردەوە و بە تامەزرۆیییەوە گوێی لە بیرۆکە و قسەکانی دەگرت، ئەوەش دوا بەدوای ئەوەی بەهرە و تواناکانی بۆ بەدیارکەوت لە دیبەیت و ڕووبەڕووبوونەوەکانی لەگەڵ مامۆستا و شەرعناسەکان و سەرکەوتن بەسەریاندا، بەڵام ئەو پەیوەندییە تا سەر بەردەوام نەبوو، دوای ئەوەی شەرعناسەکان ئیرەییان بە پەیوەندییەکانی نێوانیان دەبرد و بە دەرچوو لە ئایینیان لە قەڵەم دا، هەربۆیە پەنایان برد بۆ باوکی و ئەوەیان لە لادا گەڵاڵە کرد کە بیرۆکەکانی مایەی هەڕەشەیە لەسەر هزری کوڕەکەی ئەگەر تا سەر ئەو پەیوەندییە بەردەوام بێ، بێگومان ئەوەش کاریگەری زۆری کردە سەری، چونکە هەر خۆی لە بنەچەدا ڕقی لە فەلسەفە و لۆژیک بوو، دواجار نامەی نارد بۆ کوڕەکەی فەرمانی پێکرد کە بیکوژی (ابن شداد، ٢٠٠٥، ص٦١؛ ابو الفداء، ١٩٩٩، ١٠٣/٣-١٠٤). ئەوەی لێرەدا شیاوی گوتنە مەلیک الظاهر نیازێکی ئەوتۆی نەبوو هیچ جۆرە ڕێکارێک لە دژی بگرێتە بەر، بەڵام پێداگری شەرعناسەکان و نامەکەی

باوکی بوونە سەرچاوەی سەرەکی ئەو کردارە بە بێ ئەوەی خۆی ویست و خواستی لە سەربێ.

هەرچی پەیوەستیشە بە کوڕەکانی مەلیک العادل، ئەوا ڕێژەیەکی زۆریان رقیان لە فەیلەسوف و هەوادارانی ئەو جۆرە لە زانستانە هەبووە بە تایبەتی فەلسەفە و لۆژیک، بەڵام هەموویان وەک یەک بە یەک ئەندازە دوور نەبوونە لێیان، بە جۆرێک مەلیک المعظم حەزو خولیای هەبووە بۆ ئەو بوارە و لە سەردەمی ئەودا جۆرە کرانەوەیەک بە ڕوویاندا هەبووە، بە شێوەیەک نێوانی خۆش بووە لەگەڵ ئەو بیرمەندو زانایانەی سەرقاڵی ئەو جۆرە لە زانستانەن، لە پێشەوەی هەمووشیان سیف الدین الامدي[٤]، هەرچەندە کەسێکی خۆشەویست نەبوو لە لای، بەڵام لەبەر ئەو ئاستە بەرزەی کە هەیبووە پایەی بەرز بووە زیاد لە پێویست ڕێزی دەگرت و دەهاتە کۆڕ و وانەکانی و بە تامەزرۆییەوە گوێی دەگرت لە قسە و گفتوگۆ و دیبەیتەکانی لەگەڵ زانایان (ابن ابي اصيبعة، د. ت، ص٦٥٠). بەدەر لەوەش پەیوەندییەکی توندو تۆڵی هەبووە لەگەڵ زاناو فەیلەسوفی دیار شمس الدين الخويي (م: ٦٣٦ک/١٢٣٨ز).

لە لایەکی دیکەش ئەگەر زەین بدەین، ئەو جۆرە زانستە عەقڵیانە لە سەردەمی مەلیک الناصر داودی کوڕیشی ڕەواجی زۆریان هەبوو بەردەوام لە برەوسەندندا بووە، ئەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە خۆی مەیل و خولیای زۆری هەبووە بەلای فەلسەفە و ڕووچووبووە نێو ئەو زانستانەی پەیوەستن بە فەلسەفە و لۆژیک تەنانەت خودی خۆی شارەزاییەکی چاکی لە بارەیانەوە هەبووە، ئیتر ئەوەش کاریگەری زۆری هەبووە بەسەریەوە بە جۆرێک گومان لەسەر باوەڕی دروست بووە، ئەو ڕاستییەش ابن کثیری مێژوونووس دانی پێدا ناوە و جەخت لەوە دەکاتەوە کە ((هەندێک شت لە بارەیەوە دەگێڕدرێتەوە واتاکەی ئەوە دەگەیەنێت ئەگەر ڕاست بن ئەوا بیرو باوەڕی خراپ بووە)) (ابن كثير، ١٩٨٨، ٢٣١/١٢). ئەوەش ڕەنگدانەوەی

هەبووە لە سەر ئەوەی کەوا مامەکانی بەردەوام دژایەتی بکەن، لەبەر ئەوەی مەلیک الکامل هاوشێوەی سەلاحەددینی مامی ڕقی لە فەلسەفە و ئەو کەسانەی پەیوەست بوون بەو زانستە، ئەوە لە کاتێکدا مەلیک الاشرف هەڵوێستی زۆر توند بووە بەرامبەر بە هەوادارانی ئەو بوارە، بەڵکو بگرە لەوەش زیاتر بە ئاشکرا دژایەتی دەکردن، ئەو هەنگاوەشی بەشێوەیەکی کردارەکی دوای وەرگرتنی فەرمانڕەوایەتی دیمەشق هات، کاتێک هەڵسا بە وەدەرنانی سیف الدین الامدي لە قوتابخانەی العزیزیە و فەرمانیکرد بەوەی کەوا لە قوتابخانەکاندا بێجگە لە ڕاڤەکردنی قورئان و فەرموودە و زانستە شەرعییە ئیسلامییەکان هیچ جۆرە زانستێکی دیکە بخوێنرێت (النعیمي، ١٩٩٠، ٢٩٨/١).

بەم شێوە فەیلەسوفان و هەوادارانی ئەو زانستانە بۆ ماوەیەک دوور کەوتنەوە لە کۆڕ و کۆبوونەوە زانستیەکان و بە کولەمەرگی و لە ترس و دڵەڕاوکێ دوور لە خەڵک ژیانیان دەگوزەراند، ئەوەش زیاتر لەبەر ئەو مەترسیانە بوو کە ڕاستەوخۆ هەڕەشە بوو لە سەر ژیانیان، بەڵام ئەوەی لێرەدا جێگای تێڕامانە ئەو تەنگ پێ هەڵچنینانە تا سەر بەردەوام نەبوو، بەڵکو لە هەندێک کاتدا لە ئەنجامی پشتگیری و هاندانی مەلیک و دەسەڵاتدارەکان هەرمێن و ڕەواجی بۆ پەیدا دەبوو، بە تایبەتی لە سەردەمی مەلیک الناصر یوسفی دووەم کوڕی مەلیک العزیز محمد (م: ٦٥٨ک/١٢٦٠ز) خاوەنداری شام جۆرێک لە کرانەوە و لێبووردەیی بەرامبەر بە بیروباوەڕ و هزرەکانیان هەبووە، لەم نێوەندەشدا فەیلەسوفەکان زۆر ئازادانە گوزارشتیان لە وتە و بیرۆکەکانی خۆیان کردووە، لە دیارترینی ئەوانەش فەیلەسوف الفخر بن البدیع البندهي (م:٦٥٧ک/١٢٥٨ز) کەسێکی بێباوەڕ بوو لەگەڵ زاناکانی موسڵمانان ژیانی دەگوزەراند، تەنانەت بە ئاشکرا کاری دەکرد لە سەر تێکدانی باوەڕی گەنجان و بە خراپە باسی پێغەمبەرانی دەکرد بە بێ ئەوەی کەس ڕێگری لێبکات (ابو شامة، ٢٠٠٢، ص٣٠٢). بە هەمان شێوە عزالدین الضریر بن نجا الاربلي (م:٦٦٠ک/١٢٦٦ز) یەکێک بوو لە

زانـا و بیرمەنـدە هـەرە دیارەکـانی بـواری فەلسـەفە و پەیوەندییـەکی توندوتۆڵی لەگەڵ مـەلیک الناصـر یوسف هـەبووە و بـەو پـەڕی ڕێزەوە مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکـرد، تەنانـەت هـیچ کـات داواکارییـەکانی ڕەت نـەدەکردەوە (ابـن العمـاد الحنبلـي، د. ت، ٣٠١/٥). لێرەدا بـە لەبـەرچاوگرتنی هـەموو ئەوانـەی کـە خرانـە ڕوو بۆمـان بـەدیار دەکـەوێت کـە مـەلیک الناصـر یوسـف مـەیلی بـە لای فەلسـەفەدا چـووە و بـە پێچەوانـەی مەلیکەکانی قۆناغەکانی پێش خۆی کەشێکی لەباری بۆ هـەوادارانی ئـەو زانستانە ڕەخساندبوو بۆ ئەوەی ئازادانە بە بێ سانسـۆر گوزارشـت لـە ڕا و بۆچوونەکانی خۆیان بکەن.

**ب_ بیرکاریی و ئەندازە و گەردوونناسی:**

لـە چوارچێوەی ئـەو زانسـتانە بـوون کـە بوونەتـە جێگـای بایـەخ پێدانی مەلیکـەکانی ئـەیوبی، بـە جۆرێـک زانسـتی بیرکـاری بابەتـەکانی ژمێریـاری و جـەبر و ئەنـدازیاری لـە خـۆ دەگرێـت تێکهەڵکێشـی و پەیوەندییەکی توندو تۆڵی زۆری هەیە لەگـەڵ زانستی فەلەکناسی (علم الهيئة)[٥]، لەم نێوەندەشدا بە دەگمەن بەرچاو دەکەوێت زانایەکی بواری بیرکـاری ئـەزموون و شـارەزایی و کارامـەیی نـەبووبێت لـە بـواری گـەردوون و ئەستێرەناسـی (بـدوي، ١٩٧٢، ص٢٢٩). لـەم نێوەندەشـدا هەندێک لە مەلیکەکانی ئەیوبی مەیلیان بەلای ئەو زانستانە چووە، هـەر وەک مـەلیک الامجـد بهـرام شـاە خاوەنـداری بعلبـگ، یـەکێک بـوو لـەو مەلیکانـەی مـەیلی زۆری بـەلای ژمێریـاری و ئەنـدازیاری هـەبووە، لـەم نێوەندەشدا دوای بیستنی هەواڵی نێوبانگی زانـای دیـار رشـیدالدین علي بـن حليفـة (م:٦١٦م/١٢١٩ز)، دەسـتبەجێ هێنایـە لای خـۆی و زۆربـەی کاتەکان لە تەکیا بوو بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئەزموون و شارەزایی پەیدا بکات لە زانستی ژمێریاری و بێجگە لـەوەش ئـەو پایـەدارە کتێبێکی بۆ نووسی لەو بوارەدا بەناوی (الموجز المفيد) کە تیایدا چوار لێکۆڵینەوە و وتاری لە خۆ دەگرت (ابن ابي اصيبعة، د.ت، ص٧٣٨،٧٥٠). ئەوە لە کاتێکدایە

کە مەلیک المظفر محمودی دووەم خاوەنداری حماە، لە پاڵ زانستە ئایینی و شەرعییەکان گرنگی و بایەخی داوە بە زانستی گەردووونناسی و هەسارەکان، لەم نێوەندەشدا سوودمەند بووە لە بەهرە و تواناکانی ئەندازیاری دیار علم الدین قیصر (م:٦٤٩ک/١٢٥١ز)و هەر لە لای ئەودا کتێبی (المجسطي)[٦]خوێندووە کە تایبەت بووە بە زانستی گەردووونناسی و ئەستێرەکان، هاوکات بە یارمەتی ابن واصل الحموي (م: ٥٩٧ک /١٢٩٨ز) تۆپێکی لە داری بۆ دروستکرد و لە سەریدا وێنای ئەو هەسارانەی بۆ کێشا کە مرۆڤایەتی ناسیویەتی و دەستی پێگەیشتووە، ئیتر لەو کاتانەی خەریکی کار بوون، مەلیک المظفر دەهاتە لایان و پرسیاری لەبارەی وردەکاری هەندێک لە شوێنەکان دەکرد (ابن واصل، ١٩٥٧، ٥/٣٤٣-٣٤٤؛ علي، ١٩٨٣، ٤/١١١).

### ج_ زانستی پزیشکی:

بواری پزیشکی یەکێک بووە لە گرنگترین ئەو زانستانەی کە بۆتە جێگەی گرنگی و بایەخی بەشێکی زۆر لە مەلیکەکانی ئەیوبی، لەبەر ئەوەی بەشێکی لە نزیکەوە پەیوەست بووە بە پاراستنی تەندروستی خۆیان، ئەوەی دیکەشیان بەستراوەتەوە بە بەرژەوەندیی گشتیەوە بە جۆرێک تاک بە تاکەکانی سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگا پێویستیان بە پزیشک و نۆژدار و بەهرەکانیان هەبووە، لەم چوارچێوەیەشدا هەمیشە پزیشک و ئەو کەسانەی بەو بوارە سەرقاڵبوون ڕێزو پایەیەکی بەرزیان هەبووە لە لای دەسەڵاتداران، ئەوە لە کاتێکدایە پیشەیەکی قازانج بەخش و بەهەرمێن بووە و بۆتە هۆکاری کۆکردنەوەی سامانێکی زۆر، هاوکات لەلایەن خەڵکیشەوە بەردەوام خۆشەویست و ڕێز لێگیراو بوون (بدوي، ١٩٧٢، ص٣٠٧).

لەبەر ڕۆشنایی هەموو ئەمانەش، مەلیک الظاهر غازي بایەخی زۆریداوە بە پزیشکان و لە خۆیانی نزیک دەکردەوە و بەردەوام هانیداون بۆ ئەوەی بەوپەڕی دڵسۆزیەوە ئەرکە مرۆڤایەتییەکەی خۆیان

بە جێبگەیێنن هەم بۆ خۆی و هەم بۆ میللەتەکەی، لەم نێوەندەشدا پزیشکی دیار فخرالدین عبدالسلام الماردیني (م: ٥٩٤ک/١١٩٧ز)، یەکێک بووە لەو پزیشکانەی لە نزیکەوە لە دەربارى چاودێری تەندروستی کردووە، ئەوەش دوا بەدوای ئەوەی سەرسام بووە بە لێهاتووییەکەی ڕێزی زۆری گرتووە و لە دانیشتنەکانیدا بە تامەزرۆییەوە گوێیگرتووە لە قسەکانی بۆ ئەوەی لە نزیکەوە لێزانیی ئەوی بۆ بەدیاربکەوێت لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان (القفطي، ٢٠٠٥، ص٢١٩).

جگە لەوەش مەلیک الافضل بایەخ پێدانی زۆری هەبووە بۆ زانستی پزیشکی و لەم ڕووەشەوە ئەو پزیشکانەی لە خزمەتیدا بوون ڕێنمایی زۆریانکردووە بە ئامۆژگاری و هەم لە ڕێگای نووسین بۆ ئەوەی بە وردی چاودێری تەندروستی خۆی بکا، لەم نێوەندەشدا پزیشکی دیار موسی بن میمون (م: ٦١٠ک/١٢١٣ز)، کتێبێکی بۆ نووسی بە ناونیشانی (مقالة في تدبير الصحة) (ابن ابي اصيبعة، د.ت، ص٦٦٢).

جگە لەوەش مەلیک المؤيد نجم الدين مسعود کوڕی سەلاحەددین حەز و خولیای زۆری بۆلای زانستی پزیشکی چووە، لەم نێوەندەشدا زانای لێهاتوو رشیدالدین علي بن حلیفە کتێبی تایبەت لە بارەی زانستی پزیشکی بۆ نووسیوە و لە میانەیدا بەدواداچوونی کردووە بۆ بابەتەکانی پەیوەست بە بواری پزیشکی لە ناساندنی نەخۆشییەکان و هۆکارەکانی سەرهەڵدانی و هاوکات شێوازەکانی چارەسەرکردنی بە تێرو تەسەلی تێدا خرابووە ڕوو (ابن ابي اصيبعة، د.ت، ص٧٥٠).

لە لایەکی دیکەش، مەلیک المعظم لە پاڵ زانستەکانی دیکە بەدواداچوونی زۆری هەبووە بۆ زانستی پزیشکی، لەم چوارچێوەیەشدا پەیوەندییەکی بەهێزی هەبووە لەگەڵ پزیشکان و ئەوانەی سەرقاڵبوونە بەو جۆرە زانستە، لە دیارترینی ئەو شارەزایانەش رشیدالدین ابو المنصور بن علي الصوريم (م: ٦٣٩ک/١٢٤١ز) بوو، کەوا کتێبێکی لە بارەی زانستی پزیشکی بۆ مەلیک نووسی بە ناوی (الادوية المفردة) کە

تیایدا ناو و جۆر و چارەسەری ئەو دەرمانانەی تێدا خرابووە ڕوو كە زانا و كارامەكانی پێشینانی بواری پزیشكی ئاماژەیان پێكردووە، بەڵام بەبێ ناوهێنانی زاناكان (الصفدي، ٢٠٠٠، ٨٤/١٤-٨٥).

هاوكات مەلیک الكامل لە ئاستێكی بەرزی ڕۆشنبیریدا بووە لە ڕووی پزیشكی، لەم نێوەندەشدا پرسیارو باس و خواسی زۆریكردووە لەو پزیشكانەی كە لە خزمەتیدا بوون، تەنانەت هەندێک جار پرسیار و بەدواداچوونی كردووە بۆ گەیشتن بە ڕاستییەكان، لەم نێوەندەشدا جارێكیان لە یەكێک لە دانیشتنەكانی بابەتێكی پزیشكی خستە بەردەم پزیشكەكانی و پرسیاری لە أفضل الدین الخونجي (م: ٦٤٦ک/١٢٤٨ز) كرد كەوا (ئاروو) بە چ شێوەیەک بخورێت باشە، ئەویش لە بەرامبەردا ئەوەی خستە ڕوو كە باشترە بە بەرگەكەیەوە بخورێت، بەڵام ئەو وەڵامە نەبووە جێگای باوەڕی مەلیک الكامل، هەربۆیە پرسیاری لە پزیشكی ناودار الرشید بن ابی الحلیقة (م: ٦٧٠ک/١٢٧١ ز) كرد و ئەویش لە بەرامبەردا جەختی لەوە كردەوە كە باشترە كە بەرگەكەی لێبكرێتەوە ئینجا بخورێت، لەبەر ئەوەی بەرگەكەی ئەستوورە و هەرسكردنی زەحمەتە، هەڵبەتە مەلیک الكامل ئەو وەڵامەی بەدڵ بوو، سەرزەنشتی پزیشک الخونجی كردو گاڵتەی پێكرد، ئەویش لەبەرامبەردا تووشی شەرمەزاری بوو، بەڵام ئەوەی لێرەدا جێگای تێڕامانە ابن واصل باس لەوە دەكات ئەو هەڵوێستەی مەلیک الكامل ڕەوا نەبوو بەرامبەر بەو پزیشكە، لە بەر ئەوەی هەڵەكردنێكی بچووک مانای نەزانی نییە، بەڵكو ئەویش وەک زۆرێک لە پزیشكەكان هەمان قسەی علي ابن سینا (م: ٤٢٨ک/١٠٣٦ز) لە كتێبی القانون دووبارە كردەوە لەبارەی چۆنیەتی خواردنی خیار لە گۆشەنیگای بۆچوونەكانی ئەودا بە هەڵەدا چوون (ابن واصل، ١٩٥٧، ١٦١/٥). بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەگەر زەین بدەین ئەو هەڵوێستە لێهاتوویی و شارەزایی مەلیک الكامل بەدیار دەخات لە بواری پزیشكیدا.

وێڕای هەموو ئەوانەی کە خراونەتە ڕوو، هەندێک ئاماژە هەن بەڵگەی ئەوە بەدەستەوە دەدەن مەلیکەکانی ئەیوبی شارەزاییان هەبووە لە چارەسەر و ساڕێژکردنی برینەکان لە ڕووی پزیشکی، ئەوەش لە یەکێک لە ڕووداوەکان بە ڕوونی بەرجەستە دەبێ لە ساڵی ٥٩٥ک/١١٩٩ز، کاتێک مەلیک المنصور محمد خاوەنداری حماه هێرشی سەربازی کردە سەر شاری بعرين و تیایدا بریندار بوو، لەو کات و ساتەدا دوای دەست بەسەرداگرتنی خۆی چارەسەر و ساڕێژی برینەکەی کرد (ابن واصل، ١٩٥٧، ١٠١/٣).

بەدەر لە هەموو ئەوانەی کەوا خرانە ڕوو، هەندێک زانستی تایبەتمەند هەبووە مەلیکەکان مەیلیان بەلایەوە چووە، لەوانە زانستی (السيمياء)[٧]، مەلیک الظاهر غازي خاوەنداری حەلەب حەزو خولیایی زۆری بۆ لای ئەو جۆرە زانستە هەبووە ، هەربۆیە کاتێک زانا و گەڕیدەی دیار الهروي (م: ٦١١ک/١٢١٤ز ) هاتە لای لە حەلەب پایەی زۆر بەرز بۆوە و تەنانەت پەیوەندییەکی توندو تۆڵیش لە نێوانیاندا هاتە کایەوە، ئەوەش زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ئەو زانایە شارەزا و لێهاتوویی زۆر بووە لە زۆر بواردا بە تایبەتی لەو جۆرە زانستە (ابن خلكان، ١٩٩٠،٣، ٣٤٧/١٩٩٠).

### ٣_ زانستە زمانەوانی و کۆمەڵایەتییەکان:

سەبارەت بە زانستی زمانەوانی، بە تایبەتی زمانی عەرەبی مەلیکەکانی ئەیوبی زۆر بەگرنگیەوە لێیان ڕوانیوە، لەبەر ئەوەی زۆربەی سەرچاوەکانی شرۆڤەکردن و تێگەیشتن لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بە زمانی عەرەبی بووە، بە لەبەر چاوگرتنی ئەوە کارێکی ئاسان نەبوو بتوانرێت تێبگەیت لە کرۆک و هەڵهێنجانی حوکمەکانی زانستە شەرعییەکان بەبێ پەنا بردنە بەر زانستە زمانەوانیەکان بە هەموو وردەکاریەکانی، بەمەش پەیوەندییەکی توندو تۆل هەبووە لە نێوان هەردوو زانستدا، بە جۆرێک ئەستەم بووە تێبگەیت لە یەکێکیان بە بێ

فێربوونی ئەوەی دیکەیان (حاجي خليفة، ١٩٤١، ٥٣/١). بە لەبەر چاوگرتنی ئەمەش لێرەدا دەکرێت بوترێت فێربوونی زانستە زمانەوانییەکان کلیلی تێگەیشتن بووە لە زانستە شەرعی و ئاینییەکان.

ئەوەی لێرەدا جێگای ئاماژە پێدانە ماڵباتی ئەیوبییەکان وەک بنەماڵەیەکی ڕەسەنی کوردی وەک بەشێک لە نەتەوەکانی دیکە کاریگەر و پەرۆش بوونە بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام، ئەوەش وایکردووە وەک پێداویستیەکی زێدەگی بۆ تێگەیشتن لە بنج و بناوانی فێری زمانی عەرەبی ببن.

لەبەر ڕۆشنایی هەموو ئەوانەش، مەلیک الافضل ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی لە خۆی نزیک دەکردەوە لە زۆربەی بوارە جۆراوجۆرەکان بۆ ئەوەی سوودمەند بێ لە بەهرەو تواناکانیان، تا دواجار ئەزموونێکی باشی پەیدا کرد لە ڕووی زمانەوانی، هەربۆیە لە بارەیەوە دەگوترێت: (( بە ڕێنووسێکی زۆر جوان دەینووسی)) (المنذري، ١٩٨٤، ١٤٠/٣). هاوکات مەلیک الظاهر غازي برای بەدواداچوونی زۆری کردووە بۆ بابەتە زمانەوانیەکان، بەجۆرێک لە دانیشتنەکانیدا زۆر حەزی بە دیبەیت و ڕاگۆڕینەوە هەبووە لەگەڵ زانایان، لەم نێوەندەشدا لە یەکێک لە دانیشتنەکانی لە مانگی ڕەمەزان پرسیاری لە بارەی ڕەگ و ڕیشە و بنەچەی زاراوی (العيد) لە زانای دیار القاسم بن القاسم الكيال الواسطي (م: ٦٢٦ک/١٢٢٩ز) کرد، ئەویش زۆر بە لێوەشاوەیی بۆی شیکردەوە کە زاراوەکە لە(عود) واتە لە دووبارە گەڕانەوە هاتووە، لەبەر ئەوەی لە ڕووی وشەسازی نابێ پیتی (و) لەگەڵ بزوێنی کورتی (كسرة) لە دوای یەکەوە بێ، هەربۆیە پیتی (و) بووە بە(ی) بۆ ئەوەی گونجان دروست بێ لە نێوانیان، بێگومان ئەو بۆچوونەش زاناکانی دیکەی بواری وشەسازی لە دانیشتنەکەدا پشت ڕاستیانکردەوە (القفطي، ١٩٨٢، ٣٢/٣).

هەرچی مەلیک المعظم بوو، ئەوا جیاواز لە بەشێکی زۆر لە مەلیکەکانی دیکە، گرنگی و بایەخی زۆریداوە بە زانستی زمانەوانی، لەم نێوەندەشدا سوودمەند بووە لە بەهرە و تواناکانی زانای دیار تاج الدين

الكندي لە بارەی زمان و ئەدەب، تەنانەت چەندین جار بەوپەڕی خاکی خۆی لە کۆشکەکەیدا لە قەڵاوە دەردەچوو بە بڕینی کۆڵانەکان بە پێ دەچووە کۆڕ و دانیشتەکانی و لە خزمەتی ئەودا کتێبەکانی (سیبویه)ی عمرو بن عثمان سیبویه (م:١٨٠ک/٧٩٦ز) و کتێبی (الايضاح) و کتێبی (الحجة في القراءات) علي الفارسي (م:٣٧٧ک/٩٤٨ز) و کتێبی (المفصل) الزمخشري (م: ٥٣٨ک/١١٤٣ز)، لە پاڵ ئەوانەشدا چەندان کتێبی دیکەشی دەخوێندەوە (مؤلف مجهول، ٢٠١٠، ص٣٦٨، ابن الجزري، ١٩٣٢، ٢٩٧/١) ، بێگومان هەموو ئەوانەش کاریگەیی زۆری هەبووە لەسەر ئاستی مەعریفی و ڕۆشنبیری دواجار بووە بە یەکێک لە زانا و پایە بەرزە هەرە دیارەکانی بواری زمانەوانی و ڕێزمان.

جگە لەوەش، بایەخ پێدانی بێوچانی بۆ زانستی زمانەوانی گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە داوا لە زانایان بکات کتێبێکی تایبەت بەو زانستەی بۆ کۆبکەنەوە بە پشتبەستن و سوود وەرگرتن لە کتێبی (الصحاح) الجوهري و کتێبی (الصحاح من التهذيب)ی الارموي و لەگەڵ کتێبی (الجمهرة)ی ابن دريد و چەند کتێبێکی دیکەی ئەو بوارە (ابن الاثير، ١٩٩٧، ٤٢٥/١٠).

بە هەمان شێوە مەلیک الناصر يوسفی دووەم، بایەخی زۆریداوە بە زانستە زمانەوانیەکان، لەم نێوەندەشدا ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی ئەو بوارە لە خزمەتیدا بوون، لە دیارترینیان ابن يعش النحوي (م: ٦٤٣ک/ ١٢٤٥ز) کە لەو کاتەدا سەرمەشق و پێشەوای زمانزانەکانی حەڵەب بووە (ابن خلكان، ١٩٩٤، ٥٢/٧)، هاوکات محمد بن عبدالله بن مالک (م: ٦٧٢ک/١٢٧٣ز ) چەندین بەرهەمی نەوازەی بۆ مەلیک الناصر يوسف کوڕی مەلیک العزيز محمد نووسیوە لە بواری زمان و ڕێزمان لە دیارترینیان، إيجاز التعريف في علم التصريف، وفاق المفهوم في اختلاف المقول والمرسوم، إكمال الاعلام بتثليث الكلام (الجياني، ٢٠٠٢، ص٣١).

هەرچی پەیوەستە بە هۆنراوە و ئەدەب، ئەوا لە لای مەلیکەکانی ئەیوبی ڕەواجێکی ئێجگار زۆری هەبووە، تەنانەت زێدەڕۆیی تێدا نییە ئەگەر بگوترێت دەگمەن بەرچاو دەکەوێت لە نێوماڵباتی ئەیوبییەکان مەیلی بەلای ئەدەب و شیعر و هۆنراوە نەچووبێ. دیارە ئەوەش زیاتر لەبەر چەند هۆکارێکەوەیە کە دەکرێت لەم خاڵانە بخرێتە ڕوو:

١_ ئەو کەش و هەوا ڕۆشنبیریەی تێدا ژیاون کاریگەری زۆری هەبووە لە سەریان، لەبەر ئەوەی ئەوان کوڕی سوڵتان و دەسەڵاتداری وڵات بوون هەموو پێداویستیەکانی فێرکردن و خوێندن بۆیان دەستەبەر بوو.

٢_ پەیوەست بووە بە بارودۆخی سەردەم، زیاتر لەو کاتەدا شەڕوشۆڕ لە ئارادا بووە، بە تایبەتی لەگەڵ خاچییەکان، لێرەدا سەرکەوتن و شکست و دۆڕانەکان لە لایەن هۆنراوە بێژان وێنای بۆ کراوە چ بە گریان و لاوانەوە و پیا هەڵگۆتن یاخود بە دەربڕینی خۆشی و شادی گوزارشتیان لە سەرکەوتنەکان کردووە، تەنانەت زۆر جار شاعیران لە ڕێگای هۆنراوە پڕ جۆش و خرۆشەکانیان هانی گەنجە خوێن گەرمەکانیان داوە بۆ بەرخودان و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هێزانەی بەرۆکیان گرتوون.

٣_ بۆچوونێک هەیە پێیوایە، مەلیکەکانی ئەیوبی بۆیە هێندە مەیل و خولیایان بەلای هۆنراوە چووە و نووسیویانە بۆ ئەوەی وا سەیر نەکرێن کەمتر حەزیان لە هۆنراوەیە وەک لە عەرەبەکان، هەروەک دیارە نەتەوەی عەرەب هەر لە کۆنەوە ناسرابوون بە شاعیر و هۆزانڤانی گەورە (بدوي، ١٩٧٩، ص٣٦).

بەدەر لەوانەی کە ئاماژەی بۆ کراوە دەکرێت باس لەوە بکرێت مەلیکەکانی ئەیوبی لەگەڵ ئەوەی کوردی ڕەسەنن و دوای کۆچکردنیان لە زێدی باو باپیرانیان بۆ ناوچەکانی مصر و شام شوێنەکانی پابەند بوونە بە هەندێ لە کلتوور و داب و نەریتی کوردانی خۆیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەوتنە ژێر هەژموونی کلتوور و نەریت و زمان و

فەرهەنگ و ڕۆشنبیریی ئەو ناوچانەی کە دەوڵەتیان تیادا بنیاد نا، بە لەبەر چاوگرتنی هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر شێوازی ژیان و بەرپرسیاریەتی و هزریاندا هات تێبینی ئەوە دەکرێت لە نێو پەڕاوی سەرچاوەکاندا هیچ جۆرە ئاماژەیەک بەدی ناکرێت بەوەی کەوا مەلیکەکانی ئەیوبی لەگەڵ ئەو مەیل و خولیا زۆرەیان بەلای هۆنراوە و ئەدەب شیعریان بە زمانی باو و باپیران هۆنیبێ و لە نێو دیوانەکانیان تۆماریانکردبێ.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەمانەی کە خرانە ڕوو بەشێکی زۆر لە مەلیکەکانی ئەیوبی توانای نووسینی هۆنراوەیان هەبووە و تەنانەت هەندێکیان هێندە زۆر شیعریان هەبووە و وایکردووە دیوانی تایبەت بە خۆیان هەبێ، بە شێوەیەک لە بارەی مەلیک الافضل دەگوترێت: ((هۆنراوەکانی چاک ڕێکدەخست)) (ابو شامة، ٢٠٠٢، ص٢٢٠)، تەنانەت زۆر لە جۆرەکانی شیعری نووسیوە، بەڵام لە دەربڕینەکانی زیاتر باسی زوڵم و ستەمەکانی نزیکەکانی کردووە بەرامبەر بە خۆی، ئەوەش بە ڕوونی ڕەنگی داوەتەوە کاتێک لە ساڵی ٥٩٢ک/١١٩٥ز هەوڵی دوورخستنەوەی درا لە دیمەشق لە لایەن مەلیک العزیزی و مەلیک العادلی مامی نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفەی عەبباسی الناصر لدین الله (٥٧٥-٦٢٢ک/١١٨٠-١٢٢٥ز) تیایدا بە هۆنراوە گوزارشتی لۆمە و سکاڵای لە مامی و برای کرد بەوەی کە دەیانەوێ بە زۆرەملێ دیمەشقی لە ژێر دەسەڵات دەربهێنن و هەر وەک دەڵێ:

**مولاي، ان ابا بكر وصاحبه — عثمان قد غصبا بالسيف حق علي**
**وهو الذي كان قد ولاه والده — عليهما، فاستقام الامر حين ولي**
**فخالفاه، وحلا عقد بيعته — والامر بينهما، والنص فيه جلي**
**فانظر الى حظ هذا الاسم كيف — لقي من الاواخر ما لاقى من الاول**

(الدواداري، ١٩٧٢، ١٣٤/٧)

بە هەمان شێوە مەلیک الظاهر غازي دەستی نووسینی هۆنراوەی هەبووە و لەم ڕووەشەوە ستایشی زۆری کراوە بەوەی هۆنراوە

بێژێکی گەورە و بلیمەت بووە (ابن واصل، ١٩٥٧، ٢٤٥/٣). ئەوەش یەکێکە لە نموونەی شیعرەکانی:

**طلبنا الدر من بـحر المعانـي　　وعذب اللفظ من عضب اللسان**
**وهل تجنى ثمــــار الفضل إلا　　فروع اصـلها حـلو المجـاني**

وەنەبێ تەنیا کوڕەکانی سەلاحەددین شیعریان هۆنیبێتەوە، بەڵکو کوڕەکـانی مــەلیک العــادل بەشــێکیان پێشــەنگ بــوون لــە نووســینی هۆنراوەدا، ئەوەتا مـەلیک المعظم وەک چۆن لـە زۆر بواردا شـارەزایی زۆری هەبووە، بە هەمان شێوە لە بواری ئەدەب شارەزاییەکی ئێجگار زۆری هەبووە، هەر ئەوەش وایکردووە دانراوی تایبەت بە خۆی هـەبێ بە ناوی (العروض) (السیوطي، ١٩٦٧، ٤٥٦/١) ، ئەوە لە کاتێکدا دەستی نووسینی هۆنراوەی هەبووە، تەنانەت دیوانی تایبەت بـە خۆی هـەبووە، بەڵام زۆر گرنگی بە کێش و سەروا نەداوە هەرچەندە کتێبێکی تایبـەتی هەبووە لەو بوارە، ئەوەش یەکێکە لە هۆنراوەکانی لـەو کاتـەی تووشـی نەخۆشی بووە گوتوویەتی:

**زارت ممحضة الذنوب وودعت　　تبا لـها من زائر ومــــــودع**
**باتت معانقتي كأني حبــــها　　ومقيلها ومبيتها في أضلعي**

( ابن العماد الحنبلي، د.ت، ١١٥/٥)

هاوکات مەلیک الکامل خۆشەویستییەکی زۆری هەبووە بۆ ئـەدەب و هـۆنراوە، لـەم چوارچێوەیەشدا بـەدواداچوونی زۆر بـووە بـۆ دیـوانی شاعیرەکان لە هەموو سەردەمە جیاوازەکان، لـەم نێوەندەشدا داوای لـە ابـن دحیـەی الاندلسـی (م:٦٣٣ک/١٢٣٥ز) کـردووە کـەوا کـە کتێبێکـی بـۆ بنووسێ لەبارەی شیعرەکانی خـەڵکی ئەندەلس و مـەغریب، ئـەویش لـە بەرامبـەردا کتێبێکـی بـۆ نووسـی بـە نـاوی (المطـرب مـن أشـعار أهـل المغـرب) (ابـن دحیـة الاندلسـي، ١٩٥٥، ص١ ومـا بعـدها)، ئـەوە لـە کاتێکدایـە خۆشــی شــارەزاییەکی باشــی هــەبووە و زۆر بــە چــاکی هــۆنراوەی دەنووسی، هەروەک لە یەکێک لە شیعرەکانی دەڵێت:

**إذا تحققتم ما عند صاحبكم من الغرام فذاك القــدر يكفيــه**
**سكنتم في فؤادي وهو منزلكم وصاحب البيت أدرى بالذي فيه**

(ابن الشعار، ٢٠٠٥، مج٦،ج٣١٣/٧)

هەرچی پەیوەستە بە مەلیك الناصر داود ئەوا لە بەشێكی هەرە زۆری نەوەكانی خانەوادەی مەلیك العادل جوانتر شیعری ڕێكدەخست، ئەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە كەوا لە كەش و هەوایەكی زانستی و ئەدەبی لە ژێر سێبەری باوكیدا پێگەیشتووە، ئەوە لە كاتێكدایە قووڵبوونەوەی لە زانستە عەقڵییەكان وایكردبوو ڕەنگدانەوەی زۆری بەسەر دەربڕینەكانیدا هەبێ بە جۆرێك هەردوو هونەری شیعر و پەخشانی بە یەكەوە كۆكردبۆوە (الحنبلي، ١٩٧٨، ص٣٥٧)، لەم نێوەندەشدا ئەو هۆنراوە بێژانەی لەو جۆرە بوون پەسن و ستایشی زۆر كراون بەوەی ناسراون بە هۆنراوە بێژی هەست ناسك، پەیڤەكانیان شیرین و مانادار و پڕ واتایە، بەردەوام لە دەربڕینەكانیاندا نوێگەری و داهێنان دەكەن (القيرواني، ١٩٨١، ١٠٦/٢)، سەرەڕای ئەوەش دیوانی تایبەت بەخۆی هەبووە كە كوڕەكەی مەلیك الامجد حسن لە دوای مردنی كۆیكردۆتەوە بە ناوی (الفوائد الجلية في الفرائد الناصرية) (الملك الناصر داود، ١٩٩٢، ص٣٧)، ئەوەش یەكێكە لە نموونەی شیعرەكانی:

**عيون عن الســحر المبين تبين لها عندك تحريك القلوب سكون**
**تصول ببيض وهي سود فرندها ذبول فتور والجفون الجفــون**

(ابو الفداء، ١٩٩٩، ٢٣٥/٣)

بێجگە لەوەش، لە سەردەمی هەندێك لە مەلیكەكان ئەدیب و هۆزانڤانان پێگەیەكی ئێجگار دیاریان هەبووەو ڕەواجیان زۆر بووە، ئەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە كە بەشێك لە مەلیكەكان خۆیان هۆنراوە بێژی گەورە بوون بەردەوام لە كۆڕ و دانیشتنەكانیان ژمارەیەكی زۆر لە ئەدیبان لە دەوریان بوون، لەم نێوەندەشدا مەلیك الناصر یوسف خاوەنداری شام لەبەر مەیلی زۆری بەلای شیعردا هانی ئەدیبانی داوە كتێبی بۆ بنووسن لە بارەی هەواڵی هۆنراوە بێژان، لەم

چوارچێوەیەشدا ابن سعید المغربي (م: ٦٨٥ك/١٢٨٦) دوای ئەوەی بە یاوەری کمال الدين ابن العديم هاتە خزمەتی مەلیک الناصر یوسف کوڕی مەلیک العزيز محمد، ئەویش بەوپەڕی ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵدا کرد لەبەر ئەو توانا لە ڕادەبەدەرەی لە نووسیندا هەیبوو، ئەویش لە بەرامبەردا کتێبێکی بۆ نووسی بە ناوی (ملوك الشعراء) کە تیایدا ژمارەیەکی زۆر لە شاعیران ئاماژە بە ژیننامەیان کرابوو بەپێی جۆری هۆنراوەکانیان (المقري، ١٩٩٧، ٢/٢٩٥)، جگە لەوەش ئەدیبی گەورەی شارەزا لە بواری هەواڵی شاعیران صدرالدين علي بن الفرج البصري(م: ٦٥٩ك /١٢٦٠ز) پاش ئەوەی بە خزمەتی مەلیک الناصر یوسف گەیشتووە لە حەڵەب، ئەویش کتێبێکی بۆ نووسیوە لە ژێر ناوی (الحماسة البصرية) کە تیادا ژمارەیەک هۆنراوەی ڕۆژگاری نەفامی و سەردەمی ئیسلامی لە خۆ دەگرت (البصري، د.ت، ١/ ٢). ئەوە لە کاتێکدایە خۆشی شارەزاییەکی زۆر باشی هەبووە لە بواری ئەدەب و دارشتنی هۆنراوە، لەم سۆنگەیەوەش ستایشی زۆر کراوە بەوەی هۆنراوە بێژێکی زمان پاراو بووە (الصفدي، ١٩٩٢، ٢/١٥٦؛ ابن تغري بردي، د.ت، ٢٠٤/٧)، ئەوەش یەکێکە لە نموونەی شیعرەکانی کاتێک دوور کەوتەوە لە نیشتمانی خۆی و بە بەندی کەوتە دەست هۆلاکۆ، ئەوەش کاریگەری زۆری بەسەردا هەبووە، بە جۆرێک پەرۆشی بۆ زێدی باو و باپیرانی وایکرد بە هۆنراوەی پیاهەڵدان گوزارشت لە دوورە وڵاتی بکات، هەروەک گوتوویەتی:

**يسقى حلب الشهباء كل مزنـــه     سحائب غيث نووها ليس يقلع**
**فتلك دياري لا العقيق ولا الحمى     وتلك ربوعي لا زرود ولعـــلع**

(الكتبي، ١٩٨٠، ٢٠/٢٦٠)

وێڕای هەموو ئەوانە، مەلیک الامجد بهرام شاه خاوەنداری بەعلبەگ، یەکێک بووە لەو مەلیکانەی حەزو خولیایەکی بێسنووری بۆ ئەدەب و هۆنراوە هەبووە، تەنانەت دیوانی تایبەت بەخۆی هەبووە، لەم نێوەندەشدا هیچ کامێک لە ئەندامانیماڵباتەکەی هێندەی ئەو هۆنراوە

بێژ نەبووە (الملک الامجد، ١٩٨٣، ص٧٨؛ ابن خلكان، ١٩٩٠، ٤٥٣/٢)، ئیتر هەر ئەوەش وایکردووە کە پەسن و ستایشی زۆر بکرێت بەوەی گەورەیی و شکۆمەندی ئەو هۆنراوە بێژە ئەیوبییە بەراورد بە شاعیرە عەرەبەکان لەوەدایە کە خۆی لە بنەچەدا کوردێکی ڕەسەنە، بەڵام بە زمانی عەرەبی شیعری نووسیوە (جواد، ١٩٥٨، ص٢٦).

لە لایەکی دیکەش، ئەو کەش و هەوا زانستی و ئەدەبییەی لە ئارادابوو لە حەماە ڕەنگدانەوەی زۆری هەبوو بەسەر کەسێیەتی مەلیکەکانی، بە جۆرێک مەلیک المنصور محمد هێندە زەینی بەلای ئەدیب و هۆنراوە بێژان چووبوو تاوەکو کتێبێکی لە بارەیانەوە دانا بە ناوی (طبقات الشعراء) کە پێکهاتووە لە دە بەرگ (ابن ظافر الازدي، ١٨٦١، ص١٨١)، یاخود ناسراوە بە (اخبار الملوک ونزهة المالک والمملوک في طبقات الشعراء) کە تیایدا بە کورتی باسی ژیننامەی شاعیرەکانی سەردەمی نەفامی و دواتر ئەوانەی ڕۆژگاری ئیسلامی تاوەکو سەردەمی خۆی لەگەڵ بەشێک لە نموونە شیعریەکانیان دەکات (الملک المنصور، ٢٠٠١، ص١ وما بعدها)، جگە لەوەش دەستی نووسینی هۆنراوەی هەبووە و تەنانەت دیوانی تایبەت بە خۆی هەبووە (ابن واصل، ١٩٥٧، ٨١/٤)، هەرچەندە دیوانەکەی وەکو کتێبێکی سەربەخۆ لەبەر دەستدا نەماوە، بەڵام وەک کۆپلە و دێڕە هۆنراوە لە نێو پەڕاوی سەرچاوەکاندا ئاماژەی پێکراوە، هەروەک گوتوویەتی:

**سحا الدموع فإن القوم قد بانوا وأقفر الصبر لما أقفر البان**
**وأسعداني بوجد بعد بينهم فالشان لما نأوا عنى له شان**

(الدواداري، ١٩٧٢، ٢٣٦/٧)

جگە لەوەش، لە کۆشک و دەربارى مەلیک المنصور محمد ژمارەی زانا و ئەدیبەکان زۆر زیاتر بووە لە ژمارەی میر و فەرماندە و سەر لەشکرەکان، هەروەک دەگوترێت: ((نزیکەی دوو سەد شەرعناس و زمانەوان و ئەوانەی خەریک بوون بە فەلسەفە و لۆژیک ئەندازیار و

ئەستێرەناس و ئەدیب و هۆنراوەبێژ بەردەوام لە خزمەتیدا بوون)) (الكتبي، ١٩٧٤، ١٢/٤).

سەبارەت بە لایەنی کۆمەڵایەتی، بواری مێژوو لە پێشەوەی هەموو ئەو زانستانە بووە کە بەشێک لە مەلیکەکانی ئەیوبی زۆر بەگرنگییەوە لێیان ڕوانیوە، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەست بووە بەو ڕووداو و پێشهاتانەی کە لە ڕابردوودا ڕوویانداوە، بە لەبەرچاوگرتنی زانیاریی ورد لە بارەی میللەتانی پێشوو لە ڕووی هەواڵی ڕەچەڵەک و وڵاتەکانیان لەگەڵ داب و نەریت ئەو جۆرە لە ژیانەی گوزەراندوویانە، لەم سۆنگەیەشەوە مەلیک الظاهر غازي گرنگیی زۆری داوە بە هەواڵی ڕەچەڵەکناسی، لەم نێوەندەشدا کتێبی تایبەتی خوێندۆتەوە لە بارەی ڕەچەڵەکی خانەدانەکان و وەچە و نەوەکان، بە تایبەتی ئەو کتێبەی مێژوونووس كمال الدين عومەر کوڕی ئەحمەد ناسراو بە ابن العديم (م: ٦٦٠ک/١٢٦٢) پێشکەشی کرد لە ژێر ناوی (الدراري في ذكر الذراري) (الصفدي، ٢٠٠٠، ٢٦٠/٢٢).

لەلایەکی دیکە مەلیک المعظم لە پاڵ زانستەکانی دیکە زۆر ئارەزووی خوێندنەوەی مێژووی هەبووە، بە تایبەتی ژیننامەی پێغەمبەر(د.خ)، لەم چوارچێوەیەشدا چۆتە خزمەتی شەرعناسی گەورە العماد بن المحلی (م: ٦٢٩ک/١٢٣١ز) لەلای ئەو (سيرة ابن هشام)ی خوێندووە و لەو بوارەدا شارەزا بووە (سبط ابن الجوزي، ج٨، ق٢/٦٤٥)، ئەوە لەکاتێکدایە گرنگی و بایەخی زۆریشی داوە بە کتێبە دانسقە و نەوازانەی کە لە بارەی ژیننامەی مەلیکەکانی پێشینان نووسراون، لەم نێوەندەشدا لە ساڵی ٦٢٢ک/ ١٢٢٥ز الفتح بن علي البنداري (م: ٦٤٣ک/١٢٤٤ز) ڕاسپارد بە وەرگێڕانی کتێبی (الشاهنامة) الفردوسي لە ساڵی ٤٠٠ک/١٠٠٩ز کە بە زمانی فارسی نووسراوە، ئەوەش لە میانەی پێشەکی کتێبەکەدا وەرگێڕ جەخت لەوە دەکاتەوە کە مەلیک المعظم فەرمانی پێکردووە و ڕایسپاردووە بە وەرگێڕانی کتێبەکە و شیکردنەوەی ئەو چیرۆکانەی کە لە نێویدا بە شێوەی هۆنراوە

نووسراون دایانماڵێ لە زمانی فارسی، هاوکات لادانی زاراوە عەرەبییە نەگونجاوەکان و گۆڕینی بەو زمانەی کە کتێبی پیرۆزی پێ دابەزیوە کە مەبەستی قورئانی پیرۆزە (الفردوسي، ١٩٣٢، ص١ وما بعدها).

وەنەبێ مەلیکەکانی ئەیوبی تەنیا لە کۆڕ و دانیشتنەکانیاندا گوێیان لە ڕووداو و بەسەرهاتەکان گرتبێت یاخود هانی نووسین و وەرگێڕانیان دابێت، بەڵکو هەندێکیان خۆشیان وەکو مێژوونووس بەشداریانکردووە لەم بوارەدا، ئەوەتا مەلیک المنصور محمد خاوەنداری حەماە ئەزموونی باشی هەبووە لە تۆمارکردنی مێژوودا، لەم نێوەندەشدا کتێبێکی نووسیوە بە ناوی (مضمار الحقائق وسر الخلائق)، لە شێوەی (حولیات) ساڵ لە دوای ساڵ لە بیست بەرگدا تۆمارکراوە، بەڵام لە کاتی ئێستادا تەنیا یەک بەرگی لە بەر دەستدا ماوە کە تیایدا ڕووداوەکانی ساڵی ٥٧٥ک/١١٧٩ز تاوەکو ٥٨٤ک/١١٨٨ز تۆمار کراوە.

مەلیک المظفر محمود خاوەنداری حەماە مەیلی بەلای زانستی مێژوودا هەبووە، لەم نێوەندەشدا ابراهیم بن عبدالله الحموي ناسراو بە ابن ابي الدم (م:٦٤٢ک/١٢٤٤ز) کتێبێکی مێژووی نووسیوە بە ناوی (التاریخ المظفری الکبیر) بە دیاری داویەتی بە مەلیک المظفر محمود کە تیایدا ڕووداوەکانی مێژووی ئیسلامی تێدا تۆمارکراوە بە شێوەی ساڵ لە دوای ساڵ تاوەکو ٦٢٨ک/١٢٣٠ز (ابن قاضي شهبة، ١٤٠٧هـ ٩٩/٢).

بەدەر لە هەموو ئەوانەش، وا پێدەچێت مەلیک المنصور ئیبراهیم خاوەنداری حمص بە گرنگییەوە لە هەواڵ و ڕووداوە مێژووییەکانی ڕوانیبێ، لەم ڕووەشەوە کاتێک ابن نظیف الحموي (م: ٦٤٤ک/١٢٤٦ز) هاتە خزمەتی لە حمص کتێبێکی مێژووی بە ناوی (التاریخ المنصوري) کە تیایدا وردەکاری ڕووداوەکانی نێوان ساڵانی ٥٨٩ک/١١٩٣ز تاوەکو ٦٣١ک/١٢٣٤ز نووسی و کردیە دیاری بۆ ئەو وەک ڕێز و وەفایەک بەرامبەر بەو بەخشندەیی و چاکەیەی کە لەگەڵیدا کردی، دوای ئەوەی مووچە و ژیانێکی شایستەی بۆ خۆی و خێزانەکەی فەراهەمکرد (بروکلمان، ١٩٧٧، ١٥٠/٦؛ مصطفی، د.ت، ٢٥٥/٢).

هاوکات، بواری جوگرافیا یەکێکی دیکە بووە لەو زانستە کۆمەڵایەتیانەی بۆتە جێگای بایەخی هەندێک لە مەلیکەکانی ئەیوبی، بە تایبەتی مەلیک الظاهر غازي کاتێک هەوڵیداوە زۆرترین زانیاری لە بارەی جوگرافیای هەرێم و وڵاتان و ڕێگاوبانەکان وەدەست بخات، بۆ ئەو مەبەستەش هەوڵەکانی خۆی خستۆتەگەڕ بۆ بەدەستخستنی کتێبە دانسقە و ناوازانەی کە لەو بوارەدا نووسراون، لەم نێوەندەشدا یاقوت الحموي جەخت لەوە دەکاتەوە کە لە ساڵی ٦٠٧ک/١٢١٠ز ڕوویکردۆتە ناوچەکانی شام لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵێک کتێبی زانستی پێبووە کە بازرگانی پێوە دەکرد، یەکێک لەو کتێبانەش (صور الاقاليم) ابو زيد احمد بن سهل البلخي (م: ٣٢٢ک/٩٤٣ز) بوو فرۆشتوویەتی بە مەلیک الظاهر کە بەرگێکی نەوازە و دەگمەن بوو بە دەست و خەتی دانەرەکە نووسرابوو کە تیایدا زانیاریی گرنگ بەرجەستە کرابوو لە بارەی جوگرافیای هەرێم و وڵاتەکان (ياقوت الحموي، ١٩٩٣، ٥/٢١٨٤). جگە لەوەش، مەلیک الامجد بهرام شاه خاوەنداری بەعلبەگ حەز و خولیای بەلای زانستی جوگرافیادا چووە، لەم نێوەندەشدا زانای بەهرەمەند و دیار رشيدالدين علي بن خليفه کە لە نزیکەوە لە خزمەتیدا بووە کتێبێکی بۆ نووسیوە بە ناوی (السبب الذي له خلقت الجبال) ( ابن ابي اصيبعة، د. ت، ص٧٥٠).

**دووەم:**

**ڕۆڵی مەلیکەکانی ئەیوبی لە بنیادنانی دامەزراوە زانستی و فێرکارییەکان**

قوتابخانە و فێرگەکان[٨] لە پێشەوەی ئەو دامەزراوانە بوون ببوونە جێگای بایەخی مەلیکەکانی ئەیوبی و بە گشتی چەند هۆکار و پاڵنەرێک لە پشت دروستکردن و بنیادنانیان بووە و دەکرێت لەم خاڵانەدا بخرێتە ڕوو:

١_ دروستکردنی قوتابخانەکان بەشێکی گرنگ بووە لە نەخشە و پلانی خزمەتکردنی مەزهەبی سونە لە ناوچەکە، بەتایبەتی وەک جوولانەوەیەک بۆ دووبارە زیندووکردنەوەی بیرۆکەی چوار ڕێبازەکە لە بەرامبەر ئەو بیرۆکە و هزرانەی کە لە پێشووتریشدا لە ئارادا بوون لە بنەچەدا دوور بوون لە کرۆکی مەزهەبی سونە (حمزة، ١٩٤٧، ص٣١).

٢_ زۆربەی هەرە زۆری فێرگەکان زانستی ئایینی تێدا دەخوێنرا، ئەوەش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر مەلیک و دەوڵەمەند و زەنگینەکان بەوەی بەدوای پاداشتی دواڕۆژەوە بن بۆ زیاتر نزیکبوونەوە لە خوای گەورە، ئەوە لە کاتێکدا بۆ ناوبانگیش بووە، بە شێوەیەک هەندێکیان پارە و سامانێکی ئێجگار زۆریان خەرجکردووە بۆ ئەوەی لە ڕێگەیەوە ناویان بە زیندوویی بمێنێتەوە (علي، ١٩٨٣، ٦٨/٦).

٣_ بەوپێیەی مەلیکەکانی ئەیوبی بەشێکی زۆریان زانستخواز و لە خزمەتی زانست بوون، هەربۆیە بەردەوام بەدوای زانا و پیتۆڵە لێهاتووە دیارەکاندا دەگەڕان و قوتابخانەی تایبەتییان بۆ بنیاد دەنان لەگەڵ فەراهەمکردنی مووچە و ژیانێکی شایستە، وەک هاندانێک بۆ زیاتر چالاککردنی جوولانەوەی ڕۆشنبیری و بزاڤی ڕۆشنگەری.

٤_ لە پاڵ ئەوانەش، یەکێک لە ئامانجەکانیان بریتی بووە لە پەروەردە و پێگەیاندنی کەسانی پسپۆڕ و شارەزا لە بوارە جۆراو جۆرەکان، بەتایبەتی لە هەر چوار ڕێبازەکە، ئەمەش هەم بۆ خزمەتکردنی ئایین و هەم بۆ پڕکردنەوەی پلەو پایە و پۆستەکانی دەوڵەت. بەمەش قوتابخانەکان لەوکاتەدا هەمان ئەرک و ڕۆڵی

زانکۆکـانی ئێسـتایان بینیـوە لـە خوێنـدنی زانسـتە جـۆراو جۆرەکـان و هاوکات پێگەیاندنی کەسانی شارەزا و پسپۆر لە سەرجەم بوارە جۆراو جۆرەکان.

هەرچی پەیوەستیشە بە شێوازی بنیادنـانی قوتابخانـە و فێرگـەکان لە ڕووی بیناسازی و ئەندازیاری لە وڵاتی شام، ئەوا زیاتر وەستاوەتە سەر ئەو جۆرە زانستانەی کە تیایدا دەخوێنرا لەگـەڵ ئاراسـتە و مـەیلی ئەو کەسەی بنیادی دەنا و تێچووەکانی لـە ئەسـتۆی خـۆی دەگرت، بـە شـێوەیەک قوتابخانـەکان لـەو کاتـەدا ڕووبـەر و پانتایییـەکی فراوانیـان هـەبووە و پێکهـاتبوو لـە دوو نهـۆم و چـەند بەشـێکی سـەرەکی لـە خـۆ دەگرت، لەوانە ژمارەیەک لە ژوور و هۆڵی خوێندن کە بەپێی گـەورەیی و قەبارەی قوتابخانەکە ڕێژەکانی جیاواز بووە لەگـەڵ چـەند هـەیوانێک، هەندێک جار چوار بووە، ئەوەش زیاتر وەستابوو لەسەر ئەو ڕێبازانەی کـە تیایـدا دەخـوێنرا لەگـەڵ هـەیوانی تایبـەت بـە خوێنـدنی قورئـان و فەرموودە، لەگەڵ جێگای نوێژکردن، لە هەموو ئەوانەش چەند بەشـێکی دیکــە وەکــو پاشــکۆ هــەبووە وەک کتێبخانــە، چێشــتخانە، شــوێنی حەوانەوە و پشوودانی مامۆستا و قوتابییەکان، هەنـدێک جـاریش گـۆڕ و دوامەنزڵگـە لـە تـەکیا دروسـت دەکـرا ( ابـن طولـون، ١٩٨٠، ٢٠٣/١، ٢١٣؛ رمضان، ١٩٧٧، ص١٤٧)، لێرەدا زۆربەی کات نـاوی قوتابخانەکـە بـە نـاوی بنیادنەرەکـەی دەکـرا، جـا چ مـەلیک و دەسـەڵاتدار و خـوا پێداو بووایـە یـاخود کەسـێکی دیـارو دەسـت ڕۆیشـتوو بووایـە ڕاسـتەوخۆ لـە لایـەن خۆیـەوە سـەرپەرشـتی دەکرا و کەسـانی تایبـەتی وەک بەڕێوەبـەری بـۆ دادەنا و بە زۆری ئەوانەی ئـەو ئەرکەشـیان لـە ئەسـتۆ دەگـرت خـودی مامۆستای قوتابخانەکان بوون.

بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەوانە، هەر یەکێک لە مەلیکـەکان بـەپێی بـارودۆخی سـەردەم و ئـەو توانـا داراییـیـەی لەبـەر دەسـتیاندا بـووە بەشێک لەو دامەزراوانەیان بنیاد ناوە، ئەوەتا مەلیک الافضـل هەڵسـا بـە دروستکردنی قوتابخانەیەک بە ناوی (الافضلیة) لە دیمەشق، بەڵام لەبەر

ئەو گۆڕانکاری و پێشهاتە سیاسییانەی هاتە ڕێگای نەیتوانی تەواوی بکات پاش ئەوەی بە ناچاری شارەکەی جێهێشت، بەڵام لە دوای ئەوەی مەلیک العزیز عثمان برای دەستی بەسەر شارەکەدا گرت لە ساڵی ٥٩٠ک/١١٩٣ز ئەرکی تەواوکردنی قوتابخانەکەی سپارد بە محي الدين بن زكي (م: ٥٩٨ک/١٢٠١ز)، هاوکات بۆ تێچوو خەرجییەکانیشی گوندێکی گەورەی تەرخانکرد بە ناوی محجة، دوا بەدوای هەموو ئەمانەش لە ساڵی ٥٩٢ک/١١٩٥ز تەرمی سەلاحەددینی باوکی لە قەڵاوە گواستەوە و لە وێدا بە خاکی سپارد (احمد، ١٩٨٥، ص١٢٩)، هەربۆیە لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت ناوەکەشی بوو بە قوتابخانەی (العزيزية) (النعيمي، ١٩٩٠، ١/٢٩٠).

جگە لەوەش، مەلیک الافضل قوتابخانەیەکی دیکەی دروستکردووە لە گەڕەکی المغاربة لە قودس هەر بە ناوی (الافضلية)و تایبەت بووە بە شەرعناسەکانی سەر بە ڕێبازی مالیکی، ئەوەش دوا بەدوای ئەوەی ژمارەیەکیان لە مەغریبەوە هاتن لە شاری قودس نیشتەجێ بوون (العليمي، د.ت، ٢/٤٦). لێرەدا ئەو هەنگاوەی مەلیک الافضل بۆمان بە دیار دەخات کەوا هیچ جۆرە دەمارگیرییەکی نەبووە بەرامبەر ڕێبازێکی دیاریکراو هەر چەندە خۆی شافعی بووە، بەڵام کارئاسانی تەواویکردووە بۆ شوێنکەوتوانی ڕێبازەکانی دیکەش گوزارشت لە ڕا و بۆچوونەکانیان بکەن، لەم ڕووەشەوە بەبێ جیاوازی کاری بۆ هەمووان کردووە.

هاوکات مەلیک الظاهر غازي درێغی نەکردووە لە خەرجکردنی پارەیەکی زۆر لە بنیادنانی ئەو دامەزراوانەی لە ڕێگایەوە خزمەت بە لایەنی زانستی دەکرێت، لەم نێوەندەشدا ژمارەیەک قوتابخانەی بنیادناوە لە ناوچەکانی شام، لە دیارترینیان قوتابخانەی (الظاهرية) لە دواوەی دەرگای المقام لە حەڵەب ساڵی ٦١٠ک/١٢١٣ز کۆتایی بە بنیادنانی هێنا و لە بەرامبەریشدا ئەرکی سەرپەرشتیکردنی سپارد بە بهاء الدين يوسف بن رافع ناسراو بە ابن شداد (٦٣٢ک/١٢٣٤ز)،

تەنانەت لە کاتی کردنەوەی قوتابخانەکە بە شێوەیەکی فەرمی ئەو ڕۆژە وەکو کەرنڤال وا بوو خۆی و ژمارەیەکی زۆر لە زانا و شەرعناسەکان تیایدا ئامادە بوون (ابن شداد، ١٩٨٧، ج١،ق٢٦٠/١؛ ابن العجمي، ١٤١٧هـ ٢١٧/١-٢١٨).

جگە لەوەش بەردی بناغەی قوتابخانەیەکی دیکەشی بە ناوی (الظاهرية) بە ئاراستەی دەرگای قەڵای حەڵەب لە لای باشووری دانا و زیاتر ناسراویشە بە قوتابخانەی (السلطانية)، بەڵام مردنی لە ساڵی ٦١٣ک /١٢١٦ز دەرفەتی ئەوەی پێنەدا تەواوی بکات، بەڵکو لە دوای خۆی شهاب الدين طغريل ئەتابەگی مەلیک العزیز محمدی کوڕی دووبارە کاری تێدا کرد و لە ساڵی ٦٢٠ک/١٢٢٣ز بە تەواوی ئاوەدانیکردەوە (ابن شداد، ١٩٨٧، ج١،ق٢٥٢/١؛ كامل الغزي، ١٤١٩هـ ٩٨/٢).

وەنەبێ تەنیا لە حەڵەب بایەخی دابێت بە دروستکردنی قوتابخانە، بەڵکو کار و چالاکیەکانی لەم ڕووەوە درێژ بۆتەوە بۆ دیمەشق، بە جۆرێک لەو شارەشدا قوتابخانەیەکی بنیادنا بە ناوی (الظاهرية البرانية) لە دەرەوەی دەرگای النصر لە گەڕەکی المنيبع لە قەراغی هەردوو ڕووباری قنوات و بانياس (النعيمي، ١٩٩٠، ١،٢٥٧).

بێجگە لەوەش، هەندێک جار پەیوەندیی بەهێزی لەگەڵ زانایان وایکردووە قوتابخانەی تایبەتییان بۆ بنیاد بنێت، لەم نێوەندەشدا کاتێک گەڕیدەی دیار الهروي (م:٦١١ک/١٢١٤ز) هاتە حەڵەب، مەلیک الظاهر غازي زۆر سەرسام بوو بە بەهرە و تواناکانی و بەشیاوی ئەوەی زانی وانە بڵێتەوە لە لایان، بۆ ئەو مەبەستەش قوتابخانەیەکی تایبەتی بۆ بنیادنا هەربە ناوی (الهروي) بۆ ئەوەی لەوێدا بەهرە و زانیارییەکانی بخاتە ڕوو، لە بەرامبەر ئەوەشدا تەواوی پێداویستیەکانی ژیان لە شوێنی حەوانەوە و پێداویستیەکانی دیکە لە ڕێگای وەقفەوە بۆیان دابینکرا (ابن خلكان، ١٩٩٠، ٣٤٧/٣؛ الحلبي، ١٩٨٨، ١٨٤/٢-١٨٥).

هەرچی پەیوەستە بە مەلیک العادل، ئەوا وەکو زۆرێک لە مەلیکەکانی دیکە ڕۆڵی کارای هەبووە لە دامەزراندنی بەشێک لە

دامەزراوە فێرکاریە بەناوبانگەکان، لە دیارترینیان قوتابخانەی (العادلیة الکبری) لە لای باکوری مزگەوتی ئومەوی لە شاری دیمەشق، کە خۆی لە بنەڕەتدا بەردی بناغەی لە لایەن نورالدین محمود (م:٥٦٩ک/١١٧٣ز) دانـرا و تایبـەتکرا بـەڕێبازی شـافعی وەک هـەوڵێک بـۆ دووبـارە زیندووکردنەوەی ڕێبازە سونیەکان، بەڵام مردنی ڕێگای نەدا تەواوی بکات، پاشان وەکو خۆی مایەوە تاوەکو مەلیک العادل هات لە ساڵی ٦١٢ک/١٢١٦ز کاری تێدا کرد، بەڵام مردنی ئەویش دووبارە ڕێگر بوو لـە تـەواوکردنی، دواتـر لـە سـەردەمی مـەلیک المعظـم لـە سـاڵی ٦١٩ک/١٢٢٢ز تـەواوی پێکهاتـەی قوتابخانەکـە تـەواوکرا و بـۆ خەرجیەکانیشی گوندەکانی الدریج و رکیس و ینگا وەکو وەقف بۆی تەرخانکرا و لە ڕۆژێکی پرشنگداردا بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە زانا و شەرعناسە دیارەکان لەگەڵ خەڵکێکی زۆر هەموویان بە یەکەوە بەشێوەی بازنەیی لە هەیوانی قوتابخانەکە دانیشتبوون و بەشێوەیەکی فـەرمی لـە لایـەن مـەلیک المعظـم بـە ڕووی قوتـابی و فێرخوازەکانـدا کرایەوە (ابن کثیر، ١٩٨٨، ٨٢/١٣؛ شمیساني، ١٩٨٣، ص١١٥).

بە هەمان شێوە مەلیک الصالح ئیسماعیل کوڕی مەلیک العادل، قوتابخانەیـەکی بنیادنـاوە بـە نـاوی (الصـالحیة) لـە گۆڕسـتانی دایکـی الصـالح لـە دیمەشـق (الذهبي، ٢٠٠٣، ٥٩٣/١٤)، زیـاتر ئـەو بابەتانـەی لـەو قوتابخانەیـەدا دەخـوێنرا بریتـی بـووە لـە زانسـتە شـەرعییەکان و فـەرموودە و قورئـانی پیـرۆز، هـەموو ئەوانـەش لـە لایـەن چەنـد مامۆسـتایەکی بـەتوانا دەگوترانـەوە لـە دیارترینیشـیان نجـم الـدین ابـو العبـاس احمـد بـن محمـد بـن راجـح بـن بـلال بـن عیسـی المقدسـي (م: ٦٣٨ک/١٢٤٠ز) (النعیمـي، ١٩٩٠، ٢٣٩/١-٢٤٠). ئـەوە لـە کاتێکدایـە مـەلیک القاهر ئیسحاق کوڕی مەلیک العادل قوتابخانەیەکی بنیادناوە لە کەناری ڕووباری یەزید لە لای باکوریەوە بە ناوی (القاهریة) لە دیمەشق، زیاتر تایبەت بووە بە شەرعناسەکانی ڕێبازی ئەبو حەنیفە (ابن طولون، ١٩٨٠، ٢٣٤/١-٢٣٥).

هاوکات مەلیک المعظم ڕۆڵێکی کارای هەبووە لە چالاککردنی بزاڤی ڕۆشنبیری، بە تایبەتی لە ڕێگای دروستکردن و بنیادنانی دامەزراوە فێرکاری و زانستیەکان، لەم نێوەندەشدا شوێن دەستی دیارە لە دامەزراندنی چەندین قوتابخانە، ئەوەتا لە ساڵی ٦٠٤ک/١٢٠٧ز هەڵسا بە دامەزراندنی قوتابخانەیەکی زمانەوانی لە شاری قودس، زیاتر بابەتە زمانەوانیەکانی وەکو زمانی عەرەبی و ڕێزمان و ئەدەبی تێدا دەخوێنرا، ئەوە لە کاتێکدا بۆ خەرجیەکانیشی وەقفی پێویستی بۆ تەرخانکردبوو (ابن واصل، ١٩٥٧، ٢١١/٢). جگە لەوەش بۆ زیاتر برەودان بە لایەنی زانستی و چالاککردنی جوولانەوەی هزری لە قودس دووبارە هەڵسا بە بنیادنانی قوتابخانەیەک بە ناوی (الناصرية) لە ساڵی ٦٠٧ک/١٢١٠ز، ئەو ناوەش دەگەڕایەوە بۆ شیخ النصر المقدسی و زیاتر زانستەکانی زمانەوانی و چۆنیەتی خوێندنەوەی قورئانی تێدا دەخوێنرا، لە پاڵ ئەمەش ژمارەیەکی یەکجار زۆر کتێبی لە ڕێگای وەقف بۆ دابینکرد بۆ ئەوەی قوتابی و فێرخوازەکان لە کاتی پێویستدا بۆی بگەڕێنەوە (العليمي، د. ت، ٣٤/٢).

لەلایەکی دیکەش، یەکێک لە کار و چالاکیە هەرە دیارەکانی لەم نێوەندەدا بریتی بوو لە دروستکردنی قوتابخانەیەکی تایبەت بە مەزهەب و ڕێبازی ابوحنیفە بە ناوی (المعظمية) لە دیمەشق، کاتێک لە ساڵی٦٢١ک/١٢٢٤ز کۆتایی بە بنیادنانی هێنا لە گەڕەکی الصالحية لە قەدپاڵی چیای قاسیون نزیک لە قوتابخانەی العزيزية (النعيمي، ١٩٩٠، ٤٢٣/١). بێجگە لەمەش، لە ساڵی ٦١٤ک/١٢١٧ز قوتابخانەیەکی دیکەشی بنیادناوە هەر بە ناوی (المعظمية) لە نزیک مزگەوتی قودسی پیرۆز و تایبەت بووە بە شەرعناسەکانی ڕێبازی ئەبو حەنیفە، هەربۆیە پێشی گوتراوە قوتابخانەی (الحنفية) (العليمي، د. ت، ٢١٨/٢؛ علي، ١٩٨٣، ١٢١/٦).

هاوکات مەلیک العزیز عثمان کوڕی مەلیک العادل، ئەویش لە لایەن خۆیەوە لە ڕێگای دروستکردنی دامەزراوەی فێرکاری خزمەتی بەلایەنی زانستی کردووە، لەم چوارچێوەیەشدا لە ساڵی ٦٣٥ک/١٢٣٧ز هەڵسا بە بنیادنانی قوتابخانەیەک بە ناوی (العزيزية) لە نزیک

قوتابخانەی المعظمیەی گەڕەکی الصالحیة لە دیمەشق (ابن طولون، ١٩٨٠، ٢٠٤/١).

ئەوەی پەیوەستە بەو قوتابخانەیەش زیاتر تایبەت بووە بە ڕێبازی ئەبو حەنیفە، لە بەر ئەوەی خاوەنەکەی تەنیا ڕێگای دەدا بەو مامۆستا و زانایانەی لە قوتابخانەی (المعظمیة) وانە دەڵێنەوە لەوێشدا وانە بڵێنەوە (النعیمي، ١٩٩٠، ٤٢٣/١).

هەرچی مەلیک الاشرف، ئەوا شوێن دەستی دیارە لە خزمەتکردن بە پرۆسەی فێرکردن و بەرەودان بە لایەنی زانستی، لەم چوارچێوەیەشدا قوتابخانە و خانەی تایبەت بە گەڕان و بەدواداچوون بۆ فەرموودەی بنیادناوە، بە تایبەتی خانەی تایبەت بە فەرموودە کە لە ڕووی پرەنسیپ و کارکردنەوە هەمان ڕێکار و ئامادەکاریەکانی قوتابخانەیان بۆ گیراوەتە بەر لە ڕووی بنیادنانی دامەزراوە و فەراهەمکردنی پێداویستیەکانی لە کتێب و شوێنی حەوانەوەی تایبەت بە مامۆستا و قوتابیان، بە شێوەیەک جیاوازیەکی زۆر لە نێوانیاندا نەبووە، تەنیا ئەوە نەبی کە لە ڕووی ڕووبەردا کەمێک بچووکتر بووە لە قوتابخانە، لە بەر ئەوەی وەکو بنکەیەکی زانستیی گرنگ کتێب و دانراوە دیار و بەناوبانگەکانی وەکو صحیح بخاری، صحیح مسلم، ترمذي، نسائي، سنن ابي داود، ابو ماجە تیادا دەخوێنرا (ابن طولون، ١٩٨٠، ١٣٩/١-١٤٠).

لەبەر ڕۆشنایی هەموو ئەمانەش، مەلیک الاشرف دوو خانەی فەرموودەی دروستکردووە، ئەوەتا یەکێکیان دەکەوێتە نزیک دەرگای ڕۆژهەڵاتی قەڵای دیمەشق لە دیمەشق، کە خۆی لە بنەچەدا خانووی یەکێک لە میرەکان بوو بە ناوی حسام الدین قایماز بن عبداللە النجمي و مەلیک الاشرف لە ساڵی ٦٢٨ک/١٢٣٠ز لە بەرامبەر بڕە پارەیەک لێی کڕیەوە و تێکیدا، دواتر هەر لەو شوێنەدا خانەی فەرموودەی بنیادنا ئەوەی ناسراوە بە (دار الحدیث الاشرفیة)، دوا بەدوای ئەوەش گەرماو و خانووەکانی دەوروبەری تێکدا و دووبارە کردیە بەشێک لە

قوتابخانەکە و لە جێگای ئەوان شوێنی حەوانەوەی بنیادنا بۆ ئەو مامۆستایانەی لەوێدا وانەیان دەگوتەوە (ابن کثیر، ١٩٨٨، ٢٩/١٣؛ الاوتاني، ٢٠٠٧، ص٣٩٤)، ئەوە لە کاتێکدایە تقی الدین بن الصلاح الشهرزوري (م: ٦٤٣ک/١٢٤٥ز)، یەکێکە لەو زانا و مامۆستا دیارانەی کە مەلیک الاشرف ئەرکی گوتنەوەی وانەی فەرموودەی پێسپارد لەو قوتابخانەیە (الذهبي، ٢٠٠٣، ٤٥٥/١٤). ئەوەی دیکەشیان دەکەوێتە قەدپاڵی چیای قاسیون لە لێواری ڕووباری یەزید و زیاتر ناسراوە بە (دار الحدیث الاشرفیة البرانیة)، هاوکات شەرعناسی گەورەی سەر بە ڕێبازی حەنبەلی شمس الدین بن ابي عمر محمد بن قدامة المقدسي (م:٦٨٢ک/١٢٨٣ز) دوا بەدوای کردنەوەی خانەکە بە شێوەیەکی فەرمی، یەکەمین کەسە وانەی تێدا گوتۆتەوە (ابن العماد الحنبلي، د.ت، ٣٧٦/٥-٣٧٧).

ئەوەی پەیوەستیشە بە مەلیک الناصر یوسفی دووەم خاوەنداری شام، ئەوا لە سەردەمی ئەودا جۆرێک لە کرانەوە و ئازادی ڕادەربڕین لە ئارادابووە تەنانەت دەمارگیری نەبووە بۆ ڕێبازێکی دیاریکراو، هەموو ئەوانەش کاریگەری و ڕەنگدانەوەی هەبووە لە سەر زۆربوونی قوتابخانە و فێرگەکان لە ناوچەکانی شام، لەم چوارچێوەیەش خۆشی شوێن دەستی دیارە لە هاندان و بنیادنانی قوتابخانەکان، کاتێک هەڵسا بە دانانی بەردی بناغەی قوتابخانەیەک لە ناوەوەی دەرگای الفرادیس بەلای باکوری مزگەوتی ئومەوی لە دیمەشق، پاشان لەساڵی ٦٥٤ک/١٢٥٦ز کۆتایی بە بنیادنانی هێنا و لە کاتی کردنەوەی قوتابخانەکەش بە شێوەیەکی فەرمی، ئەو ڕۆژەی وەکو کەرنەڤاڵێک وابوو کاتێک مەلیک الناصر یوسف و ژمارەیەکی زۆر لە میر و سەرلەشکر و زانا و بیرمەند و گەورە پیاوانی دەوڵەت تیایدا ئامادەبوون (سبط ابن الجوزي، ١٩٥١، ج٨، ق٨٩٣/٢)، لە هەمان کاتدا بۆ دابینکردنی خەرجیەکانی پارەیەکی زۆری تەرخانکرد، بە تایبەتی بۆ وەدەستخستنی کتێبە ناوازەکان بۆ ئەوەی قوتابی و مامۆستاکان لە کاتی پێویستدا بۆی بگەڕێنەوە، هاوکات ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستای

بـە توانـا وانـەیان تیـادا دەگوتـەوە لـە سـەرووی هەمووشـیان دادوەر صـدرالدین احمـد بـن سـناء الدولـة (م:٦٥٨ک/ ١٢٥٩ز)، هـەروەها دادوەر شمس الدین ابن خلکان (م:٦٨١ک/١٢٨٢ز)، هەندێک جـار مـەلیک الناصـر یوسف خۆی لەگەڵ ژمارەیەک لە میر و گەورە پیاوانی دەوڵەت لە کۆڕ و وانەکانیدا ئامادە دەبوون (ابن کثیر، ١٩٨٨، ٢٢٥/١٣).

بێجگە لەمەش، بۆ زیاتر گرنگیدان بە لایەنی زانستی و ڕۆشنبیری، دروسـتکردنی فێرگـەکان بەشـێک بـووە لـە چوارچێـوەی کـار و چالاکیەکانی مەلیک المنصور محمد خاوەنداری حـەماە، لـەم نێوەندەشـدا کاتێک زانای پایەدار سیف الدین الامدي هاتە لای بۆ سوود وەرگرتن لە توانا و بەهرەکانی قوتابخانەیەکی بنیادنا بە ناوی (المنصورية) لە نزیک دەرگای باکوری حەماە کە ناسـراوە بـە بـاب الجسـر، تەنانـەت خۆشـی وەکو قوتابی و فێرخوازەکان زۆر جار بۆ کەڵک وەرگرتن لـە زانسـت و زانیاری دەهاتە کۆڕ و وانەکانی (ابن واصل، ١٩٥٧، ٧٨/٤). بە هەمان شێوە قوتابخانەیـەکی دیکەشـی لـە قـەراخی شـاری حـەماە بنیادنـا و لـە تـەکیا گۆڕی مەلیک المظفر تقی الدین عمر بووە لە دوای مردنی لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات لەوێدا بە خاک سپێردراوە (ابن خلکان، ١٩٩٠، ٤٥٨/٣).

لە لایەکی دیکـەش مـەلیک المظفر محمـودی دووەم قوتابخانەیـەکی بنیادنـاوە لـە نزیـک مزگـەوتی (الجـامع الاعلـی) کـە زیـاتر ناسـراوە بـە مزگەوتی گـەورە لـە حـەماە (ابـو الفداء، ١٩٩٩، ٢١٠/٣؛ سبانو، ١٩٨٤، ص١٨١). هـەر چەنـدە زانیاریـەکی ئـەوتۆ لەبـەر دەسـتدا نییـە کـەوا چ جـۆرە زانسـتێکی تێدا خـوێنراوە، بـەڵام ڕەنگـە وەکـو زۆربـەی قوتابخانـەکانی دیکە زانستە ئایینییەکانی تێدا خوێنرابێ لەگەڵ زانستەکانی دیکەی وەک ئەندازە و فەلەکناسی، لە بەر ئەوەی ناوبراو خـۆی مـەیلی زۆری بـەلای ئەو جۆرە زانستانە هەبووە.

بە هەمان شێوە مەلیک المجاهد شێرکۆی دووەم وەکو زۆرێک لـە مەلیکـەکانی دیکـە هەوڵیـداوە لـە ڕێگـای بنیادنـانی دامـەزراوەی تایبـەت خزمـەت بەلایـەنی زانسـتی بکـات، لـەم نێوەندەشـدا قوتابخانەیـەکی بنیـاد

ناوە لە حمص، بەڵام هیچ جۆرە زانیاریەک لە بارەیەوە بەردەست نییە ئاخۆ چ جۆرە زانستێکی تێدا خوێنراوە و کام لە مامۆستاکان وانەیان تێدا گوتۆتەوە (الیونيني، ١٩٩٢، ٣١٣/٢-٣١٤)، بەڵام لێرەدا بە لەبەر چاوگرتنی کەسێتی مەلیک المجاهد کەوا کەسێکی خواناس و بەردەوام پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەبووە لەگەڵ زانایان و شەرعناسان، ئەوا دەکرێت بوترێت لە نێو ئەو قوتابخانەیە زیاتر بایەخی داوە بە خوێندنی زانستە شەرعییە ئایینییەکان.

دوا بەدوای هەموو ئەوانەی کە خراوەتە ڕوو، ماوەتەوە بگوترێت لە نێو خانەوادەی ئەیوبیەکان نەک تەنها هەر مەلیک و دەسەڵاتداران ڕۆڵیان هەبووە لە بنیادنانی فێرگە و قوتابخانەکان، بەڵکو ژن و ئافرەتە دیارەکانی نێو ئەو ماڵباتەش، بە تایبەتی کەسە نزیکەکانیان لە دایک و خێزان و کچی مەلیکەکان شان بە شانی پیاوەکان لە پارە و خەرجیی تایبەتی خۆیان شوێن دەستیان دیارە لە بنیادنانی ژمارەیەکی زۆر لە قوتابخانەکان، بە ئامانجی خزمەتکردنی زیاتر بە پرۆسەی خوێندن و گەشەسەندنی لایەنی زانستی، بۆ ئەو مەبەستەش هەموو کار ئاسانییێکیان دەکرد بۆ قوتابی و فێرخوازەکان لە فەراهەمکردنی شوێنی حەوانەوە و دابینکردنی کتێب و لەئەستۆگرتنی تێچوو خەرجیەکان و هێنانە کایەی ژیانێکی شایستە بۆیان، هەموو ئەوانەش وایکردبوو لە زۆربەی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی ڕوو لەو قوتابخانانە بکەن بۆ ئەوەی لەسەر دەستی مامۆستا و زاناکانیان فێری زانست و زانیاری ببن (سلطان و احمد، ٢٠٠٨، ١٩٧/٧-٢١٠).

**کۆتایی:**

دوای بەجێگەیاندنی ئەو توێژینەوەیە گەیشتین بەو دەرئەنجامانەی خوارەوە:

١_ بۆمان بەدیار دەکەوێت مەلیکەکانی ئەیوبی وەک بنەماڵەیەکی خانەدان و دیاری کوردی نێو قۆناغەکانی مێژووی ئیسلام، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە جۆشدراون بە زانست و زانیارییەکان، بەتایبەتی زانستە ئایینییەکان لەسەر دەستی باشترین مامۆستاکانی سەردەم، ئەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە ماڵباتی ئەیوبیەکان وەکو یەکێک لە بنەماڵە دیارەکانی نێو مێژووی ئیسلام پەرۆش بوونە بۆ پەروەردە و پێگەیاندنی نەوەکانیان بۆ ئەوەی بە زانست و زانیاریەکانی سەردەم ڕۆشنبیریان بکەن.

٢_ وێڕای خەریکبوونیان بەلایەنی ڕامیاری و سەربازی، لە هەمان کاتدا لایەنی زانستیشیان پشتگوێ نەخستووە و بگرە لەوەش زیاتر بەشێکی زۆر لە مەلیکەکانی ئەیوبی کەسانی زانا و ئەدیب و هۆنراوەبێژ بوونە.

٣_ هەندێک لە مەلیکەکانی ئەیوبی لە ئاستێکی بەرزی ڕۆشنبیریدا بوون، بە جۆرێک دەیانتوانی گفتوگۆ و دیبەیت و ڕاگۆڕینەوە بکەن لەگەڵ زانا دیارەکانی سەردەمی خۆیان، بە تایبەتی مەلیک المعظم یەکێک بووە لە پایە بەرز و زانا هەرە دیارەکانی ماڵباتی ئەیوبی لە بواری شەرعناسی و زمانەوانی.

٤_ بەدەگمەن لە نێو مەلیکەکانی ئەیوبیی وڵاتی شام بەرچاو دەکەوێت مەیلی بەلای هۆنراوە و ئەدەب نەچووبێ، تەنانەت هەندێکیان هۆزانڤانی لێوەشاوە و دیوانی تایبەت بە خۆیان هەبووە هەروەک مەلیک الامجد بهرام شاه خاوەنداری بەعلبەگ لەگەڵ مەلیک الناصر داود خاوەنداری کەرک.

٥_ بەوپێیەی ماڵباتی ئەیوبی بنەماڵەیەکی ڕەسەنی کوردین دوای کۆچکردنیان لە زێدی باوباپیرانیان لە دوینەوە بۆ ناوچەکانی شام و

مصر پابەند بوونە بە هەندێ لە داب و نەریتی کوردانەی خۆیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی فەرهەنگ و نەریت و زمان و ڕۆشنبیریی ئەو ناوچانەی ڕوویان تێکردوون، هەربۆیە لێرەدا تێبینی ئەوە لەگەڵ ئەو حەز و خولیا زۆرەیان بۆ ئەدەب و هۆنراوە، بەڵام لە نێو پەڕاوی سەرچاوەکاندا هیچ ئاماژەیەک بەوە ناکرێت بە زمانی شیرینی کوردی باو و باپیرانیان شیعریان هۆنیبێ و لە نێو دیوانەکانیان تۆماریانکردبێ.

٦_ بۆمان ڕووندەبێتەوە هەندێک لە مەلیکەکانی ئەیوبی لە پاڵ زانستە ئایینی و شەرعییەکان، مەیلیان بەلای زانستە نەقلییەکان چووە بە تایبەت مەلیک المعظم و مەلیک الناصر یوسف کوڕی مەلیک العزیز محمد و مەلیک الناصر داود، ئەوە لە کاتێکدایە بەشێکیان لە ژێر کاریگەریی بیرۆکەی ئایین و شەرعزانەکانی دەوروبەریان رقیان لە فەیلەسوف و ئەو کەسانە بووە کە خەریک بوون بەو بوارە وەک مەلیک الاشرف و مەلیک الکامل.

٧_ بەوپێیەی خۆیان کەسانی ڕۆشنبیر بوون، هەربۆیە زانست دۆست و قەڵەم بەدەستانیان زۆر خۆشدەویست و لە خۆیان نزیک دەکردنەوە، بەمەش کۆشک و دەرباریان بەردەوام جمەی هاتووە لە زانا و ئەدیب و پیتۆڵ و ڕۆشنبیران، تەنانەت هەندێکیان ژمارەی زانا و ئەدیب و ڕۆشنبیریان زۆرتر بووە لە ژمارەی میر و فەرماندە و سەرلەشکرەکانیان، هەروەک مەلیک المنصور محمد خاوەنداری حەماە بەردەوام نزیکەی دوو سەد زانا و ئەدیب و ڕۆشنبیر و فەیلەسوف لە تەکیەوە بوون.

٨_ بەشێکی زۆر لە مەلیکەکانی ئەیوبی بۆ پێشخستنی لایەنی زانستی و ڕۆشنگەری گرنگی و بایەخی زۆریانداوە بە بنیادنانی دامەزراوە فێرکاریەکان لە ڕێگای دابینکردنی سەرجەم پێداویستیەکان، ئەوەش وایکردبوو بەشێک لە شارەکانی شام وەکو دیمەشق و حەڵەب و حەماە ببنە ڕووگە و لانەی ئەو کەسانەی بە دوای زانست و زانیارییەوە وێڵ بوون.

**پەراوێزەکان:**

[1] روح العـــارفين: ئـــەو كتێبـــە پێكهـــاتبوو لـــە حـــەفتا فـــەرموودەی پێغەمبەر(د.خ)، خەلیفە لە فەرموودە گێڕەوە باوەڕپێکراوەکان وەریگرتبوو تیایدا تۆمـاریکردبوو، ئـەوەش دوا بـەدوای ئـەوەی خـۆی خـەریککرد بـە کۆکردنـەوە و گێڕانـەوەی فـەرمووده، پاشـان داوایکـرد ئـەو کتێبـە لـە زۆربەی وڵات و هەرێمەکان دابەش بکرێت بۆ ئەوەی هەموو لایەک لە نزیکەوە پێیەوە ئاشنا بن و بیخوێننەوە (ابن واصل، ١٩٥٧، ٢٢٨/٣–٢٣٣).

[2] زانستە عەقڵییەکان: ئەو جۆرە زانستانەن کە مرۆڤ هەڵیهێنجاون بە عەقڵ و ژیریی خۆی، دواتریش پەرەی پێداوە و بە شێوەیەکی کردارەکی کاری پێکـردوون، دیـارە بەشـێکی زۆر لـەو زانسـتەش بـە هـۆی وەرگێڕانـەوە گوازراوەتەوە بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی، بە تایبەتی وەرگێڕانی کتێبی یۆنانی و هیندیـــەکان لـــە بوارەکـــانی: پزیشـــکی، بیرکـــاری، ئەستێرەناســـی، گەردوونناسی، فەلسەفە و لۆژیک، ... هتد. (الغزالي، د.ت، ١٦/١؛ الخطيب، ٢٠٠٧، ص ص ١٩٦–٢٣٨).

[3] شهاب الدين السهروردي: شهاب الدين يحيى کوڕی محمد کوڕی حبش، لە ساڵی ٥٤٩ک/١١٥٤ز لە سهرەوەردی نزیک هەمەدان لە دایک بووە، فەلســەفە و بنـەماکانی فقهـی لـە لای زانـا دیارەکـانی شـاری مەراغـە خوێندووە لە پاڵ ئەوەش علم الكلام و لۆژیکی خوێندووە، دواتر لەو بوارانەدا بووە بە بیرمەندێکی لێهاتوو لە دوای خۆی چەندین بەرهەمی جێهێشتووە، لەوانە: التلويحان في الحكمة، حكمة الاشراق، هياكل النور، التنقيحات، اللمحات، المحارج و چەندانی دیکە، لە ساڵی ٦٨٧ک/١١٩١ دەستبەسـەر کرا، پاشـان لـە زیندانـدا کۆتـایی بـە ژیـانی هـات. (ابن ابي اصيبعة، د.ت، ص ص٦٤١–٦٤٤؛ اليافعي، ١٩٩٧، ٣٢٩/٣).

[4] سيف الدين الامدي: ابوالحسن عەلی کوڕی عەلی کوڕی محمد، لە ساڵی ٥٥١ک /١١٥٦ لە دایک بووە، چەندین شوێن گەڕاوە وەکو بغداد، شام، مصر، خاوەنی چەندین بەرهەمی دانسقە و ناوازەیە لە بارەی فەلسەفە و لۆژیک، لەوانە (لباب الالباب في المنطق)، (ماخذ على المحصول)، (شرح الجدل الشـريف)، (أبكـار الافكـار)، دواجـار لـە سـاڵی ٦٣١ک/١٢٣٣ز لـە دیمەشـق کـۆچی دوایـی کـرد. (ابـن خلكـان، ١٩٠٠ ٢٩٣/٣_٢٩٤؛ المدرس، ١٩٨٣، ص ص٣٨٢–٣٨٤).

(٥) علـم الهیئـة: زانسـتی فەلەکناسـی، ئـەو جـۆرە زانسـتەیە کـە دەڕوانێتـە جوولـەی هەسـارە گـەڕۆک و جێگیرەکـان، هاوکـات شـێوە و دووری و نزیکییـان لـە یـەکتر نیشـان دەدات بـە مەبەسـتی دیاریکردنی کـات. طـاش کبری زادە، ١٩٥٤)، ٣٤٨/١؛ ماجد، ١٩٧٢، ص ص٢٢٤-٢٢٩).

(٦) المجسـطي: ئـەو کتێبـە لـە لایـەن زانـای یۆنـانی بـەناوبانگ بطلیمـوس نووسراوە کە پێکهاتووە لە سیانزە وتار و تیایدا باس لە زانستی شێوە ناسی و جوولەی هەسارەکان دەکات، بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە گەردوونەوە هەیە. (ابن الندیم، ١٩٩٧)؛ القفطي،٢٠٠٥، ص ص٧٨-٧٩).

(٧) السیمیاء: ئەو جۆرە زانستەیە کە بەدواداچوون دەکات بۆ ئەو شتانەی کە لە دەرگای هەست دەدەن و دوورن لە واقیع، وەکو سیحر و جادوو شـتی خـەیاڵی و ئەفسـووناوی، بێگومـان ئـەو شـتانەش هـەموو کەسێک نـایزانێ تـەنیا ئەوانـەی لـە نێویـدا قـاو بوونەتـەوە. (حـاجی خلیفـە، ١٩٤١، ١٠٢١/٢).

(٨) قوتابخانەکان: هەڵبەتە مەسەلەی بوونی قوتابخانە و فێرگە زانستیەکان لە جیهـانی ئیسـلامی مێژوویـەکی زۆر لـەوە لەپێشـتری هەیـە، هەرچەنـدە سەرچاوە مێژووییەکان باس لەوە دەکەن وەزیری سەلجوقی نظام الملک (م: ٤٨٥ک/١٠٩٢ز) یەکـەمین کـەس بـووە قوتابخانـەی دامەزرانـدووە بـە شـێوەیەکی ڕێکخـراو لـە جیهـانی ئیسـلامی. (ابـن خلکـان، ١٩٩٠، ١٢٨/٢-١٢٩؛ الصفدي، ٢٠٠٠، ٧٧/١٢). بەڵام بەڵگە و ئاماژەی دیکە هەن گەواهی ئەوە دەدەن بەر لە لەدایکبوونی نظام الملک قوتابخانە بوونی هەبووە لە ناوچەکانی ڕۆژهـەڵاتی ئیسلامی بە تایبـەتی لـە خوراسـان و وڵاتـی ئـەو دیـوی ڕووبـار (مـا وراء النهـر)، لـەم نێوەندەشـدا زیـاتر لـە قوتابخانەیـەک بـوونی هـەبووە لـە شـاری نیسـابور، لـە دیارترینیـان قوتابخانـەی (البهقیهة)و(السـعدیة) لەگـەڵ چەنـدانی دیکـەش. (السـبکي، ١٩٩٢، ٣١٤/٤؛ المقریزي، ١٤١٨هـ ١٩٩/٤).

**لیستی سەرچاوەکان**

**یەکەم/ سەرچاوە ڕەسەنەکان**

_ ابــن الاثيــر: ابــو الحســن عزالــدين بــن علــي الشــيباني الجــزري (ت: ٦٣٠هـ/١٢٣٢م)
١_ الكامل في التاريخ، تحقيق: عمر عبدالسلام تدمري، دار الكتاب العربي، ط١ (بيروت، ١٩٩٧).
_ ابن ابي اصيبعة: موفق الدين احمد بن القاسم (ت: ٦٦٨هـ/١٢٦٩م)
٢ _ عيون الانباء في طبقات الاطباء، تحقيق: نزار رضا، مكتبة الحياة، ( بيروت، د. ت).
_ البصري: علي بن ابي الفرج بن الحسن (ت: ٦٥٩هـ/١٢٦٠م)
٣_ الحماسة البصرية، تحقيق: مختارالدين احمد، مطبعة عالم الكتب، (بيروت، د. ت).
_ ابن تغري بردي: جمال الدين ابو المحاسن يوسف (ت: ٨٧٤هـ/١٤٦٩م)
٤ _ النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، وزارة الثقافة والارشاد القومي، (مصر، د. ت).
_ ابن الجزري: شمس الدين محمد بن محمد بن يوسف (ت: ٨٣٣هـ/ ١٤٢٩م)
٥_ غاية النهاية في طبقات القراء، مكتبة ابن تيمية، (د.م، ١٩٣٢).
_ الجياني: جمال الدين محمد بن عبدالله بن مالک (ت: ٦٧٢هـ/١٢٧٣م)
٦_ إيجاز التعريف في علم التصريف، محمد المهدي عبدالحي عمار سالم، ط١ (المدينة المنورة، ٢٠٠٢).
_ حاجي خليفة: مصطفى بن عبدالله الرومي (ت: ١٠٦٧هـ/ ١٦٥٦م)
٧_ كشف الظنون عن اسامي الكتب والفنون، مكتبة المثنى، ( بغداد، ١٩٤١).
_ الحسيني: عبدالرزاق كمونة (ت: ٦٤٤هـ/ ١٢٣٦م)
٨_ منية الراغبين في طبقات النسابين، مطبعة النعمان، ط ١ (النجف، ١٩٧٢).
_ الحنبلي: احمد بن ابراهيم (ت: ٨٧٦هـ/١٤٧١)
٩ _ شفاء القلوب في مناقب بني ايوب، تحقيق: ناظم رشيد، دار الحرية للطباعة، ( بغداد، ١٩٧٨).
_ ابن خلكان: ابو العباس شمس الدين احمد بن محمد (ت: ٦٨١هـ/١٢٨٢م)

١٠ _ وفيات الاعيان وانباء ابناء الزمان، تحقيق: احسان عباس، ج١-٣، ١٩٩٠، ج٤ ١٩٧١ دار صادر، (بيروت، ١٩٩٤).
_ ابن دحية الاندلسي: ابو الخطاب عمر بن حسن (ت: ٦٣٣هـ/ ١٢٣٥م)
١١_المطرب من اشعار اهل المغرب، ابراهيم الابياري وآخرون، دار العلم، (بيروت، ١٩٥٥).
_ الدواداري: ابوبكر بن عبدالله بن ايبک (ت: ٧٣٦هـ/١٣٦٣م)
١٢_ كنز الدرر وجامع الغرر (الدر المطلوب في اخبار بني ايوب)، تحقيق: سعيد عبدالفتاح عاشور، دار احياء الكتب العربية، (القاهرة ، ١٩٧٢).
_ الذهبي: شمس الدين محمد بن احمد عثمان (ت: ٧٤٨هـ/١٣٤٧م)
١٣ _ تأريخ الاسلام ووفيات المشاهير والاعلام، تحقيق: بشار عواد معروف، دار الغرب الاسلامي، ط ١ (بيروت، ٢٠٠٣).
١٤_ سير اعلام النبلاء، دار الحديث، (القاهرة، ٢٠٠٦).
١٥_ معرفة القراء الكبار على الطبقات والاعصار، (القاهرة،١٩٩٧).
_ زين الدين الحنبلي: عبدالرحمن بن احمد بن رجب (ت: ٧٩٥هـ/١٣٤٢م).
١٦_ ذيل طبقات الحنابلة، تحقيق: عبدالرحمن بن سليمان، مكتبة العبيكان، ط١ (الرياض، ٢٠٠٥).
_ سبط ابن الجوزي: شمس الدين يوسف بن قزاوغلي (ت: ٦٥٤هـ/١٢٥٦م).
١٧ _ مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، مطبعة دائرة المعارف العثمانية، (حيدر اباد، ١٩٥١).
_ السبكي: تاج الدين عبدالوهاب بن علي ( ت:٧٧١هـ/١٣٦٩م)
١٨_ طبقات الشافعية الكبرى، تحقيق: محمود محمد الطناحي و عبدالفتاح محمد الحلو، ط ٢ (القاهرة، ١٩٩٢).
_ السيوطي: جلال الدين عبدالرحمن بن ابي بكر (ت:٩١١هـ/١٥٠٥م).
١٩_ حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، تحقيق: محمد ابوالفضل ابراهيم، دار احياء الكتب العربية، ط ١(مصر،١٩٦٧).
_ ابو شامة: شهاب الدين عبدالرحمن بن اسماعيل المقدسي (ت: ٦٦٥هـ/١٢٦٦م)

٢٠_ تراجم رجال القرنين السادس والسابع المعروف بالذيل على الروضتين، وضع حواشيه وعلق عليه: ابراهيم شمس الدين، دار الكتب العلمية، ط ١ (بيروت، ٢٠٠٢).
٢١_ الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، تحقيق: ابراهيم الزيبق، مؤسسة الرسالة، (بيروت، ١٩٩٧).
_ ابن شداد: بهاءالدين يوسف بن رافع ( ت: ٦٣٢هـ/١٢٣٤م)
٢٢ _ النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية او سيرة السلطان الناصر صلاح الدين الايوبي، تحقيق: احمد ايبش، (دمشق، ٢٠٠٥).
_ ابن شداد: عزالدين محمد بن علي بن ابراهيم (ت: ٦٨٤هـ/١٢٨٥م)
٢٣ _ الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة ، تحقيق : يحيى زكريا عبارة، منشورات وزارة الثقافة والارشاد القومي، ط ١ (دمشق، ١٩٨٧).
_ ابن الشعار: كمال الدين ابي البركات المبارك بن الشعار الموصلي (ت:٦٥٤هـ/١٢٥٦م)
٢٤ _ قلائد الجمان في فرائد شعراء هذا الزمان المشهور بـ عقود الجمان في شعراء هذا الزمان، تحقيق: كامل سلمان الجبوري، دار الكتب العلمية، ط ١ (بيروت، ٢٠٠٥).
_ الصفدي: صلاح الدين خليل بن ايبك ( ت: ٧٦٤هـ/١٣٦٣)
٢٥_ تحفة ذوي الالباب فيمن حكم بدمشق من الخلفاء والملوك والنواب، تحقيق: احسان بنت سعيد خلوصي وزهير حميدان الصمصام، دار احياء التراث العربي، (دمشق، ١٩٩٢).
٢٦ _ الوافي بالوفيات، تحقيق: احمد الارناؤوط وتركي مصطفى، دار احياء التراث، (بيروت، ٢٠٠٠).
_ طاش كبرى زادة: احمد بن مصطفي (٩٦٨هـ/١٥٦٦م)
٢٧_ مفتاح السعادة ومصباع السيادة في موضوعات العلوم، دار الكتب العلمية، ط ١ (بيروت، ١٩٥٤).
_ ابن الطقطقي: محمد بن علي بن طبا طبا (ت: ٧٠٩هـ/١٣٠٩م).
٢٨_ الفخري في آداب السلطانية والدول الاسلامية، تحقيق: عبدالقادر محمد مايو، دار القلم العربي، (بيروت، ١٩٩٧).
_ ابن طولون: شمس الدين محمد بن طولون الدمشقي ( ت: ٩٥٣هـ/١٥٤٦م)

٢٩_ القلائد الجوهرية في تاريخ الصالحية، تحقيق: محمد أحمد دهمان، مطبوعات مجمع اللغة العربية، (دمشق، ١٩٨٠).
_ ابن ظافر الازدي: علي بن ظافر بن الحسين (ت: ٦١٣هـ/١٢١٦م).
٣٠_ بدائع البدائه، (مصر، ١٨٦١).
_ ابن العجمي: احمد بن ابراهيم بن محمد بن خليل (ت: ٨٨٤هـ/١٤٨٠).
٣١_ كنوز الذهب في تاريخ حلب، دار القلم، (حلب، ١٩٩٦).
_ العليمي: مجيرالدين عبدالرحمن محمد بن عبدالرحمن (ت: ٩٢٨هـ/١٢٥١م)
٣٢_ الانس الجليل بتاريخ القدس والخليل، تحقيق: عدنان يونس عبدالمجيد نباتة، مكتبة دنديس، (عمان، د.ت).
_ ابن العماد الحنبلي: ابو الفلاح عبدالحي بن احمد (ت: ١٠٨٩هـ/١٦٧٨م)
٣٣_ شذرات الذهب في اخبار من ذهب، دار الكتب العلمية، (بيروت، د.ت).
_ الغزالي: ابو حامد محمد بن محمد (ت: ٥٠٥هـ/١١١١م)
٣٤_ احياء علوم الدين، دار الكتب العلمية، (بيروت، د.ت).
_ ابو الفداء: الملك المؤيد عمادالدين اسماعيل بن محمد (ت: ٧٣٢هـ/١٣٢١م)
٣٥ _ المختصر في اخبار البشر، تحقيق: محمد زينهم عرب و يحيى سيد حسين، تقديم : حسين مؤنس، دار المعارف، (القاهرة، ١٩٩٩).
_ الفردوسي: ابو القاسم الفردوسي (ت: توفي بعد ٤٠٠هـ/ ١٠٠٩م)
٣٦_ الشاهنامة، الترجمة: الفتح بن علي البنداري، تحقيق وتقديم: عبدالوهاب عزام، دار الكتب المصرية، (القاهرة، ١٩٣٢).
_ ابن قاضي شهبة: ابوبكر بن احمد بن محمد بن عمر ( ت:٨٥١هـ/١٤٤٧م)
٣٧_ طبقات الشافعية، تحقيق: الحافظ عبدالحليم خان، دار عالم الكتب، ط ١ (بيروت، ١٤٠٧هـ).
_ القرشي: عبدالقادر بن محمد بن نصرالله (ت: ٧٧٥هـ/١٣٦٤م)
٣٨_ الجواهر المضية في طبقات الحنفية، (كراتشي، د. ت).
_ ابن قطلوبغا: زين الدين القاسم بن قطلوبغا السودوني (ت:٨٧٩هـ/١٤٧٦م)
٣٩_ تاج التراجم، تحقيق: محمد خيري رمضان يوسف، دار القلم للطباعة والنشر، ( دمشق، ١٩٩٢).
_ القفطي: جمال الدين ابو الحسن علي بن يوسف (ت: ٦٤٦هـ/١٢٤٨م)

٤٠ _ انباء الرواة على انباء النحاة، تحقيق: محمد ابو الفضل ابراهيم، مؤسسة الكتب الثقافية، (بيروت، ١٩٨٢).
٤١_ اخبار العلماء باخبار الحكماء، تحقيق: ابراهيم شمس الدين، دار الكتب العلمية، (بيروت، ٢٠٠٥).
_ القيرواني: ابو علي حسن بن رشيق (ت: ٤٦٣هـ/١٠٧٠م)
٤٢_ العمدة في محاسن الشعر وآدابه، تحقيق: محمد محي الدين عبدالحميد، دار الجيل، (بيروت، ١٩٨١).
الكتبي: محمد بن شاكر بن احمد (ت: ٧٦٤هـ/١٣٦٣م)
٤٣ _ عيون التواريخ ، تحقيق: فيصل السامر ونبيلة عبدالمنعم، دار الحرية للطباعة، (بغداد، ١٩٨٠).
٤٤_ فوات الوفيات، تحقيق: احسان عباس، دار صادر، (بيروت، ١٩٧٤).
_ ابن كثير: ابو الفداء اسماعيل بن عمر (ت: ٧٧٤هـ/١٣٧٣م)
٤٥ _ البداية والنهاية ، تحقيق: علي شيري، دار احياء التراث العربي، (بيروت، ١٩٨٨).
٤٦_ طبقات الشافعيين، تحقيق: احمد عمر هاشم و محمد زينهم محمد عزب، مكتبة الثقافة الدينية، ( د. م، ١٩٩٣).
_ المقري: شهاب الدين احمد بن محمد (ت: ١٠٤١هـ/١٦٣١م)
٤٧_ نفخ الطيب من غصن الاندلس الرطيب، تحقيق: احسان عباس، دار صادر، (بيروت، ١٩٩٧).
_ المقريزي: تقي الدين ابي العباس احمد بن علي (ت: ٨٤٥هـ/١٤٤١م)
٤٨_ المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والاثار المعروف بالخطط المقريزية، دار الكتب العلمية، (بيروت، ١٤١٨هـ).
_ الملک الامجد: مجدالدين بهرام شاه الايوبي (ت: ٦٢٨هـ/١٢٣٠م)
٤٩_ ديوان الملک الامجد، تحقيق: ناظم رشيد، وزارة الاوقاف والشؤون الدينية، (موصل، ١٩٨٣).
_ الملک الناصر داود: داود بن عيسى الايوبي (ت: ٦٥٦هـ/١٢٥٨م)
٥٠ _ الفوائد الجلية في الفرائد الناصرية (رسائله وشعره)، تحقيق: ناظم رشيد، دار الشؤون الثقافية العامة، (بغداد، ١٩٩٢).

_ الملك المنصور: ناصرالدين محمد بن الملك المظفر تقي الدين عمر (ت:٦١٧هـ/١٢٢٠م)
٥١_ اخبار الملوك ونزهة المالك والمملوك في طبقات الشعراء، تحقيق: ناظم رشيد، دار الشؤون الثقافية العامة، (بغداد، ٢٠٠١).
_ المنذري: زكي الدين عبدالعظيم بن عبدالقوي بن عبدالله (ت: ٦٥٦هـ/١٢٥٨م)
٥٢_ التكملة لوفيات النقلة، حققه وعلق عليه: بشار عواد معروف، مؤسسة الرسالة، ط ٣ (بيروت، ١٩٨٤).
مؤلف مجهول: ( توفي بعد ٦٥٥هـ/١٢٥٧م)
٥٣ _ تاريخ دولة الاكراد والاتراك (تاريخ دولة الاكراد)، دراسة و تحقيق: موسى مصطفى الهسنياني، منشورات جامعة دهوك، ط ١ (دهوك، ٢٠١٠).
_ ابن النديم: ابو الفرج محمد بن ابي يعقوب (ت: ٤٣٨هـ/١٠٤٧م)
٥٤_ الفهرست، تحقيق: ابراهيم رمضان، دار المعرفة، (بيروت، ١٩٩٧).
_ النعيمي: عبدالقادر بن محمد الدمشقي (ت:٩٢٧هـ/١٥٢٠م)
٥٥_ الدارس في تأريخ المدارس، اعد فهارسه: ابراهيم شمس الدين، دار الكتب العلمية، (بيروت، ١٩٩٠).
_ ابن نقطة: محمد بن عبدالغني بن ابي بكر بن شجاع (ت: ٦٢٩هـ/١٢٣١م)
٥٦_ اكمال الاكمال ( تكملة لكتاب الاكمال لابن ماكولا)، تحقيق: عبدالقيوم عبد ريب النبي، جامعة أم القرى، (مكة المكرمة، ١٤١٠هـ).
_ ابن واصل: جمال الدين محمد بن سالم (ت: ٦٩٧هـ/١٢٩٧م)
٥٧_ مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، ج١_٣، تحقيق: جمال الدين الشيال، ج ٤_٥، تحقيق: محمد حسنين ربيع وسعيد عبدالفتاح عاشور مطبعة الاميرية، ( القاهرة ، ١٩٥٧).
_ اليافعي: ابو محمد عبدالله بن أسعد بن علي (ت: ٧٦٨هـ/١٣٦٦م)
٥٨_ مرآة الجنان و عبرة اليقظان في معرفة ما يعتبر من حوادث الزمان، وضع حواشيه: خليل المنصور، دار الكتب العلمية، (بيروت، ١٩٩٧).
_ ياقوت الحموي: شهاب الدين عبدالله الرومي (ت: ٦٢٦هـ/١٢٢٩م)
٥٩_ معجم الادباء (ارشاد الاريب الى معرفة الاديب)، تحقيق: احسان عباس، دار الغرب الاسلامي، (بيروت، ١٩٩٣).
_ اليونيني: قطب الدين موسى بن محمد (ت: ٧٢٦هـ/١٣٢٦م)
٦٠ _ ذيل مرآة الزمان، دار الكتب الاسلامي، ط ٢ (القاهرة، ١٩٩٢م).

**دووەم/ ژێدەرەکان**

_ الاتروشي: شوكت عارف
٦١_ الحياة الفكرية في مصر خلال العصر الايوبي، (عمان، ٢٠٠٧).
_ احمد: عبدالقادر
٦٢_ منادمة الاطلال ومسامرة الخيال، تحقيق: زهير الشاويش، المكتب الاسلامي، (بيروت، ١٩٨٥).
_ الاوتاني: احمد محمد
٦٣_ دمشق في العصر الايوبي (٥٧٠-٦٥٨هـ/١١٧٤-١٢٦٠م)، تقديم: سهيل زكار، مطبعة التكوين ، ط ١ (دمشق، ٢٠٠٧).
_ بدوي: احمد احمد
٦٤_ الحياة الادبية في عصر الحروب الصليبية بمصر والشام، دار نهضة مصر، ط ٢ (القاهرة، ١٩٧٩).
٦٥_ الحياة العقلية في عصر الحروب الصليبية بمصر والشام، دار نهضة مصر للطباعة والنشر، ( القاهرة، ١٩٧٢).
_ بروكلمان: كارل
٦٦_ تاريخ الادب العربي، ترجمة: عبدالحليم النجار، (القاهرة، ١٩٧٧).
_ الحلبي: محمد راغب الطباخ
٦٧_ اعلام النبلاء بتاريخ حلب الشهباء، تحقيق: محمد كمال، دار القلم العربي، (حلب، ١٩٨٨).
_ حمزة: عبداللطيف
٦٨_ الحركة الفكرية في مصر في العصرين الايوبي والمملوكي الاول، دار الفكر العربي، ( القاهرة، ١٩٤٧).
_ الخطيب: محمد
٦٩_ تاريخ الحضارة العربية، منشورات دار علاءالدين، ط ١ (دمشق، ٢٠٠٧).
_ رمضان: احمد
٧٠_ المجتمع الاسلامي في بلاد الشام في عصر الحروب الصليبية، (القاهرة، ١٩٧٧).
_ سبانو: احمد غسان
٧١_ مملكة حماه الايوبية، دار قتيبة، (دمشق، ١٩٨٤).

_ شميساني: حسن
٧٢_ مدارس دمشق في العصر الايوبي، (بيروت، ١٩٨٣).
_ علي: محمد كرد
٧٣_ خطط الشام، مكتبة النوري، (دمشق، ١٩٨٣).
_ الغزي: كامل
٧٤_ نهر الذهب في تأريخ حلب، دار القلم، (حلب، ١٤١٩هـ).
_ الكروي و شرف الدين: ابراهيم سلمان و عبدالتواب
٧٥_ المرجع في الحضارة العربية الاسلامية، منشورات دار ذات السلاسل، ط٢ (الكويت، ١٩٨٧).
_ ماجد: عبدالمنعم
٧٦_ تاريخ الحضارة الاسلامية في العصور الوسطى، (القاهرة، ١٩٧٢).
_ المدرس: عبدالكريم محمد
٧٧_ علماؤنا في خدمة العلم والدين، عني بنشره: محمد علي القرداغي، ( بغداد، ١٩٨٣).
_ مصطفى: شاكر
٧٨_ التاريخ العربي والمؤرخون، ( بيروت، د. ت).
_ الهسنياني: صالح شيخو
٧٩_ علماء الكورد وكوردستان ( ق١_١٤هـ/٧_٢٠م)، مطبعة هاوار، (دهوک، ٢٠١٢).

**سێیەم/ گۆڤارەكان**

_ جواد: مصطفى
٨٠_ أغزل شعراء الكرد في العربية الملک الامجد بهرام شاه، مجلة الكتاب، العدد/٢، (بغداد، ١٩٥٨).
_ سلطان و احمد: طارق فتحي و رضا احمد
٨١_ مدارس الخاتونات والاميرات الايوبيات في بلاد الشام في العصر الايوبي (٥٧٠-٦٥٨هـ/١١٦١-١٢٦٠م)، مجلة ابحاث كلية التربية الاساسية، العدد/٤، (الموصل، ٢٠٠٨).

# ملخص البحث

## المستوى الثقافي للملوك الأيوبين ودورهم وموقعهم في انشاء المؤسسات التعليمية في بلاد الشام (٥٨٩-٦٥٨هـ/ ١١٩٣-١٢٦٠م)

**أ.د. ئاكو برهان محمد** **م.م. محسن مامل محمد**

قسم التاريخ – كلية الاداب – جامعة صلاح الدين

تطرق البحث إلى إعطاء صورة شاملة عن المستوى الثقافي لملوك الأيوبيين ودورهم في بناء المؤسسات التعليمية في بلاد الشام (٥٨٩_٦٥٨هـ/ ١١٩٣_١٢٥٩م)، من خلال متابعة هؤلاء الملوك حول حياتهم الخاصة والمستوى المعرفي ومحاولاتهم لتفعيل الحركة الثقافية، كل ذلك موثوقة بالمصادر التاريخية الأساسية والمعاصرة لتلك الفترة.

على الرغم من انشغالهم بالأمور السياسية والحروب المستمرة مع الصليبيين ولكنهم لم يهملوا جوانب معرفتهم، وكانوا على الدوام يعيرون اهتماماتهم في المجالات الثقافية وحبهم وتمعنهم بشكل عام لأخذ العلوم والمعارف العامة، وإلى جانب ذلك لم يتوانوا في دعم عملية التطور التعليمي والعلمي لبلادهم وخدمة الأدباء والعلماء والمثقفين ولاسيما عن طريق صرف الأموال لهم وللمؤسسات، وكل هذا كان له الإنعكاس الإيجابي في تطور عجلة المعرفة الثقافية لبلادهم وأيضا على مستواهم المعرفي، بشكل ليس مبالغ فيه إذا قيل إن العديد من الملوك الأيوبيين كانوا ذا كفاءة عالية من الناحية العلمية والأدبية والثقافية مقارنة بأقرانهم من الملوك والزعماء والشخصيات البارزة في العصور الإسلامية السابقة، بشكل إذا لم يكن ذا مستوى أعلى منهم كانوا في مستواهم.

وقد اقتضى البحث تقسيمه إلى مبحثين أساسيين تسبقهما المقدمة وتلحقهما الخاتمة، في المبحث الاول تطرقنا إلى المستوى الثقافي لهؤلاء الملوك واهتماماتهم بالعلوم والمعارف، وعلى وجه الخصوص العلوم الدينية منها علوم القرآن وعلوم الحديث والفقه، كذلك الاهتمام بالعلوم العقلية كعلم الحساب والهندسة والفلك والطب، لكنهم لم يهتموا بالعلوم العقلية كالفلسفة والمنطق مثل اهتماماتهم بالعلوم السابقة، وفي الوقت نفسه خصصنا مواضع عدة للعلوم اللغوية والأدبية والاجتماعية. رغم إن اهتمامهم باللغة الكوردية كان معدوما، لأنهم عاشوا وتثقفوا ثقافة إسلامية عربية بعيدة عن موطنهم الأصلي. أما المبحث الثاني خصصت لدورهم واهتماماتهم في بناء المؤسسات التعليمية والإشراف على المدارس وصرف مبالغ من الأموال الهائلة لتوفير الحاجات والمستلزمات لتلك المؤسسات التعليمية وللمدرسين والطلاب.

Abstract

**The cultural level of Ayyubid Kings and Their Role And Position in the Foundation of Educational Institutions in Bilad al-Sham (589-658A-H/1193-1260A.D)**

**Prof. Dr. Ako Burhan Mohammed**
History Dept. – College of Arts- Univ. of Saladin

**Asst. Lecturer. Muhsin Mamel Mohammed**
History Dept. – College of Arts- Univ. of Saladin

This research is an attempt to clarify the cultural level of the Ayyubid kings in the establishment of educational institutions in Bilad Al-Sham by following up and highlighting their personal lives and their level of knowledge, and their attempts to activate the cultural movement by establishing educational institutions away from the official political and military issues. All this information is supported by a bunch of resurces in which some of them were primary that have been obtained from their period.

Although Ayybid Kings were fighting and struggling in civil war and they were in continuous war against crucifiers; and other who headed towards their region, these were not barriers to the cultural side and continue to increase their desires and take the cultural side .Also They have a desire for science, knowledge, reading and writing.In addition to this, they did not neglect to develop the process of education and serve scientists, writers and intellectuals by spending money to build schools and provide all the needs of teachers and students. All this has affected the cultural movement in the country and its impact on their culture. It is not an exaggeration if it is said that a number of the Ayyubid kings had a high level of culture, literature and knowledge of modern science compared to kings and other presidents in the stages of Islamic history.

This paper can be divided into two main sections with an introduction and presenting the most concise results in the end,In the first section, the cultural level of the kings was highlighted and their interest in science and contemporary knowledge. Foremost among them the sciences of Quran, interpretation and Al-shareia sciences .In additional ,special materials were devoted to experience and interest in mental sciences, philosophy, logic, mathematics, astronomy, medicine and medical aspects, besides showing the appropriate aspect of literary, The second section was devoted to the role and status of the establishment of educational institutions and supervision and schools and allocate large amounts of needs and living well for teachers and students.

# ڕاپەڕینی چەمچەماڵ لە ساڵی ١٩٨٨ دا

**پ. ی. د. پشکۆ حەمەتاهیر عەبدلرەحمان** **د. فەرهاد عەبدلعەزیز محەمەد**
کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی – بەشی مێژوو

## پێشەکی

لەکاتی پرۆسەی ئەنفالدا، گەلێك کاری خۆڕسك و بوێرانە لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵ روویانداوە لەلایەن هاووڵاتی ئاسایی شار و شارۆچکەکانی باشووری کوردستان ، یەك لەو نموونانە راپەڕینەکەی چەمچەماڵە ، کە لە ١١ی نیسانی ١٩٨٨ روویدا و بەیەکێك لە راپەڕینە هەرە گرنگ و کاریگەرەکانی مێژووی شاری چەمچەماڵ و تەواوی باشووری کوردستان دادەنرێت. گرنگیی ئەم راپەڕینە تەنها لەبەر ئەوە نییە کە بەیەکێك لە دیارترین و دەگمەنترین بەرەنگاربوونەوەی ناوازەی جەماوەری خەڵکی باشووری کوردستان بووە بەرووی هەڵمەتەکانی پرۆسەی ئەنفالدا، بەڵکو تواندراوە بەهۆیەوە ژمارەیەکی زۆر منداڵ و لاو و ژن و پیاو لەو پرۆسەیەی بەرەو مەرگ ئازاد بکرێن. سەبارەت بە هۆکاری هەڵبژاردنی بابەتێکی وەها لەژێر ناونیشانی (راپەڕینی چەمچەماڵ لە ساڵی ١٩٨٨ دا ) لەو ڕوانگەیەوە دێت کە تائێستا وەکو پێویست ئاوڕی لێ نەدراوەتەوە و هیچ نووسراوێکی زانستی لەبارەوە نەنووسراوە، جگە لە چەند بابەتێکی کورت نەبێت کە لە چەند لاپەڕەیەکی رۆژنامەدا وەك بیرەوەری باسکراوە. لەلایەکی دیکەشەوە هەوڵێکە بۆ نووسینەوەی راستییەکی مێژوویی لە زاری بەشداربووانی راپەڕینەکەوە کە لەژیاندا ماون و بخرێتەڕوو بەشێوەیەکی زانستی.

ئامانج لە توێژینەوەیەکی وەهاش لەژێر ناونیشانی ( راپەڕینی چەمچەماڵ لە ساڵی ١٩٨٨ دا) ، لێکدانەوەیەکی زانستییانە و ئاکادیمییانە و شیکارییانەیە بۆ رەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی چەمچەماڵ، لەو ماوە دیاریکراوەدا، وێڕای ئەوەی مەبەستمانە بوترێت شاری چەمچەماڵ لەو ماوەیەدا بەچەند قۆناغێکی جیاجیا تێپەڕیوە، کە هەر قۆناغێك سەرەتایەکی خراپتر بووە بۆ قۆناغی دواتری، هەموو ئەوانەش لەلایەن حکومەتی بەعسی عێراقی ئەوکاتەوە پیلانی بۆ کێشرابوو ، لە

پێناو لەناوبردنی کورد لە قەزای چەمچەماڵ و ناوچەکەشی کە دەیزانی داینەمۆی شۆڕشی نوێن. سەبارەت بە میتۆدی توێژینەوەکەش کە گیراوەتە بەر بۆ نووسینی ئەم بابەتە، پشت بە میتۆدی لێکۆڵینەوەی زانستی مێژوویی بەستراوە لەسەر بنچینەی شیکردنەوە و هەڵهێنجانی بابەتەکان سەرچاوەی گرتووە.

ئەو سەرچاوانەی سوودی لێوەرگیراوە، بۆ ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیە، بریتیین لە ژمارەیەك سەرچاوەی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی ، لەگەڵ دوو بەڵگەنامەی حکومەتی عێراقی ئەوکات و یاداشتی ئەو کەسانەی ئاگاداری ڕاپەڕینەکە بوون یان بەشداربوون لە ڕاپەڕینەکەدا کە بەم جۆرەی خوارەوە پۆلێن کراوە: سەرچاوە کوردییەکان وەك (د. پشکۆ حەمەتاهیر ئاغجەلەری: شاری کەرکووك لە نێوان ساڵانی ١٩٥٧-١٩٧٧ و حەمید عەبدوڵلا ساڵح: سیاسەتی تەعریب لە شاری کەرکووك و لەتیف فاتح فەرەج و مەجید ساڵح: کورد قڕان و د. مارف عومەر گوڵ: جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر ڕۆشنایی یاسایی تازەی نێو دەوڵەتان دا). و سەرچاوە عەرەبییەکان ، وەك (د. اسماعیل خلیل محمد: مؤشرات سیاسة التعریب والتهجیر في اقلیم کوردستان العراق ، خلیل بن احمد الفراهیدي: کتاب العین) و سەرچاوەی ئینگلیزی ، وەك ( The Encyclopedia Americana,International Edition). و چەندین چاوپێکەوتن لەگەڵ بەشداربووانی ڕاپەڕینەکە وەك ( لەتیف فاتح فەرەج ، عبدالرحمن صدیق ، نازم حەمەی ئینجە ... تاد) و لەگەڵ چەندین گۆڤار و ڕۆژنامە و دەستنووس.

بەپشتبەستن بەو سەرچاوانە تواندراوە تاڕادەیەك سەرکەوتوو بین بەسەر گرفتەکانی ناو توێژینەوەکەدا، کە بریتی بوون لە کەمیی سەرچاوەی تایبەت بە ڕاپەڕینی شاری چەمچەماڵ و نەنووسینەوەی بیرەوەری لای بەشداربووانی ڕاپەڕینەکە و ونبوونی چەندین وێنە و ڤیدیۆی تایبەت بە ڕاپەڕینەکە و کۆچکردنی بەشێك لە گەواهیدەرانی ئەنفالکراوەکان کە لەکاتی ڕاپەڕینەکەدا ئازاد کراون. دوای زاڵبوون بەسەر ئەو گرفتانەدا تواندراوە ناوەرۆکی توێژینەوەکە بەم جۆرە دابڕێژرێت .

**تەوەری یەکەم : هۆکاری ڕاپەڕینی چەمچەماڵ ساڵی ١٩٨٨ :** لەم تەوەرەدا بە وردی باس لەهۆکارە ناڕاستەوخۆ و ڕاستەوخۆکانی کە ڕێگە خۆشکەر بوون بۆ ڕاپەڕینی ١١ی نیسانی ١٩٨٨ چەمچەماڵ کراوە.

**تەوەری دووەم: ڕۆژانی ڕاپەڕینەکەی چەمچەماڵ و دەسکەوتەکانی :** لەم تەوەرەدا لەگەڵ ئەوەی باس لە ساتی ڕاپەڕینی چەمچەماڵ کراوە ، هەروەها باس لە دەستکەوتەکانی ڕاپەڕینەکەش کراوە کە باشترین دەستکەوتی بریتی بووە لە ئازادکردنی چەندین هاووڵاتی کە کەوتووبوونە بەر پرۆسەی ئەنفالەوە .

## تەوەری یەکەم : هۆکاری ڕا پەڕینی چەمچەماڵ ساڵی ١٩٨٨

ڕاپەڕینی چەمچەماڵ لەساڵی ١٩٨٨ دا ئەوەی دووپاتکردەوە، کە کۆمەڵێك هۆکاری ( ناڕاستەوخۆ و ڕاستەوخۆ– لاوەکی و سەرەکی) بنچینە بوون بۆ هەڵایسانی ئەو ڕاپەڕینە، لێرەدا هەوڵدەدرێت هەریەکەیان بەجیا ئاماژەی پێبکرێت:

**١) هۆکارە ناڕاستەوخۆکان بۆ ڕاپەڕینی ١٩٨٨ :** هۆکارە ناڕاستەوخۆکان خاڵێکی سەرەکی بوون لە ڕاپەڕینی چەمچەماڵ ساڵی ١٩٨٨دا، لە گرنگترین ئەو هۆکارانەش ئەمانەی لای خوارەوەن :

**أ) ڕاگواستن (ترحیل) :**

چەمکی ڕاگواستن [1]، تاراندن، کۆچپێکردن، جیاوازن لە یەکتری لە ڕووی ماناوە، بەڵام لەبنەڕەتدا لەڕووی پراکتیکەوە یەکن، ڕژێمی عێراق بەگشتی و بەعس بەتایبەتی هەرسێ ڕێگەکەی گرتۆتەبەر دژ بە نەتەوەی کورد بەگشتی لە باشووری کوردستان و شارۆچکەی چەمچەماڵیش لەناویاندا. (مستەفا، ٢٠٠٧، ل٢٣٣.؛ فەرەج، ٢٠٠٢، ل١٤ .؛ عبدالله، ١٩٩٩،ل٤) بەڵام لەڕووی زاراوەوە (ڕاگواستن) لە زمانی کوردیدا لەبەرامبەر وشەی (Deportation) ئینگلیزی دێت، کە لە بنەڕەتدا لە زاراوەی (Deportation) ی ڕۆمانی وەرگیراوە. (Americana، 1975,p716 ) ( دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد) دەربارەی (زاراوەی ڕاگواستن) نووسیوێتی: "ڕاگواستن بریتییە لە ڕاگوێزانی زۆرەملێی دانیشتوان، لە ناوچەکەی بۆ ناوچەیەکی تر بەبێ ئارەزوویان ".( محەمەد ، ٢٠٠٣،ل٢٣) کەواتە بەمانای ڕاگواستنی

دانیشتوان دێت لەناوچەی نیشتەجێبوونی هەمیشەییان بۆ ناوچەیەکی تر، بەبێ ئەوەی پرس و ڕایان پێبکرێت، ئەم ڕاگواستنەش یان بۆ سنووری ناوەوەی وڵاتە یان بۆ دەرەوە، کە لەڕێگەی فشار و بەڵێنی درۆ و بەکارهێنانی هێز دەکرێت. (ئاغجەلەری، ٢٠١٥ ، ل٢٢٢).

ڕاگواستنی زۆرەملێ سیاسەتێکە ڕژێمی داگیرکەر و کۆلۆنیالیست و زەوتکەرەکانی مافی مرۆڤایەتی دژی گەلانی ڕزگاریخواز بەکاری دەهێنن، وەك ڕاگواستنی شارۆچکە و شارەدێ و لادێکانی باشووری کوردستان بەگشتی و چەمچەماڵ بەتایبەتی لەلایەن حکومەتی بەعسەوە بەکارهێنراوە، کە مەبەستی سەرەکییان لایەنی نەتەوەیی و شۆڤێنی بووە، تابتوانن کورد لە عێراقدا لەقاڵب بدەن و بەشێنەیی لە بۆتەی عەرەبدا بیتوێننەوە، ئامانجی سەرەکی ڕژێمی عێراق لە ڕاگواستنی چەمچەماڵ و ناوچەکانی دەوروبەری ، بریتی بووە لە :

یەکەم : دانیشتوانی ناوچەکە لە هێزی شۆڕشگێڕە چەکدارەکان دووربخاتەوە و لە شوێنێکدا کۆیان بکاتەوە و هەتا هەمیشە لەژێر کۆنترۆڵی دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی بەعسدا بمێننەوە .

دووەم: لەبواری بەرهەمهێنان دووریان بخاتەوە و بیانکەنە هێزێکی بەرخۆر، تا لەلایەك نەتوانن بژێوی و پێداویستی خۆیان و پێشمەرگەکان دابین بکەن، لەلایەکی ترەوە بۆ ئەوەی لەدەرفەرتی گونجاو چەکداریان بکەن و بەگژ شۆڕشیاندا بکەن. ( محەمەد ، ٢٠٠٩، ل٣٢-٣٣).

سێیەم : پاراستنی بیرە نەوتەکان، ئامانجێکی تری بەعس لە ڕاگواستنی ناوچەکانی چەمچەماڵ، دروستکردنی پشتێنەیەکی ئاسایش بوو بۆ بیرە نەوتەکانی کەرکوك، کە زۆرکات پێشمەرگە لەو ناوچانەوە هێرشی دەکردە سەر بیرە نەوت و بۆرییەکانی گواستنەوەی نەوت.

لە ساڵانی ( ١٩٨٦و ١٩٨٧ و١٩٨٨)دا حکومەتی بەعس لە عێراق زۆربەی ناوچەکانی سەر بەقەزای چەمچەماڵی ڕاگواستووە، دانیشتوانە ڕاگوێزراوەکانیان لەو شوێنانە کۆکردەوە کە ناویان ناوە (گوندی هاوچەرخ)، بەڵام لای کورد بە(ئۆردوگای زۆرەملێ) ناودەبرا. ( مینە ، ، ١٩٩٩، ل١٤٠). دروستکردنی ئەو ئۆردوگا زۆرەملێ سایگۆنی بۆ دانیشتوانی ڕاگوێزراو لە سنووری چەمچەماڵ، بریتیی بوون

لە( ئۆردوگای شۆڕش، ئۆردوگای تەکیە).( ئاغجەلەری، ٢٠٠٤، ل٥٤) بەپێی ئامارەکان ژمارەی ڕاگوێزراوان بۆ ئەو ئۆردوگایانە لە قەزای چەمچەماڵ، بریتی بووە لە (١٩) گوندی سەر بەسەنتەری قەزای چەمچەماڵ کە لە (٥١٦) خێزان پێکهاتبوون. (ساڵح، ٢٠٠٨، ل٦) ناحیەی سەنگاویش کە (٧٠)[٢] گوندی لەخۆ دەگرت هەموویان لەساڵانی ١٩٨٧–١٩٨٨ لەگەڵ ناوەندی ناحیەکەدا وێران کران و ڕاگوێزران، کە ژمارەی خێزانەکانی ئەو گوندانەش بە(٢٦٤٨) خێزانی جووتیار هەژمار دەکرێت، (سدیق ، ٢٠٠٩، ل١٢٥) لەهەمان کاتدا ناحیەی ئاغجەلەریش کە لە (٧٥)[٣] گوند و ناوەندی ناحیەکەش تەختکرا و ڕاگوێزان بۆ ئۆردوگاکانی (شۆڕش و تەکیە)، ژمارەی خێزان لەو ناحیەدا (٦٧٣١) خێزان بووە. ( ساڵح، ٢٠٠٨،ل٦٠) بەم جۆرە کۆی ڕاگوێزراوان بە نزیکەی (٥١٧٩٧) کەس هەژمار دەکرێت. (ساڵح،٢٠٠٨،ل٦١-٦٠) کە تەواوی (گوند و ناحیە)کانی سەربە قەزای چەمچەماڵ ڕووبەڕووی گەورەترین پرۆسەی ڕاگواستن بوونەتەوە.

**ب) بەعەرەبکردن ( تعریب):**

بەعەرەبکردنی لە ڕووی زمانەوانییەوە " بریتییە لە بەعەرەبکردنی شتێکی نا عەرەبی، وەك بەعەرەبکردنی ئیدارە یان خوێندن یان دامودەزگاکانی ... تاد." (المنجد في اللغة و الاعلام ، ١٩٨٦، ص٩٤) بەواتای بەزۆر بەعەرەبکردنی شتێکی ناعەرەبییە، وشەیەکە لەناو فەرهەنگی سیاسیی کورددا بۆتە زاراوەیەکی باو، پرۆسەیەکی ئاڵۆز و ئەزموونێکی تاڵ و حاڵەتێکی ناسروشتییانەیە، کە بەسەر شار و شارۆچکە و شارەدێ و گوند و ناوچەکانی باشووری کوردستان هاتووە. (محەمەد، ٢٠٠٣ ،ل٩) بنچینەی وشەکەش دەچێتەوە سەر وشەی (تعریب) کە هەم عەرەب خۆیان وشەکەیان داتاشیوە و هەم خۆشیان سوودیان لێوەرگرتووە. (فرج و ساڵح، ٢٠٠٣،ل٣٥–٣٦) لەڕووی چەمکیشەوە (د. خلیل ئیسماعیل محەمەد) نووسیویەتی: "بریتییە لە جێنشینکردنی خەڵکی عەرەب لە شێوەی تاك و کۆمەڵ لەباشووری کوردستان لەڕێگەی دۆزینەوەی نیشینگە بۆیان، هەروەها بەواتای گۆڕینی ناوی شار و گوند و گەڕەك و دامەزراوە فەرمی و نافەرمییەکانی بۆناوی عەرەبی دێت، ئەمەش بەمەبەستی گۆڕینی دیمۆگرافی ناوچەکە لە بەرژەوەندیی خەڵکی عەرەب". (محەمەد، ٢٠٠٣ ، ل٢١)

بەشـێوەیەكی گشـتی دەكرێـت بوترێـت (بەعـەرەبكردن) : بریتییـە لـەو پرۆسەیەی كە هەوڵی تواندنەوەی نەتـەوەی كـورد دەدات لـەناو بۆتـەی نەتـەوەی عەرەبـدا، لەرێگـەی بـەكارهێنانی هێـز و زەبروزەنگـەوە دەبێـت، بـۆ سـڕینەوەی ڕاستییە مێژووییەكان و كلتوور و شێوازی پەروەردە و گۆڕینی ناوە كوردییـەكان، هەموو ئەو سیما و بەها و چەمكە كوردییانەی كە كوردێتی باشووری كوردسـتان و تەنانـەت چەمچـەماڵ دەسـەلمێنن. بۆنموونـە : نەتـەوە پەرسـتەكانی عـەرەب و فـەرمانڕەواكانی عێـراق هـەر لـە سـەرەتای دامەزرانـدنی دەوڵـەتی عێـراق لـە بیستەكانی سەدەی پێشووەوە، بانگەشەی ئەوە دەكەن كە هـەموو خـاكی عێـراق بـەباكوور و باشـوور و رۆژئـاوا و رۆژهەڵاتیـەوە مـوڵكی عـەرەبن و بەشـێكە لـە نیشتیمانی عەرەبی ، خەڵكی عێراق ئەوانەش كە عەرەب نین، لەوانـەش كـورد كـە ئەمڕۆ بەشێكی لـە سـنووری دەوڵـەتی عێراقـدا دەژیـن، میـوانی خـاك و نەتـەوەی عەرەبن و لەسەر خاكی ئەوان دەژین. ( راگەیاندنی ( ی.ن.ك): ١٩٨،ل٥) بەم جۆرە بێـت خاكی باشووری كوردستان بە چەمچەماڵیشەوە ، خاكی عەرەبە و ئەو كوردانەشی لەسەری دەژین وەكو بێگانە سەیركراون. ( سدیق، ٢٠٠٩ ، ل٥٥).

بەم شێوەیە دەردەكـەوێت سیاسـەتی بەعـەرەبكردن لـە تـەواوی باشـووری كوردسـتان ( كوردسـتانی عێـراق)، سیاسـەتێكی نـوێ و كـاتی نـەبووە و بـەڵكو مەبەست و ڕیشەی مێژوویی درێژخایەن و ستراتیژی خۆی بووە و قۆناغ بـە قۆنـاغ گەشـەی كـردووە و بەتایبـەت لـە سـەردەمی دەسـەڵاتی دووەمـی بەعسـییەكاندا، لـەپێناوی چەسـپاندنی بۆچـوون و تیۆریـای شـۆڤێنیی خۆیانـدا لەسـەر دەسـت بەسـەراگرتنی بـەروبووم و سـامانە سروشـتییەكانی كوردسـتان و تواندنـەوەی گەلەكـەی لـەناو گـەلی عـەرەبی سەردەسـتدا. ( ئاغجەلـەری: ٢٠٠٤، ل٤ .؛ راگەیانـدنی (ی.ن.ك):١٩٨٥،ل٥) بۆ گەیشـتن بـەم ئامانجەشـیان چـەند رێگایـەكیان لـە باشـووری كوردستان بەقەزای چەمچەماڵیشەوە گرتۆتەبەر، لەوانە:

یەكەم // گۆڕانكارییـە كارگێڕییـەكان بـەئامانجی بەعـەرەبكردن، حكومـەتی بەعسـی عێـراق لـەنێوان سـاڵانی ١٩٦٥–١٩٨٨دا كۆمـەڵێك گۆڕانكـاریی كـارگێڕی ئەنجامدا لەپێناو درێژەدان بە سیاسەتی بەعـەرەبكردن لـە باشـووری كوردسـتان، هەندێك لەو گۆڕانكارییانە قەزای چەمچەماڵیشی گرتەوە. لەوانەش وەك دەرچوونی

(مەرسوومی کۆماری) ژمارە (٦٠٨) لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٥دا، کە قــەزاکانی (چەمچــەماڵ و کــەلار) لــە پارێزگــای کــەرکووك دابــڕان و لکێنــدران بــە پارێزگای سلێمانییەوە و قەزای (کفری) ش لە پارێزگای کەرکووکەوە گواستەوە بۆ سـەر پارێزگـای (دیالـە) ، (بڕوانـە: بەڵگەنامـەی ژمـارە ١) (لەلایـەکی دیکـەوە بەپێی ( مەرسومی کۆماری) ژمارە (٣٢) ی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٦، گونــدەکانی (گورگــەی خــان، ســاڵەی، ســەیدان، واســتی، ســەیدانی ســەروو، قــەرەوەیس) لــە ناوەنــدی قــەزای ( چەمچــەماڵ) ، لــە پارێزگــای ســلێمانییەوە گواسترانەوە بۆ ناحیـەی ( قەرەحەسـەن)ی سـەر بـە قـەزای ناوەنـدی کـەرکووك. (غفور، ٢٠٠٥، ص٥٨)

دووەم // پڕکردنەوەی دام و دەزگا کارگێڕی و سیاسی و خوێندنگـەکان بـە خەڵك و فەرمانبەر و مامۆستای عـەرەب و هێنـانی ئـەو کەسـانەش زیـاتر کەسـانی سەر بە حیزبی بەعس بوون کە بتوانن خزمەت بەسیاسـەتی بەعـەرەبکردن بکـەن، وەك سیخوڕ کاریان دەکرد. (ئاغجەلەری، ٢٠٠٤،ل٥٤-٥٥)

سێیەم// گۆڕینی ناوی شوێن و جێگا و گەڕەك و کۆڵان و شەقام و خوێندنگا و مزگەوت و باخچە و دووکان و یانـە و تـەواوی دامودەزگاکـان لـە کوردییـەوە بـۆ عــەرەبی، ( فــەرەج: ئۆکتۆبــەری ١٩٧٧، ل٥٧-٥٨) وەك گــۆڕینی نــاوی قوتابخانــەکانی (شۆڕش) بە (شهید) و (هـەڵۆ) بـە (الرسـالة) و ناولێنـانی قوتابخانـەکان بـە نـاوی عــەرەبی وەك ( رابعــة العدویــة، فلســطین، النهضــة، العــراق الجدیــد ، مســتقبل ...تاد...). هەروەها گۆڕینی ناوی زۆرێك لە گەڕەکەکان وەك (حي الفلاحین، حي العسکري، جیش الشعبي، حي العمال، حي صدام .... تاد..).

سەرباری ئەو هــەموو هەوڵانـە و پێـدانی زانیارییـەکان دەربـارەی پێکهاتـەی نەتەوە، قەزای چەمچەماڵ بەیەکێك لە هەنگاوە دژوارەکان دانراوە لە سەرژمێریی ســاڵی (١٩٧٧) و (١٩٨٧) دا، چــونکە لــەو ســاتانەدا حکومــەتی عێراقــی بەرپرسیارێتی ناوچە کوردییەکانی دەکرد و هەمیشـە هـەوڵی سـڕینەوەی مـۆرکی نەتەوەی کـوردی داوە، ئەمـە وێـڕای سیاسـەتی ڕاگواسـتن لەبـەر ئـەوە پێویسـتە بەوریاییەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت و سوودیان لێوەربگیرێت. بۆنموونـە کاتێـك ســەیری ســەرژمێری ســاڵی ١٩٧٧ دەکرێــت بــۆ پێکهاتــەی نەتــەوەیی قــەزای

چەمچـەماڵ ، ڕێـژەکان بـەم جـۆرە بـووە ( کـورد لـە ٩٨٪، و عـەرەب ١,٥٧٪ و تورکمان ٠,٠٥٪ و نەتـەوەکانی تـریش ٠,٣١٪)ی کۆی دانیشـتوانی لـەخۆگرتووە، بـوونی ئـەو ڕێـژە بەرچـاوەی عـەرەب لـە ناوچـەکەدا دەگەڕێتـەوە بـۆ هۆکـاری سیاسی. (ساڵح: زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٥،ل١٣١) دیارە ئەم سیاسەتەی حکومەتی بـەعس بـۆ بەعـەرەبکردنی لەسـەرخۆی قـەزای چەمچـەماڵ ، بەیـەکێك لـە هۆکـارە ناڕاستەوخۆکان دادەنرێت لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٨٨ دا.

**ج// بە بەعسیکردن (التبعیث):**

زاراوەی **تبعیث** بەواتای بووژاندنەوە یان زیندووکردنەوەی پێگە و کلتـووری عەرەب دێت، چونکە بەعس خۆی بە میراتگری کلتووری گشت عـەرەب دەزانێـت و بەردەوامیش لە هەوڵدایـە بـۆ سـەپاندنی دەسـەڵاتی ئـەو بەسـەر بەرامبەرەکەیـدا. (سـلێمان: ٢٠٠٣، ل١٨١) کەواتــە ( بــەعس) یــان ( بــە بەعســیکردن) بەرهــەمی ئایدۆیۆلۆژیایـە کـە لـە پێکهاتەیـدا دەچـێتە نـاو قـەوارەی ئـەو فۆرمـە تازانـەی تۆتالیتاریزم، کە پیشەیان فابریکـەکردنی مرۆڤـە و کـاری ڕۆژانـەیان بریتییـە لـە گرمۆڵەکردنی مرۆڤ لەناو تەواوی ئایدیۆلۆژیای فەرمیدا، کەواتە ئایدۆلۆژیای بەعس هەوڵدانێکە بۆ نوێکردنـەوەی فاشـیزمی مێـژوویی لەسـەر بنچینەی ناسـیۆنالیزمی عەرەبی. (عیسا: ٢٠٠٤ ،ل ١١) یەکێك لە سیاسەتەکانی حیزبی بەعس لە عێراقدا پـاش گەیشـتنی بەدەسـەڵات، بریتـی بـووە لـە سیاسـەتی بـە بەعسـیکردن، سـووربوون لەسەر ئەوەی کە دەبێ مرۆڤی عێراقی سەر بە بەعسی عـەرەبی بێـت. (ئاغجەلـەری: ٢٠٠٤،٢٠١٥،ل٢٤٥) بۆیـە لـەدوای کودەتـای (١٧ی تـەمموزی ١٩٦٨) ، عەرەبـە بـەناو چەپخوازەکان یان ( حیزبی بەعس) لەگەڵ سیاسەتی (بەعەرەبکردن و ڕاگواسـتن) کوچکەیەکی دیکەیان بـەناو (سیاسـەتی بـە بەعسـیکردن) زیـاد کـردووە. (دووبـزی: ٢٠٠٠، ل٧ ) کەوتنــە جێبــەجێکردنی لــە باشــووری کوردســتان بەگشــتی و قــەزای چەمچەماڵیشـی گرتـەوە، بـۆ جێبـەجێکردن و سەرکەوتنیشـیان چـەندین ڕێگـای جودایان بۆ گرتبووەبەر، لەوانەش:

(١) دامەزراندنی بەعسییەکان لە دام و دەزگاکانی چەمچەماڵدا.

(٢) بە بەعسیکردنی خوێندن و قوتابخانەکانی چەمچەماڵ، حکومـەتی بـەعس جگەلەوەی بەیاسا پرۆگرامی پەروەردەی لە عێراقدا بەعساندبوو، لەگەڵ ئەوەشـدا

مامۆستای بەعسی دەخزانە ناوەندەکانی خوێندن، لە چەمچەماڵ وەك (مامۆستا علي وادي، مامۆستا ساطع، م. حەمە چاوشین ... تاد...)، ئەمەش بەئامانجی بەعساندنی خوێندکاران بوو.

(٣) بە بەعسیکردنی چەمچەماڵ لەڕێگەی هێزەوە، حکومەتی بەعسی عێراق گوشاری زۆر خستبووە سەر کورد لە باشووری کوردستان و لەناویشیاندا خەڵکی چەمچەماڵ بۆ ئەوەی ببنە بەعسی. (بڕوانە : ئاغجەلەری: ٢٠٠٤،ل٥٦-٥٧؛ قوربانی: ٢٠٠٥،ل١٠٧. ؛ نیرۆیی: 2008 ،ل٣١. ؛ قەرەداغی : ٢٠٠٧، ل٢٠١-٢٠٢)

(٤) دابەشکردنی گەڕەکەکانی قەزای چەمچەماڵ لەسەر بنەمای یەکەی حیزبی و بە بەعسیکردنی بەزۆر، لەڕێگای موختارەکانی گەڕەکەکانەوە، کە سەربەحیزبی بەعس بوون. (فەرەج: ئۆکتۆبەری ١٩٩٧،ل٧٨)

(٥) بە بەعسیکردن لەڕێگەی جاشەکانەوە، جاش [٤] بەو کوردانە دەوترا کە بەپارە وەك هێزێکی فەرمی و نافەرمی لەلایەن حکومەتی بەعسی عێراقەوە بەکاردەهێنران و دەشکرانە بەعسی، ئەرکی یەکەم و سەرەکیی جاشەکان بەگژداچوونەوەی بزووتنەوەی چەکداری کورد بوو لە باشووری کوردستان ، ئەرکێکی تری جاش پارێزگاریکردن بوو لە ڕێگا سەرەکییەکانی نێوان شارەکان و دامودەزگا حکومی و پیشەسازییەکانی ناو شارەکان. ( رەسول: ٢٠٠٣،ل١٣٧)

## د// بەکارهێنانی چەکی کیمیایی :

تاوانەکانی حکومەتی بەعس بەرامبەر بە کورد لە ساڵانی ١٩٨٧ و ١٩٨٨ دا گەیشتە چڵەپۆپە، ئەوە بوو بەشێوەیەکی فراوان چەکی کیمیاوی بەکارهات و هەزاران کەس بوونە قوربانی و زۆربەی ناوچەکانی باشووری کوردستان ژیانیان تێدا نەما، ( گوڵ: ٢٠٠٣،ل٣٠-٣١) لە ڕۆژی (١٩٨٧/٤/١٥)دا ناوچەی دۆڵی جافایەتی بەچەکی کیمیاوی لێدرا، ڕۆژێك دوای ئەمەش لە (شێخ وەسان و بالیسان) یش بەهەمان چەك بۆمباران کرا و، هەروەها ( لە ڕۆژی ( ١٩٨٧/٦/٨)دا بۆماوەی یەك کاتژمێر گوللە تۆپی کیمیاوی بەسەر ( بەرگەڵوو هەڵەدن و سێکانیان)دا باراند و، (عزەت: ١٩٩٩،ل١٤٤) لە ڕۆژی (١٩٨٧/٦/٢٨)دا کارەکانی حکومەتی بەعس دژ بە کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشی گرتەوە و بە بۆمبای ژەهراوی بۆردوومانی شاری سەردەشتی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئێرانی کرد و (١٣٢) کەس کوژران و

(٥٠٠٠) کەسیش بریندار بوون. (گوڵ: ٢٠٠٣ ،ل٣١) هەروەها لەمانگی (٢) ساڵی ١٩٨٨ دا هەشت فڕۆکەی جەنگی هەردوو گوندی ( تەکیە و بەلەکجار)ی قەرەداغیان کیمیاباران کرد لەمانگی (٣)ی هەمان ساڵدا هێرشی کیمیاوی بە فڕۆکە بۆ ناوچەی سێوسێنان دەستپێکرد، ڕۆژێك دواتریش بەچەکی راجیمە قەزای دووکان بەرگازی کیمیاوی کەوت، دواتریش جافەران کیمیاباران کرا. (عزەت: ١٩٩٩، ل١٤٤)

حکومەتی بەعسی عێراق نەك هەر چەکی کیمیاوی ، بەڵکو چەکی بایۆلۆژیشی وەك ( گازی خەردەل، دەمارەگاز GB) (رۆژنامەی خەبات :١٩٨٨،ل١٨) ئامادە کردبوو بۆ شەڕی دژ بە هاووڵاتیانی باشووری کوردستان ، ئەوەش بە نووسراوی فەرمی و تەواو نهێنی و تایبەت لە (مقر آمرية قاطع أربيل– الحركات)ەوە بەژمارە ( ج١/ ٢٧٧) و نووسراوێکی نهێنی تایبەتی وەزارەتی بەرگری ژمارە ( ١٠١٣٥) دەردەکەوێت، هەموو ئەو چەکانە نیشانە بوون بۆ خۆئامادەکردن و بەکارهێنانی بوون. (وچ: ١٩٩٩، ل٤٨ ) کە دواتر دژی شاری هەڵەبجە بەکارهێنرا.

هەڵەبجە شارێکی مێژووییە و جێگایەکی دیاری هەیە لە ژیانی کلتووری و سیاسی و ئابووریی باشووری کوردستاندا، نزیکەی (٧٠,٠٠٠) کەس دانیشتوانی ئەم شارە بوون، رۆژانی (١٦–١٩٨٨/٣/١٧) رژێمی عیراق تاوانێکی زۆر دڕندانەی لە دژی هەڵەبجە و ناوچەکانی دەوروبەری ئەنجامدا، فڕۆکەکانی رژێمی بەعس بەچەکی کیمیاوی کەوتنە ژەهر بارانکردن، زۆربەی سەرچاوەکان لەو بارەیەوە ژمارەی کوژراوەکانی هەڵەبجە بە(٥٠٠٠) کەس دەستنیشان کردووە و ژمارەی بریندار و بەرکەوتووش (١٠,٠٠٠) کەس داناوە، خەڵکێکی زۆریش دوای ئەوە بەرەو شارەکانی دیکەی باشووری کوردستان ڕایانکرد کە حکومەتی بەعس زۆریانی گرت، پاشماوەی دانیشتوانی هەڵەبجە و ناوچەکانی دەوروبەری بەبێ ماڵ، ئاوارەی ئێران و ناوچە سنوورییەکان بوون. (گوڵ: ٢٠٠٣ ،ل٣١–٣٢ .؛ فاید: ٢٠١٠،ل٢٩٠–٢٩١) بەم جۆرە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە هەڵەبجە و دەیان ناوچەی جیاوازی تری باشووری کوردستان ، ترسێکی زۆری خستبووە دڵی دانیشتوانی کورد، دەکرێت بەهۆکارێکی ناڕاستەوخۆ دابنرێت بۆ ڕاپەڕینی چەمچەماڵ لەساڵی ١٩٨٨دا بۆ ئەوەی جارێکی تر تووشی ئەو ڕووداوانە نەبنەوە.

**ز// هۆکاری مێژوویی بۆ ڕاپەڕینی چەمچەماڵ لە ساڵی ١٩٨٨:** ڕاپەڕینی نیسانی ١٩٨٨ چەمچەماڵ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هۆکارێکی مێژوویی بەشداری ڕاپەڕین و ڕاپەڕینەکانی پێشووتری لەپشتەوەیە، بێگومان لە دابڕاو نییە دابڕاو لە ڕاپەڕینە جەماوەرییەکان و بەشداری ڕاپەڕینەکانی باشووری کوردستان لە رابردوودا، کاتێك سەیری ڕاپەڕینەکەی چەمچەماڵ بکرێت. چونکە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ تەواوکەر و درێژەپێدەری ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانەی ساڵانی پێشووتریەتی وەك ( بەشداریکردنی چەمچەماڵ لە شۆڕشەکانی شێخ مەحمود ١٩١٩–١٩٢٤، بەشداریکردنی چەمچەماڵییەکان لە ڕاپەڕینی ٦ی ئەیلولی ١٩٣٠ (بڕوانە// عەبدولعەزیز: ٢٠١٣، ل١٥٦–٢٦٨)، بەشداریکردنی چەمچەماڵییەکان لە شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێ و ... تاد.....) . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت وەکو کۆپیکردنەوە و دووبارەکردنەوەی میکانیکییانەی ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی پێشوو کەڵەکەبوونی چەندایەتی لێی بڕوانرێت، بەڵکو پێویستە وەك ڕاپەڕینێکی خاوەنی سروشت و نیشانەی جیاکەرەوە سەیری بکرێت. ( ئاغجەلەری : ٢٠٠٤،ل٦٥–٦٦)

٢) **هۆکاری ڕاستەوخۆ بۆ ڕاپەڕینی چەمچەماڵ لە ساڵی ١٩٨٨:** ئەو هۆکارەی کە خاڵی سەرەکییە بۆ دەسپێکی ڕاپەڕینی چەمچەماڵ لە ساڵی ١٩٨٨ دا، بریتی بوو لە پرۆسەی (ئەنفال)... وشەی ئەنفال لە ڕووی زمانەوانییەوە : "ئەنفال پەیڤێکی عەرەبییە، کە کۆی وشەی (نفل)ە، بەواتای (غنیمة) دێت لە عەرەبیدا".( الفراهیدي: ١٩٩٠،ص٣٢٥ .؛ عزیز: ٢٠٠٥،ل١٧) کەواتە لەڕووی زمانەوانییەوە لە قورئان و کتێبە ئیسلامییەکاندا بەو دەستکەوتانە دەوترێت کە دەکەوێتە دەستی سوپای ئیسلام لەدوای پێکداچوونیان لەگەڵ کافرەکاندا. (دزەیی: ٢٠٠١،ل٢٥) لەڕووی چەمکیشەوە :" ئەنفال ، پرۆسەیەکی بەرنامە بۆ داڕێژراو بووە لەلایەن هێزێکی پڕچەککراوی حکومەتی بەعسی عێراق بەچەکی سەردەم ئەنجامدراوە، لەلایەك ئامانجی (بڕوانە// ئاغجەلەری و م. محمد : ٢٠١٤) سڕینەوەی مۆرکی نەتەوەی کورد بووە لە عێراق، لەلایەکی دیکەیشەوە بە سووتماککردنی خاکی باشووری کوردستان بووە". ( ساڵح: ٢٠٠٨ ،ل٣٥)

شاڵاوەکانی ئەنفال لە ڕۆژی ( ١٨–٢–١٩٨٨)ەوە دەستپێکرد و تا ڕۆژی (٦–٩–١٩٨٨)ی خایاند، بەسەر هەشت قۆناغدا دابەش بووە، کە زۆربەی

ناوچـەکانی باشـووری کوردسـتانی گرتـەوە، وەك ( دۆڵـی جافایـەتی، شـارباژێڕ، شـارەزوور، گـەرمیان، قـەرەداغ، مەرگـە، پشـدەر، دەشـتی کۆیـە، گۆپتەپـە و عەسـکەر، ئاغجەلـەر، شـوان و، شـێخ بـزێنی، سـەنگاو، دەشـتی هـەولێر، دۆڵـی بالیسان، وەرتێ و ئالانە و ناوچـەی خۆشـناوەتی، باڵەکایـەتی، ئامێـدی، ئـاکرێ، شێخان، زاخۆ و ....تاد..) گرتەوە. (محمد: ٢٠١٢،ل٢٤) ئەنفالی سێ ، کـە بـەهۆکاری سـەرەکی ڕاپـەڕینی چەمچـەماڵ دادەنرێـت، ناوچـەی گـەرمیانی گرتبـۆوە و ئۆپەراسیۆنەکە لـە (٧-٢٠ نیسـانی سـاڵی ١٩٨٨) درێـژەی کێشـا، کـە سـنووری پەلامارەکانی ئەم قۆناغـە بریتیـی بـوو لـە (کـەرکووك، خورمـاتوو، کفـری، کـەلار، دەربەنـدیخان، زنجـیرە چـیای قـەرەداغ، سـەنگاو، تەکیـە، چەچـمەماڵ و قەرەهەنجیر). (ڕەسول: ٢٠٠٣ ،ل٩٣ .؛ قادر:٢٠٠٢،ل٥٣) ئەم ناوچە تووشبووانە بەهۆیەوە (٥٠٠) گونـدیان کـاولکران و هـەموو خانەوادەکانیشـیان دەستبەسـەر کـران و گواسترانەوە بۆ بیابانی ڕۆژئاوای عێـراق .( خورشید: ٢٠٠٧،ل١٥٦) بۆیـە ئـەم قۆناغـە بەگەورەترین و سامناکترین قۆناغەکانی ئەنفال هەژمار دەکرێـت، کـە هێرشـەکانی سوپای عێراق لەمیانەی ئەنفالی سێدا لەم قۆڵانەوە بوون :

- لە کفرییەوە بەرەو ئۆمەربل و عەزیز قادر
- لە کفرییەوە بەرەو دەراجی.
- لە کەلارەوە بەرەو تیلەکۆ و کوڵەجۆ.
- لە پێبازەوە بەرەو شێخ تەویل.
- لە دەربەندیخانەوە بەرەو درۆزنە.
- لە چیای قەرەداغەوە بەرەو تەپەکە ڕۆس.
- لە قادر کەرەمەوە بەرەو ئیبراهیم غولام.
- لە چیای قەرەداغەوە بەرەو درۆزنە.
- لە قەرەحەسەنەوە بەرەو تازەشار.
- لـە سـەنگاوەوە بـەرەو سـەرقەڵا. ( ڕەسـول: ٢٠٠٣ ، ل٩٩-١٠٠.؛ سـدیق: ٢٠٠٩ ، ل١٣٢-١٣٥) بەو جۆەر هێرشەکانی ئەم قۆناغە لە ناوەڕۆکدا خۆی لە سێ پـەلاماری جیاجیـا بـۆ ناوچـەکانی ئـەم دەڤەرانـە بینییـەوە، پـەلاماری یەکـەم بـۆ قـەزای خورماتوو، پەلاماری دووەم بۆ قادرکەرەمە و باکووری گەرمیان ، پەلاماری سێهەم

بـۆ سـەنگاو و باشـووری گـەرمیان ، کـە هێزەکـانی حکومـەتی بـەعس هـەموو پێکهاتەکانی سوپا و یەکەکانی لەم قۆناغەدا بـەکارهێنا. (صالح: هـەولێر، ٢٠٠٧،ل٦٢-٦٨) وەك هێزی کۆپتەر و هێزی فەوجەکان و جاشەکان، کە لەلایەن ( عمیـد روکـن بارق عبدالله حاجی حنطة )[٥] ، سەرپەرشتی دەکرا، (محمود: ساڵی٢٠٠٠، ل٣٠٧-٣٠٨ ) بەو شێوەیە پەلامارەکانی سوپای حکومەتی بەعس خەڵکەکەی والێکرد تەنیا یـەك ڕێگـەیان هـەبێت بـۆ دەرچـوون، کـە لـە شـوێنێکی دیـاریکراو کۆببنـەوە و لەوێـدا گـەمارۆیان بـدەن و دەسـتگیریان بکـەن، کـە لەوکاتـەدا چەمچـەماڵ مەڵبەنـدی کۆکردنەوەی گیراوەکانی باکووری گەرمیان بوو. ( دزەیی: ٢٠٠١ ،ل١٠٤-١٠٥)

لەلایەکی دیکـەوە حکومـەتی عێراقـی لـەو ڕۆژانـەدا کـە پیلانێکـی گـەورە و مەترسیداری بۆ لەناوبردنی خەڵکی کوردستان پیادە کردووە و ڕۆژانە بە بەرچاوی خەڵکییەوە کۆپتـەر هەسـتێنراوە و هێـزی سـەربازی زۆر و تانـك و تـۆپ و چـەکی قورس براونەتە سەر گوندەکان و هەواڵی کردەوە شەڕەنگێزییەکانی ئەو هێزانە لە خاپوورکردنی گوندەکان و راپێچکردنی خەڵکەکـەیان، لـە ڕێـی جـاش و مـەفرەزە خاسـەکان و خـەڵکی هـەڵاتووی گوندەکانـەوە کەوتۆتـە بـەرگوێی هاوواڵاتیـان، لەوانـەش هاوواڵاتیـانی دانیشـتووی قـەزای چەمچـەماڵ، کـە ڕۆژانـە بـۆ وەرگرتنـی هەواڵی خـزم و کەسـەکانیان چـوونەتە نـاو بـازاڕ و شـوێنی بـە یەکگەیشـتنی ئـەو شەقامانەی کە گوندە جیاوازەکانی سنوورەکەیان گەیاندۆتەوە بە ناوەندی قـەزای چەمچەماڵەوە، هەر لەوێدا ڕۆژانـە دەیـان کـاروانی گـەورەی خـەڵکی گونـدەکانیان بینیوە کە بە دەسگیرکراوی هێنراون و رەوانەی مۆڵگەکانی ئەنفال کراون. زۆربەی ئەو دەسگیرکراوانەش کە لە ڕۆژی (١١ی نیسان)دا هێنراونەتـە چەمچـەماڵەوە، لـە سـێ ڕۆژ بـەر لـەو ڕێکەوتـەوە لـە (گونـدی قـەرەتامۆر)ی نزیـك بـە چەمچـەماڵ وەستێنراون و کۆکراونەتەوە، خەڵکی چەمچەماڵیش لەڕێی ئـەو سەرچـاوانەوە کـە باسـکران زانیـاریی تـەواویان لـەبارەوە وەرگرتـوون و زانیویانـە کـە لـەو ڕۆژەدا دەگوازرێنـەوە بـۆ چەمچـەماڵ، زۆربـەی ئەوانـەش کـە بەشـداری ڕاپەڕینەکـەیان کردووە ئەوانە بوون کە خزم و کەسوکاریان لەناو ئـەو دەسـگیرکراوە کۆکراوانـەی (گوندی قەرەتامۆر)دا هەبووە و لـەناو ئۆتۆمبیلەکانـدا زیـاتر بەشـوێن کەسـوکاری خۆیانـدا گـەڕاون (چـاوپێکەوتن لەگـەڵ: سـدیق، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛ فـەرەج، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛

ئەحمەد، ٢١/ ١٢/ ٢٠١٧). لەو کاتـەدا هەڵواسـینی شـەرواڵ و جلـی ژێـرەوەی ئافرەتـە کـوردە دەسـگیرکراوەکان بـە قـەد ئیڤـا و ئۆتۆمبیلـە سـەربازییەکانەوە لەلایـەن کاربەدەسـتە سـەربازییەکانی حکومـەتی عێراقییـەوە بـە مەبەسـتی سـووکایەتی پێکردن، کارێك بووە کە خەڵکی چەمچەماڵی ئێجگار تـووڕە و نیگـەران کـردووە و وای لێکـردوون رووبـەڕووی ببنـەوە و بەڕوویـدا ڕاپـەڕن، بـێ گوێدانـە ئـەوەی کـە ڕاپەڕینەکەیان پڕکێشی کردنێکـی زۆر مەترسـیدار بـووە بـۆ سـەر ژیـانی خۆیـان و هەڵشاخان بووە بە رووی حکومەتێکدا کە لەو کاتانـەدا لەوپـەڕی بەهێزیـدا بـووە. (چاوپێکەوتن لەگەڵ: مەحموود ، ٥/ ٦/ ٢٠٠٦. ؛ ئیسماعیل ، ٦/٦/٢٠٠٦. ؛ قوربانی: ٢٠١٤،ل٢٥٠. ؛ ئەحمەد، ٥/٦/٢٠٠٦ )

هۆکـارێکی تـر کـە ڕۆڵـی کاریگـەری هـەبووە لـە جۆشـدانی خـەڵکی شـاری چەمچـەماڵ بـۆ ڕاپـەڕین بـە ڕووی ئەنجامـدەران و سەرپەرشـتیارانی پرۆسـەی ئەنفالدا، ئەو وتارە ئایینییە بەجۆش و کاریگەرانە بووە کە ژمارەیەك لـە مامۆسـتا ئایینییەکانی هەندێك لە مزگەوتەکانی شاری چەمچەماڵ لە وتاری ڕۆژانـی هەینیـدا لە کاتوساتی بەڕێوەچوونی پرۆسەی ئەنفالدا سەبارەت بەشیکردنەوەی سـوورەتی ئەنفال لە قورئانی پیرۆزدا پێشکەشیان کردووە، تیایدا ناڕەوایی پرۆسـەی ئـەنفالی دژ بـە کوردیـان بـۆ نوێـژخوێنانی مزگەوتـەکانیان ڕوونکردۆتـەوە و ناڕاسـتەوخۆ هانیـان داون بـۆ وەسـتان بـە ڕووی ئـەو پرۆسـە بـەدناوەدا و دژایـەتیکردنی پرۆسەکەیان بە (جیهاد) بۆ لە قەڵـەم داون[٦] . تەنانـەت دەوترێـت بەشـداریکردنی (قالە شێت)[٧] ئەو پیـاوەی کـە لەدواییـدا وەکـو پێشـەنگی سـەرەکی ڕاپەڕینەکـە ناسـرا، پەیوەنـدی بـە کاریگـەریی ئـەو وتارانـەوە هـەبووە. قالـە کـە ئـەوکات لـە مزگەوتی گەورەی پشـت قـەڵا ژیـاوە، لـەژێر کاریگـەریی ئـەو وتارانـە و بەهانـدانی پێش نوێژو وتارخوێنی ئەو مزگەوتە چووەتە کۆڕی خۆپیشـاندان و ڕاپەڕینەکـەی جەماوەری شاری چەمچەماڵەوە[٨].

## تەوەری دووەم: ڕۆژانی ڕاپەڕینەکەی چەمچەماڵ و دەسکەوتەکانی

### ١/ ڕۆژی راپەڕین ١١ی نیسانی ١٩٨٨ :

سەرەتای راپەڕینەکە بە خۆپیشاندانی ژمارەیەك قوتابی (قوتابخانەی دواناوەندی شەوانی چەمچەماڵ) دەستیپێکردووە کە پێکهاتبوون لە (لەتیف فاتح فەرەج و عەبدلرەحمان سدیق حوسێن و ئەحمەد عەزیز تۆراغ و عەلی سابیر و یاسین فخرالدین عارف و پۆلا سدیق حوسێن)، ئەوان وەکو خۆیان بانگەشەی بۆ دەکەن شەوی پێش روودانی راپەڕینەکە لە خانوویەکی چۆڵی گەڕەکی خانووە عەسکەرییەکان کۆبوونەتەوە و هەر لەوێدا بڕیاری سازکردنی خۆپیشاندانیان داوە. ئەو پاڵنەرە سەرەکییەش کە وای لێکردوون ئەو بڕیارە بدەن، بڵاوبوونەوەی دەنگۆی گواستنەوەی دەستگیرکراوە کۆکراوەکانی (گوندی قەرەتامۆر) بووە بۆ چەمچەماڵ، کە زۆربەیان وەك خۆیان ئاماژەی بۆ دەکەن کەسوکاری ئەوان و خزم و ناسیاوی دانیشتوانی شاری چەمچەماڵ بوون. (چاوپێکەوتن لەگەڵ: سدیق ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛ عەزیز، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧).

خۆپیشاندانەکە بە ڕێپێوان لە گەڕەکی خانووە عەسکەرییەکانەوە کە دەستیپێکردووە بەرەو ناو بازاڕی چەمچەماڵ، لە ڕێگا خۆپیشاندەران کە ژمارەیان لە پەنجەکانی هەردوو دەست تێپەڕی نەکردووە چوونەتە بەردەم (مزگەوتی حاجی حەمید ئەسعەد) بۆ داواکردنی بڵندگۆی مزگەوتەکە، بەڵام پێیان نەدراوە. (چاوپێکەوتن لەگەڵ : فەرەج، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧) دواتر خۆپیشاندەران درێژەیان بە ڕێپێوانەکەیان داوە تاکو گەیشتوونەتە دەروازەی بازاڕی چەمچەماڵ لەوێ (عەبدولقادر موحەممەد) ناسراو بە (قالە شێت) تێکەڵ بە ڕێپێوانەکە بووە و بە دەنگە دلێر و بەرزەکەی بووە بە بڵندگۆیی خۆپیشاندانەکە و گوڕ و تینی زیاتری پێ بەخشیوە و کارێکی کردووە کە خەڵکێکی زیاتری لە دەور کۆببێتەوە. لەناو بازاڕی چەمچەماڵ خۆپیشاندانەکە گۆڕاوە بە راپەڕین و لەلایەن بەشدارانەوە هەڵمەت براوەتە سەر ئەو ئۆتۆمبیلە سەربازییانەی بەناو شاری چەمچەماڵدا بڵاوەیان پێکراوە و لەدوورەوە بەردیان تێ گیراوە، (چاوپێکەوتن لەگەڵ: سدیق، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧) هەر لەوێدا (قالە شێت) بەدەم هاواری (هەستن جیهادە)وە هەڵمەتی بردۆتە پێشەوە و لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا ڕێگای بە ئیڤایەکی سەربازی گرتووە و

بەردێکی گەورەی کێشاوە بە جامەکەی پێشەوەیدا و شۆفێرەکەشی ناچارکردووە لە ئۆتۆمبیلەکەی بێتە خوارەوە. بە بینینی ئەو دیمەنە و هاواری (هەستن جیهادە)ی قالە شێت خەڵکێکی زۆری ئەو ناوە جۆشیان سەندووە و بەجارێك خرۆشاون و ئەوانیش کەوتوونەتە پەلاماردان و هەڵمەتبردن بۆ سەر ئەو ئۆتۆمبیلە سەربازییانەی خەڵکی گوندەکانیان بەدەسگیرکراوی گواستۆتەوە بۆ لیواکەی چەمچەماڵ. (چاوپێکەوتن لەگەڵ: ئەحمەد، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧)

دیمەنی پەلاماردانەکەی قالە شێت و هەڵمەتبردنی گەنجەکان هێندە دیمەنگەلێکی بوێرانە و کاریگەر بوون، بوونەتە ئیلهامی پارچە شیعرێك بۆ شاعیرێکی شاری چەمچەماڵ (لەتیف فاتح فەرەج — لەتیف بێباك) کە هەر لەو شوێنەدا رێکی خستووە و لەسەر پارچە مقەبایەك نووسیویەتیەوە و، هەر لەوێشدا بە مەبەستی زیاتر هاندانیان بەدەنگی بەرز لەلایەن (عەبدلرەحمان سدیق)ەوە بۆ خەڵکی ئەو دەوروبەرەی خوێندرایەوە کە تیایدا هاتووە:

ئەوا بەردی ئەم ولأتەش
وەکو بەردی فەلەستینی
بەدەست منالّی کوردەوە
لە هەڵمەتا رۆڵی بینی
- - -
ئەو بەردانەی تاکو دوێنێ
کەسێ نەبوو دەستیان لێدا
وا ئەمرۆکە بوونە گوللە و
زەنگی یاخیبوونیان لێدا
- - -
وا قالە شێت پێشەنگێکە
هاوار ئەکا ئەی خەڵکینە
ئەمرۆ رۆژی راپەڕینە
سەرشۆڕ مەکەن داوەشینە
ژینی سەرشۆڕی کەی ژینە. (فەرەج: ل٢٩—٣٠ — دەستنووس)

ناوەڕۆکی ئەم شیعرە دواتر کەوتۆتە دەست بەشدارانی راپەڕینەکە و هەندێك لە دێڕەکانی وەکو: (ئەی خەڵکینە، ئەمڕۆ ڕۆژی راپەڕینە، سەرشۆڕ مەکەن داوەشینە، ژینی سەرشۆڕی کەی ژینە) بوونەتە دروشمی سەرەکی راپەڕینەکە و بەردەوام بەسەر زاری بەشدارانەوە بووە و بەدەم هەڵمەتبردن و پەلاماردانەوە وتوویانەتەوە، (چاوپێکەوتن لەگەڵ: سدیق، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧) لەوکاتەدا ڕەنگدانەوەی زۆری بووە.

پەلاماری خەڵکی راپەڕیو لەناو بازاڕی چەمچەماڵ لە سەرەتادا لە شوێنێکدا دەستی پێکردووە نزیك بە بنکەی پۆلیسی شارەکە، بەڵام پۆلیسەکانی بنکەکە کە زۆربەیان کورد بوون وەکو پێویست بەرامبەریان لە خۆپیشاندەران و خەڵکە راپەڕیوەکە نەگرتووە، بگرە ئەوەندەی کە بۆیان کرابێت هاوکارییان کردوون و تیایاندا بووە هاوشێوەی بەشدارانی تری راپەڕینەکە پەلاماری بردووە و خەڵکی دەسگیرکراوی ئازاد کردووە[٩]. لەژێر کاریگەریی جموجووڵ و خۆپیشاندانەکانی ناو بازاڕی چەمچەماڵدا ژمارەیەك گەنجی دانیشتووی گەڕەکی کۆمەڵگای جووتیارانیش راپەڕینیان دەست پێکردووە، ئەوان کاتێك لەلایەن پیاوێکی چەکداری گەڕەکەکەیانەوە[١٠] ئاگادار کراونەتەوە لە هاتنی ئۆتۆمبیلێکی جۆری (وان)ی سەربازی کە پێنج کچی دەستەبژێری کوردی تێدا بووە و فەرماندەیەکی سەربازی بە پلەی (نەقیب) بۆ خۆی جیایکردووتەنەوە، بەتەواوی هەستی مرۆڤدۆستی و کوردایەتییان جووڵاوە و هەڵمەتیان بردووە و یەکێك لە گەنجەکان بەناوی (نازم حەمە ئینجە) سەر کەوتووەتە سەر ئۆتۆمبیلە (وان)ەکە و حەربەیەکی داوە لە تەوقەسەری (نەقیب)ەکە و برینداری کردووە و ئۆتۆمبیلەکەی بەدەستەوە وەرگەڕاندووە. بەو شێوەیە توانراوە هەر پێنج کچەکە ئازاد بکرێن و ڕێگەی هەڵاتنیان بۆ بکرێتەوە[١١].

سەرکەوتنی ئەم هەڵمەتە هاندەر بووە بۆ گەنجەکانی گەڕەکی کۆمەڵگای جووتیاران تا لە راپەڕین و پەلاماردان بەردەوام بن و بەرد و تایەیەکی زۆر ببەنە سەر شەقامی سەرەکی (سەنگاو — چەمچەماڵ) و بەتەواوی شەقامەکە بە ڕووی هاتوچۆی ئۆتۆمبیلەکاندا دابخەن، ئەمەش دەرفەتی بۆ ڕەخساندوون ئۆتۆمبیلێکی زۆر بوەستێنن و خەڵکە دەسگیرکراوەکەی سەریان دابگرنە خوارەوە و ئازادیان بکەن. (چاوپێکەوتن لەگەڵ: ئینجە، ١٢/١٩/ ٢٠١٧. ؛ محێدین، ١٢/١٩/ ٢٠١٧).

شـیاوی باسـە کـە لەهـەمان ڕۆژی ڕاپـەڕینی دانیشـتوانی چەمچـەماڵدا، دانیشـتوانی ئۆردوگـای شۆڕشـیش ڕاپـەڕینیان بـەرپاکردووە و بـە بـەرد و بـە دار هەڵمەتیان بردۆتە سەر کاروانی ئۆتۆمبیلـەکان و خـەڵکیان داگرتـووە، (چاوپێکەوتن لەگـەڵ: کاکەحەمـە، ٢١/١٢/ ٢٠١٧. ؛ قوربـانی: ٢٠١٤، ل١٣٥. ؛ چـاوپێکەوتن لەگـەڵ: محێـدین، ٢٠١٧/١٢/٢١ . ؛ فەرەج: ل٢٠- دەستنووس) بەڵام ئـەوەی کـە وایکـردووە ڕاپەڕینەکـە لـە چەمچەماڵ گوڕوتینی زیاتر بەخۆوە ببینێت، لەلایەکەوە پەیوەندی بـە تێکـەڵبوون و کۆبوونەوەی هەموو خەڵکە ڕاپەڕیوەکەی چەمچەماڵەوە هەبووە لە یەك شوێندا، کە ئەویش بەردەم بینـای (قوتابخانـەی فەلەسـتینی سـەرەتایی کـوڕان) بـووە لـە گەڕەکی کۆمەڵگای جووتیاران. لەلایەکی تریشەوە پەیوەندی بـە هاتنـە دەرەوەی قوتابیـانی قوتابخانـەکانی گـەڕەکی نـاوبراوەوە هـەبووە وەك (فەلەسـتین، ڕۆژ، برایان، ناوەندی ڕووناکی) کە سەرجەمیان بیناکانیان لە شوێنی ڕاپەڕینەکەوە زۆر نزیـك بـووە و لەگـەڵ دەرچـوونیان کـەوتوون بەسـەر ڕاپەڕینەکـەدا و تێکـەڵ بـە ڕووداوەکانی بوون، بە تێکەڵبوونیشیان هێندەی تر ڕاپەڕینەکەیان گەرم و گوڕتر و فراوانتر کردووە و کارێکیـان کـردووە تـا مەودایـەکی دوور کـاروانی ئۆتۆمبیلـە لـە ئەنفال بارکراوەکان ڕێگای دەرچوونیان لێ بگیرێت و ناچار بـە ڕاوەسـتان بکـرێن و لەلایـەن خەڵکـە ڕاپەڕیوەکـەوە هەڵمـەتیان ببرێتـە سـەر و خەڵکـەکانی سـەریان دابگیرێنـە خـوارەوە[12]. بـەو شـێوەیە بەدرێـژایی مـاوەی ڕاپەڕینەکـە کـە تـاکو عەسـرێکی درەنـگ درێـژەی کێشـاوە تـوانراوە بـە هـەزاران دەسـگیرکراو لـە ئۆتۆمبیلەکان بهێنرێنە خوارەوە و ئازاد بکرێن. (چاوپێکەوتن : سدیق، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛ فەرەج، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧) یەکێك لـە خۆپیشـاندەران دەڵێـت:" ڕۆژی ڕاپەڕینەکـە یـەکێك بـوو لـە ڕۆژەکـانی ڕەمـەزانی ئـەو سـاڵە، لەوکاتـەی ئێمـە هـەوڵی ئـازادکردنی گیراوەکانمان دەدا، پیاوێکی بەتەمـەن لـە پشـتی منـەوە دەیـوت: ئافـەرین ڕۆڵـە، کارەکـەی تـۆ لـە سـەد ڕۆژۆکـەی مـن خێـری زیـاترە". ( چـاوپێکەوتن لەگـەڵ: ئاغـا، ٢٠١٧/١٢/٢٥)

هۆکارێکی تـر کـە یارمـەتی سـەرکەوتنی ڕاپەڕینەکـەی چەمچـەماڵی داوە و هۆکـار بـووە بـۆ ئـەوەی پرۆسـەکە بـەبێ کوشـت و کوشـتار و خـوێن ڕشـتن بەڕێوەبچێت، پەیوەندی بەوەوە هەبووە کە بەشی هەرە زۆری ئـەو ئۆتۆمبیلانـەی

بۆ گواستنەوەی دەسگیرکراوەکان تەرخانکراون ئیڤا و ئۆتۆمبیلی سەربازی نەبوون، بەڵکو ئۆتۆمبیلی بە بێگارگیراوی مەدەنی بوون کە هیچ سەرباز و جاشێکیان لەگەڵدا نەبووە، شۆفێرەکانیان کاتێك کە بەچاوی خۆیان بینیویانە خەڵکی شاری چەمچەماڵ بەردیان بەدەستەوەیە و تەنانەت منداڵی بچووکیش پڕ کۆشیان لە بەرد کردووە و هەڕەشەی جام شکاندنیان لێکردوون، خێراو زۆر بەئاسانی خۆیان بەدەستەوە داوە و دەرگای ئۆتۆمبیلەکانیان بۆ خستوونەتە سەرپشت و ڕێگەیان داون بە ئارەزووی خۆیان دەسگیرکراوەکان دابگرنە خوارەوە. (ۆچ: ١٩٩٩ ،ل٢٢١-٢٢٢)

هاوکاری و پاڵپشتی بەشێك لە جاشەکان یا بەلایەنی کەمەوە ئەو بێدەنگییەی کە بەرامبەر بەراپەڕینەکە گرتوویانەتەبەر، هۆکارێکی تری پشت سەرکەوتنی راپەڕینەکەی چەمچەماڵ بووە. گەڕەکی کۆمەڵگای جووتیاران کە بووەتە چەقی راپەڕینەکە شوێنی کۆبوونەوەی ماڵی زۆربەی جاشەکانی چەمچەماڵ بووە، کەچی ئەوان نەك ڕێگرییان لە خۆپیشاندەران نەکردووە، بەڵکو هاوکارییان کردوون و هانیان داون بۆ بەردەوامبوون، تەنانەت دەوترێت پاسەوانی سەرۆك جاشەکان ژێر بە ژێر لەگەڵ شۆفێری ئۆتۆمبیلەکاندا ڕێکەوتوون و ئاگادارییان کردوون لەکاتی دروستبوونی قەرەباڵغیدا خۆیان ڕێنمایی دەسگیرکراوەکان بکەن بۆ راکردن و خۆدەربازکردن. (ۆچ: ١٩٩٩ ، ل٢٢٢)

لە بەرامبەر بەردەوامی راپەڕینەکە و بێ دەنگیی جاشەکاندا، (بارق عەبدوڵلا)ی فەرماندەی گشتی پرۆسەی ئەنفالی سێ بەناچاری هێزێکی زۆری لە کەرکوکەوە بۆ سەرکوتکردنی راپەڕینەکە هێناوە، ئەو دەسگیرکراوانەی کە لە بانی جەباری و ناوچەی قەرەحەسەن و قادرکەرەمەوە بە جادەی کەرکوکدا هێنراونەتە لیواکەی چەمچەماڵ شایەتحاڵی ئەو ژمارە زۆرەی سەرباز و مودەڕەعە و دەبابانەن کە لە ڕۆژی راپەڕینەکەدا جووڵەیان پێکراوە و یەك پارچە چواردەوری چەمچەماڵیان تەنیوە و هەموو سەر ڕێگاکانیان گرتووە. (عارف قوربانی: ب١، ٢٠٠٢، ل١٠١)

پاش گەیشتنی هێزە سەربازییەکان، دەسکراوە بە تەقەکردن لە خۆپیشاندەران و خەڵکی راپەڕیو، هەر ئەوکاتیش چەندین فڕۆکەی شەڕکەری

جـــۆری مـــێگ و هەلیکۆپتـــەریش بەئاسمانـــەوە بۆردومـــانی ئـــاپۆڕای خەڵکـــە ڕاپەڕیوەکـەیان کـردووە. (ۆچ: ١٩٩٩، ل٢٢٢) وەك پێشـتریش ئامـاژەی بـۆ کـرا لـە ئەنجامی بۆردومانی فڕۆکەکان و هەڵمەتی نارنجۆك و تەقەی هێزە سـەربازییەکانی سەر بەحکومەتدا، چەندین ماڵ بەرکەوتوون و چەندین کەسیش کوژراون و بریـندار بـوون و زیانیـان پێگەیشـتووە، لـە مـاڵی (فـەتاح حەسـەن) کـە ئـامر مـەفرەزە خاسەیەکی سەر بەحکومەتی نیشتەجێی گەڕەکی جووتیاران بووە کچێکی دوازدە ساڵی بـە نـاوی (فەهیمـە فـەتاح حەسـەن) بەرکـەوتووە و هـەر لەوێـدا گیـانی لـە دەسـتداوە و دوو ئۆتـۆمبیلی هـەمان مـاڵیش بـە نـارنجۆکی سـەربازەکان گڕیـان گرتووە و زیانیان پێگەیشتووە، لە ماڵی (سەید مەجید)یش کـە سـەرۆك جاشـێکی تری نیشتەجێی هەمان گەڕەك بـووە زیـان بـە چـەند ئۆتۆمبیلێـك گەیشـتووە، لـە چەند ماڵێکی تری شاری چەمچەماڵیشدا ژمارەیەك ئاژەڵ و ڕەشەوڵاغ بەرکەوتوون و تیاچـــوون. (ســـاڵەح: نیســـانی ٢٠٠٥ ،ل٢٠) لـــەکۆی گشـــتی دانیشـــتووانی شـــاری چەمچەماڵیش (١٢) کەس بەرکەوتوون و برینداربوون کـە بریتـی بـوون لـە (ماهیـە حەمیـد مـەحموود، حەبیبـە سـەعید حەمـە، ئـازاد حـاجی قـادر، مـەهاباد فـەتاح حەسەن، ڕەعنا حەسەن ساڵەح، ئەسعەد حەسەن ساڵەح، موحەممەد تـاهیر لالـە، عەدنان عومەر ڕەزا، ڕەعنا عەبدولڕەحمان، لەتیف عەبدولڕەحمان، خالد حەیدەر، سەید مەولوود) ، (چاوپێکەوتن لەگەڵ : لالە، ٤/ ٥/ ٢٠٠٦ . ؛ فـەرەج: ،ل ٢٠– دەسـتنووس) لـە بەرامبەر بەردەوامیی بۆردومانی کوێرانەی فڕۆکەکانیشدا ژمارەیـەك لـە جاشـەکان وەڵامیان داونەتەوە و تەقەیان لێ کردوون[١٣].

لەئەنجامی پیادەکردنی شێوازی توند و پەرچەکرداری بەهێزی بارق عەبدوڵلا و هێزەکەی و بۆردومانی توندی فڕۆکەکانـدا کۆتـایی بەڕاپەڕینـە جەماوەرییەکـەی خەڵکی چەمچەماڵ هێنرا، دوای ئەو هەنگاوەش هەڵمـەتێکی تونـدی ڕەشـبگیری و دەسـتگیرکردن دەسـتی پێکـردووە، ئـەو هەڵمەتـە کـە ڕۆژی ڕاپەڕینەکـە و ڕۆژی دواتریش درێژەی کێشاوە، تیایدا ژمارەیەك لە بەشدارانی ڕاپەڕینەکە و ژمارەیەکی زۆر خەڵکی بێتاوانیش ڕەشبگیرکراون و ڕەوانـەی لیـوای چەمچـەماڵ و لەوێشـەوە ڕەوانەی ئەمنی سلێمانی کراون و پـاش چـەندین مـانگ لـە بێسـەرو شـوێن بـوون، ئەوسا هەندێکیان بە بەرتیل و هەندێکیشیان بـەر ئـەو لێخۆشـبوونە کـەوتوون کـە

(سەدام حسێن)ی سەرۆك كۆماری عێراق بەهۆی كۆتاییهاتنی شەڕی هەشت ساڵەی (عێراق – ئێران) (١٩٨٠–١٩٨٨) ەوە دەری كردووە. (چاوپێكەوتن لەگەڵ: مەحموود، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛ مەولوود ، چەمچەماڵ، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛ چاوپێكەوتن لەگەڵ: خان، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧)

هەر لە میانەی هەڵمەتی ڕەشبگیری هێزە عێراقییەكاندا گەڕانی ورد كراوە بەدوای ئەو دەستگیركراوانەدا كە لەسەردەستی خەڵكی ڕاپەڕیوی چەمچەماڵ ئازادكراون و لە بڵندگۆی مزگەوتەكانەوە بانگەوازیان بۆ كراوە تا لە زووترین ماوەدا خۆیان بە هێزە ئەمنییەكان بناسێنن، بەپێچەوانەوە لەهەر ماڵێكدا بگیرێن خانووەكەیان بەسەردا دەڕووخێنرێت و بەئێرانی هەژمار دەكرێن. (عارف قوربانی: ب ١، ٢٠٠٢ ، ل١٥٧) بەڵام هەموو ئەو هەڕەشانە دانیشتووانی چەمچەماڵیان نەترساندووە و لە هاوكاریكردن و حەشاردانی ڕزگاركراوەكان ساردی نەكردوونەتەوە و لە تێكڕای چەمچەماڵدا جگە لە چەند ڕزگاربوویەكی كەم نەبێت كە لەسەر خواستی خۆیان بەدەم ئەو بانگەواز و هەڕەشانەوە چوون و خۆیان ڕادەست كردووە باقی ئەوانی تر كە زۆرینەی ڕزگاركراوەكان بوون درێژەیان بە خۆشاردنەوە لە حكومەت و دەزگا ئەمنییەكان داوە تا ئەوكاتەی دۆخەكە ئارام بووەتەوە و لێخۆشبوونی گشتی دوای كۆتاییهاتنی شەڕی (عێراق – ئێران) بۆ هەڵاتووەكان دەرچووە[١٤].

٢/ **دەسكەوتەكانی ڕاپەڕینەكە:** تەواوی دەسكەوتەكانی ڕاپەڕینی ١١ی نیسانی ١٩٨٨ی چەمچەماڵ بەم جۆرە پۆلێن دەكرێت:

١. یەكێك لە دەسكەوتەكانی ڕاپەڕینەكەی چەمچەماڵ توانراوە ژمارەیەكی بەرچاو خەڵكی دەسگیركراو ئازاد بكرێن، بەجۆرێك گەر دەسگیركراوی گوندەكانی چەمچەماڵ و سەنگاو و ئەو گوندانە بەنموونە وەربگیرێن كە پاش دەسگیركردنیان بە جادەی (سەنگاو – چەمچەماڵ)دا گواستراونەتەوە بۆ مۆڵگە و زیندانەكانی تایبەت بە ئەنفالكراوان، ئەوە تێبینی دەكرێت كە ژمارەی ئەنفالكراوانی ئەو گوند و ناوچانە بە بەراورد بە گوند و ناوچەكانی تری كوردستان زۆر كەمترە لەڕووی ژمارەوە. بەگوێرەی ڕاپۆرتەكانی (كۆمیتەی بەرگری لە مافەكانی قوربانییانی

ئەنفال) ژمارەی ئـەنفالکراوانی سـنووری ناوەنـدی قـەزای چەمچـەماڵ بـە (٥٦٤٥) کـەس و ئـەنفالکراوانی ناحیـەی سـەنگاو (٤٩٢٢) کـەس سـەرژمێرکراوە. بـەڵام ژمارەی ئەنفالکراوانی ناحیەیەکی وەکو ناحیـەی قادرکـەرەم (١٤٨٦٣) کـەس لـە قەڵـەم دراوە، لەکاتێکـدا کـە ئـەو ناوچـانەش شـار و شارۆچـکەی دەوروبـەری چەمچـەماڵ بـوون و لـە هـەمان پرۆسـەی (ئـەنفالی سـێ)دا دەسـتی ئـەنفاليان پێگەیشتووە. ئەو ڕێژەیەش لە ئەنفالکراوانی خەڵکی ناوچە و گوندەکانی سـەر بـە قەزای چەمچەماڵ و ناحیەی سەنگاو بەشێکی زۆریان ئەوانە بوون کـە لـە تەمـەنی سەربازیدا بوون و پاش گەیشتنیان بە شارەکان لەسەر خواستی خۆیـان ڕادەسـتی سەرۆک جاشەکان کراون و ئەنفالکراون.

٢. ڕاپەڕینەکەی دانیشتووانی چەمچەماڵ، کاربەدەستانی حکومەتی عێراقـی بەجۆرێك ترسـاندووە کـە لـەدوای ئـەو ڕاپەڕینـەوە چـیتر هـیچ دەسـگیرکراوێکیان نەهێناوەتــە چەمچــەماڵ. ئــەو دەســگیرکراوانەش کــە لــە لیــوای چەمچــەماڵ کۆکراونەتەوە لە هەمان ڕۆژی ڕاپەڕینەکەدا بڕیاری گواستنەوەیان بـۆ دەرکـردوون و هەر ئەو ڕۆژە دەسـتیان کـردووە بـە گواسـتنەوەیان بـۆ مۆڵگـەکانی ئـەنفال لـە تۆپزاوە، ئەویش لەژێر چاودێری و پاسەوانی توندی سـەربازیدا. (قوربـانی: ب٢٠٠٢،١، ل١١٧. ؛ قوربانی: ب٢، ٢٠١٤، ل٢٣٤. ؛ قوربانی: ٢٠٠٣، ب٣، ل١٣٤)

٣. ڕاپەڕینەکە ڕۆڵی گەورەی هەبووە لە وریاکردنـەوەی خـەڵکی گونـدەکانی ناوچەکە بەرامبەر بە پڕوپاگەندەکانی حکومەتی عێراقی بەوەی کە لـە شـار زەوی و پارەیـان بەسـەردا دابـەش دەکـات، بۆیـە لـەو ڕۆژە بـەدواوە ئەوەنـدەی بۆیـان کرابێت خۆیان ڕادەستی هێزەکانی حکومەت نەکردووە و زیاتر بەلا ڕێگاکانـدا نـەك ڕێگا سەرەکییەکاندا خۆیان گەیاندووەتە شارەکان و لەماڵی خزم و ناسیاوەکانیان خۆیان حەشار داوە تاکو ئاساییبوونەوەی دۆخەکە.

٤. ڕاپەڕینەکە لەڕووی مۆراڵییەوە، ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەی زیندوو کردۆتەوە کە حکومەتی عێراقی لە ڕێگەی پیادەکردنی سیاسەتی پەرتکـە و زاڵبـە (فـرق تسـد) تاڕادەیـەکی زۆر کـاڵی کردبوونـەوە، تەنانـەت لـەنێوان دانیشـتووانی گەڕەکەکانی ناو چەمچەماڵدا و کارێکی کردبوو، کە جۆرێك لە جیاوازی و لێکدابڕان بەتایبەت لەنێوان گەڕەکی کۆمـەڵگای جووتیـاران و گەڕەکـەکانی تـری شـارەکەدا دروست بکات. (ساڵەح: نیسانی ٢٠٠٥، ل٢٠)

٥. یەکێکی دیکە لە دەسکەوتەکانی ڕاپەڕینی چەمچەماڵ، بەشێك لە ناوچەکانی دەوروپشتی چەمچەماڵ توانییان بەر لەوەی پرۆسەی ئەنفال پێیان بگات ناوچەکانی خۆیان چۆڵکرد و خۆیان دەرباز کرد، وەك ناوچەی هەمەوەند. (چاوپێکەوتن لەگەڵ: سدیق، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧)

٦. ڕاپەڕینی ١١ی نیسانی ١٩٨٨ ی چەمچەماڵ هانی خەڵکی شارەکانی باشووری کوردستانیدا کە دەرگای ماڵەکانیان بکەنەوە بۆ خەڵکی گوندەکان کە پرۆسەی ئەنفال روو بە ڕوویان ببۆوە، لەلایەکی دیکەوە ئەوەی دووپات کردەوە کە حکومەتی بەعس هەرچەند بەتوانابێت ناتوانێت کورد لەناوببات، گەلی کوردیش بەپێی هەلومەرجەکە چۆکی دانەناوە و بەردەوام بەرگری کردووە.(سدیق: ساڵی ٢٠١٦، ل٨– دەستنووس)

**٣/ هەڵسەنگاندێك بۆ ڕاپەڕینی (١١ی نیسانی ١٩٨٨ ز.) شاری چەمچەماڵ:**

لەکاتی هەڵمەتی پرۆسەی ئەنفالدا گەلێ کاری خۆرسك و بوێرانە لەسەر ئاستی تاك و لەسەر ئاستی کۆمەڵ روویانداوە چ لەلایەن جاشەکانەوە یان لەلایەن خەڵکی ئاسایی شار و شارۆچکەکانی کوردستانەوە، بەهۆیانەوە ژیانی زۆر کەس سەندراوەتەوە و رزگارکراوە. وەك ئەو هەوڵەی لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٨٨ ز. لە میانەی ئەنفالی چواردا لە ئاستێکی زۆر بچووکدا لە شارۆچکەی کۆیە روویداوە، بەڵام هیچ کام لەو هەوڵانە بەراورد ناکرێت لەگەڵ ئەو گوڕم و بەدەنگەوە هاتنەی کە دانیشتوانی شاری چەمچەماڵ لە (١١)ی نیسانی ١٩٨٨ز. ئەنجامیانداوە کاتێ کە هاوخوێنە کوردەکانی خۆیان بینیوە بەسەر ئیڤاوە بە شەقامەکاندا گێڕدراون. (ۆچ:١٩٩٩،ل٢٢١)

کەواتە دەکرێت ڕاپەڕینەکەی (١١)ی نیسانی ١٩٨٨ ز. دابنرێت بە یەکێك لە ڕاپەڕینە هەرە گرنگ و کاریگەرەکانی مێژووی شاری چەمچەماڵ و تەواوی مێژووی باشووری کوردستان، نەك تەنها لەبەرئەوەی کە یەکێك لە هەرە دیارترین و دەگمەنترین بەرەنگاربوونەوە و بەگژاچوونەوەی ناوازەی جەماوەری خەڵکی کوردستان بووە بەڕووی هەڵمەتەکانی ئەنفالدا و بەهۆیەوە توانراوە ژمارەیەکی زۆر ژن و پیاو و گەورە و منداڵ لە پرۆسەی ئەنفال بهێنرێتە دەرەوە و رزگار

بکرێت، بەڵکو بەهۆی ئەوەش کە ڕاپەڕینەکە هەڵچوونێکی جەماوەری خۆرسك و پڕکێشییەکی بێهاوتا و ژیانی خۆخستنە مەترسی دانیشتوانی بێ چەکی شاری چەمچەماڵ بووە کە دەستی هیچ حیزب و لایەنێکی سیاسی لە پشتەوە نەبووە، هەرچەندە هەندێك حیزب و لایەن ئەیانەوێت خۆیانی لێ بکەن بەخاوەن و وای نیشان بدەن کە گوایە لەلایەن ڕێکخستنەکانی ئەوانەوە نەخشەڕێژی بۆ کراوە و سەرپەرشتی کراوە، (چاوپێکەوتن لەگەڵ: شێخ کاکەحەمە، ٢١/١٢/ ٢٠١٧) بەڵام لەڕاستیدا لە ئانوساتی ڕوودانی ڕاپەڕینەکەدا هێزی چەکداری حیزبە کوردییەکان لە مەیدانی شەڕ و بەرگریدا توانای شەڕو بەرەنگاربوونەوەیان نەمابوو، چ جای ئەوەی ڕێکخستنەکانی ناو شاریان لە جێگەی خۆیاندا مابن و لێکنەترازابن و توانای ئەوەیان مابێت کار و چالاکی لەم جۆرە بە ئەنجام بگەیەنن. (مەحموود سەنگاوی) یەك لە فەرماندە پارتیزانە دیارەکانی (ی. ن. ك) لە ناوچەکەدا بێ ئاگایی خۆی و حیزبەکەی لە ڕاپەڕینەکەی چەمچەماڵ رادەگەیەنێت . (بڕوانە// سەنگاوی : ٢٠٠٤)

ئەوەی بواری ڕەخساندووە بۆ حیزبەکان دەروازەی بانگەشەکردنی خاوەندارێتی ڕاپەڕینەکەیان بۆ بکرێتەوە، ئەوە بووە کە لەکاتی ڕووداوەکانی ڕاپەڕینەکەدا بەشێك لە بەشداران بۆ بەرزکردنەوەی ورەی جەماوەر و هاندانیان بۆ بەشداری و بەردەوامیدان، بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە گوایە پێشمەرگە لە نزیك شارەکەن و لەگەڵ بەردەوامبوون و فراوانبوونی خۆپیشاندانەکاندا بۆ پشتیوانیکردنی لە خەڵکی ڕاپەڕیو دێنە شارەوە. (چاوپێکەوتن لەگەڵ: فەرەج ، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧)

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناکرێت نکۆڵی لەوە بکرێت کە ئەنجامدانی ڕاپەڕین لە شارەکاندا دژ بە پرۆسەی ڕووخاندنی گوندەکان پێشتر واتە پێش ئەوەی هێزە چەکدارەکانیان ڕووبەڕووی ئەو هەموو شکستانە ببنەوە لە بەرنامەی هەندێك لە حیزبە کوردییەکاندا هەبووە و نەخشەڕێژی بۆ کراوە تا ئاستی ئەوەی کە لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانی حکومەتی عێراقییەوە ئەو جموجووڵانە هەستی پێکراوە و کاریش کراوە بۆ بەرپێگرتن و ڕێگری لێکردنیان، ئەم بابەتەش زۆر بەڕوونی لە یەکێك لە برووسکەکانی بەڕێوەبەریەتی ئەمنی پارێزگای سلێمانیدا ڕەنگیداوەتەوە کە ئاراستەی گشت بەڕێوەبەریەتی ئەمنی سەر بە پارێزگای سلێمانی کراوە و

تیایدا هاتووە: ((لە نیـەتی دانیشـتوانی قـەزاکانی کـەلار و دەربەنـدیخان و شـاری سـلێمانیدا هەیـە خۆپیشـاندانی نـاڕەزایی ڕێکبخـەن دژ بـە بڕیـاری بـەڕێ و جێـی سەرکردایەتی سیاسیمان سەبارەت بە ڕاگواستنی گوندە کوردییەکان، ئەوەش بـە پاڵپشـتی بـەکرێگیراوانی ئێرانـی کـە هانـدەری سـەرەکی خـەڵکی ناوچـەکەن بـۆ خۆپیشاندان لەڕێی بەکارهێنانی هێز و هەڕەشەکردنەوە، پلانیش دانـراوە لـەکاتی ڕێگریکردن لێیان لەلایەن دەسەڵاتەوە ئەوسا فەوجەکانی بەرگری نیشتمانی بچـنە پاڵ خۆپیشـاندەران و ڕووبـەڕووی هێزەکـانی حکومـەت ببنـەوە ....)).( مدیریة امن محافظـة السـلیمانیة/ش٣، ٧/ ٦/ ١٩٨٧) بــە حــوکمی ئــەوەی کــە زانیاریـیــەکانی نــاو برووسکەکە لەگەڵ هەندێك لە ڕووداوەکـانی خۆپیشـاندانەکە و ڕاپەڕینەکـەی ڕۆژی (١١ی نیسـانی ١٩٨٨ ز.) شـاری چەمچـەماڵدا یەکدەگرێتـەوە، بەتایبـەت ئـەوەی پەیوەندی بە هەڵوێستی بەشێك لە جاشـەکانەوە هەیـە بەرامبـەر بـە ڕاپەڕینەکـە، دەکرێت بڕوا بهێنرێت بە ئامادەبوونی تارمایی ڕێکخسـتنەکانی بەتایبـەت سـەر بـە (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) لە ڕاپەڕینەکـەدا هەرچـەندە کـە ئـەو ئامادەبوونـە ئامادەبوونێکی زۆر کەم و سنوورداریش بووە.

دەوترێـت لــە ئانوسـاتی بـەرپابوونی ڕاپەڕینەکـەی چەمچـەماڵدا خــەتێکی ڕێکخستنی سەر بە (ی. ن. ك) بەناوی خـەتی (شـەهید پێشـڕەو) سـەر بـە (پـۆلی ڕێکخستنی باسەڕە)ی ئەو حیزبە لەکارکردن بەردەوام بـووە و هێشـتا ڕایەڵـەکانی بـە تـەواوەتی لـێکتر نـەترازاون و لـە ژێـر کاریگـەریی ڕێنماییـیـەکانی پێشـووتری حیزبەکەیاندا، نەك ئەوەی لە ڕۆژانی نزیکی پێش ئەنجامدانی ڕاپەڕینەکەدا داوایان لێکرابێت، هەندێك جووڵەیان نوواندووە لـە کۆبوونـەوەکردن و خـۆ ئامـادەکردن و پەیوەندیکردن بە سەرۆك جاشەکانەوە، هەر ئەوانیش لەڕێی (شێخ مەهـدی تـاهیر شێخ کاکە حەمە)ی لێپرسراویانەوە ڕووداوەکانی ڕاپەڕینەکەیان کردووە بە هـەواڵ و بۆ (ئێزگەی دەنگـی گـەلی کوردسـتان)ی زمانحـاڵی (ی. ن. ك)یـان نـاردووە[١٥]، بەڵام وەك ئاماژەی بـۆ کـرا ئـەو جووڵـە و ئامادەسـازییەی لـە مەیـدانی سـەرەکی ڕاپەڕینەکـەدا زۆر بەکـەمی ڕەنگیداوەتـەوە و هەسـت بـە کاریگـەرییـەکانی کـراوە. (چاوپێکەوتن لەگەڵ : سدیق، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛ فەرەج، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛ ئینجە ، ١٢/١٩/ ٢٠١٧)

ڕاپەڕینــە جەماوەرییەکــەی شــاری چەمچــەماڵ ڕاپــەڕینێکی مەدەنیانــەی خۆڕسـك و گوزارشـتێکی جـوانی خـەباتی ناوشـارەکان بـووە و لـە کاتوسـاتێکدا ئەنجام دراوە کە حکومەتی عێراقی لە لووتکەی هێزو دەسەڵاتیدا بووە و خـاوەنی پشتیوانی مادی و مەعنەوی گەورەی زۆربـەی زۆری وڵاتـانی جیهـانی و هـەرێمی و عـەرەبی بـووە و هەرچییەکی کردبێـت و هـەر کوشتوکوشـتارێکی ئـەنجام دابێـت ڕەوایی پێدراوە و بیانووی بۆ هێنراوەتەوە. لـە بەرامبـەردا میللـەتی کـورد بـەدەر لـەوەی هـیچ پشـتیوانییەکی دەرەکـی نـەبووە، لەناوخۆشـدا هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان لەوپـەڕی لاوازیـدا بـووە و توانـای هـیچ جـۆرە بەرگرییـەکی ئـەوتۆی نەماوە. خەڵکی ڕاپەڕیویش جگە لـە هێـز و بـازوو و تـووڕەیی خۆیـان چـاوەڕوانی گەیشـتنی هـیچ پشـتیوانی و کۆمـەکێکیان لـە هـیچ کـەس و لایـەنێك نـەکردووە. (چاوپێکەوتن لەگەڵ: سدیق ، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛ فـەرەج ، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛ ئینجـە، ١٢/١٩/ ٢٠١٧. ؛ محێدین ، ١٢/١٩/ ٢٠١٧)

گرنگییــەکی گــەورەی تــری ڕاپەڕینــە جەماوەرییەکــەی شــاری چەمچــەماڵ لەوەدا بووە کە لە بارودۆخێکدا بەرپاکراوە کە باشووری کوردستان بەشـێوەیەکی گشتی لەژێر کاریگەریی هەڵمـەتێکی پڕوپاگەنـدەی ڕاگەیانـدنی چەواشـەکارییانەی تونـدی حکومـەتی عێراقیـدا بـووە بـەوەی کـە واخراوەتـە هـزری خەڵکییـەوە کـە مەبەست لە پرۆسەی ئەنفال ناونووسکردنی خەڵکی گوندەکان و نیشتەجێکردنیانە لە شارەکاندا، نەك ئەوەی مەبەست لێی لـەناوبردن و شـوێن بزرکردنیـان بووبێـت. ئەمەش کارێکی کردووە کە خەڵکە ڕاگوێزراو و دەسگیرکراوەکەش وەکو پێویسـت پشــتگیری و پشــتیوانی لــە ڕاپەڕینەکــە نەکــەن و هەرچــەندە خۆپیشــاندان و ڕێگرییەکانی خەڵکی چەمچەماڵ بۆ ڕزگارکردنی ئەوان بـووە، کەچـی زۆربـەیان بـە زۆریش لە ئۆتۆمبیل و ئیڤا سـەربازییەکان دانەبـەزیون و نەهاتوونەتـە خـوارەوە و خەڵکە ڕاپەڕیوەکەیان بە ڕێگر زانیوە لەبەردەم گەیشتنیان بـە نیشـتەجێبوون لـە کۆمەڵگاکان و دابەشکردنی پارە و زەوی بە سەریاندا[١٦]، لەم بارەیەوە بۆ نموونـە یـەك لـە ڕاگوێزراوەکـان بـاس لـەوە دەکـات و دەڵێـت: ((ئێمـە ئـەو سـێ ڕۆژە لـە قــەرەتامۆر پێیــان وتبــووین لــە شــار موجەمــەعتان بــۆ دەکرێتــەوە و تــەعویز دەکرێنەوە، بۆیـە خواخوامـان بـوو ئـەو خەڵکـە پێشـی سـەیارەکانمان بـەردەن و

وازمـان لێ بێـنن)).( عـارف قوربـانی: ب٢، ٢٠١٤، ل١٣٥) جـا لەکاتێکـدا کـە کاریگـەری پڕوپاگەندەکانی حکومەتی عێراقی بەو شێوەیە بووە دانیشتوانی چەمچەماڵ هـەر زوو درکیان بە بەتاڵی و بێ بنەمایی ئەو جۆرە پڕوپاگەندانە و مەبەستی سـەرەکی حکومـەت و مەترسـییە گـەورەکانی پشـت پرۆسـەی ئـەنفال کـردووە و بـە ڕوویـدا ڕاپــەڕیون و کاریشــیان لەســەر ئــەوە کــردووە خەڵکــە دەســگیرکراوەکان لــەو مەترسییانە ئاگادار بکەنەوە و هاوکارییان بکەن بۆ ڕاکردن و خۆ دەربـازکردن لـەو پرۆسە مەترسیدارە.

بـوێریی ئەنجامـدەرانی ئـەم ڕاپەڕینـە لـەوەدا بـووە کـە نەترسـاون لـە هـەر کاردانەوە و پەرچەکردارێك کە چاوەڕوانکراو بووە ڕووبەڕوویان ببێتەوە، لەکاتێکدا زۆرباش ئـەوەیان زانیـوە کـە پەرچـەکردارەکانی حکومـەت زۆر قـورس و کاریگـەر دەبـن، چـونکە ڕۆژی ئەنجامـدانی ڕاپەڕینەکـەیان لـە (١١ی نیسـانی ١٩٨٨ ز.) لەگەڵ ڕۆژی کیمیابارانکردنی شـاری هەڵەبجـە لـە ڕۆژی (١٦ی مـارتی ١٩٨٨ ز.)و کیمیابارانکردنی گوندەکانی سێوسێنان و جافەرانی ناوچەی قەرەداغ لە ڕۆژەکانی (٢٢ و ٢٣)ی مارت و هەروەها کیمیابارانکردنی گوندەکانی سەر بە قەزای دووکـان و دۆڵی خەلەکان لە هەمان ئـەو ماوەیـەدا، نێوەنـدیان ئەوەنـدە زۆر نـەبووە. وەك چـاوەڕوانکراویش بـووە ئەگـەری کیمیابـارانکردنی شـاری چەمچـەماڵ ئەگـەرێکی کـراوە بـووە و یـەکێك بـووە لـە بـژاردەکانی حکومــەتی عێراقـی و، وەك دواتـر ئەفسەرێکی ئەمنی حکومەتی عێراقـی دانـی پێـدا نـاوە لەبەرامبـەر درێژەکێشـانی ڕاپەڕینەکەدا ئامادەکاری تەواو کراوە بـۆ ڕژانـدنی. (چـاوپێکەوتن لەگـەڵ : ئاغـا، ٢٠١٧/١٢/٢٥) لـەوەش زیـاتر زۆربـەی زۆری خــەڵکی شـاری چەمچـەماڵ بـەگوێی خۆیان گوێبیستی ئەو هەڕەشە و گوڕەشانە بوون کە دەزگا ئەمنییەکانی شـارەکە لە شەوی دوای ڕاپەڕینەکەدا بە بڵندگۆ بانگەوازیان بۆ کردووە و تیایدا هەڕەشـەی بەکارهێنانی چەکی قورسیان کردووە ئەگەر بێتو وەك ئەوان گوتوویانـە درێـژە بـە خۆپیشـاندان و کـارە تێکدەرانـەکانیان بـدەن. (چـاوپێکەوتن: سـدیق، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛ فەرەج، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛ ئینجە ، ١٢/١٩/ ٢٠١٧. ؛ محێدین ، ١٢/١٩/ ٢٠١٧.)

دانیشتووانی شاری چەمچەماڵ نەك بەتەنها بوێرییان نوانـدووە لـە ڕووبـەڕوو بوونـەوەی هێزەکـانی سـەر بەحکومـەت و ڕزگـارکردنی ژمارەیـەکی زۆر خـەڵکی

دەسگیرکراودا، بەڵکو جوامێریی زۆر گەورەشیان نواندووە لە لەباوەش گرتنی ئەو خەڵکە ئازاد کراوانەدا و سەرەڕای هەڕەشەکانی دەزگا ئەمنییەکان دەرگای ماڵەکانیان بەڕوودا ئاواڵا کردوون و لە سەرووی خۆیانەوە جێگە و ڕێگەیان بۆ دابینکردوون، لەو ڕۆژانەدا تەنانەت زۆر لە دووکانەکانی ناو بازاڕی شارەکەش بوونەتە شوێنی خۆ حەشاردان و مانەوەی خەڵکە ئازادکراوەکان(١٧). هەر لە ڕۆژی ڕاپەڕینەکەدا چەندان شۆفێر بە ئۆتۆمبیلەکانیان بە لێشاو خەڵکی ئازادکراویان لەپشتی ئۆتۆمبیلەکانیان بارکردووە و لە شوێنی ڕاپەڕینەکە دووریان خستوونەتەوە و بەسەر گەڕەکە جیاوازەکانی چەمچەماڵدا دابەشیان کردوون.
(چاوپێکەوتن لەگەڵ: مەولوود ، ٢٥/ ١٢/ ٢٠١٧. ؛ ڕەحیم ، ٢٥/ ٤/ ٢٠٠٦)

**ئەنجام:**

یەکــەم : خــاپوورکردنی شــارەدێ و دێهاتــەکانی قــەزای چەمچــەماڵ و دەستبەســەراگرتنی ســامان و ســووتاندنی باخچــە و کــارە کشــتوکاڵییەکان و بەتاڵانبردنی سامانی ئـاژەڵی و تێکدانی کانیـاو و مزگـەوت و تـەواوی سەرچاوەکانی ژیان ، دواتریش لە ناوەندی قەزاکەدا دەستکرا بـە بەعسـاندنی دانیشـتوان بەڕێگـەی جۆراو جۆر کە هەموو فشارێکی تیایدا بەکاردەهات، کە بەفاکتەری لاوەکی راپـەڕینی ساڵی ١٩٨٨ ی چەمچەماڵ هەژمار دەکرێت.

دووەم: لـەپێناو شـێواندنی ڕێـژەی دابەشـکردنی جوگرافیـای نەتـەوەیی لـە ناوچــەکانی باشــووری کوردســتان ، حکومــەتی بەعســی عێــراق شــێوازی بــاڵ و بەسـتنەوەی کـارگێڕی قـەزای پارێزگاکـانی بـەکارهێناوە، وەك گواسـتنەوەی قـەزای چەمچەماڵ لە پارێزگای کەرکووکەوە بۆ سەر پارێزگای سـلێمانی . ئـەم سیاسـەتەش بەشێوەیەك بوو کە لە بەرژەوەنـدیی سیاسـەتی بەعەرەبکردنـدا بکەوێـتەوە ، بـەبێ ئـەوەی رەچـاوی هـیچ بنـەما و پێوانەیـەکی نەخشەکێشـی بـۆ ئـەو گۆڕانکارییانـە دانرابێت.

سێیەم : پرۆسەی ئـەنفال بەگشـتی و ئـەنفالی قۆنـاغی سـێیەم لـەنێوان (٧ – ٢٠)ی نیسانی ١٩٨٨ بەتایبەتی ، کە بەهۆکاری (لەناوبردن و گۆڕینی نەتەوەی کـورد و سەرکوتکردنی شۆڕشەکانیان ، ئەنفال وەك پرۆسەی راگواسـتن و بەعـەرەبکردن و بەعساندن و هەڵتەکاندنی ژێرخانی ئابووری باشووری کوردستان و سڕینەوەی هـزر و شێواندنی کلتووری کورد ... تـاد) ، بەفاکتـەری راسـتەوخۆ و دەسـتپێکی سـەرەکی راپەڕینی چەمچەماڵ دادەنرێت لە ساڵی ١٩٨٨دا.

چـوارەم : راپـەڕینی جـەماوەری چەمچـەماڵ لـە سـاڵی ١٩٨٨ دا، راپـەڕینێکی مەدەنییانـەی خۆڕسـك و گوزارشـتێکی جـوان و دروسـتی خـەباتی شـارەکان بـووە، لـەکات و سـاتێکدا ئەنجامـدراوە کـە حکومـەتی بەعسـی عێـراق لـە لووتکـەی هێـز و دەسـتەڵات بـووە و خـاوەنی پشـتیوانی مـاددی و مەعنـەوی گـەورەی زۆری وڵاتـانی جیهانی و هەرێمی و عەرەبی بووە و هەر کارێکی بکردایـە لـە کوشـتار و کۆمـەڵکوژی رەوایەتی پێدراوە.

پێنجەم: راپـەڕینی چەمچـەماڵ لـە سـاڵی ١٩٨٨ دا لـەکاتی پرۆسـەی ئەنفالـدا بەگشتی و ئەنفالی قۆناغی سێ بەتایبەتی، کارێکی ئێجگار بوێرانەیـە لەسـەر ئاسـتی تاك و لەسەر ئاستی کۆمەڵ، بەهۆیەوە ژیـانی هـەزاران کـەس لـە مردنێکـی مسـۆگەر ڕزگارکراوە.

**بەڵگەنامەی ژمارە (١):**

رقـم ٦٠٨

استنادا الى احكام المادة الخامسة من قانون المحافظات رقم (١٥٩) لسنة ١٩٦٩ المعدل ، وبناء على ماعرضه وزير الداخلية .

رسمنا بما هو آت : ـ

١ ـ فك ارتباط قضائي جمجمال وكلار من محافظة كركوك ، والحاقهما بمحافظة السليمانية .

٢ ـ فك ارتباط قضاء كفري من محافظة كركوك ، والحاقه بمحافظة ديالى .

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسوم .

كتب ببغداد في اليوم الثاني من شهر ذي القعدة سنة ١٣٩٥ المصادف لليوم السادس من شهر تشرين الثاني سنة ١٩٧٥ .

احمد حسن البكر
رئيس الجمهورية

١٩٧٥/١٢/١٥

**پەراوێزە ڕوونکراوەکان:**

[١] بۆ زانینی ئەوەی ڕاگواستن چییە و ڕاگوێزراو کێن؟، ئەم دوو مەرجە ڕەچاو دەکرێت:" یەکەم: ڕاگواستن ناکرێت تاکە کەسی بێت ... دووەم: حکومەت دەبێت بەشێوەی (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) دەستی تێدا هەبێت. (بڕوانە//د. پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری: شاری کەرکوک لە نێوان ساڵانی ١٩٥٧–١٩٧٧، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ٢٠١٥، ل٢٢٢. ؛ مراد حەکیم محەمەد: ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی ڕاگواستن لە هەرێمی کوردستان، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە (٤٣)، ئابی٢٠٠٤،ل٣٤–٣٥).

[٢] ناوی گوندەکانی سەنگاو وەك (مەملەحە، کانی مامە، زەلە سووتاو، شاهـ حەسەن، دووەر و پونگەڵەی دووەر، فەقێ حاجی، هەشەزینی، تەپە سوورە، گۆمە زەرد، دەروێشان گەورە، دەروێشان بچووك، کەلەڕەشی، جنۆکە، پونگەڵە، زالواو، کەریم ئەجەل، گۆیژە، عزەت ئاوا، میرەیی حەمە حەسەن، خدری، دلکە، کانی خاکی، هەمزە رومی، هەنارە_قەلای گۆپتەپە، باخە گردەڵە، میرەیی حەو زەوار، کەلان، قادر ئاوا_گەرمك، مەسۆیی ئەحمەد رەحیم، سەرقەلا_ دوو پەلانە، فاتکە، کچان_کچان کۆن، کرپچنە، ژاڵەی کرپچنە، رەبات، تیمار، پێنج ئەنگوست، کارێزەی دەلۆ و سەیدە، حەسەن کەنۆشی سەروو، کەلۆزەڕەش و هێلانە قەل، عەینکەی حەمە شاسوار_ تەپە عەرەب نەریمان، عەینکەی سوێرەڕەش، تەپە عەرەب حاجی مارف، داربەروو، کۆیك و تەپەسپی، جامرێز و دەرزیلە، درۆزنە، شەلەیی، سێ گومەتان، کانی بەیتەش و هەنجیرە، حەسەن کەنۆشی ژووروو، قەلاگە و کێلەبەرز، بانی مۆرد، دەرەواری سەروو، مەسۆیی بەرگەچ، مەسۆیی حەمە فەرەج، دەرەواری خواروو). (سوهەیل خورشید عەزیز: ئەتڵەسی کەرکوك گۆڕانکارییە کارگێڕییەکانی نێوان ١٩٤٧–١٩٨٧، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بلاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠١٣، ل٢٧)

[٣] ناوی گوندەکانی ئاغجەلەر وەك ( عەسکەر، گردخەبەر، مۆتلیجە، توتەقەڵ، گەڵناغاج، کانی هەنجیر شێخ بزێنی، سەرچنار، جەلەمۆرد، مۆردخواردەی سەروو، دارە قوتە، ئاوبارە، مۆردخواردەی خواروو، گەڕاو، بێدەر، مەحمەخان، کانی گەوهەر، تلیان، کانی عەرەبان، گەزەلان، تەق تەق، تورکە، باوەفەتی خواروو، کوچك نەخشینە، باوەفەتی سەروو، شێخ وەیسی، خەربەندەلو، قشلاخ، کانی سپیلکە، چیاسەوز، قوڕاوە، تەوەکەڵ، کانی هەنجیری صالحۆك، شێخ پاڵەوان، کۆزەبۆرە، دالاوای کوردان، دالاوای شێخ صالح، دالاوا رووتە، قەلاچۆغەی شێخ کەریم، قەلاچۆغەی شێخ سەلام، گۆپتەپە، بۆلقامیش، عازەبان، شێخان سوور قاوشان، سۆتکە، مایلە، کانی بی شێخ عەبدوڵلا، کانی بۆگەنە، بلوکێن، قەسرۆك، چۆخلیجە، چنارتوو، قۆجەلەر، گەرگەڕ و قۆجەبولاخ، گەورە دێ، کانی بی، قامیشە). (سوهەیل خورشید عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦)

[٤] ناوی جاش: لەو کەسانە نراوە کە بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان لە سەرووی بەرژەوەندیی گشتیدا دادەنێن، ئەوان خاوەن دەروونێکی نەخۆش بوون هەردەم بۆ گەیشتن بە

مەرامــەکانیان هــەموو ڕێگەیــەکی نەشــیاویان دەگرتــە بــەر .( بڕوانــە : مسـعود عبـدالخالق: مەوسوعەی جودی بۆ چەمك و زاراوەی سەردەم، چاپخانەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٨،ل٣٠٢)

[٥] بارق: فەرماندەیەکی سـەربازی بـوو بەپلـەی جـەنراڵی لـە سـوپای بەعسـدا، لـە سـاڵی ١٩٨٨ز فەرماندەی ئەو هێزانەبوو کـە پاراسـتنی بـڕە نەوتـەکانی پـێ سـپێردرا، لەپرۆسـەی ئەنفالـدا بەشـداریکردووە و پــەلاماری شـیعەکانی داوە لەناوەڕاسـتی هەشـتاکاندا، لەسـاڵی ١٩٩١ دا بەبیانووی ئەوەی دەستی هەبوو لـە پیلانـی کودەتـا دژی سـەدام حسـێن، لـە سـێدارەدراوە : (عەدالەت عومەر صالح: سەرچاوەی پێشوو ، ل٦٣)

[٦] دیارترینی ئەو مزگەوتانەی کە لەو ڕۆژانەدا وتاری دژ بە پرۆسەی ئەنفالیان تێدا خوێندراوەتەوە بریتی بوون لە مزگەوتەکانی (حاجی حەمید ئەسعەد) کـە مامۆسـتا مـەلا (ئەسـعەد جـەباری) پێش نوێژو وتارخوێنی بووە، هەروەها مزگەوتی گەورەی چەمچەماڵ (پشت قەلاّ) کە مامۆستا مەلا (غەریب سەنگاوی) وتاری تێدا خوێندۆتەوە. دەوترێت وتاری ئەو مامۆسـتایانە سـەبارەت بـە پرۆسـەی ئـەنفال هێنـدە وتارگـەلێکی ڕوون و ڕاشـکاو و کاریگـەر بـوون، کـە بەشـێك لـە نوێژخوێنانیان وەها ترساندووە لەترسی پەرچەکرداری دەزگا ئەمنییەکان بـەر لـە تـەواوبوونی وتارەکـان مزگەوتـەکانیان بـەجێ هێشـتووە. (دڵشـاد موحەمـەد ئەحمـەد: جیهادەکـەی قالـە شێت، ڕۆژنامەی قالە، ژ (١)، ساڵی یەکەم)

[٧] عەبـدولقادر موحەممـەد ناسـراو بـە قالـە شـێت لـەدایکبووی سـاڵی ١٩٥٧ ز گونـدی گورگـەیی چاوسووری نزیـك چەمچـەماڵ. ئـەو هەرچـەندە لـە ڕووی عەقڵییـەوە کێشـەی هـەبووە، بـەڵام کەسێکی تەواو شێت نەبووە و لەناو بـازاڕی چەمچـەماڵ بەدەسـگێڕی قـووتی ڕۆژانـەی ژیـانی خۆی پەیداکردووە، ئەویش لەڕێی فرۆشتنی کەلوپەلی وەکو سابوونی ڕەقی و خەنە و وزمـە و شمەکی تری لەو جۆرانەوە. لەدوای ئەنفال ماوەیەك لە گۆڕستانی شێخ سەعید بەبێ بەرامبـەر کاری هەڵکەندنی گۆڕی کردووە. لەدوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی (١٩٩١ز)یش دەستی کـردووە بە هەڵگرتنەوەی مینە چێندراوەکانی سەردەمی حوکمی سەدام حسێن، تا لـە ڕۆژی (٢١/ ١٢/ ١٩٩٢ز) بەهۆی تەقینەوەی مینـەوە گیـانی لـە دەسـتداوە و لـە گۆڕسـتانی شـێخ سـەعید لـە چەمچەماڵ بە خاك سپێردراوە. قالـە شـێت پـێش مردنـی خێزانـدار بـووە و کچێکی لـە پـاش بەجێماوە بە نـاوی (تـەنیا). (بڕوانـە//م. عەبـدولڕەحمان سـدیق: چـەند بیرەوەرییـەك لەسـەر ڕاپەڕینەکەی بەهاری ساڵی ١٩٨٨ی چەمچەماڵ ، چەمچەماڵ ، ٢٠١٦. دەستنووس)

[٨] سـەبارەت بـە بـاس و خواسـی کاریگـەری بانگـەوازی (جیهـاد)ی مامۆسـتا ئایینییـەکان بڕوانـە (عـارف قوربـانی، شـایەتحاڵەکانی ئـەنفال، ب٢، چ٢، چـاپخانەی شـڤان، سـلێمانی – ٢٠١٤، ل٢٥٠) ؛ چـاوپێکەوتن لەگـەڵ (سـەبریە عومـەر ئیسـماعیل)، لـەدایکبووی سـاڵی (١٩٣٠ ز)، (گوندی دێرەشە)ی ناو زەنگنە. عارف قوربانی، شایەتحاڵەکانی ئەنفال، ب٣، چ٢، چاپخانەی شڤان، سلێمانی – ٢٠١٤، ل١٣٣. ؛چاوپێکەوتن لەگەڵ (بەسیرە عـەلی ئەحمـەد)، لـەدایکبووی ساڵی (١٩٦٤ ز)، (گوندی دێرەشە)ی ناو زەنگنە)

(٩) یەك لە بەشداران ئەوە دەگێڕێتەوە کە خەڵکانێکی زۆر لەناو دەسگیرکراوەکاندا هەبوون بەزۆریش لە ئۆتۆمبیلەکان نەدەهاتنە خوارەوە، لەوانە پیرەژنێك بوو کە دەیگوت هەر دانابەزم، تا ئەوکاتەی پۆلیسێکی بنکەی پۆلیسی چەمچەماڵ هات و بەزۆر دایگرتە خوارەوە، پیرەژنەکەش لەترسی ئەوەی کە پۆلیسەکە تفەنگی لەشان بوو هیچی نەوت و سووك لەگەڵ دەستیا هات و دابەزی. (چاوپێکەوتن لەگەڵ (نەورەز مەزهەر) بەشداری راپەرینەکە، چەمچەماڵ (٤/٥/ ٢٠٠٦). ؛ بڕوانە (دڵشاد موحەمەد ئەحمەد: جیهادەکەی قالە شێت، رۆژنامەی قالە، ژ (١)، ساڵی یەکەم)

(١٠) ئەو پیاوە چەکدارە کەسێك بووە کە بە (غەفوورە موڵکە) ناسراو بووە. (چاوپێکەوتن لەگەڵ (نازم حەمە ئینجە) بەشداری سەرەکی راپەرینەکە، چەمچەماڵ، ١٩/١٢/ ٢٠١٧ )

(١١) نازم حەمە ئینجە ناسراو بە نازە بچکۆل دەکرێت وەکو پێشرەوێکی سەرەکی تری راپەرینەکە باسی لێوە بکرێت کە رۆڵی هیچ لە رۆڵ و کاریگەری (قالە شێت) کەمتر نەبووە

(١٢) یەك لە بەشدارانی سەرەتای راپەرینەکە دان بە کاریگەریی بەشداری گەنجەکان و منالانی گەڕەکی کۆمەڵگای جووتیاراندا دەنێت و دەنووسێت: ((منالانی پۆلی یەك تا شەشی سەرەتایی گەڕەکەکانی سەرشەقام و موجەمەع کارێکیان بە بەعس کرد با بە دەواری شڕی نەکردبێت، ئەوان نەبوونایە ئەوەی ئێمە دەستمان پێکرد هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نەدەبوو...)). بڕوانە (لەتیف فاتح فەرەج: هەمووماں لە ئەنفالدا، ل٣٠)

(١٣) هەریەك لە (قادر قادر، رەئووف تەیب، سەید مەولوود، لەماڵی فەتاح حەسەنیش موحەممەد و لەتیف و خالد) دیارترینی تەقەکەرەکان بوون. (چاوپێکەوتن لەگەڵ (عەبدولرەحمان سدیق)، چەمچەماڵ ، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧.؛ چاوپێکەوتن لەگەڵ (تەلعە) ، چەمچەماڵ ، ٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧)

(١٤) سامان عوسمان فەرەج – مەلا سامان، کە خۆی یەکێك بووە لەو کەسانەی بەدەم بانگەوازەکەوە چووە و لەگەڵ ماڵەوەیاندا خۆیان رادەستی دەزگا ئەمنییەکان کردووە و وەك داوایان لێکراوە چوونەتە (خانووە سپییەکان) کە کۆمەڵێك بینای سەربازی بوون لە باکووری رۆژهەڵاتی چەمچەماڵ، ناوبراو باس لەوە دەکات کە بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە دەزگا ئەمنییەکان وەك دوا مۆڵەت بۆ خۆ تەسلیمکردنەوە تەرخانیان کردبوو، تەنها (٢٥) خێزان خۆیان تەسلیم کردووە و هاتوونەتە خانووە سپییەکان. (عارف قوربانی: سەرچاوەی پێشوو، ب ١، ل١٥٧. ؛ چاوپێکەوتن لەگەڵ (سامان عوسمان فەرەج – مەلا سامان)، لەدایکبووی ساڵی (١٩٧٧ز). (گوندی سەرقەڵا)ی ناوچەی سەنگاو)

(١٥) شێخ مەهدی باس لەوە دەکات کە ئەو لەرێی باوەڕپێکراوێکی خۆیەوە هەواڵی راپەرینەکەی ناردووە بۆ بێ تەلەکەی حەمەرەش (شەهید حەمەرەش) سەرکردەی پارتیزان لە ناوچەکە و لەرێی ئەویشەوە نێردراوە بۆ ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان. (چاوپێکەوتن لەگەڵ (شێخ مەهدی تاهیر شێخ کاکەحەمە) بەشداری راپەرینەکە ئۆردوگای شۆڕش، چەمچەماڵ (٢١/١٢/ ٢٠١٧ز)

[16] هەموو بەشدارانی ڕاپەڕینەکە ئەوە دەگێڕنەوە کە ئەوان لەلایەن زۆرێك لە دەسگیرکراوەکانەوە بەرپەرچدراونەتەوە و داوایان لێکراوە ڕێگەیان بۆ بکەنەوە، یەك لە بەشداران باس لەوە دەکات کە ئەو بۆ یەکەم جار وشەی (گۆپاڵ)ی لە دەمی پیاوێکی بەتەمەنی دەسگیرکراوی ناو یەکێك لە ئۆتۆمبیلەکانەوە گوێ لێ بووە، ئەویش کاتێك کە داوای لێکردووە لە ئۆتۆمبیلەکە بێتە خوارەوە و خۆی ڕزگار بکات، لە بەرامبەردا پێی گوتووە: لاچۆ با بە (گۆپاڵ)ێك سەرت نەشکێنم، بۆ وازمان لێ ناهێنن سەرژمێر بکرێین و قەرەبوو بکرێینەوە. (چاوپێکەوتن لەگەڵ (نازم حەمە بچکۆل)، چەمچەماڵ، ٢٠١٧/١٢/١٩)

[17] چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەبور شکر حسێن)، لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٠ ز)، چەمچەماڵ (٥/ ٥/ ٢٠٠٦ ز). کە لەکاتی ڕاپەڕینەکەدا لەناو بازاڕ دووکانی هەبووە و وەك خۆی دەڵێ خەڵکێکی زۆری بۆ چەند ڕۆژێك لە دووکانەکەیدا شاردۆتەوە و بە نهێنی خواردن و پێداویستی بۆ بردوون.

## سەرچاوەکان

### یەکەم ) کتێبە کوردییەکان:


١) ئەلبێرت عیسا: خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژوو، چاپخانەی روون، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری، سلێمانی ، ٢٠٠٤.

٢) ئەمین قادر مینە : ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێکوچکەی بەعسییان: تەرحیل، تەعریب ، تەبعیس ، چ٢، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٩.

٣) پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری: ڕاپەڕینی کەرکوك ساڵی ١٩٩١، مەکتەبی ڕووناکبیر (ی.ن.ك) سلێمانی، ٢٠٠٤.

٤) د. پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری و م. حسیب محمود محمد : هۆکارە ناوخۆییەکانی و دەرەکی ئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفال لە باشووری کوردستان ١٩٨٨، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری جەمال عیرفان ، سلێمانی، ٢٠١٤ .

٥) د. پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری: شاری کەرکوك لە نێوان ساڵانی ١٩٥٧–١٩٧٧، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ٢٠١٥.

٦) حەمید عەبدوڵڵا ساڵح: سیاسەتی تەعریب لە شاری کەرکوك، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٨.

٧) دەزگای ڕاگەیاندنی ( ی.ن.ك): کەرکوك و سیاسەتی تەعریب، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، ئایاری ١٩٨٥.

٨) ڕەجائی فاید: کوردەکانی عێراق هیوا و ئاوات لەنێوان بەدیهێنان و بەدینەهاتن، و. عەلی میرزا مارف هەورامی، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠١٠.

٩) زانـا فــەقێ محمـد: جینۆسـاید لەباشـووری کوردسـتان (ئـەنفالی گـەرمیان بەنموونــە)، چاپخانەی یاد، ٢٠١٢.

١٠) سنوور سـەباح سـدیق: مێـژووی سیاسـەتی بەعـەرەبکردن لـە پارێزگـای کـەرکوک ١٩٦٣- ١٩٩١، چاپخانەی ئاراس، کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٩.

١١) سۆزان کەریم مستەفا: بەعسیزم و کـورد، مەکتـەبی بـیرو هۆشـیاری (ی.ن.ك)، سـلێمانی، ٢٠٠٧

١٢) سوهەیل خورشید عـەزیز: ئەتڵەسـی کـەرکوك گۆڕانکارییـە کارگێڕییـەکانی نێـوان ١٩٤٧- ١٩٨٧، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بلاَوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠١٣.

١٣) شۆڕش حاجی ڕەسول: ئەنفالی کورد و دەوڵەتی عێراق، چاپی دووەم، چـاپخانەی شـڤان، سلێمانی، ٢٠٠٣ .

١٤) عارف قوربانی، شایەتحاڵەکانی ئەنفال، ب ١، چاپخانە و ئۆفیسی ئاسا، سلێمانی، ٢٠٠٢.

١٥) عارف قوربانی، شایەتحاڵەکانی ئەنفال، ب٢، چ٢، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠١٤.

١٦) بانی، شایەتحاڵەکانی ئەنفال، ب٣، چاپخانە و ئۆفیسی ئاسا، سلێمانی، ٢٠٠٣.

١٧) عارف قوربانی: کـەرکوك و پاکتـاوی ڕەگـەزی لـە بەڵگەنامـەکانی بەعسـدا، بـەرگی دووەم، چاپخانەی تیشك، کەرکوك ، ٢٠٠٥ .

١٨) عەتا قەرەداغی : کاریگەری کولتووری ئەوان لەسەر کـورد، چـاپخانەی ڕوون ، سـلێمانی ، ٢٠٠٧.

١٩) عەدالەت عومەر صاڵح: ئەنفال و ئافرەتی کورد، چاپخانەی وەزارەتی پـەروەردە، هـەولێر، ٢٠٠٧.

٢٠) عەلی تەتەر نێرۆیی: بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد لە کوردسـتانی عێـراق لـە سـاڵانی جەنگی عێراق و ئێران (١٩٨٠- ١٩٨٨)، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٨.

٢١) فـەرهاد عەبدولعـەزیز : چەمچـەماڵ لـەنێوان هـەردوو شـەڕی جیهانیـدا ١٩١٨- ١٩٣٩- ، چاپخانەی زینە، کەرکوك، ٢٠١٣.

٢٢) د. فوئـاد حەمـە خورشـید: کـەرکوك لـە بەڵگەنامەکانـدا، و. نـەریمان عەبـدوڵلاَ خۆشـناو، چاپخانەی منارە، هەولێر،٢٠٠٧.

٢٣) لەتیف فاتح فەرەج: کوردو کەرکوك، بـەرگی یەکـەم، دەزگـای چـاپ و پەخشـی سـەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢

٢٤) لەتیف فاتح فـەرەج و مەجیـد سـاڵح: کـورد قـڕان ، بـەرگی یەکـەم، چـاپخانەی سـلێمانی، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٢٥) د. مارف عومەر گول: جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر رۆشنایی یاسایی تازەی نێودەوڵەتان دا، چ٢، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی ، ٢٠٠٣.

٢٦) محمد رؤوف عزیز: ئەنفال و رەهەندە سۆسیۆلۆجییەکان، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٢٧) مەحموود سەنگاوی : بیرەوەرییەکانی سەنگاوی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٢٨) محمود مەلا عیزەت: بازنەکانی ململانێ و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورد، چ٢، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ١٩٩٩.

٢٩) مسعود عبدالخالق: مەوسوعەی جودی بۆ چەمك و زاراوەی سەردەم، چاپخانەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٨.

٣٠) مێدڵ ئێست وۆچ: جینۆساید لە عێراقدا و پەلاماری ئەنفال لەسەر کورد، و. سیامەند مفتی زادە، چاپخانەی خاك، سلێمانی، ١٩٩٩.

٣١) نەبەز دووبزی: دووبز لەنێوان (ڕاگواستن و بەعەرەبکردن)دا، بێ شوێن و جێگەی چاپ، ٢٠٠٠.

٣٢) یوسف دزەیی: ئەنفال کارەسات و ئەنجام و رەهەندەکانی، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠٠١.

**دووەم ) کتێبە عەرەبییەکان:**

١) د. اسماعیل خلیل محمد: مؤشرات سیاسة التعریب والتهجیر في اقلیم کوردستان العراق ، الطبعة الثانیة، مکتب التوعیة (ی.ن.ك)، سلیمانیة، ٢٠٠٣.

٢) المنجد في اللغة والاعلام، الطبعة الثامنة والثلاثون، دار المشرق بیروت، ١٩٨٦.

٣) خلیل بن احمد الفراهیدي: کتاب العین، جزء (٨)، ط٣، دار الفکر ، بیروت، ١٩٩٠.

٤) د. عبدالله غفور: التشکیلات الاداریة في جنوب کردستان، المدیریة العامة للطباعة والنشر، وزارة الثقافة، السلیمانیة، ٢٠٠٥.

**سێیەم ) کتێبە ئینگلیزییەکان:**

The Encyclopedia Americana,International Edition,vol(5),1975

**چوارەم ) گۆڤارو رۆژنامە:**

١) سلێمانی عبدالله: راگواستنی گوندنشینەکان لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، گۆڤاری (سەنتەری برایەتی)، ژ (١٢)، حوزەیرانی ١٩٩٩.

٢) لەتیف فاتح فەرەج: کورد و کەرکوك، گۆڤاری (پەیڤین)، ژمارە (٢)، ئۆکتۆبەری ١٩٩٧.

٣) تەها سلێمان: خوێندنەوەیەك بۆ حیزبی بەعس و کارەساتی ئەنفال، گۆڤاری (ئەنفال)، ژ(٤)، ساڵی ٢٠٠٣.

٤) بورهان عەلی محەمەد: ڕاگواستن و بەعەرەبکردنی کەرکوك لە بەڵگەنامەکانی بەعسدا، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٣٩)، زستانی ٢٠٠٩.
٥) جەبار قادر: ئەنفال بەرجەستە بوونێکە لە سەروەریی هێزی گشتگیری و توندو تیژی و زەبرو زەنگ، و. م. شیرکۆ، گۆڤاری (ئەنفال)، ژ(٣)، ٢٠٠٢ .
٦) عەبدوڵلا کەریم مەحمود: بێسەرو شوێنەکان و پانۆرامای جینۆساید ، گۆڤاری (ئەنفال)، ژ(٥) ساڵی ٢٠٠٠.
٧) دڵشاد موحەمەد ئەحمەد: جیهادەکەی قالە شێت، ڕۆژنامەی قالە، ژ (١)، ساڵی یەکەم.
٨) ڕۆژنامەی خەبات ، ژمارە (٥٧٥) کانونی دووەمی ١٩٨٨.
٩) مديرية امن محافظة السليمانية/ش٣، موضوع: حوادث الشغب، العدد: (٣٥٤)، التأريخ: (٧/ ٦/ ١٩٨٧م).
١٠) عەزیز ساڵەح، بروسکەیەك لە شەوەزەنگدا ڕاپەڕینی چەمچەماڵ (١١/ ٤/ ١٩٨٨ز)و ڕۆڵی قالە شێت تیایدا، گۆڤاری (چواردەی چوار)، ژ (٣)، نیسانی ٢٠٠٥ ز.
١١) مراد حەکیم محەمەد: ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی ڕاگواستن لە هەرێمی کوردستان، گۆڤاری (سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی)، ژمارە (٤٣)، ئابی ٢٠٠٤.

**پێنجەم ) دەستنووس:**
١) م. بدولرەحمان سدیق: چەند بیرەوەرییەك لەسەر ڕاپەڕینەکەی بەهاری ساڵی ١٩٨٨ی چەمچەماڵ ، چەمچەماڵ ، ٢٠١٦. دەستنووس).
٢) لەتیف فاتح فەرەج، هەموومان لە ئەنفالدا بووین (تێکەڵێکە لە بیرەوەری ، بۆچوون ، دیرۆك دیارییەکی بچووکی منە بۆ خەڵکی شارۆکەی چەمچەماڵ و شۆڕش). (دەستنووس)

**شەشەم ) چاوپێکەوتن :**
١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (عەبدولڕەحمان سدیق) ، چەمچەماڵ (٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧).
٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (لەتیف فاتح فەرەج) بەشداری ڕاپەڕین، چەمچەماڵ (٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧).
٣) چاوپێکەوتن لەگەڵ (ئیدریس موحەممەد ئەحمەد) ، چەمچەماڵ (٢١/ ١٢/ ٢٠١٧).
٤) چاوپێکەوتن لەگەڵ (ناسح عەزیز مەحموود)، چەمچەماڵ (٥/ ٦/ ٢٠٠٦).
٥) چاوپێکەوتن لەگەڵ (نەورەز مەزهەر) بەشداری ڕاپەڕینەکە، چەمچەماڵ (٤/٥/ ٢٠٠٦).
٦) چاوپێکەوتن لەگەڵ (نازم حەمە ئینجە) بەشداری سەرەکی ڕاپەڕینەکە، چەمچەماڵ، (١٩/١٢/ ٢٠١٧ )
٧) چاوپێکەوتن لەگەڵ (پێشڕەو سەردار محێدین) بەشداری سەرەکی ڕاپەڕینەکە، چەمچەماڵ (١٩/١٢/ ٢٠١٧ز).

٨) چاوپێکەوتن لەگەڵ (شێخ مەهدی تاهیر شێخ کاکەحەمە) ، چەمچەماڵ (١٢/٢١/ ٢٠١٧ز).

٩) چاوپێکەوتن لەگەڵ (هەڵەت کەریم ئاغا)، چەمچەماڵ، (٢٠١٧/١٢/٢٥).

١٠) چاوپێکەوتن لەگەڵ (ئەحمەد عەزیز) بەشداری ڕاپەڕین و بەشداری کۆبوونەوەکە، چەمچەماڵ (٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧).

١١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (ئیدریس موحەممەد ئەحمەد)، چەمچەماڵ (٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧).

١٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (موحەممەد تاهیر لالە) کە خۆی یەك لە برینداره‌کان بووە، چەمچەماڵ (٤/ ٥/ ٢٠٠٦ز).

١٣) چاوپێکەوتن لەگەڵ (تەلعە) ، چەمچەماڵ ، (٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧).

١٤) چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەید مەولوود) دەسگیرکراو، چەمچەماڵ، (٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧).

١٥) چاوپێکەوتن لەگەڵ (حەمەخان) دەسگیرکراو، چەمچەماڵ ، (٢٠/ ١٢/ ٢٠١٧).

١٦) چاوپێکەوتن لەگەڵ (نازم حەمە بچکۆل)، چەمچەماڵ، (٢٠١٧/١٢/١٩).

١٧) چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەبور شکر حسێن)، ، چەمچەماڵ (٥/ ٥/ ٢٠٠٦ز).

١٨) چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەید مەولوود)، سلێمانی (٢٥/ ١٢/ ٢٠١٧ز).

١٩) چاوپێکەوتن لەگەڵ (م. موحسن عەلی رەحیم)، چەمچەماڵ ، (٢٥/ ٤/ ٢٠٠٦).

٢٠) چاوپێکەوتن لەگەڵ (سامان عوسمان فەرەج — مەلا سامان)، چەمچەماڵ ، (٢٠١٧/١٢/١٧).

**حەوتەم ) سەرچاوەی زانکۆیی:**

١) چراخان نصرالدین صالح: دانیشتوانی قەزای چەمچەماڵ، ماستەرنامە، بەشی جوگرافیا، زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٥.

## پوختەی توێژینەوەکە

ئەنفال ئەو تاوانە قێزەونەیە کە حکومەتی عێراقی دەرهەق بە میللەتی کورد لە میانەی توندترین و وەحشیانەترین شاڵاودا بە ئەنجامی گەیاند، تیایدا هەزاران گوند سووتێنران و کاولکران و سەدان هەزار سەر ئاژەڵ و کەرەستەی کشتوکاڵیی جووتیاران تاڵانکران و لەو ژمارانەش زیاتر ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتە پەلکێشی ناو ئیڤا و ئۆتۆمبیلە سەربازییەکان کران و بە دەسگیرکراوی گوێزرانەوە بۆ بیابانەکانی خواروو ناوەڕاستی عێراق و لەوێ زۆرێکیان زیندەبەچاڵ کران. هەموو ئەم کردەوە توندو تیژیانە لە ماوەیەکی زەمەنی کورت و بەبێ ڕووبەڕوو بوونەوە و بەرەنگاربوونەوەیەکی ئەوتۆ بۆ حکومەت چوونە سەر و بە کۆتا هاتن، جگە لە چەند بەرەنگاربوونەوەیەکی کەم نەبێت کە لێرەو لەوێ هاتە بەردەم ئەنجامدەرانی شاڵاوەکە کە توندترین و گرنگترینیان ئەو ڕێگرییانە بووە کە دانیشتوانی شاری چەمچەماڵ لە (١١/ ٤/ ١٩٨٨ز.) بۆ پرۆسەکەیان دروستکردووە.

ڕاپەڕینی جەماوەری چەمچەماڵ لە سەعات (١١)ی پێش نیوەڕۆ دەستی پێکردووە و تاکو ساتەکانی کۆتایی ئەو ڕۆژە درێژەی کێشاوە، ئاپۆڕای خەڵکی چوونەتە سەر شەقامی (سەنگاو — چەمچەماڵ) و بەدەم هوتاف کێشانەوە بە بەرد و بە دار کەوتوونەتە پەلاماردانی ئەو ئۆتۆمبیلانەی لەو ڕۆژەدا و بە ڕێگای ناوبراودا ئەنفالکراوەکانیان گواستۆتەوە، بەو شێوازە توانیویانە ژمارەیەکی بەرچاو دەسگیرکراو ئازاد بکەن و هەلی ڕاکردنیان بۆ برەخسێنن.

لە بەرامبەردا هێزە عەسکەرییەکانی شار و ناوچەکە زۆربەیان لە چەمچەماڵ کۆکراونەتەوە و بە پشتیوانی تانک و زرێپۆش و چەند فڕۆکەیەکی سەربازی کەوتوونەتە پەلاماردانی خەڵکی ڕاپەڕیوی چەمچەماڵ و کوێرانە ڕووی تفەنگەکانیان لێکردوون و زیاتر لە (١٢) کەسیان لێ کردوون بە قوربانی لەنێو کوژراو و بریندارادا، هێزە پەلاماردەرەکان هەر بەوەوە نەوەستاون، بەڵکو پاش کۆنترۆڵکردنی خۆپیشاندانەکە ئەوسا هەڵمەتێکی گەورەی پشکنین و دەسگیرکردنیان دەست پێکردووە و لەو ڕێگەیەشەوە سەدان کەسیان دەسگیرکردووە و ڕەوانەی لیوای چەمچەماڵیان کردوون و لەوێشەوە بۆ زیندانەکانی شاری سلێمانییان گواستوونەتەوە و بێ سەرو شوێنیان کردوون.

## ملخص البحث

### انتفاضة جمجمال سنة ١٩٨٨

أ.م.د. پشكو حمه طاهر عبدالرحمن د. فرهاد عبدالعزيز محمد
قسم التاريخ – كلية العلوم الانسانية – جامعة السليمانية

الأنفال هذه الجريمة البشعة التى إرتكبتها الحكومة العراقية ضد الشعب الكوردي في اعنف وأوحش هجوم لم يشهده التأريخ، أخذوا خلالها بحرق القرى ونهب مئات الالوف من رؤوس الماشية وممتلكات الفلاحين، وإعتقال النساء والأطفال والشيوخ وتكديسهم في شاحنات الجيش وإرسالهم الى المناطق المجهولة. كل هذه العمليات الإجرامية مرت بمدة زمنية محدودة وبدون مواجهة أية مقاومة تذكر لا من قبل البيشمرگه الكورد ولا من قبل جماهير الشعب الكوردي في داخل المدن وخارجها، ما عدا مقاومة محدودة أهمها وأشدها هي التي قامت بها جماهير قضاء جمجمال في (١١/ ٤/ ١٩٨٨).

بدأت إنتفاضة جماهير قضاء جمجمال في الساعة (١١) قبل الظهر واستمرت حتى الساعات الاخيرة من نهار هذا اليوم. في البداية إجتمع خلق كثير على الطريق العام بين قضاء جمجمال وناحية سنكاو التابعة لنفس القضاء، كانوا يهتفون وبصوت عال بشعارات معادية للسلطة، وقاموا بقطع الطريق أمام المارة وأمام مرور السيارات وخاصة مرور قوافل سيارات نقل المؤنفلين عن طريق رشقها بالحجارة وإجبارها على الوقوف، ونجحوا بهذه الطريقة في إطلاق سراح عدد غير قليل من المسجونين والمؤنفلين.

قامت السلطات العسكرية بحشد قوات عسكرية هائلة وقاموا وبمساعدة الدبابات والمدرعات والقصف المدفعي والقصف الجوي باجتياح المدينة وذلك للقضاء على إنتفاضتها وبدأوا باطلاق النار على المتظاهرين واستخدموا كافة إجراءآت القمع العسكرية، التي تسببت في قتل وجرح اشخاص وبلغ عددهم نحو (١٢) شخصاً. وبعد القضاء على الإنتفاضة شنوا أوسع حملة تفتيش لاعتقال المشاركين والمتعاونين في الإنتفاضة وأعتقلوا الكثير من سكان المدينة من الشباب والشيوخ.

Abstract

**The Chemchemal uprising in 1988**

**Ass. Prof. Dr. Pishko Hama Tahir Abdul-Rahman**

History Dept. – College of Humanities- Univ. of Sulaimani

**Dr. Farhad Abdul-Aziz Muhammad**

History Dept. – College of Humanities- Univ. of Sulaimani

During the operation of Anfal which was a disgusted crime against kurdish innocent citizens by Sadam´s regime thousands of villages were set on fire and thousand of cattle and farmer´s instruments were looted. Beside this, more than thousands of children, women and whitebeards were taken to the deserts of south and most of them buried alive. These crimes done within a short period of time without enogh resistence but the defence of Chamchamal city on April, 4th , 1988 was wortmentioning.

The uprising of Chamchamal was started from 11 am to the end of the day. Its people went to Sangaw Street and stoned the regime armycars which were shifting the Anfalized people. Thus, Chamchamal´s people were able to rescue some of them. Then the regim´s forces fired the uprised people and 12 of them were sacrificed. After that they started investigations and arresting everyone and sending them to the prisons of Sulaimani.

# خانەقین و دەوروبەری
# لەژێر ڕۆشنایی"سیاحەتنامەی حدود"دا

**م. خالد مەحمود کەریم**
کۆلیجی پەروەردەی بنەڕەت – زانکۆی گەرمیان

**پوختەی توێژینەوە**

گەشتە سنوورییەکەی خورشید پاشا، کە بە **"سیاحەتنامەی حدود"** ناسراوە و لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٨٥١ ز.) داڕێژراوەتەوە و تیایدا بەشێوەیەکی فەرمی ناوچە سنوورییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی بەسەرکردۆتەوە. بەهۆی زۆری و گرنگی ئەو زانیارییانەی تیا هاتووە، بە یەکێك لە بایەخدارترین سەرچاوەکان دادەنرێت سەبارەت بە مێژووی سەدەی نۆزدەهەمی ناوچەکانی کوردستان، بەوپێیەی بەشی هەرە زۆری ئەو ناوچانە، سنووری نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی– ئێرانی پێکهێناوە، لەو نێوانەشدا خانەقین و دەوروبەری، کە کەوتبووە سەر سنووری نێوان ئەم دوو دەوڵەتەوە.

هەڵبژاردنی توێژەر بۆ ئەم ناونیشانە: **خانەقین و دەوروبەری لە ژێر ڕۆشنایی "سیاحەتنامەی حدود"**دا لەو سۆنگەوە سەرچاوە دەگرێت، بۆ تیشك خستنە سەر دۆخی گشتی خانەقین و دەوروبەری لە میانەی ئەم گەشتە سنوورییەوە و هەڵسەنگاندن و ڕوونکردنەوەی زانیارییە بەهادارەکانی، کە بەراورد و پاڵپشت بە نووسینی گەڕیدە ئەوروپی و سەرچاوە مێژووییەکان، پێکرا وێنایەکی ڕوونترمان سەبارەت بە قۆناغێکی گرنگی مێژووی سەدەی نۆزدەهەمی ناوچەی توێژینەوە پێدەبەخشێت، قۆناغێك کە سەرچاوە مێژووییەکان کەمترین زانیارییان لەبارەیەوە تۆمارکردووە.

## پێشەکی

سەرچاوە و توێژینەوە مێژووییەکان دەربارەی کورد و کوردستان، زانیاریی کەمی دەربارەی دۆخی خانەقین و دەوروبەری لە سەردەمی عوسمانی تێدایە. ئەو کەمە زانیارییانەش کە هەن، بریتین لە کۆمەڵێك سەرنجی خێرا و ڕاگوزەر و زیاتر تایبەتن بەدوا ڕۆژگارەکانی ئەو سەردەمە. لێرەوە گرنگی و بایەخی "سیاحەتنامە حدود" دەردەکەوێت، کە نووسەرەکەی لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، بە فەرمی ناوچە سنوورییەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی بەسەرکردۆتەوە لەوانە، ناوچەی خانەقین و دەوروبەری.

سیاحەتنامەی حدود بەڵگەنامەیەکی مێژوویی گرنگ و دەگمەنە، دەربارەی قۆناغێکی گرنگ لە قۆناغەکانی مێژووی کوردستان، لە ڕۆژگاری حوکمڕانی عوسمانیدا. تیایدا خورشید پاشا بەشێوەیەکی ورد و گشتگیر سەرجەم بینینەکانی لەسەر ناوچە سنوورییەکان تۆمارکردووە، لەوانە ناوچەی توێژینەوە. بایەخی سەرنج و تێبینییەکانی نێو سیاحەتنامەی حدود دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بەرهەمی لە نزیکەوە دیتن و سەرنجەکانی خودی نووسەر خۆیەتی، هەر بۆیە تۆمارێکی مێژوویی پڕ زانیاری و وردەکارە، بەتایبەتیش کە تیشکی خستۆتە سەر هەندێ بوار و لایەن، کە پێش ئەو کەسی تر دەستی بۆ نەبردووە. لەوانە داتا و زانیاری دەربارەی ژمارەی دانیشتوان، خێڵ و عەشیرەتەکانی ناوچەکە و دابەشبوونیان، بازاڕ و دووکان، تەرمی مردووان و ئەو شمەك و کاڵایانەی لە سنوورەوە دەهێنران بۆ خانەقین، هەروەها سەرچاوەکانی کشتکاری و بڕی ئەو باجانەی دراونەتە میری لە ناوچەکە... هتد.

هەڵبەتە گەنگەشەی ئەوە ناکەین، کە زانیارییەکانی سیاحەتنامە گشتگیر و هەمەلایەنە و ورد و درشتی بوارە جیاجیاکانی ژیانی ئەو ڕۆژگارەی خانەقین و دەوروبەری گرتۆتەوە، بەڵام بەبڕوای تۆژەر زانیارییەکانی سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراون و بەراورد و پاڵپشت بە سەرچاوە مێژوویی و نووسینی گەڕیدە ئەوروپییەکان، کە لە سەدەی نۆزدەهەم هاتوونەتە ناوچەکە، پێکڕا دەتوانن وێنایەکی ڕوونترمان سەبارەت بە مێژووی ناوچەی خانەقین و دەوروبەری پێببەخشێت.

توێژینەوەکـە لـە پێشـەکییەك و پێـنج تـەوەر و ئـەنجامگیری پێکهـاتووە. تەوەری یەکەم تەرخانکراوە بۆ ئامانجی گەشتەکە و ئاشنابوون بە نووسـەرەکەی. لـە تـەوەری دووەم پێکهاتـەی دانیشـتوانی خانـەقین و ڕووالەتـەکانی ئـاوەدانی ڕوونکراوەتەوە. تەوەری سێیەم تەرخانکراوە بۆ دۆخی کاروانسەرا و زیارەتکـەران و تەرمی مـردووان، کـە بـە خانەقینـدا تێپـەڕدەبوون. لـە تـەوەری چـوارەمدا ئـەو شـوێنەوار و مەزارگانـەی ناوچـەکە هـاتووە، کـە سـیاحەتنامە ئامـاژەی پێـداون. تـەوەری پێنجـەم دۆخـی کشـتوکاڵ و ئـاودێری کردۆتـە ناونیشـان و ئـەو باجـە میرییانەی لە دانیشتوانی خانەقین و گوندەکانی دەوروبەری وەرگیراون.

## تەوەری یەکەم: ئامانج لە گەشتەکە و ئاشنابوون بە نووسەر

ناکۆکی و ئاڵۆزییەکانی نێوان هەردوو دەوڵـەتی عوسمـانی و ئێـران، لەسـەر ناوچـەکانی عەرەبسـتان و سـلێمانی و زەهـاو، هـەروەها کێشـەی هـەوارگۆڕینی عەشـیرەتەکان، ئێرانـی خسـتە سـەر کەلکەڵـەی بیرکردنـەوە لـە جـەنگ دژ بـە عوسمانییەکان. هەوڵەکانی ئێران بۆ لەخۆگرتنی بەحرەین[1] و بەکردار داگیرکردنی بـۆ ناوچـەی زەهـاو و دەسـتێوەردانەکانی بـۆ ناوچـەی سـلێمانی و عەرەبسـتان، وایکرد دەوڵەتی عوسمانیش بکەوێتە کۆکردنەوەی هێز لە ناوچەکەدا، تا هاوبەشی بکات لەو جەنگە چـاوەڕوانکراوەدا. بـەڵام هـەردوو دەوڵـەتی بـەریتانی و ڕووسـی هەژموون و دەسەڵاتی پەرەسەندووی خۆیان لە ناوچـەکەدا بـەکارهێنا و فشـاریان خستە سـەر ئـەم دوو دەوڵەتـە، تـا لەڕێگـەی دانوسـتان و وتووێـژەوە کێشـەکانی نێوانیـان چارەسـەربکەن، لـە کۆتاییـدا بـۆ ئەنجامـدانی ئاشـتەوایی، لیژنەیـەکی چوارقۆڵی لە نوێنـەرانی هـەر چـوار دەوڵـەت لـە ئـەرزەڕۆم کۆبوونـەوە، بەرهـەمی کۆبوونەوەکان، کە بریتیبوو لە چل و دوو دانیشتن و نزیکەی چوار سـاڵی خایانـد، پەیماننامەی دووەمی ئەرزەڕۆمی لێکەوتەوە، کە لە ٣١ی ئایاری ساڵی (١٨٤٧ ز.) مۆرکرا. لە بڕگەی سێیەمی ئەم پەیماننامەدا پێشنیازکرا، لیژنەیـەکی هاوبـەش بـۆ دیاریکردنی سەرانسەری سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت پێکبهێنرێت، کـە هـەر لـە ڕێژگەی شەت ئەلعەرەبەوە لە کەنداو تا چیاکانی ئارارات لە بـاکووری کوردسـتانی دەگرتەوە (نوار، ١٩٦٨، ص ص٣٣٤-٣٤٢).

لیژنـە هاوبەشـەکە پێکهـاتبوو لـە: مـیرزا جەعفـەر خـانی موشـیرولدەولە، ناسراو بە موهەندیس باشی، نوێنەری ئێـران[٢] فـەریق دەروێـش پاشـا، نوێنـەری ڕاسـپێردراوی شـاندی عوسمـانی بـوو. دەوڵـەتی ئینگلیـز-یـش سەرپەرشـتی نوێنەرایـەتی وڵاتەکـەی سـپارد بـە کۆلۆنێـل ولیـامز[٣]، ڕووسـەکانیش کۆلۆنێـل چریکۆف-یان هەڵبژارد بۆ سەرۆکایەتیکردنی ئەو ستافەی وڵاتەکەیان، کە لە چـل و یـەك سـوارەی ئەفسـەر و ئەنـدازیار و زەوی نـاس پێکهـاتبوو (دانتسـغ، ١٩٨١، ص٢٦٩-٢٧٥). لیژنــە چــوار قۆڵییەکــە شــاری بەغــدای دەستنیشــانکرد بــۆ بەیەکگەیشـتن، تـا لـەوێوە بەرنامەڕێـژی بـۆ دەسـتپێکردنی کارەکانیـان بکـەن. هــەموان گەیشــتنە شــوێنی مەبەســت، بێجگــە لــە دەروێــش پاشــای نوێنــەری عوسمانی، کە یەکلایەنە سەرقاڵی دەستنیشانکردنی سنوور بوو لە (قوتـوور)، کـە ناوچەیەکی جێناکۆك بوو لە نێوان هـەردوو دەوڵـەتی عوسمـانی و ئێـران، ئەمـەش کۆبوونەوەکانی سنووری دواخست بـۆ کـانونی دووەمـی سـاڵی (١٨٥٠ز)، ئـەوکات نوێنەرانی هەر چوار وڵات لە شاری "محەممەرە"ی نزیك ڕێژگەی ڕووبـاری کـاروون لە شەتولعەرەب، کارەکانی دەستنیشانکردنی سنووریان دەسـتپێکرد (لـوریمر، ٤، د. ت، ص ٢٣٤-٢٣٥ ؛ النجار، ٢٠١٦، ص١٤٦-١٥٨).

نوێنەرانی هەر چوار دەوڵەت پاش تەواوکردنی کارەکانیان، لە کۆتاییەکانی سـاڵی ١٨٥٢ز. ، هەرچـی بـیروڕا و سـەرنج و تێبـینی، کـە سـەبارەت بـە سـنوور هەیانبوو، لە شێوەی ڕاپۆرت و نووسیندا تۆمارکرد. میرزا جەعفەر خانی نوێنـەری ئێران، کە لەو ماوەدا لە شەت ئەلعەرەبەوە تا ناوچەی ئاراراتی هەنگاو بە هـەنگاو کێومــاڵکرد، تــەواوی گەشــتەکەی لــە ڕاپۆرتێکــدا نووســی و پێشــکەش بــە کاربەدەســتانی دەوڵەتەکــەی کــرد (چــریکۆف، ٢٠١٣، ل١٥-١٧). کۆلۆنێــل ولیامز_یش سـەرنج و تێبینیـی زۆری لەسـەر کێشـەکانی سـنوور و عەشـیرەتەکان یاداشتکردبوو، بەو نیازەی لە ڕاپۆرتێکدا دۆخی ناوچـەکە و کێشـە سـنوورییەکانی تیـا ڕوونبکاتـەوە، بـەڵام تـەواوی ئـەو یاداشـتانە لـە ڕووداوێکـی نـەخوازراودا، لـە سەرەتاکانی ساڵی (١٨٥٣ ز.) لە کاتی گەڕانـەوەدا بـۆ لەنـدەن تیاچـوو (لـوریمر، د.ت، ص٢٠٣٨)). هەرچی (دبلیو. ك. لۆفتس) بوو، کە زەوی ناسـێك بـوو لەگـەڵ تیمەکەی کۆلۆنێل ولیـامز، سـەبارەت بەکێشـەکانی سـەر سـنوور دوو دەفتـەر پـڕ

یاداشتی نووسیوەو بەناوی **"کێشەی سنووری ئێران و عوسمانی و سەفەر و لێکۆڵینەوە لە کلدە و شووش"** بەدوای یەکدا لە ساڵەکانی (١٨٥٤ ز.) و (١٨٥٧ ز) بلاْویکردوونەتەوە. نوێنەری دەوڵەتی ڕووسیایش کۆلۆنێل چریکۆف، یاداشتەکانی خۆی پڕکرد لە وەسفی ئەو گوند و شارۆچکانەی پیا گوزەری دەکرد، بەتایبەتیش گوند و شارۆچکە کوردەکانی هەردوو دیوی سنووری ئێران و عوسمانی (بڕوانە: چریکۆف، ٢٠١٣، ل١٤١-١٧٦).

فەریق دەروێش پاشا، بەوپێیەی سەرۆکی ئەو لیژنە بوو، کە دەسەلاْتدارانی عوسمانی بۆ دەستنیشانکردنی سنوور دایاننابوو، سەرجەم ناوچە سنوورییەکان گەڕاوە و زانیاریی یەکجار وردی دەربارەی عەشیرەتە کوردەکان و سەرۆکەکانیان، هەروەها گوند و شارۆچکەکانی سەر سنوور و شوێنە جێناکۆکەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی نووسیوە، لە دووتوێی ڕاپۆرتێکی بێ ناونیشاندا، لە ساڵی (١٨٥٢ ز.)، لە ئەستەمبوول بلاْویکردۆتەوە (نەریمان، ١٩٨٦، ل١٣٧).[٤] جێی ئاماژەیە لە بڕگەیەکی ئەو فەرمانەدا کە بۆ دەروێش پاشا دەرکراوە، داوای لێکراوە بارودۆخی ئەو ناوچانەی پیایدا گوزەر دەکات و داب و نەریتی دانیشتوانەکەی و بەروبووم و پیشەی خەڵکەکەی تۆماربکات. بۆ ئەم مەبەستە فەرمانێکی زارەکی لە وەزارەتی دەرەوە بۆ "محەممەد خورشید پاشا" دەرکراوە، کە لە هەمان وەزارەتدا فەرمانبەری قەڵەم-نووسین بووە، تاوەکو یاوەری گەشتەکەی دەروێش پاشا بکات و ئەرکی تۆمارکردن و نووسینەوەی ئەو بابەتانە بگرێتە ئەستۆ کە ئاماژەیان بۆکراوە (العزاوي، د. ت، ص١٠).

خورشید پاشا کە لەلایەن وەزارەتی دەرەوە، هەروەها لەلایەن خودی سوڵتانی عوسمانی عەبدولمەجیدی یەکەم (١٨٣٩-١٨٦١ز) ڕاسپێردرابوو، تا یاوەری شاندی عوسمانی بکات، دواتر لە سەردەمی خودی سوڵتان عەبدولمەجیدی یەکەم و سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦-١٩٠٩ز)دا، دەبێتە یەکێك لە پایەکانی دەوڵەتی عوسمانی و چەندین پلە و پۆستی گرنگی سیاسی لە دەوڵەتدا پێسپێردراوە، لەوانە پۆستەکانی سەرۆکی ویلایەت، وەزیر و پۆستی ڕاوێژکاری، لە گرنگترینیان والیی ویلایەتی ئەنقەرە و دواتر ویلایەتی حیجاز بووە لە ساڵی (١٨٧٠ز.)، وەزیری ئەوقاف و ڕاوێژکاری سەدری ئەعزەمی عوسمانی بووە لە ساڵی (١٨٧٨ز) (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص٥٥).

خورشید پاشا، کە لە نێوان ساڵانی (١٨٤٨–١٨٥٢ز.)دا بەیاوەری دەروێش پاشا سەردانی ناوچە سنوورییەکانیان کردووە و زانیاریی هەمەجۆری سەبارەت بەو ناوچانە کۆکردۆتەوە، بەرهەمی سەرنج و تێبینییەکانی بریتیبووە لە کتێبێکی چوارسەد پەڕەیی، بە ناونیشانی **"سیاحەتنامەی حدود"**، کە لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٨٥١ ز.) دارشتنەوەی کۆتایی هاتووە (العزاوي، د. ت، ص١٠). ئەم گەشتە بۆ یەکەم جار، لە ساڵی (١٨٦٠ ز.)، لە ئەستەمبول بڵاوکراوەتەوە، لەلایەن م. ئا. گامازۆف– وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی ڕووسی و لە ساڵی (١٨٧٧ز.)، لە سان پێتەربۆرگ بڵاوکراوەتەوە، عەلائەددین ئەسەر لە ساڵی (١٩٩٧ز.) وەریگێڕاوەتەوە سەر زمانی تورکیی نوێ و دەقە بنەڕەتییە عوسمانلییەکەشی لەگەڵدا بڵاوکردۆتەوە (عەبدوڵڵا، ٢٠١٤، ل٥٩–٦١). لەلایەن مستەفا وهران–یشەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و بەناونیشانی **"رحلة الحدود بين الدولة العثمانية و ايران– گەشتی سنووری نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران"**، لە ساڵی (٢٠٠٩ز)، لە میسر بڵاوکراوەتەوە.[٥]

سیاحەتنامەی حدود، کە بەرهەمی گەشتێکی درێژی چوار ساڵەیە، نووسەرەکەی بەشێکی گرنگی ناوچەکانی کوردستان (هەروەها ناوچەکانی خوارووی عێراقی ئەمڕۆ)ی بەسەرکردۆتەوە، لەوانە مەندەلی، خانەقین، زەهاو، سلێمانی و پشدەر تا دەگاتە ناوچەکانی وان و بایەزید، لە باکووری کوردستان. تیایدا زانیاریی وردی سەبارەت بە سەرجەم لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و مێژوو و جوگرافیای ناوچەکان تۆمارکردووە. لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە زانیاریی وردی دەربارەی داب و نەریت و ژمارەی دانیشتوان و هۆزەکان و لق و پۆکانیان و زمان و ڕەگەزیان تۆمارکردووە. لە ڕووی ئابوورییەوە ئاماژەی بۆ شێوە ژیان و گوزەرانی خەڵکەکەی و پیشە و باجەکان کە بەدەوڵەتیان داوە کردووە. لە ڕووی جوگرافییەوە سەرجەم ئەو چەم و ڕووبار و گرد و چیا و شوێنەوار و سنوورەی تۆمارکردووە، کە لە ناوچەکاندا هەبوون. لەڕووی مێژوویشەوە زانیاریی گرنگ و بەپێزی دەربارەی عەشیرەت و کەسایەتییەکانی ناوچەکە، کە ڕۆڵیان لە ڕووداوەکاندا هەبووە نووسیوەتەوە (خورشد باشا، ٢٠٠٩، ص٥٥–٥٦). وەك یەکێك لە توێژەرەکان دەڵێت، دوور لە هەموو ئەو نیازانەی

سیاحەتنامە حدود–یان پێنووسراوەتەوە، بەلاَم بە سەرچاوەیەکی دەستی یەکەمی گرینگی مێژووی سەدەی نۆزدەهەمی کورد دادەنرێت (عەبدوڵلاَ، ٢٠١٤، ص٦١).

## تەوەری دووەم: پێکهاتەی دانیشتوان و ڕواڵەتەکانی ئاوەدانی

خانەقین، کە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، لیوایەك بووە سەر بە بەغدا، وەك لە سیاحەتنامەی حدوددا هاتووە، لە دوو بەش پێکهاتبوو، ڕووباری ئەلوەن لە یەك جیایدەکردنەوە. بەشی لای چەپی ڕۆخی ئەلوەن، کە بە "خانەقین" ناسرابوو، بەشەکەی تر دەکەوتە بەرامبەرییەوە، لە ڕۆخی لای ڕاستی ڕووباری ناوبراو، پێیدەوترا "حاجی قەرە". بەشی لای چەپی ڕۆخی ئەلوەن، هەر یەك لە عەشیرەتەکانی: عەلی بەگ و خانە بەگ و یوسف بەگ–ی تێدا ژیاوە، ژمارەی ماڵەکانیان دوو سەد و شانزە ماڵ بووە. بەشی لای ڕاستی ڕووبارەکەش، عەشیرەتەکانی: تووتنچی و مەڵخەتای و مەحمود ئاغا و خمێسات–ی تێدا ژیاوە، ژمارەی ماڵەکانیان دوو سەدو بیست ماڵ بووە، کە بیست ماڵی جوولەکە بوون. بەم چەشنە کۆی هەموو ماڵەکانی شارۆچکەکە بریتیبووە لە چوارسەد و سی و شەش ماڵ (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨١). جێی سەرنجە ژمارەی ماڵەکانی خانەقین، بەراورد بەساڵانی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم زۆر دابەزیوە. جیمس بیکنگهام، کە لە ساڵی (١٨١٦ ز.)دا هاتۆتە خانەقین، ژمارەی ماڵەکانی بە (١٥٠٠) ماڵ خەملاَندووە (بیکنغهام، ١٩٨٦، ص٢١٣). چوار ساڵ پاش ئەوەیش مونشی بەغدادی، هەمان خەملاَندنی بۆ کۆی ماڵەکانی خانەقین کردووە (المنشي البغدادي، ٢٠٠٨، ص٥٩). هۆکاری ئەم پاشەکشێ لە ئاوەدانی و دابەزینی ژمارەی ماڵەکان، لە نێو تێبینییەکانی سیاحەتنامەدا دەبینینەوە، کە وێڕای جەختکردنەوە لە ئاوەدانیی شارۆچکەکە لە ساڵانی پێشووتردا، ئاماژەی کردووە بۆ دوو ڕووداو، یەکێکیان سیاسی و ئەویتر سروشتی، کە کاریگەریی نەرێنی لەسەر ئاوەدانیی، نەك خانەقین، بەڵکو تەواوی ناوچەکە هەبووە. ئەویش دەستبەسەراگرتنی خانەقین لەلایەن ئێرانییەکانەوە، هەروەها بلاَوبوونەوەی نەخۆشی تاعون و درێژەکێشانی، تا کۆتاییەکانی دەسەلاَتی داوود پاشای والیی بەغدا (١٨١٧–١٨٣١ز) (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨٢).

جێی ئاماژەیە محەمەد عەلی میرزا (١٨٠٦-١٨٢١ز)ی حاکمی کرماشان، لە چوارچێوەی ناکۆکییەکانی لەگەڵ داوود پاشای والیی بەغدا و دەستێوەردانەکانی بۆ ناوچەکانی بابان، پاش داگیرکردنی یەکجاریی زەهاو، لە ساڵی (١٨٢٠ ز.)، پەلاماری خانەقین و دەوروبەری داوە و هەر شارۆچکە و گوند و مەرزایەکی هاتۆتەڕێ وێران و تالآنی کردووە. (نازم بەگ، ٢٠١٣، ل٣٤٠-٣٤١). ناوچەکەش بەگشتی زۆرجار پەتای تاعونی بەخۆوە دیوە، بەڵام ئەمەی دواییان، کە سەرەتا، لە تەموزی ساڵی (١٨٣٠ ز.)، لە شاری تەورێز بڵاوبوویەوەو پاش چەند مانگێك لەڕێگەی ئەو کاروانانەی بێ هیچ بەربەست و لێپرسینەوەیەك لە ئێرانەوە دەهاتن، ناوچەکانی کوردستان و سەرانسەری عێراقی عەرەبی گرتەوە و ژمارەیەکی زۆری لە خەڵك کوشتووە (نورس، ١٩٧٥، ص٢٥٧). بۆ وێنە شوێنێکی وەك بەغدا تەنها یەك لەسەر سێی دانیشتوانەکەی ماوەتەوە، زۆر گەڕەك بەتەواوی چۆڵبووبوون، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی شاری حیللە (الحلة) بەم پەتایە تیاچوون (الاعظمي، ٢٠٠٥، ص١٨٤-١٨٥ ؛ نەوار، ٢٠١٢، ل٢٧٣). ئەگەرچی سەرچاوە مێژووییەکان سەبارەت بە کاریگەریی ئەم پەتایە لەسەر دابەزینی ڕێژەی دانیشتوان لە خانەقین، زانیارییەکی ئەوتۆ بەدەستەوە نادەن، بەڵام لەو سۆنگەوە کە پەتاکە سەرانسەری بووە و (خانەقین)یش کەوتبووە سەر ڕێگای هاتوچۆکردنی زیارەتکەرانی ئێرانی، بۆیە بەدووری نازانین پەتاکە هۆکارێکی سەرەکی بووبێت، بۆ دابەزینی ڕێژەی دانیشتوانی خانەقین.

پاش بڵاوبوونەوەی پەتای تاعون لە ناوچەکە، پێدەچێت کاتێکی زۆری ویستووە، تا خانەقین جارێکی تر هەناسەی بەبەردا بێتەوە و سەرلەنوێ ببووژێتەوە. **کۆنت دوسێری**، کە لە کۆتایی سییەکانی سەدەی نۆزدەهەم هاتۆتە شارۆچکەکە، فراوانیی ڕەز و باخەکان و دیمەنی دڵڕفێنی ئەو دار خورمایانەی لە دەوروبەری ماڵەکاندا بوون سەرنجی ڕاکێشاوە، کە چۆن وەك سایەیەك ڕێگری دەکرد لە گەیشتنی پلە بەرزەکانی گەرمای خۆر بۆ نێو ماڵەکان و بووبوونە جێی هێلانەی ئەو قومریانەی نەوە دوای نەوە لە هێلانەکانیاندا لەسەر درەختە خورماکان دەژیان (دوسێری، ٢٠١٣، ل٦٤). بەگوێرەی نووسەری سیاحەتنامە لە ڕۆژگاری نەجیب پاشا (١٨٤٢-١٨٤٩ز)ی والیی بەغدا بووژانەوەی ڕاستەقینە و

ئاوەدانی ڕووی لە خانەقین کردۆتەوە، پێدەچێت پاش ئەویش بەردەوام بووبێت، وەك دەڵێت:" **کاتێك ئێمە لە ناوچەکە بووین کارەکانی چاندنی ڕەزی دارە خورما و دروستکردنی بینای جۆراوجۆری خانووبەرە و بازاڕ و.. هتد سەرلەنوێ دەستپێکردۆتەوە**"(خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨٢). بەرهەمی ئەم بایەخدانە بە ڕەز و باغ و چاندنی دارە خورما، لە نووسینی ئەو بیانییانەی لە ساڵەکانی دواتردا هاتوونەتە شارۆچکەکە ڕەنگیداوەتەوە، لەوانە **هینری بێندەر**، کە لە هەر شت زیاتر سەرنجی ڕاکێشاوە، دیمەنی ئەو دارە خورما و درەختە جۆراوجۆرانەی وەك هەنار و هەنجیر و لیمۆ و پرتەقاڵە، کە لەگەڵ گیاکاندا بەتایبەت تووترکە کێویلکە تا نزیك ڕووباری ئەڵوەن شۆڕبوونەتەوە (بێندەر، ٢٠٠٦، ل٤١٨). بەو جۆرە ناوبانگی باخچەکانی خانەقین بە میوەی نایاب بەهەموو چەشنەکانییەوە، تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، لە ناو ویلایەتی بەغدا ناوبانگی پەیداکرد (ڤیتال، ٢٠١٧، ل١٦٠).

دانیشتوانی خانەقین، وەك لە سیاحەتنامەدا هاتووە: "**زۆربەیان کوردن، بە کەمی عەرەبیان تیایە، هەموویان موسڵمانن، بە زۆری لەسەر ئاینزای شافیعین، ژمارەیەکی کەمیان سەر بە ئاینزای شیعەن. خەڵکەکەی لەبری زمانە ڕەسەنەکەی خۆیان کە کوردییە، بە پێچەوانەوە بە زمانی فارسی و هەندێکیشیان بە زمانی تورکی دەدوێن**" (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨٢-١٨٣). هەڵبەتە حاڵەتێکی سروشتی بووە خەڵکی شارۆچکەکە زمانی فارسی لە ئاخاوتندا بەکارهێنابێت، چونکە بەهۆی شوێنەکەیانەوە، کە نزیك بووە لە سنووری ئێران و کەوتۆتە سەر ڕێگەی کاروانی زیارەتکەرانی شیعە، ڕۆژانە لە ناوچە جیاجیاکانی ئێرانەوە، بە مەبەستی سەردانیکردنی شوێنە پیرۆزەکانی شیعە لە بەغدا و سامەڕا و نەجەف و کەربەلا، خەڵکێکی زۆر ڕووی لە خانەقین دەکرد. ئاخاوتنی هەندێکی تریشیان بە زمانی تورکی لەبەر ئەوەبووە، کە شارۆچکەکە یەکێك بووە لە مەڵبەندەکانی پاشایەتی بەغدای عوسمانی.

بەگوێرەی سیاحەتنامە، خەڵکی خانەقین شەیدای بەدەستهێنانی زانستەکان بوون، هەر بۆیە هەندێ کۆڕی زانستی و وانەوتنەوەی تێدا بەڕێوەدەچوو، سێ مزگەوتی گەورە و دوو تەکیەی سەر بە تەریقەتی قادری[٦] تیابووە، کە

ناوەندەکەی لە کەرکووك بووە و لەلایەن شێخ عەبدولڕەحمان ئەفەندی[٧] وە بەڕێوەدەبرا.

دانیشتوانی هەموو شوێنێکی سەرزەمین، لە دروستکردنی بینا و خانووەکانیاندا، ئەو کەرەستانە بەکاردەهێنن، کە لەگەڵ ژینگە و تۆبۆگرافیای ناوچەکەیاندا دەگونجێت، دانیشتوانی خانەقین و دەوروبەریشی ئەوەیان کردووە، خانوو و حەوشە گەورە و ئاوەدانەکانیان، لە بەردی زۆر و زەوەندی ناوچەکە و قوڕ دروستکردووە: (**بیناکان.. لە قوڕ و بەرد دروستکرابوون.. چەشنی خەڵکی مەندەلی لە ماڵەکانیاندا چەپەرێکیان دروستدەکرد، پێیاندەوت "حەوش" ، لەم حەوشەدا ژمارەیەکی زۆر ژوور هەبوو، کە جێی دوو تا سێ خێزانی تیا دەبووەوە**) (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨٢).

خانەقین بەهۆی ئەوەی ڕێڕەوی زیارەتکەرانی شیعەی ئێران و بازرگانەکان بووە، کە لە هەرێمە جیاجیاکانەوە دەهاتن، بۆیە بازاڕێکی ئاوەدان و گەرم و گوڕی هەبووە "**ژمارەیەکی زۆر لە قاوەخانە و دووکانی کووتاڵ فرۆشی و عەتاری و گۆشتفرۆشی و بەقاڵی و دووکانی پیشەی دەستی**" تیابووە، کە شمەکی هەمەڕەنگی تیا دەفرۆشرا (**بۆ وێنە بازرگانی کووتاڵ فرۆش، کووتاڵیش و هەندێ سەوزەواتی وەك "کاهوو و ترۆزی" دەفرۆشت، زێڕینگەریش زێڕ و هەندێ بەرهەمی عەتاری تری دەفرۆشت، گۆشتفرۆشیش گۆشت و خوێی ئینگلیزی دەفرۆشت... هتد**" ( خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨٢).

ڕووباری ئەڵوەن و پردە یەك لە دوای یەکەکانی، کە لەسەر ڕووبارەکە دەکرا و بەدرێژایی مێژووی دێرینی خانەقین سەرچاوەی ئاوەدانییەکەیان پێکهێناوە[٨]، دیوێکی تری ئەو ڕواڵەتانەیە کە سیاحەتنامە ئاوڕی لێداونەتەوە، وەك نووسیوێتی ڕووباری ئەڵوەن: کە (**لە کتێبە جوگرافییەکاندا بە حەلوان ناسراوە، لە شاخی مەزنی ناسراو بە داڵەهۆی نزیك زەهاو سەرچاوە دەگرێ، لە لێژاییەکانی گەلی پیرانەوە، کە کەوتۆتە سەر چیای زەردە دەڕوات، بە دەربەندی دەرەتەنگدا، لای ڕۆژئاوای گوندی ڕێژاو و لەوێشەوە بە بەردەم زەهاودا تێپەڕدەبێت، لە کۆتاییشدا لە نزیك کۆشکی زەنکی، کە کەوتۆتە سەرووی گوندی قزڵڕەبات، دەڕژێتە ڕووباری دیالەوە (سیروان)** ( خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨١). جێی ئاماژەیە خەڵکی

خانەقین بۆ ڕاییکردنی ژیانی ڕۆژانە و خۆپاراستن لە گەرمای هاوین سوودی زۆریان لە ئاوی ڕووبـاری ئـەلوەن وەرگرتـووە، هێنـری بێنـدەر ئەمـەی دووپاتکردۆتـەوە: **"بەرەبەری ئێوارەیە و هەرکەس خەریکی ئەنجامدانی کاری خۆیەتی، چەند ژنێك ئاو دەبەن، هەندێکی تر خەریکی جل شوشتنن، منداڵەکانیش لـە تەنیشـتیانەوە مەلە دەکەن، چەند پیاوێك ئەسپ و مانگـا و گوێدرێـژ و حوشـتریان بـۆ ئـاودان هێناوە، هەموو دوای گەرمای ڕۆژانە لە نزیکی ڕووبار خڕبوونەتەوە"**(٣٥). جێـی ئاماژەیە پلەی بـەرزی گـەرما و هـەتاوی خانـەقین و دەوروبـەری، جێـی سـەرنجی زۆرێك لـەم بیانییانـە بـووە، کـە لـە ڕۆژگارەکـانی سـەدەی نۆزدەهـەم هاتوونەتـە ناوچەکە. بەگوێرەی کۆنت دۆسێری، دانیشتوانی خانەقین بۆ خۆپارێزی لە بەرزیی پلەی گەرمای خۆر، خۆیان لە تـاریکترین شـوێنی ماڵـەکانیان حەشـارداوە، تـا لـە سایەی هەوای فێنکیدا بژین و چاوەڕوانی کاتە فێنکەکانی ڕۆژ بکەن، بۆ ئەوەی لە نـوا تاریکـەکانیان بێنــەدەرێ... لـەو سـاتانەدا خـۆر بـەرەو ماڵئـاوایی دەچـێ و فرسەتێ بە مرۆڤ دەدات هەناسە هەڵبکێشێت، خێرا خـاوەن مـاڵ لەسـەر سـەکۆی سەربانەکانیان قاڵیچەیەك ڕادەخـەن و چـێژ لـە شـنەبای فێنکـی شـەو وەردەگـرن (دوسـێری، ٢٠١٣، ل٦٦-٦٧). چـریکۆف-ی هـاوڕێ ناوبـژیوانی نووسـەری سیاحەتنامەی حدود-یش، لە زمانی نوێنەرێکی ئینگلیزەوە، کە لەو ڕۆژگارەدا لـە خانەقین بووە، بەم چەشـنە وەسـفی گڕەبـای شارۆچـکەکەی کـردووە: **"تـەوژمی زۆرە، بۆ ماوەی چل ڕۆژ بەردەوام لە تین و تاوی کەم نابێتەوە، لە سەرەتاوە ئەو هێزەی نییە، بەڵام وردە وردە کاری خۆی دەکا تـاکو پێـی ڕەشـی لـە ناوچـەکە دەبڕێت بێبەزەییانە لە دار و درەختەوە بیگرە تا گیانداران دەیخاتە بەر قەمچی خۆی!"**(چریکۆف، ٢٠١٣، ١٤٦). پێدەچێت ئەمە وایکردبێت ژاك دمۆرگان، کە لـە سـەرەتای نەوەتـەکانی سـەدەی نۆزدەهـەم سـەردانی ناوچـەکانی دەوروبـەری خانەقینی کردووە بڵێـت: **"ئـەم ناوچـانە بـا گـەرم و سـووتێنەرەکانی باشـووری ڕۆژئاوا دەیگرێتەوە و لە با فێنکەکانی باکوور بێبەشە.. گەر کەسـێك لـە وەرزی هاویندا سەردانی ئەم ناوچەیە بکات خۆی دووچاری کێشە دەکات!"**(دومۆرگان، ٢٠١٢، ل١١٨).

محەمەد عەلی میرزا، کە کوڕە گەورەی فەتح عەلی شا (١٧٩٧–١٨٣٤ز)ی ئێران بووە، لە نێوان سالآنی (١٨٠٦– ١٨٢١ز)، لەلایەن باوکییەوە کراوەتە فەرمانڕەوای کرماشان، لە چوارچێوەی چاوتێبڕین و فراوانخوازییەکانیدا بۆ سەر ناوچە سنوورییەکان، لە سالّی (١٨١١ ز.)دا بۆ ماوەیەك دەستی بەسەر زەهاودا گرتووە (سۆن، ٢٠٠٧، ل٤٠). بەگوێرەی سیاحەتنامە بەمەبەستی ئاسانکردنی هاتوچۆی هاولآتیانی ئێرانی بەسەر ڕووباری ئەلّوەندا، کاربەدەستانی ئێرانی هەر کە پردێك دەڕووخا پردێکی تریان لەسەر دروستدەکرد، لەو سالّەدا کە نێوبراو دەستی بەسەر زەهاودا گرتووە، پردێکی توندوتۆلّی لەسەر ڕووباری نێوبراو دروستکردووە، تێچووی ئەو پردەش لە داهاتی زەهاو دابینکردووە (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨١)، کە بڕەکەی (٢٠٠٠٠٠) قروش بووە[9] (ڕیچ، ٢، ٢٠١٢، ل ٢٥٣). هۆکاری دروستکردنیشی گەڕاندۆتەوە بۆ ئەوەی **"ناوچەکە ڕێڕەوێکی گەورەی زیارەتکەران و بازرگانە ئێرانییەکان بووە، ڕووبارەکە لە کاتی لافاودا بەربەستی بۆ هاتوچۆکردن دروستکرد)** (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨١). کلاودیۆس جەیمس ڕیچ و مونشی بەغدادیی هاوسەفەری، کە لە سالّی (١٨٢٠ ز.)دا هاتوونەتە خانەقین و بەسەر پردەکەدا تێپەڕبوون، یەکەمیان وەك پردێکی قەشەنگ، دووەمیشیان وەك پردێکی توندوتۆلّ و بێوێنە لە ناوچەکەدا ئاماژەیان پێداوە، دوپاتیشیانکردۆتەوە، کە لەلایەن "محەمەد عەلی میرزا"ی حاکمی کرماشانەوە دروستکراوە ( ڕیچ، ٢، ٢٠١٢، ص ٢٥٣ ؛ المنشي البغدادی، ٢٠٠٨، ص٥٩).

ئەگەرچی سیاحەتنامە تەنها ئاماژە بۆ توندوتۆلّی پردەکە دەکات و باسی شێوەی پردەکە و ئەو کەرەستانە ناکات، کە لە دروستکردنیدا بەکارهاتوون، بەلآم بیانییەکانی تر، کە چەند سالّێك پاش دروستکردنی پردەکە هاتوونەتە خانەقین، سەرنج و تێبینییەکانی خۆیان لەسەر داوە، لەوانە بێکنگهام کە دەلّێت: **"پێدەچێت پردەکە تازەبێت و لە خشتی سوورەکراو دروستکراوە"**(بیکنغهام، ١٩٦٨، ص٢٠١٢)[10]. بەگوێرەی ژاك دمۆرگان، لە ناوچەکانی نزیك خانەقین، پێکهاتەی گەچی بەرچاو دەکەوێت، جوانترین دیمەنی ئەم پێکهاتەیە لە کەناری چەپی ئەلّوەن، لە بەرامبەر قەسری شیرینە، ئەم پێکهاتە گەچییانە بۆ

سوورکردنەوە و دروستکردنی شتومەکە گەچییەکان زۆر گونجاوبوون، کۆشکەکانی قەسری شیرین و حەوش کوڕوی سەردەمی ساسانی لەم پێکهاتەیە دروستکراون (دومۆرگان، ٢٠١٢، ل١٠٦)، هەروەها دروستکردنی پردەکانی تری سەر ڕووبارەکە لە سەردەمەکانی تردا، بۆیە دوور نییە هەمان پێکهاتەی گەچی لە دروستکردنی خشتەکانیدا بەکارهاتبێت.

**تەوەری سێیەم: کاروانسەرا و زیارەتکەران و تەرمی مردووان**

کاروانسەرا یان خان[11]، دەزگایەکی زۆر دێرینی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتە، ئەرکی بریتیبوو لە دابینکردنی شوێنی حەوانەوەی ژمارەیەکی زۆر لە میوان و موسافیر و وڵاخە بارهەڵگرەکانیان لە تێکڕای وەرزەکانی ساڵدا (هان، ٢٠١٧، ل١٦–٢٠). بەو پێیەی خانەقین ڕێڕەوی سەرەکی ئەو زیارەتکەرانە بوو، کە لە ناوچە جیاجیاکانی ئێرانەوە دەڕۆیشتن بۆ سەردانی مەزارگە پیرۆزەکان، هەروەها ڕێڕەوی ئەو بازرگانانەش بوو، کە لە ناوچەکانی دەوروبەری شام و بەغدا و حەڵەبەوە پرۆسەی بازرگانییان دەکرد، سیاحەتنامە تیشکی خستۆتە سەر ئەم مەسەلە، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە لە هەردوو دیوی شارۆچکەکەدا، پێنج خان و کاروانسەرایەك، کە لەسەر شێوازی عەجەم دروستکرابوو و پێیدەوترا کاروانسەرای عەجەم هەبوون. کاروانسەرای عەجەم تەرخانکرابوو بۆ زیارەتکەران و بازرگانانی ئێرانی، کە لە کاتی تێپەڕبوون بە خانەقیندا تیا دەمانەوە (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨٢). بەگوێرەی مونشی بەغدادی، ئەم کاروانسەرایە لەلایەن (حاجی عەلی خانی زەنگەنە)، لە ڕۆژگارێکدا فەرمانڕەوای کرماشان بووە دروستکراوە، بەمەبەستی هاتوچۆکەرانی ئێرانی لە زیارەتکەران و بازرگانان (المنشي البغدادي، ٢٠٠٨، ص٥٩). بێکنگهام و بەدوای ئەویشدا ڕیچ وەك خانێکی باش و گەورە و نایاب، کە جێگەی کاروانێکی گەورەی تیادەبێتەوە وەسفیانکردووە (بیکنغهام، ١٩٦٨، ص٢١٣ ؛ ڕیچ، ٢، ٢٠١٢، ل٢٥٣). بەگوێرەی سیاحەتنامە وێڕای ئەو دەستکەوت و قازانجە زۆرەی کاروانسەراکە هەیبووە، بەڵام هیچ کاتێکیان تەرخان نەکردبوو بۆ خاوێنکردنەوە و پاکڕاگرتنی ژوور و حەوشە و بانەکانی (**لە نهۆمە زەمینییەکانی خانەکەدا ئاودەست نەبوو... کاروانسەراکە زۆر پیس و پۆخڵ بوو،**

**هەرچەندە بریکاری کونسوڵی ئێران، لە یەکێك لە گەشتەکانیدا لە کاروانسەراکە ماوەتەوە، کاتێك بارودۆخەکەی بینیوە، بڕیاریداوە چەند ئاودەستخانەیەك، هەروەها چەند ڕێڕەوێك، بۆ نهۆمی خوارەوەی خانەکە دروستبکات، بڕە پارەیەکیشی بۆ پاککردنەوەی تەرخانکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دۆخی پیس و پۆخڵی کاروانسەراکە گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە)** ( خورشید باشا، ۲۰۰۹، ص۱۸۷). سەرباری چەندین کێشەی تر کە لە کاروانسەراکانی ئەو ڕۆژگارەی ناوچەکەدا بەگشتی هەبووە، لەوانە بەرزیی نرخی مانەوە لە نێو کاروانسەراکان، هەروەها بەرزیی نرخی ئەو خۆراك و پێداویستییانەی دەفرۆشرایە زیارەتکەران، سەرباری ئەوەش کاروانسەراکان شوێنێکی دڵنیا و ئارام نەبوون، بەهۆی دەستێکەڵکردنی خاوەنەکانیان لەگەڵ دز و جەردەکاندا، هەندێ جار مەترسیی لەسەر ژیان و سامانی زیارەتکەران دروست دەبوو، سکاڵا لە دەست ئەم جۆرە ڕەفتارانە زۆر جار لەو داواکاریانەدا ڕەنگیداوەتەوە، کە سەفارەتی ئێران پێشکەشیکردووە، بۆ پاراستنی ماڵ و سامانی زیارەتکەران و بایەخدانی زیاتر پێیان و داخستنی ئەو کاروانسەرانەی خاوەنەکانیان بەڵێننامەیان نییە (العزاوي، د. ت، ص۹۰؛ النجار، ۲۰۱٦، ۱۸۳).

سەرجەم ئەو شتومەك و کەلوپەلانەی لە ئێرانەوە بەرەو بەغدا، یان بە پێچەوانەوە دەهاتن، بەم ناوچەدا تێپەڕدەبوون. هەروەها زۆربەی ئەو کەسانەی لە ڕۆژهەڵاتەوە سەردانی شوێنە پیرۆزەکانی شیعەیان دەکرد، لە ناوچە جیاجیاکانی عێراق بە دەروازەکانی زاگرۆس و بەخانەقیندا تێپەڕدەبوون، بە تێپەڕبوونیشیان بەشێکی گرنگی داهاتی خەڵکەکەی دابین دەبوو (دومۆرگان، ۲۰۱۲، ل۱۵۱). لەو خشتەی خوارەوە کە سیاحەتنامە لە تۆماری هێشتنەوەی تەندروستی– کۆرانتینە[۱۲]ی خانەقین وەریگرتووە، ژمارەی زیارەتکەران و تەرمی ئەو مردووانەی بۆ ناشتن دەبران بۆ ناوچە پیرۆزەکان، هەروەها ژمارەی بازرگان و قەبارەی ئەو شمەك و بارە بازرگانی و مەڕوماڵاتانە ڕووندەبێتەوە، کە لە ماوەی ساڵێکی تەواودا بە خانەقیندا تێپەڕبوون (خورشید باشا، ۲۰۰۹، ص۱۸۳–۱۸۵).

| زیارەتکەر و بازرگانان | بارهەڵگرانی کاڵاکان | مەڕەکان | بارە بازرگانییەکان | ئاژەڵەکان | ئەوەی مردوون | حوشتر | مانگی تێپەڕبوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١١٢٢ | ٢٨٤ | – | ٣١٦ | ٢١٩٠ | ١٧٨ | – | مارس |
| ١٨٣٠ | ٣٠٤ | – | ٩٧٧ | ٣٠٨٧ | ١٧١ | – | ئەپریل |
| ٣٠٦٠ | ٢٢٩ | – | ١٤٦ | ٣٣٣٠ | ١٦٣ | – | مایۆ |
| ١٢٦٧ | ١٥٤ | – | ٤٥٤ | ٢٠٧٢ | ٢٣٢ | – | یۆنیۆ |
| ٦٥٨ | ١٦١ | ٣٠٥٩ | ٦١٥ | ١٢٥٦ | ١٣ | – | یۆلیۆ |
| ١٠٩٣ | ٨٨ | ١٠٠ | ١٩٧ | ١٣٢٠ | ٦٦ | ١٢٠ | ئۆگستۆس |
| ١٧٠٥٢ | ٧٠١ | – | ٧٧٨ | ١٨٧٠ | ٧٨٧ | – | سپتەمبەر |
| ١٩٦١٤ | ٦٦٩ | ٣٠٤٠ | ١٢٣٠ | ٢٠٣٨٤ | ٥٧٧ | – | ئۆکتۆبەر |
| ٣٨٦٢ | ٦٤ | ٣١١٨ | ٨١٨ | ٤٠٢٥ | ٣٠٢ | – | نۆڤەمبەر |
| ٢٦١٧ | ١٥٠ | ٣٠٤٠ | ٨٥٣ | ٣٨٥٧ | ٢٦٨ | – | دیسەمبەر |
| ٦٦٩ | ٢٥٤ | ٧٢٠٠ | ١٩٩٦ | ٢٤٢٩ | ٢٩٣ | – | یەنایەر |
| ١٦١ | ٢٩٠ | ٤٧٠٠ | ٨٩٥ | ١٤٠٦ | ١٢٦ | – | فێبرایەر |
| ٥٢٩٦٩ | ٣٣٤٨ | ٢٤٩٥٧ | ٩٨١٥ | ٦٤٠٥٦ | ٣١٣٦ | ١٢٠ | کۆی گشتی |

وەك لە ژمارەی کۆتایی بەندی یەکەمی خشتەکەدا هاتووە، کە تایبەتە بە زیارەتکەران و بازرگانان کە ژمارەیان (٥٢٩٦٩) کەسە، بەگوێرەی سیاحەتنامە ئەوە تەنها ژمارەی نێرینە پێگەیشتووەکانە، بەبێ ناوی ژنان و منداڵان، کە بە زۆری ئەسپ سواربوون و کەمیان پیادە، پاش لێکۆڵینەوەش دەرکەوتووە ژمارەی ئەوانەی لە ماوەی ساڵێکدا تێپەڕبوون، زۆر لەوە زیاتربووە کە تۆمارکراوە و سەد هەزار کەسی تێپەڕاندووە. بەڵام بەهۆی ئەوەی شەوان دەڕۆن، لە تۆماری کۆرانتینە ناونووس ناکرێن، بەتایبەتی ئەو زیارەتکەر و بازرگانانەی لە وەرزی

هاویندا دێن و دەڕۆن، بێ ئەوەی لە خانەقین بمێننەوە (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨٥–١٨٦). هەڵبەتە بە ڕەچاوکردنی خەرجی و تێچووی سەفەری زیارەتکەران بەگشتی و ئەو باج و ڕسووماتە قورسانەی دەخرایە سەر خۆیان و کەلوپەلەکانیان لەگەڵ هاتنیاندا بۆ نێو خاکی عوسمانی لە خانەقینەوە. بڕوانە: (النجار، ٢٠١٦، ص١٨٣ ؛ جونز، ١٣٨٧، ص١٩٧). دەتوانین مەزەندەی ئەوە بکەین، کە خەڵکانێکی زۆر بۆ خۆلادان لە زیادە مەسرەفی و ڕۆتیناتی ڕاگرتن، خۆیان لە تۆماری بەرپرسانی کۆرانتینە دەدزییەوە. سەرچاوە مێژووییەکانیش بەرزیی ژمارەی زیارەتکەران، لە ڕۆژگارەکانی سەردەمی قاجاری دەسەلمێنن، بەگوێرەی هەندێك تۆژەر لە ساڵێکدا نزیکەی سەد هەزار کەس سەردانی شوێنە پیرۆزەکانی کردووە، تۆژەرانی دیکە ژمارەکەیان بە چوارسەد هەزار کەس خەملاندووە (ماهری، ١٣٩٢، ص٩٤). دەبێت تێبینی ئەوەش بکرێت، ئەم ژمارانە لە کاتی جەنگ و ئاڵۆزییەکاندا کەمیان کردووە، یان هەر زیارەتکردن بە فەرمی قەدەغەکراوە. بۆ وێنە بەهۆی کێشەکانی دیاریکردنی سنوور لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی– ئێرانی لەلایەك، گلەیی و گازندەکانی دەسەلاتدارانی ئێرانی لەسەر خراپ مامەڵەکردنی زیارەتکەران لەلایەن پاشایەتی بەغدادەوە لەلایەکی تر، لە ساڵی (١٨٥٢ ز.)وە بۆ ماوەی چوار ساڵ، هاتوچۆکردنی کاروانەکانی زیارەتکەران بە فەرمی قەدەغەکرا (لوریمر، د.ت، ص٢٠٣٨ ؛ معتمد، ١٣٣٤، ص١٦٩).

بەندی دووەمی خشتەکە، کە ژمارەی بارهەڵگری کاڵاکان لەخۆدەگرێت، وەك لە تێبینییەکانی سیاحەتنامەدا هاتووە، هەردوو کەسیان تەنها ولاخێکیان پێبووە و بە درێژایی ڕێگا بەنۆرە سەرکەوتوون. ژمارەی ئەو ئاژەڵانەی لە بەندی سێیەمی خشتەکەدا هاتوون، کە بریتییە لە (٢٤٩٥٧) سەر ئاژەڵ، ئەوە تێکڕای ئاژەڵەکانی دەگرتەوە، چی ئەوانەی تایبەت بوون بە زیارەتکەران و بازرگانان یان بارهەڵگرانی کاڵا و تەرەمەکان و ئەو مەڕو ماڵاتەی بۆ فرۆشتن دەهێنران. ئەو بارە بازرگانیانەش کە ژمارەیان لە بەندی چوارەمی خشتەکەدا هاتووە، تەنها ئەو بارانەی دەگرتەوە کە باج و رسووماتی گومرگ دەیگرتنەوە، ئاژەڵەکانی کە بارەکان یان خاوەن بارەکانی لەسەر بوو نەدەگرتەوە. ( خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨٥–١٨٦).

ناشتنی مردوو لە نزیك گۆڕی یەكێك لە ئیمامەكان، لای هەڵگرانی ئاینزای شیعە بڕوایەكی پتەوبووە، بۆیە بە مەبەستی گواستنەوەی تەرمەكان، ساڵانە بە سەدان كاروان، لە دوورترین شوێنی ئێرانەوە دەهاتن بۆ شوێنە پیرۆزەكان. وەك لە بەندی شەشەمی ئەو خشتەدا دەردەكەوێت، كە سیاحەتنامە بۆ تەرمی مردووانی تەرخانكردووە، كۆی ئەو تەرمانەی لە ماوەی مانگەكانی ساڵێكدا لە كۆرانتینە تۆماركراون، بریتییبووە لە (٣١٣٦) تەرم ( خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨٦).

بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەكان، لە دوای بەستنی پەیماننامەی دووەمی ئەرزەڕۆم، لە ساڵی (١٨٤٧ز)دا، ژمارەی ئەو تەرمانەی كە دەگوازرایەوە بۆ شوێنە پیرۆزەكان زیادیكردووە، لە هەندێ ساڵدا ژمارەكان گەیشتوونەتە (١٠ هەزار) تەرم، لە ساڵانی كۆتایی سەردەمی قاجاریشدا ئەو ژمارەیە دووقات بووەتەوە و گەیشتۆتە (٢٠ هەزار) تەرم. جێی ئاماژەیە نووسینگەی كۆرانتینە لەسەر سنوورەكان، باجێكی تایبەتیان هەبوو بۆ پشكنینی زیارەتكەران و تەرمەكانی كە پێیانبوو، پێیدەوترا باجی كۆرانتینە (النجار، ٢٠١٦، ص٣٧٥)، بۆ تێپەڕبوونی هەر تەرمێك لە خانەقین دوازدە قران، بۆ ناشتنیشی لە گۆڕستانە گشتییەكانی كەربەلا و نەجەف، هەشت تا چواردە قران وەردەگیرا (ماهری، ١٣٩٢، ص٩٧).[13]

گواستنەوەی تەرمی مردووان سەرچاوەی كێشەگەلێكی زۆربوون، هەم بۆ پەیوەندییەكانی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران، هەم بۆ لێپرسراوانی كۆرانتینەی خانەقین و دانیشتوان بەگشتی. لێپرسراوانی عوسمانی لە كۆرانتینەی خانەقین چەندین ڕۆژ تەرمەكانیان دەهێشتەوە، ڕێگەی هێنانە ژوورەوەی بە زۆرێك لەو تەرمانە نەدەدا، كە كەمتر لە سێ ساڵ بەسەر مردنیاندا تێدەپەڕی، تەرمەكان بۆ ئەوەی مۆڵەتی هێنانە ژوورەوە وەربگرن، پێویستبوو لە سندووقێكی تایبەتدا دابنرێت، هەندێ كات ئەو تەرمانەی ڕێگەی هێنانە ژوورەوەیان وەرنەدەگرت، بەكۆمەڵ دەنێژران، یان كاتێك نیشانەكانی نەخۆشی تاعون یان كۆلێرا دەبینرا، تەرمەكانیان دەسووتاند، ئاشكرایە ئەم جۆرە كردارە دەبووە مایەی ناڕەزایەتی خەڵك و زاناكان و دەوڵەتی ئێران. ئەو باجانەش كە كارگوزارانی

عوسمانی بە بەهانەی جیاواز لەسەر تەرمەکان دایاندەنا، زۆرجار بەرهەڵستی و ناڕەزایەتی دەوڵەتی ئێرانی لێدەکەوتەوە. لەوانە بۆ نموونە، ئەو بڕە پارەی وەك باجی پێدانی "وەفات نامە" لە خاوەنی تەرمەکان وەردەگیرا و ناویان لێنرابوو "باجی کۆرانتینە"، کە هەندێ جار بڕەکەی زۆر لەوە زیاتر وەردەگیرا کە دانرابوو (ماهری، ١٣٩٢، ص٩٩). لە ساڵانی دواتردا دەوڵەتی عوسمانی هەوڵیدا باج و ڕسووماتی سەر تەرم و زیارەتکەران، بەگوێرەی یاسای گومرگی تەندروستی ڕێکبخات. بۆ هەر تەرمێك بڕی پەنجا قروش، بۆ هەر زیارەتکارێکیش دە قروشی دیاریکرد. بەڵام ئەم یاسایە لەلایەن کاربەدەستانەوە جێبەجێ نەدەکرا، سەربارى ئەوەی تەرمەکان لە کرماشان بە مۆری پزیشکی و تەندروستی عوسمانی دەگەیشت و بیست یەك قرانیش پارەشیان دەدا، بەڵام لە خانەقین جارێکی تر تەرمەکانیان دەردەکرد و مۆری پزیشکی تەندروستیان دەشکاند و بڕێکی تر پارەیان بۆ هەر تەرمێك وەردەگرتەوە، پاشان بە مۆر ڕەنگ دەکرایەوە، ئەمە بێجگە لەو زەحمەتی و قورساییە داراییەی لە دەروازەی کەربەلا ڕووبەڕوویان دەبوویەوە (ماهری، ١٣٩٢، ص٩٩-١٠٠).[١٤]

بەگوێرەی سیاحەتنامە، گواستنەوەی ئەو تەرمانە لە ناو خانەقین، بەتایبەت لە ناو کاروانسەرای عەجەمدا دەبووە سەرچاوەی بۆگەنێکی زۆر ناخۆش و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی **"ئەو تەرمانەی کە ئێرانییەکان لەگەڵ خۆیان دەیانهێنان .. بۆگەنێکی زۆر ناخۆشیان لێوە دەردەهات، کە بە سروشتی حاڵ نەخۆشی لەوێدا بڵاوبێتەوە، چی لە میانەی بۆگەنی خۆڵ و خاشاك و پاشماوەکانەوە، یان بۆگەنبوونی ئەو تەرمانەی لەوێ بوون"** (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨٧). گواستنەوەی تەرمی شیعە ئێرانییەکان و بۆگەنی لەڕادەبەدەری، کە بەرەو خانەقین براون، سەرنجی هێنری بێندەری ڕاکێشاوە و بەم جۆرە وەسفیکردووە: **"جەستەکان دەخەنە نێو تابووتێکی داری گچکەوە یان تەنیا دایدەپۆشن یان دەیخەنە نێو فەرش و هەر دوو یان سێ یان چوار پێکەوە دەبەستن و لە وڵاغێك باری دەکەن. لەژێر ئەو هەتاوە سووتێنەرەدا بۆنێکی بەرگەنەگر کە لەو جەستانەوە دێ لە ماوەی سەفەرێکی چەند هەفتەییدا بڵاودەبێتەوە. لەبەر ئەوەی باری ئەم وڵاغانە لەهەر مەنزڵێك دادەگرن و جارێکی**

**تر باردەکەنەوە، ئەم کاروانانە لە دووری پێنج یان شەش کیلۆمەتری گوندەکان لادەدەن، سەرباری ئەوەی هەواکەیان ژەهراوی دەکەن، لەهەر جێگایەك ڕادەوەستن ئەو شوێنە تا شەوێ بۆگەن دەبێت"** (بێندەر، ٢٠٠٦، ل ٤٢٢).

**تەوەری چوارەم: شوێنەوار و مەزارگەکان**

خانەقین و دەوروبەری بەهۆی هەڵکەوتە جوگرافیاییەکەی، کە دەکەوێتە سەر شارێی خۆراسان و میسۆپۆتامیا بە ئێرانەوە دەبەستێتەوە، لە سەردەمە هەرە دێرینەکانەوە، بەیەکێك لە گرنگترین ڕێگاکانی گرێدان و پێکەوە بەستنی ئەو دوو وڵاتە و گرنگترین ڕێگاکانی ڕۆژئاوای ئاسیا دادەنرێت، هەم لە کاتی ئاشتیدا شادەماری ئابووری و بازرگانی بووە، هەمیش لە کاتی شەڕو ململانێکاندا شوێنی هاتن و ڕۆیشتنی سوپا و هەڕەشەی داگیرکاری بووە (ئەحمەد، ٢٠٠٩، ل١٤–١٥)، ئەم بارودۆخە جیۆپۆلیتیکە، سەرباری دەوڵەمەندیی ناوچەکە، بە سەرچاوەکانی ئاو و بەپیتیی خاکەکەی، وایکردووە لە دێرزەمانەوە شوێنی نیشتەجێ و ئاوەدانی بێت. بۆیە دەوڵەمەندە بە پاشماوە شوێنەوارییەکان. لە کتێبی "اطلس المواقع الاثرية"، کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری عیراقەوە، لە ساڵی (١٩٧٦ ز.) بڵاوبۆتەوە، تەنها لە ناوچەی خانەقیندا (نەوەت و چوار) شوێنی شوێنەواری تۆمارکراوە (المواقع الاثرية في العراق، ١٩٧٠، ص٥٧–٥٨)، ئەمە تەنها تا ئەوکاتە، ئیدی نازانین لە داهاتوودا چەندی تر دەردەکەوێت. هەندێك لەو تەپۆڵکە و شوێنە شوێنەوارییانە سەرنجی نووسەری سیاحەتنامەی حدود–یان ڕاکێشاوە، لەوانە کەلاوەکانی **"تەپە گاور"**ی لە ناوچەی بنکوورە، کە وەك یەکێك لە شوێنەوارە دێرینەکان ئاماژەی بۆکردووە، پێش ئەویش سەرنجی **کلۆدیۆس جیمس ڕیچ** –ی ڕاکێشاوە (ڕیچ، ٢ ، ٢٠١٢، ل٢٦٢).[١٥]

وەك لە سیاحەتنامەی حدوددا هاتووە تەپە گاوری:" **پڕبووە لە بینای مەزن... زۆرینەیان داڕووخاون، هەرچەندە دانیشتوانی ناوچەکە دەڵێن ئەم شوێنەوارانە هی سەردەمی گاورە، بە بەڵگەی ئەو بەردە گەورانەی کە درێژییەکەی دەگاتە نیو باڵ و پانییشیان چوار تا پێنج پەنجە دەبێت و شێوەی گردێکیان پێکهێناوە. بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە نازانرێت لە چی کاتێکدا ئەم شوێنەوارانە بونیادنراوە، هی کێیە و بۆچی بونیادنراون، هەر کاتێکیش**

**خەڵکەکەی پێویستییان بە بەرد بێت، بۆ بەکارهێنانە جۆراوجۆرەکان لەم تەپۆڵکە دەیبەن"** (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٩٠). ناوی گاور کە لەم تەپە و زۆرێکی تر لە گرد و تەپە و دەربەندەکانی کوردستان نراوە(١٦)، بەگوێرەی هەندێ سەرچاوە لە (گەبری) زەردەشتییەوە هاتووە و بەو کەسانە وتراوە، کە لەسەر ئایینی زەردەشتی بوون، لەمڕۆیشدا کورد ناوی لەسەر هەموو ئەو گرد و تەپۆڵکە دێرینانە ناوە کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئیسلام. بڕوانە: (المرشد الی مواطن الاثار والحضارة، ١٩٦٥، ص٢٥). بەگوێرەی سیاحەتنامە چوار ڕێگەوبان، کە پانی هەر یەکێکیان نزیکەی پێنج باڵ بووە و بە بەرد و چەو تێکەڵرێژ کراون، بەجۆرێك شیاوبوون بۆ پیاڕۆیشتن. دەچوونەوە سەر تەپە گاور. **"ڕێگەی یەکەم تا لاپاڵی بەرامبەر بەرزاییەکانی چیای مرواری دەڕوات، کە دەکەوێتە پشت گوندی دەکەوە. ڕێگەی دووەم لە گوندی "قولای"یەوە دەچێتەوە سەر دامێنی چیای مرواری. ڕێگەی سێیەم دەچێتەوە سەر پردە ڕووخاوەکەی سەر ڕووباری دیالی (سیروان)، لەو شوێنەی کە بەرامبەر گوندی شێروانەیە(١٧) ڕێگەی چوارەمیش دەچێتەوە سەر چیای ئاق (ئاق داغ)، کە لەسەر ڕێگەی خانەقینە. بەوپێیەی بنکوورە تاڕادەیەك ناوچەیەکی نەوی و نشێوە، جادە و ڕێگەوبانەکانی لە کاتی باران باریندا پڕدەبن لە قوڕ و چڵپاو، بۆیە پێدەچێت ئەو کەسەی فەرمانی دروستکردنی ئەو ڕێگەو بانانەی داوە، هەر خۆیشی خاوەنی ئەو بینایانە بێت کە لە شوێنی تەپە گاوریدان"**(خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٩٠-١٩١). ئەگەرچی لە کۆن و نوێشدا هیچ هەوڵێك بۆ کنە و پشکنین لە تەپە گاور-ی نەدراوە، بەڵام وەك خاوەنی سیاحەتنامە بۆی ڕۆیشتووە، پێدەچێت ئەگەر دەستەیەکی شوێنەوارناس کنە و پشکنین لە تەپەکەدا ئەنجام بدات، شتگەلێکی شوێنەواریی زۆری تیا دەدۆزرێتەوە.(١٨)

"حەوش کوڕی-کوڕو" کە بینایەکی گەورە و گرنگە لە باکووری خانەقین، یەکێکی ترە لە شوێنەوارەکانی ناوچەی خانەقین، کە بەگوێرەی سیاحەتنامە خەڵکی ناوچەکە دەڵێن گوایە تەویلەی ئاژەڵەکانی شیرین بووە، ئەو ئاژەڵانەی لە لەوەڕگاکانی ناوچەکەدا ماونەتەوە، گوایە لە میانەی ئاوەڕۆیەکی تایبەتییەوە شیری ئاژەڵەکانیان گواستۆتەوە بۆ قەسر (مەبەست قەسری شیرین)ە !. ئەوەش دەگێڕنەوە گوایە ئاوەڕۆکە، بۆ گواستنەوەی ئاو بووە، بۆ بونیادنانی تەلارەکان،

کە لە شێوەی سەربازگەدا دروستکراون، چونکە ئاوی لێنەبووە. ئەگەر ئەم گێڕانەوە ڕاستبێت، ئەوا ئەم کارە کۆششی زۆری ویستووە. دەشڵێن ئەم شوێنەوارە (خەسرەوی کوڕی هورمز)[19] بۆ شیرینی دوڵبەری دروستیکردووە.. ئەگەرچی ئەمە لە خەیاڵ دەچێت، بەڵام خەڵکەکەی وەك ڕاستییەك لێی دەڕوانن! بەبڕوای نووسەری سیاحەتنامەش شوێنەوارەکە پێدەچێت تەویلە و سەربازگە بێت (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٩٠–١٩١).

ڕیچ، کە سی ساڵ پێش نووسەری سیاحەتنامە، سەردانی شوێنەواری حەوش کوڕوی کردووە وردتر وەسفی دەکات :"**شوورایەك لە دیواری بەرد، دوابەدوای ئەوە خاکێکی سروشتییە، لە نزیکی (دوو سەد) یاردە باشووری شووراکە بینایەکە... بریتییە لە سەکۆیەك و تاقەکان ڕاگیریکردووە، کە ژووری شێوە گومەزەیی پێکهێناوە، ژوورۆچکەکانی لای باکوورەوە زۆر نموونەیین و بەهۆی دووکەڵی ئاگری ئەو دز و جەردانەی زستانان وەك حەشارگەیەك بەکاریان هێناوە ڕەش داگەڕاوە. ئەم سەکۆیە لەسەر چوار خاڵ ڕیزبووە، لەشێوەی لاکێشەییدایە، لاکەی باکووریم پێوانەکرد، لەگەڵ ئەو بینایەی لە ڕووکاری ڕۆژئاوایە سێسەد و چل پێ بوو. بەرزیی سەکۆکە پانزە پێ و نیوە. پانییەکەی باکوور و باشوور لەوانەیە نزیکەی نیوەی درێژی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا بێت... هەندێ لە کوردەکان دەڵێن، ئەوە شوێنی لەدایکبوونی جوانووەکانی کیسرا بووە، شیری بەهۆی جۆگەیەکەوە بۆ هێناون کە لە بەرد هەڵکۆڵرابوو! !... هەندێکی تریان پێیانوابووە کۆشك یان قەڵایەك بووە و شاپوور (پاشای ساسانی) دروستیکردووە**"(ڕیچ، ٢، ٢٠١٢، ل٢٦٠).

ژاك دمۆرگان، کە لە سەرەتاکانی دەیەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، بۆ کاری زانستی (جوگرافی و مێژوویی) هاتۆتە ئێران، یەکێکی ترە لەو بیانییانەی سەردانی حەوش کوڕو–ی کردووە، سەرنج و بۆچوونەکانی لە چەند دێڕێکدا بەم جۆرە تۆمارکردووە: **کوردانی ناوچەکە باس لەمە دەکەن، کە ئەو شوێنانە تەنیا بۆ ڕاگرتنی ئەسپەکان بووە و ئەمە تەنیا تەویلە بووە، بەڵام ئەم وتەیە هیچ بنەمایەکی نییە. بیناکانی حەوش کوڕو دروست لە ئەوانەی قەسری شیرین دەچن، پێدەچێت حەوش کوڕو شوێنی فەرمانڕەوا بووبێت... لە چوار بەش پێکهاتووە، کە بریتین لە کۆشکی سەرەکی و دوو بەشی نیشتەجێبوونی تری لە یەکتر جیا و**

**باخـەکان، باخـەکان شـوێنەکانی نیشـتەجێبوون لـە کۆشـکەکە جیادەکەنـەوە** (دومۆرگان، ٢٠١٢، ل١٠٦).

**لە مەزارگەکانی دەوروبەر خانەقین، کە لە سیاحەتنامەدا ناویـان هـاتووە، مەزارگەی "ئیمام محەمەد"ی ناوچەی بنکوورەیە، کە خەڵکی ناوچەکە باوەڕیان وابووە کەسێکی پیرۆز و لە ئەولیاکانە، هـەروەها مەزارگـەی بـاوە مـەحموود لـە گوندی باوە بلأوی ، کە کەوتۆتە سەر تەپۆڵکەیەکی گەورە، لە ناوچەیەکی پڕ ئاو و دارە خورمای زۆردا** (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٩١). **گڵکۆی ئەم مەزارگە هێشتا یەکلایی نەبۆتەوە هی کێیە، لە مێژە خـەڵکی ناوچـەکە بـۆ مەبەسـتی جیـا جیـا سـەردانی دەکـەن. هەنـدێك بـە نـەوەکانی ئیمـام موسـای کـازم-ی دەناسـێنن، هەندێکی تریش پێیوایە گڵکۆی باوە مـەحموود لـە پیرانـی کاکـەیی** (الروژبیـانی، ١٩٩٩، ص٢٦٧). **بـەگـوێرەی** لێکۆڵینـەوە نوێیـەکانیش، **پێدەچـێت ئـەم بـاوە مەحمووده هەر شێخ مەحموودی کورد بێ کە مێژوونووسی دیمەشقی"محەممەدی کوڕی عیسا ناسراو بـە "أبـن کنـان" (١٦٦٣-١٧٣٤ز) لـە یاداشـتەکانیدا باسـی کەراماتی گڵکۆکەی دەکا و بە عەللامـەی خـەڵوەتی نـاوی دەبـات و دەڵـێ پیـاو چـاکێکە لـە وڵاتـی کـوردان** (توفیـق، ٢٠١٣، ل٤٦). **جێـی ئاماژەیـە بـەگوێرەی ڕاپـــۆرتێکی ســـەرەتایی بەڕێوەبەرایـــەتی شـــوێنەواری گـــەرمیان، پاشمـــاوە گڵێنەییـەکانی سـەر ڕووی ئـەو تەپۆڵکـەی گڵکـۆی بـاوە مـەحموودی لەسـەرە، پێشنیازی شوێنەوارێکی مەزنی سەردەمی کۆتایی هەزارەی دووەمی پێش زایـین دەکات، بەتایبـەتی سـەردەمی کاشـییەکان (١٥٩٥-١١٥٧پ. ز)** (Report No.6 .(Glatz, and Casana,

## تەوەری پێنجەم: بنچینەکانی کشتکاری لە گوندەکان و باجە میرییەکان

لـە دەوروبـەری خانـەقین ژمارەیـەك گونـد و شـوێنی ئـاوەدان هـەبووە، کـە لەلایەن ژمارەیەکی زۆر لە عەشیرەتەکانی بەتایبـەت کـورد و چـەند عەشـیرەتێکی عەرەبـــەوە ئاوەدانکرابوونـــەوە، لەوانـــە کۆنفیدراســـیۆنی باجـــەلأن و کۆمـــەڵێك عەشیرەتی تر لەوانە سورەمیری، زەند، مەلخەطـای، زەنگەنـە و کـەروەی و بـەنی ڕەبیعە...هتد. کە بە سوودوەرگرتن لەو زەویوزارانەی، لق و جۆبارەکـانی هـەردوو

ڕووباری ئەڵوەند و سیروان پیا دەڕۆیشت، سەرقاڵی کشتکاری و باغداری بوون، سیاحەتنامە حدود تیشکێکی خێرای خستۆتە سەر ناو و ژمارەی ئەو عەشیرەتانە و ناوچەکانیان و ئەو جۆگەلانەی ئاویان لێوە وەرگرتووە بۆ زەویوزارە کشتوکاڵییەکانیان و بڕی ئەو موڵکانە و باجە میرییانەی داویانەتە دەوڵەت. کە لە خوارەوە ئاماژەیان بۆ دەکەین:

بنکوورە: بریتیبوو لە سەرزەمینێکی پان و بەرین، سنوورەکەی لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕووباری دیالە (سیروان)، لە باکوور و ڕۆژئاوا–شەوە زەویوزارەکانی زەهاوە، لای باشوور–یش بە زەویوزارەکانی دەککە و حاجی قەرە و خانەقین دەوردراوە. پێشتر سەر بە زەهاو بووە، بەڵام پاش ئەوەی ئێرانییەکان دەستیان بەسەر زەهاودا گرت خراوەتە سەر بەغدا[٢٠] وەك لە سیاحەتنامەدا هاتووە لە بنکوورەدا لق و پۆکانی کۆنفیدراسیۆنی باجەلان و کۆمەڵێك عەشیرەتی تر نیشتەجێبوون، کە بەزۆری لە خێوەتی گەورە گەورەدا ژیاون و کەمتر خانووی سەرداپۆشراویان هەبووە (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨٠ و ١٩٠)، ئەوانیش:

| بنەماڵە | ژمارەی ماڵەکان | بنەماڵە | ژمارەی ماڵەکان |
|---|---|---|---|
| قەزانلۆ | ٧٠ | شێرەوەند | ١٥ |
| غەریبەوەند | ٣٠ | چوگرلوو | ١٠ |
| حەجاج | ٢٠ | جموور | ٨٠ |
| مەحلان | ١٠ | مەلا میرزا حاجیلەر | ١٠ |
| سەیدەکان– سەیکەوەن | ١٥٠ | گراوەند | ١٠ |
| سارووجە | ٤٠٠؟[٢١] | زەند | ٧٥ |
| زەنگەنە | ٢٠ ماڵ | ڕەبات | ٢٥ |
| سورەمیری | ١٥ | | |

بنکوورە، بەوپێیەی کەوتبووە نێوان هەردوو ڕووباری سیروان و ئەڵوەن و لق و جۆگەلەکانی، دلگیری و سەوزیی دەشتاییەکانی و کشتوکاڵ باشییەکەی،

هەروەها بەپێتیی خاکەکەی سەرنجی ئەو بیانییانەی ڕاکێشاوە، کە پێشتر هاتوونەتە ناوچەکە[٢٢]. سیاحەتنامە سەرچاوەکانی ئاوی ئەم پێدەشتەی بە وردی دەستنیشانکردووە، بەوەی لە دوو جۆگەوە ئاوی پێگەیشتووە: یەکەمیان بە **"باڵەجۆ"** ناسراوە، کە لای چەپی ڕووباری دیالەوە (سیروان) سەرچاوە دەگرێت، لە نزیك ئەو شوێنەی، کە جۆگەلە ئاوی قۆرەتوو دەڕژێتە ناو ڕووباری (دیالەوە). سەرچاوەی ئاوی دووەم-یش جۆگە ئاوێکی ترە، پێیدەوترێت خضری (خیری)، لەم دوو جۆگەیەش جۆگەلە ئاوی بچووکتریان لێدەبێتەوە (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٨٩-١٩٠).

سیاحەتنامە گوندەکانی دەوروبەر خانەقین و ژمارەی ماڵەکانی بەم جۆرەی خوارەوە دیاریکردووە:

| ناوی گوندەکان | ژمارەی ماڵەکان | خێڵ و عەشیرەتەکان |
|---|---|---|
| باوەپلاوی | ٥٠ | باجەلان |
| کارێز | ٥٠ | باجەلان و مەلخطاوی |
| دەککە | ١٥٠ | سوورەمیری و مەلخطاوی |
| قولای | ٢٠٠ | کەرەوی عەتیق |
| عەلیاوە | ١١٠ | باجەلان و سورەمیری و بەنی تەمیم |
| زاویە | ٩٠ | بەنی عەویس و کەرەوی نویێ |
| قزلڕەبات | ١٠٠ | بەنی ڕەبیعە و بەنی عەویس |

سەرچاوەی ئاوی بەشێك لەم گوندانەی سەرەوە بەم چەشنە بووە:

باوەپلاوی: ئاوی لە جۆگەلە ئاوییەکەوە وەردەگرت، کە بە سەوزەبولاق (سەوزبلاخ) ناسراوە، بەکوردی مانای (سەرچاوەی سەوزەوات) دەبەخشێت، ئاوی ئەم جۆگەلەیە گەلێك زۆرە و بەشی گێرانی ئاشێك دەکات، یەك دوو ساڵێك لەمەوپێش، لە تەنیشت مەزارگەی باوە مەحموود، چەندین سەرچاوەی ئاو هەبوون، کە بەهۆی کەناڵە ئاوییە سەرگیراوەکانەوە باخ و بێستانەکانی گوندەکەیان پێ ئاودەدران. هەروەها ئاوەکە دەڕژایە نێو ئەو زەوییە نزمانەی

دەکەوتنە دیوی چەپی ئەو ڕێگەی لە خانەقینەوە بەرەو بنکوورە دەڕوات، لەوێ لە دەریاچە ئەچوو، ماسی تیابوو (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٧٩–١٩٠).

کاریز: لە پێنچ کەناڵەوە ئاوی پێدەگات، کە لە دیوی چەپی ڕووباری ئەڵوەنەوە سەرچاوە دەگرن. بەڵام قولای لە جۆگەلەیەکی ئاوییە ئاوی بۆ دەڕوات، کە لە دیوی ڕاستی ڕووباری ئەڵوەنەوە سەرچاوە دەگرێت، لە نزیک ئەو پردەی لە نێوان خانەقین و حاجی قەرەدا دروستکراوە. جۆگەکە بە گەڕەکەکانی حاجی قەرەدا دەڕوات بۆ قولای، لەوێ دانیشتوانەکەی بۆ ئاودێریکردنی زەوییە کشتوکاڵییەکانیان بە ئاسانی سوودی لێوەردەگرن، هەر لەبەر ئەمەشە ناونراوە قولای، چونکە مانای سادە و ئاسانە. عەلیاوەش، کە چەشنی حاجی قەرە و باوەپلاوی، ژمارەیەك زۆر دارەخورمای لێیە، وێڕای بوونی تەڕەکاڵ و دانەوێڵە وەکو گەنم و جۆ و برنج و کونجی و هەندێ جاریش سەوزەوات. بە هەمان شێوە لە جۆگەیەکەوە ئاویان بۆ دەڕوات، کە وەکو کەناڵێك لە دیوی چەپی ڕووباری ئەڵوەنەوە جیادەبێتەوە. بەڵام قزلڕەبات کە گوندێکی گەورەیە، دەکەوێتە خۆرئاوای خانەقین، بە دووری پێنج سەعات، ئاو لە جۆگەلە ئاوێکەوە دەستەبەردەکەن، کە لای چەپی ڕووباری دیالەوە سەرچاوەدەگرێ، لەو جێگەی ڕووباری ئەڵوەنی تێدەڕژێ (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٩١–١٩٢).

قۆرەتوو، کە کەوتۆتە سەر ڕۆخی چەمێك بەهەمان ناوەوە، لە باکووری خانەقین، یەکێکی ترە لەو گوندانەی سیاحەتنامەی حدود ئاوڕی لێداوەتەوە. بەگوێرەی سیاحەتنامە قۆرەتوو خاوەن زەویوزارێکی شیاوبووە بۆ کشتوکاڵ و سەر بە میرایەتی قەسری شیرین بووە، تا ئەو کاتەی محەمەد عەلی میرزای حاکمی کرماشان دەستی بەسەر زەهاودا گرتووە، لە ساڵی (١١٢٦ك–١٨٢١ز) ناوچەیەکی ئاوەدانبووە و دووسەد ماڵی تیابووە[٢٣] چەندین گوندیشی لەخۆگرتووە، لەوانە هەردوو گوندی سەنگەر و خوڕخوڕە. بەڵام لە پاش دەستبەسەراگرتنی لەلایەن حاکمی نێوبراوەوە، خەڵکەکەی پەرتەوازە بوون و ناچاربوون کۆچبکەن بۆ ناوچەکانی دراوسێ (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ٢١٠)، کە بەگوێرەی دەروێش پاشا خەڵکەکەی ئاوارەی ناوچەکانی بنکوورە و کفری و زەنگاباد بوون (درویش باشا، ١٩٥٣، ص٢٣). بەم جۆرە قۆرەتوو چۆڵ و وێرانە ماوەتەوە، تا ساڵی ١٢٥٧ك

(١٨٤١-١٨٤٢ن)[٢٤]، ئـــەوكات ژمارەيـــەك لـــە دانيشـــتوانەكەی گەڕاونەتـــەوە شـــوێنەكانی خۆيـــان و خـــانوو و ماڵيـــان تيـــا دروســـتكردۆتەوە و ژيانيـــان دەستـپێكردۆتەوە (خورشـيد باشـا، ٢٠٠٩، ص٢١٠). وەك دەروێـش پاشـا-يـش ئامـاژەی بـۆ كـردووە، لـە سـاڵی (١٢٦٥ك-١٨٤٩ ز.)دا، شەسـت و پێـنج كەسـی ديكـەيان، لەوانـەی دەستڕۆيشـتوو بـوون، گەڕاونەتـەوە بـۆ شـوێنەكانی خۆيـان، لـــەنێوان ســـاڵانی ١٢٦٧-١٢٦٨ك (١٨٥١-١٨٥٢ ن)دا ژمارەيـــەكی تريـــان لـــێ گەڕاوەتـــەوە و ســـەرلەنوێ پرۆســـەی كشـــتكارييان لەســـەر زەويوزارەكانيـــان دەستپێكردۆتەوە (درويش باشا، ١٩٥٣، ص٢٣).

خانەقين كە لە ناوەڕاستەكانی سەدەی نۆزدەهەمدا، لە ڕووی كارگێڕييـەوە پاشـكۆی ويلايـەتی بەغـدا بـوو، وەك چـۆن ڕژێمـی دەرەبەگايـەتی عوسمـانی لـە زەويوزارە كشـتوكاڵييەكانيدا پـەيڕەودەكرا. بـڕی بـاج و ڕسـووماتی سـەر زەوی و بەروبوومەكانيش، هەمان ڕێسـای دەرەبەگايـەتی بەسـەردا جێبەجێـدەكرا. كـە لـە سياحەتنامەدا بەم جۆرە دەستنيشانيكردووە:

جووتيارانی خانەقين پێنج يەكی بەروبوومە زستانييەكانيان دەدايـە لايـەنی ميری، بەڵام بەروبوومە هاوينييەكان سێيەكی لەسەر دەدەن، دەيەكيش[٢٥] لەسـەر ئەو بەروبوومانە پێويستيان بە ئاودێری نييـە و بـە عـەرەبی پێيـدەڵێن (ديـم)[٢٦]، سـێيەكيش لەســەر ئــەو بەروبوومــە زســتانيانەی لــەو كێڵگەكانــە چـێنراون وەردەگيرێت، كە ناوچەكانيان پاشكۆی خانـەقينن و پێيـدەوترێت (شـبه)[٢٧] لـەم سـێيەكەش پشـكی دەيـەك تـەرخان دەكرێـت بـۆ چـاودێری ئـەم كێڵگەيـە يـان سەركارەكەی. ئەگەر تۆوی كاشتە هاوينييەكان لەلايەن ميرييەوە دابينكرابوو، ئەو كاتە دوو لەسەر سێی بەرهەمەكەی بـۆ لايـەنی مـيری دەبێـت، جووتيـارانيش يـەك لەسەر سێی دەبەن، ئەگەر بە پێچەوانەشـەوە تۆوەكـە جووتيـار دابينيكـرد، ئـەوا بەرهەمەكـەی لـە نێـوان جووتيـاران و ميريـدا وەك يـەك دابەشـدەكرێت. چـاودێری كێڵگەكـەش دەيـەكی خـۆی لـەو بەشـە دەبـات كـە بـەر لايـەنی مـيری دەكـەوێت. (خورشيد باشا، ٢٠٠٩، ص١٩٣). موڵكانەی بەروبوومەكانی زەويوزاری خانـەقين و حاجی قەرە بريتيبووە لە: بيست و چوار هەزار و چوارسـەد و پـەنجا قـران. باجـە ميرييـەكانی بنكـوورە لـە بەروبوومـە زسـتانييەكاندا پێـنج يەكـە، سـەبارەت بـەو

کێڵگانەش کە بە (واسطة)[٢٨] ناسراون، لە هەر جووتیارێك بڕی یەك وەزنە گەنم و دوو وەزنە جۆ وەردەگیرێت.[٢٩] هەرچی ئەو بەروبوومانەیە، کە پێویستییان بە ئاو نییە، حەوت یەکیان لەسەر وەردەگیرێت، ئەو دە یەکەش کە تایبەتە بە سەرکاری کێڵگەکان لەو بەروبوومانە وەردەگیرێت کە بەر میری دەکەون. بۆ بەروبوومە هاوینەکانیش هەمان ئەو بڕە وەردەگیرێت، کە لە خانەقین وەردەگیرێت. باجی قولای لە بەروبوومە هاوینییەکان وەکو ئەوەی خانەقین وەردەگیرێت، بەروبوومی زستانەش چەشنی سێ یەك و دوو لەسەر سێ وەردەگیرێت. بەلاَم لێرەدا جیاوازییەك هەیە، ئەویش نەبوونی باجی نێوەندکارە کە تۆوەکە دەهێنێت، باجی گوندەکانی دەککە و عەلیاوەش وەك ئەوەی بنکوورەیە، قزلڕەبات-یش وەك ئەوەی قولای (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٧٨-١٩٣).

سەبارەت بە ناوچەکانی قۆرەتوو شێخان-یش، وەك پێشتر ڕوونکراوەتەوە، بەهۆی ئەوەی لە پاش ساڵی (١٨٢١ ز.) وە، لەلایەن حاکمی کرماشانەوە دەستی بەسەرداگیراوە، بۆیە سیاحەتنامە تیشکی نەخستۆتە سەر بڕ و شێوازی باجەکانیان. ئەوە نەبێت بە ئاماژەیەکی خێرا سەبارەت بە شێخان و پاشکۆکانی نووسیویەتی، ئەو ناوچانە بەشێوازی موڵکانە بەڕێوەبراون، بەو مەرجەی پەنجا سوارەیان لەگەڵ والیی بەغدا بن، لە کاتی پەلامارەکانیدا بۆ سەر بەسرە (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص٢٠٧). بەلاَم دەرویش پاشا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کە دەسەلاَتدارانی عوسمانی، لە ڕۆژگاری ئیبراهیم پاشای (باجەلاَن)دا، سەد تەغار[٣٠] گەنم و جۆیان وەك باجی میری لە دانیشتوانی قۆرەتوو وەرگرتووە (درویش باشا، ١٩٥٣، ص٢٣).

**ئەنجام:**

وەك سیاحەتنامەی حدود دەریدەخات خانەقین و دەوروبەری، لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، ناوچەیەکی ئاوەدان و پڕ ژیان بووە، چی لە ناوەندی شارۆچکەکە و چی لە گوندەکانی دەوروبەری، ژمارەیەکی زۆر لە عەشیرەت و بنەماڵە نیشتەجێبووە، کە زۆرینەی هەرە زۆریان کورد بوون، ژمارەیەکی کەم عەرەبیان تیابووە.

بەوپێیەی خانەقین ڕێڕەوی سەرەکی ئەو زیارەتکەر و بازرگانانە بوو، کە لە نێوان ئێران و شوێنە پیرۆزەکانی شیعەدا لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق هاتوچۆیان دەکرد، ئەمە وایکردبوو کاربەدەستانی ئێرانی بایەخ بدەن بە دروستکردنی پرد و کاروانسەرا لەنێو شارۆچکەکەدا، بۆ ئاسانکردنی هاتوچۆی زیارەتکەرانی ولاتەکەیان، کە ژمارەیان هەر لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە ڕووی لە هەڵکشان بووە. گواستنەوەی تەرمی مردووانی شیعە مەزهەبی ئێرانی، کە بە خانەقیندا دەبران بۆ شوێنە پیرۆزەکان، لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق، دیاردەیەکی سەرنجڕاکێش و پڕ گرفت بووە، چی بۆ خەڵکی شارۆچکەکە و چی بۆ پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانی.

ناوچەی خانەقین دەوڵەمەندبووە بە مەزارگە و پاشماوە شوێنەوارییەکان، کە هەندێکیان سەرنجی سیاحەتنامەی حدودیان ڕاکێشاوە و پێشبینی کردووە ئەگەر دەستەیەکی شوێنەوارناسی کنە و پشکنینیان تیا ئەنجامبدات، پێدەچێت شتگەلێکی شوێنەواریی زۆری تیا بدۆزرێتەوە، کە لە ئەمڕۆدا کنە و پشکنینە نوێیەکان ئەم پێشبینییەی نووسەری سیاحەتنامەی حدودیان سەلماندووە. لەڕووی ئابووریشەوە سەرباری ئەوەی سەرچاوەی بژێوی و داهاتی بەشێکی ناوەندی شارۆچکەی خانەقین، لە میانەی ئەو زیارەتکەر و خەڵکانەوە بووە، کە ساڵانە بە ناوچەکەدا تێپەڕدەبوون، بەڵام بەشەکەی تری خەڵکی ناوچەکە، بەتایبەتیش گوندنشینان زیاتر پشتیان بەکشتوکاڵکردن و ڕەز و باخ بەستووە، بەتایبەتیش دارە خورما. بەگوێرەی ڕێسای دەرەبەگایەتی عوسمانیش، ساڵانە باج و ڕسوومات و موڵکانەی سەر زەویوزار و بەروبوومەکان، کە بەرهەم هاتوون پێشکەش بەلایەنی میری دەکرد.

**پەراوێزەکان:**

(١) ئێران بە سوودوەرگرتن لە هێز و توانای ڕەعییەتە عەرەبەکانی لە بوشەهر و کانجون، توانییان لە ساڵی (١٦٠٢ز) پورتوگالەکان لە بەحرەین دەربکەن، بۆ ماوەیەکیش کە ڕوون نییە دەستی بەسەردابگرن. لە ساڵانی دواتریشدا ململانێکانی کاربەدەستانی ئێران لەگەڵ هێزەکانی تری ناوچەکە بۆ لەخۆگرتنی بەحرەین بەردەوامبوو. لە ساڵی ١٧٥٣ز ناکۆکییە نێوخۆییەکانی بەحرەینی قۆستەوە و جارێکی دیکە دوورگەکانی بەحرەینی گرتەخۆ، کاتێك لە ساڵی (١٧٨٢ز) عەرەبەکانی عەتوب، لە بنەماڵەی خەلیفە، توانییان دەستی ئێران لە دوورگەکان ببڕن، ئێرانییەکان لەدەستدانی بەحرەینی پێ قبووڵ نەبوو، بۆیە هەوڵەکانیان بۆ گێڕانەوەی هەژموونی وڵاتەکەیان بەسەریدا، بەشێوەی جۆراوجۆر، درێژەی هەبوو. ڕێکەوتنەکەی ٣٠ی ئابی ساڵی (١٨٢٢ز)یش، کە تیایدا نشینگەی سیاسیی حکومەتی بەریتانی بێ گەڕانەوە بۆ حکومەتەکەی، دانی بە لەخۆگرتنی ئێراندا بۆ بەحرەین نا، هێشتا باڵادەستی ئێرانییەکانی بەسەر بەحرەیندا نەسەلماند. جارێکی تر و لە ساڵی (١٨٤٣ز.)دا کاربەدەستانی ئێران لە درێژەی هەوڵەکانیاندا بۆ دەستەمۆکردنی سەرانی بەحرەین، بوونە پشتوپەنای "شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ ئەحمەد"، بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتی لەدەستچووی لە بەحرەین، بەڵام بێسوودبوو. بۆ وردەکارییەکان و زیاتر بڕوانە: (لوریمر،٣، د.ت، ل ل ١٢٦٧–١٣٢٦).

(٢) میرزا جەعفەر خان (؟–١٨٦٣ز): کوڕی محەمەد میرزای تەورێزییە، یەکێك بوو لەو پێنج کەسەی، کە عەباس میرزای کوڕی فەتح عەلی شای ئێران لە چوارچێوەی یەکەمین نێردە زانستییەکاندا، لە ساڵی (١٨١٤ز) ڕەوانەی بەریتانیای کردن تا هونەری سەربازی بخوێنێ، پاش گەڕانەوە عەباس میرزا نازناوەکانی"موهەندیس باشی" و "خان"ی پێدا، لە دانیشتنەکانی کۆنگرەی دووەمی ئەرزەڕۆم و دیاریکردنی سنووری نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە، چەندین پۆستی سیاسی و دیپلۆمانی وەرگرتووە لەوانە سەفیری ئێران لە لەندەن (١٨٥٩–١٨٦٠)، یەکەمین کەس بوو نازناوی موشیر ئەلدەولەی پێدرا. پاش ئەو دەبەخشرایە هەر کەسێك پۆستی وەزیری دەرەوەی ئێرانی وەردەگرت (البدیری، ٢٠١٥، ص٢٦١–٢٦٢).

(٣) کۆلۆنێل ولیامز: کە بەهۆی لێهاتووییەوە لە جەنگی کرێما (١٨٥٣–١٨٥٦) دژ بە ڕووسیا، بە پاڵەوانی قارس ناوبانگی دەرکرد، یەکێك بووە لە ئەفسەر و دیپلۆماتکارە لێهاتووەکانی ئینگلیز، پاڵێوراوی یەکەم بوو بۆ دانوستانەکانی پەیماننامەی ئەرزەڕۆمی دووەم لە نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران، کە لە ساڵی ١٨٤٣ز لە شاری ئەرزەڕۆم دەستی بەکارەکانی کرد (لوریمر، ٤، د.ت، ص٢٠٢٤–٢٠٢٥).

(٤) حکومەتی عیراقی بۆ مەبەستی سیاسی، لە ساڵی (١٩٥٣ز.)، ئەم ڕاپۆرتەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و بەناوی: (التقریر الذی تفضل بتقدیمة صاحب السعادة المغفور له درویش باشا الذی عین لتحدید الحدود الایرانیة العثمانیة) لە چاپیداوە. نەجاتی عەبدوڵڵا بەشێکی کەمی ئەم

ڕاپۆرتەی لە زمانی فەرەنسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. بۆ زیاتر بڕوانە: بەشێك لە ڕاپۆرتی دەرویش پاشا، سەرۆکی کۆمسیۆنی عوسمانی بۆ دیاریکردنی سنووری عوسمانی-ئێرانی، لە: (عەبدوڵلا، ٢٠١٤، ل٥٩-٦١).

(٥) لە نووسینی ئەم توێژینەوەدا ناوەڕۆکی ئەم وەرگێڕانەم کردۆتە سەرچاوە، کە وەرگێڕ لەبری **(سیاحەتنامەی حدود)،** کە ناونیشانی ڕاستەقینەی کتێبەکەیە و ئێمە پێمان باشبوو وەك خۆی ئاماژەی بۆ بکەین، ناونیشانێکی تری بە ناوی"گەشتی سنووری نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران" هەڵبژاردووە. ئەو بەشەی کتێبی سیاحەتنامەی حدود، کە تایبەتە بە ناوچەی خانەقین و زەهاو دەوروبەری لەلایەن (محسین عەلی ئەکبەر) کراوەتە کوردی و لە کتێبی مێژووی خانەقین (بەرگی یەکەم)، کە مامۆستا جەعفەر (فازل کەریم ئەحمەد) ئامادەیکردووە، بە ناونیشانی خانەقین و دەوروبەری لە گەشتە سنوورییەکەی خورشید پاشادا (سلێمانی ٢٠١٧)، لەلاپەڕەکانی (١٣١-١٥٦)دا بڵاویکردۆتەوە، بەڵام تۆژەر لە دوا قۆناغەکانی تەواوکردنی ئەم توێژینەوەدا بوو، کە کتێبەکە گەیشتە کتێبخانەکان.

(٦) تەریقەتی قادری: یەکێکە لە کۆنترین و گرنگترین تەریقەتە سۆفیگەرییەکانی جیهانی ئیسلامی، هەتا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم، هەرە تەریقەتی زاڵ و باڵادەست بووە لە کوردستان، شێخەکانیان چی ئەوانەی نەهری و چی بەرزنجییەکان، ڕێبەری ئاینیی کاریگەر بوون، خانەوادەی شێخانی تاڵەبانی لە کەرکووك یەکێك بوون لە ڕکابەرەکانی ساداتی بەرزنجە لە باشووری کوردستان (کریم، ٢٠١٥، ل١١٩-١٢١).

(٧) مەبەست شێخ عەبدولڕەحمان تاڵەبانییە (١٧٩٧-١٨٧٨ز)، کە وێڕای ئەوەی مورشیدێکی بەتوانا بووە، ئەدیب و شاعیریش بووە، نازناوی شیعری خالص بووە. بۆیە بە شێخ عەبدولڕەحمانی خالص ناسراوە، خاوەن دیوانێکی شیعرییە، کە بە هەردوو زمانی تورکی و فارسی لە ژێر ناونیشانی (جذبة عشق) لە ساڵی (١٢٨٤ك) لە ئەستەمبوول چاپکراوە. پاش ئەوەی ناو و ناوبانگی گەیشتووەتە سوڵتانی عوسمانی عەبدولمەجیدی یەکەم (١٨٣٩-١٨٦١ز)، فەرمانی دەرکردووە لەسەر شێوازی نوێ مزگەوت و تەکیەکی لە کەرکووك بۆ دروستبکەن، لە ڕۆژگاری شێخ عەبدولڕەحماندا تەکیەکە بووەتە ناوەندێکی زانستی ئاینی و چەندین قوتابی ڕوویان تێکردووە، لقیشی لێبراوەتە ناوچەکانی تر لەوانە: خانەقین (کریم، ٢٠١٥، ل ١٢٦-١٢٨).

(٨) ڕووباری ئەڵوەن و ئەو پردانەی لە سەری دروستکراون مێژوویەکی دێرینیان هەیە، لە سەرچاوەکانی مەعریفەی مێژوویی و شارستانییەتی ئیسلامیدا ئاماژەیان بۆکراوە، لەوانە: معجم البلدان-ی یاقوت الحموی و الکامل في التاریخ ابن طبري، الحمیری (کە لە ١٣٢٧ز. مردووە) دەڵێت: "ڕووبارێکی گەورە بەنێو شاری خانەقیندا تێدەپەڕێت، پردەکەی کە لەسەر ئەم ڕووبارە بونیادنراوە لە دروستکردنیدا چینی خشت و گەچ بەکارهاتووە"(عارف و أمین، ٢٠١٧، ل١٨٧-١٨٨).

(٩) قرش: دراوێکی زیوی عوسمانی بوو، بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٦٨٨ز.، لە ڕۆژگاری سلێمانی دووەم (١٦٨١-١٦٩١ز) لێدراوە، سەرەتا کێشی شەش درهەم بووە، بەڵام لە قۆناغەکانی تردا گۆڕانکاری زۆر بەسەر بەهاکەیدا دێت. بۆ زیاتر دەربارەی ئەم دراوە و دراوەکانی تری ڕۆژگاری عوسمانی (علي، ١٩٨٩، ص١٦٥-١٦٧).

(١٠) بیکنگهام وەسفێکی ورد و سەرنجڕاکێشی پردەکەش دەکات: "پێکهاتووە لە سیانزە تاقە پایەی چەماوەی قایم و بەهێز، زۆر بەرز و پان و پۆڕ و لەیەك دوورن، درێژییەکەی سەدو هەشتا هەنگاوی ئەسپە، هەرچەندە پانیی ڕووبارەکە نیوەی ئەو درێژییە نابێت، گابەردێکی سەخت لەناوەڕاستیدا بەکارهێنراوە تا ببێتە بنچینەی پردەکە، ئاوی ڕووبارەکە لە ژێر هەر یەکە لەو تاقە پردانەوە بەکەناڵێکی تەسك و قووڵدا دەڕوات، کە لە بنەڕەتدا لەناو ئەو گابەردانەوە هەڵکۆڵراوە، پاش ئەوە گۆڕانکاری بەسەر کەناڵەکاندا هاتووە و زۆر بەڕوونی پەنگاوێکی سروشتی و قووڵی پێکهێناوە، هەر دوو دیوی بەردەکەش کەوتوونەتە سەرووی ئاستی ئاوەکە و بە وشکی دەرکەوتوون. بەو شێوازە لەژێر هەر پایەیەکدا دوو سەکۆی پان لە بەرد و ڕێڕەوێکی قووڵی ئاو کە بەنێوانیاندا دەڕوات پێکهاتووە، کاتێك ئاستی ئاوەکە دادەبەزێت وەك ئەم وەرزەی ساڵ "سەرەتاکانی مانگی ئەیلول بووە" مرۆڤ دەتوانێت بە ئاسانی بەسەر تاوێرەکانی تەنیشت پردەکەدا بڕوات بێ ئەوەی پێکانی تەڕ بن، ئەو جێگانەی کەوتوونەتە ژێر تاقە پردەکانەوە پەناگەیەکی سایکایی وا پێکدێنن، کە خەڵکی بۆ خۆفێنکردنەوە و چێژوەرگرتن لەم ئاوە سازگار و شیرینە، کە بەسەر زەوییەکی بەردەڵاندا دەڕوات لێی کۆدەبێتەوە"(بیکنغهام، ١٩٦٨، ص ٢١٢-٢١٣).

(١١) خان و کاروانسەرا لە ڕووی چەمکەوە یەك مانایان هەیە، کە شوێنی حەوانەوەی موسافیر و میوانەکانە. یەکەمیان پێدەچێت لە وشەی (خون)ی فارسییەوە سەرچاوەی گرتبێت، دووەمیشیان لە (قیروان سرای) وە هاتووە، کە لە بنچینەدا وشەیەکی تورکییە و لای فارسەکان بووە بە (کارڤان سرای). هەندێ لە خانەکان کەرەستە و شمەکە بازرگانییەکانی تیا دەپارێزرا یان دەکرانە شوێنی حەوانەوەی ئاژەڵەکان (ئێستر و گوێدرێژ...هتد) بۆ زیاتر (هان، ٢٠١٧، ل١٦-٦١ ؛ فاروقي وأخروان، ٢٠٠٧، ص٤٢٠). بەڵام کاروانسەراکەی خانەقین، وەك لە ناوەڕۆکی توێژینەوەکەدا ڕوونکراوەتەوە ئێرانییەکان تایبەت بۆ زیارەتکەرانی شیعە و بازرگانە ئێرانییەکان دروستیانکردبوو.

(١٢) کۆرانتینە: وشەیەکی ئینگلیزییە (Quarantine) خاڵێکی تەندروستییە، بۆ هێشتنەوەی کەسانێك یان هەر شتێك پێدەچێت هەڵگری پەتایەکی دیاریکراوبێت، عوسمانییەکان لە ساڵی (١٨٣٧ ز.)، لە پاش بڵاوبوونەوەی پەتای تاعون، بایەخیان بە سیستمی کۆرانتینە داوە، لە ساڵی (١٨٤٠ ز.) بەدواوە ئۆفیسەکانی لە ویلایەتەکان و هەندێ لە دەروازە سنوورییەکانی عوسمانی کراوەتەوە، بەهۆی ئەوەی خانەقین کەوتبووە سەر هێڵی زیارەتکەرانی ئێرانی،

بۆیە یەکێك بووە لەو ناوەندانەی هەر زوو ئۆفیسی کۆرانتینەی تیا کراوەتەوە (الدولة العثمانية تاريخ و حضارة، ٢٠١١، ص٥٨٧ ؛ النجار، ١٩٩١، ص٤٤٣-٤٤٤).

(١٣) **قران** دراوێکی زیوی ئێرانی بوو، بەهۆی هاتوچۆی زیارەتکەرانی ئێرانی بۆ ناوچەکانی ناوەڕاست و خوارووی عێراق و پەیوەندییە بازرگانییەکانەوە، هاوڕێ لەگەڵ دراوەکانی تردا بەزۆری بەکارهاتووە، دوو جۆر قران هەبووە، قرانی ناصر شای و قرانی بانابادی، نرخەکەی لە نێوان چوار بۆ پێنج قرش بووە. بۆ زیاتر بڕوانە: (علي، ١٩٨٩، ص ١٧٣-١٧٤).

(١٤) بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی شارە پیرۆزەکانی وەك كەربەلا و نەجەف، باجی خۆیان هەبوو، کە لە نێوان سی و یەك قرش و نیو تا پێنج هەزار قرش بووە و بەگوێرەی گرنگی و پیرۆزی ئەو شوێنەی تەرمەکەی تیا دەنێژرا دەگۆڕا. بۆ زیاتر بڕوانە: (النجار، ١٩٩١، ص ٣٧٥-٣٧٦).

(١٥) جێی ئاماژەیە وەرگێڕی کوردی گەشتنامەکە ئەم شوێنەوارەی بە (کاتەر تەپەسی) وەرگێڕاوە، ڕێی تێدەچێت هەڵەی ڕێنووس بێت، دەبێت گاور تەپەسی- تەپە گاوری بێت، چونکە ڕیچ بۆ خۆی هاتۆتە بنکورە و شەوێکیش تیا ماوەتەوە.

(١٦) بەگشتی لە زۆر شوێنی تری کوردستان، ناوی گاور لە تەپە و شوێنە شوێنەوارییەکان نراوە، بۆ وێنە: دەربەندی گاور لە ناوچەی قەرەداغ، تەپەی گاوری لە گوندی وارانی، جۆگەی گاوری لە کەلار....هتد.

(١٧) مەبەست لە پردە دێرینەکەی سەر ڕووباری سیروان-ە، کە تا ئەم دواییانەش شوێنەوارەکەی دەبینرا، کەوتۆتە خوار قەڵای شێروانە، ڕێك لەو شوێنەی پردە نوێیەکەی تیا دروستکراوە، وەك لە سیاحەتنامەدا ئاماژەی بۆ کراوە بەرامبەر بەو شوێنە گوندێك بەناوی شێروانە هەبووە، بەڵام لە ئێستادا ئەو گوندە نەماوە.

(١٨) لە یەکێك لە گرنگترین چالاکییە شوێنەوارییەکان، کە لە نێوان ساڵانی (٢٠١٣-٢٠١٤ز) لەلایەن تیمێك لە هەردوو زانکۆی گلاسکۆی بەریتانی و کۆلێجی دارمۆسی ئەمریکییەوە، لە گوندی کانی ماسی، نزیك تەپە گاوری ئەنجامدراوە، لە دەرەنجامی کارەکانیان دەرکەوتووە، ناوچەکە یەکێك بووە لە ناوچە گرنگ و دیارەکانی سەردەمی برۆنزی- Bronz Age (٢٥٠٠-١٢٠٠پ.ز). بڕوانە:(Glatz and Casana, 2016. P133)

(١٩) مەبەست کیسرای دووەم، کە بەخەسرەو پەرویز ٥٩٠ - ٦٢٨ز. ناسراوبوو، کوڕی هورمزی چوارەم (٥٧٩-٥٩٠ز)ی بیست و سێیەمین پاشای دەوڵەتی ساسانی.

(٢٠) بەگوێرەی پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەڕۆم (١٨٢٣ز.)، دەبوو زەهاو کە پێشتر لەلایەن ئێرانی قاجارییەوە دەستی بەسەرداگیرابوو، لە ماوەی دوو مانگدا بدرێتەوە بە دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام ئێران جێبەجێی نەکرد. کێشەی زەهاو لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا بە چارەسەرنەکراوی مایەوە، تا مۆرکردنی پەیماننامەی دووەمی ئەرزەڕۆم لە ساڵی ١٨٤٧ز . کە تیایدا ئێران بەڵێنیدا هەموو ئەو زەویوزارە نزمانەی دەکەوتنە بەشی خۆرئاوای ناوچەی زەهاو بداتەوە بە عوسمانییەکان. بەڵام ئێران دیسان دەستی لێهەڵنەگرت. ئەو زەویوزارانە کە بوون بە زەوی

جێنـاكۆك لـەنێوان هـەردوو دەوڵـەتی عوسمـانی– ئێرانـی و لـە حـەوش كـوڕو و قۆرەتـووی باكووری خانەقینەوە تا چیای بەمۆ، لـەو ناوچـانەی شـێخان و مەیـدانی لێیـە دەگرتـەوە، لـە پاش مۆركردنی پرۆتۆكۆلی ئەستانە، لـە ١٦ی تشـرینی دووەمـی سـاڵی (١٩١٣ز) و كۆنووسـی دانیشتنەكانی لیژنەی دیاریكردنی سنوور، لە ساڵی (١٩١٤ز)، ئەوكات بـە فـەرمی وەك بەشـێك لە خاكی عوسمانی ناسێنرا (الشعیبي، ٢٠٠٢، ص١٧–٢٠)

(٢١) بێگومان ئەو ژمارەیـە بـۆ لقـە عەشـیرەتێك زۆرە، بەتایبـەت، كـە بـەراوردی دەكـەین لەگـەڵ ماڵەكانی لقەكانی تردا زۆرە، پێدەچێت هەڵەی چاپ بێت و دەبێت (٤٠) ماڵ بن.

(٢٢) كلاودیـۆس جـەیمس ریـچ، لـە بیرەوەرییـەكانی ڕۆژی ٢٧ی ئـازاری (١٨٢٠)ی دا، ئامـاژەی كردووە بۆ هاتنی بۆ دەشتی باجەلان و بنكوورە، وەك دەشتێك كە باش كشـتوكاڵی لێكـراوە، بڕوانە: (ریچ، ب ٢، ٢٠١٢، ل٢٦٢). هنری ڕاوڵنسون –یش لە میانەی نووسـینێكیدا دەربـارەی سنووری عوسمانی ئێرانی وەك خـاكێكی زۆر بـە پیـت ئامـاژەری بـۆ زەویوزارەكـانی بنكـوورە كردووە. بڕوانە: (ڕاوڵنسون، ١٩٩٤، ل١٢).

(٢٣) لە وەرگێڕانەكەدا بە هەڵە نووسراوە دوو هـەزار مـاڵ، ڕاسـتییەكەی ئـەوە ژمارەیـەكی زۆرە، پێدەچێت دوو سەد ماڵ بێت، چونكە لە ڕاپۆرتەكەی دەرویش پاشـای هاوسـەفەری خورشـید پاشایشدا ژمارەی ماڵەكانی بە دوو سەد ماڵ هەژماركردووە.

(٢٤) لە وەرگێڕانە عەرەبییەكەی سیاحەتنامەدا بە هەڵە هـاتووە (بعد سبعة وخمسـین عامـا–واتـا پاش پەنجاو حەوت ساڵ)، لە چاپی لاتینی سیاحەتنامەدا خورشید پاشـا دەڵێـت: ( لـە سـاڵی ٥٧ )دا، كە مەبەست لێی ساڵی ١٢٥٧ك/ ١٨٤١–١٨٤٢ز.

(٢٥) دەیـەك بـاجێكی ئیسـلامی ناسـراوە، ڕێژەكـەی بریتیبـووە لـە ١/١٠ی بـەروبوومی زەوییـە كشتوكاڵییەكان، بەڵام لـە ڕۆژگـاری عوسمانیـدا زۆر جـار پەیوەسـت نـەدەبوون بـەم ڕێـژەوە. بڕوانە پەراوێزی چوارەم لە: (مراد، ٢٠٠٥، ص٢٣).

(٢٦) دێم: هەر زەویوزارێكی كشتوكاڵی، كە پشـت بـە بـاران دەبەسـتێت و پێویسـتی بـە ئـاودێری نییـە، پێیـدەوترێت زەویـی دێـم، بـەگوێرەی ڕێسـای گشـتی دەیـەكی بەرهـەمی ئـەم جـۆرە زەویوزارانە بەشێوەی باج وەردەگیرا، هەنـدێ جـاریش ئەگـەر بەرهـەمی زەوییـەك پێـنج یـەك بووایە باجەكەی وەرنەدەگیرا. بڕوانە: (النجار، ١٩٩١، ص٣٦٩).

(٢٧) شـبە: بـەو زەویوزارانـە دەوترێـت دەكەوێتـە سـەر جۆبارێـك، كـە لـە یـەكێك لـە ڕووبارەكـان جیابۆتەوە، دەكرێت پانزە تـا بیسـت پارچـەی بكێڵـرێ و نـاوی "شـبە"ی لێبنرێـت، بـەمانای "كێڵگە"، بەرامبەر وشەی "چفتلك"ی ڕۆمللی یە، بەهۆی ئەوەی زۆربەی بەروبوومـەكانی ئـەو ناوچانە بە ئاوی زۆر دەچێنرێ و هەندێكیان نەبێت ئاوی كەمی دەوێ، بۆیە لە كشتوكاڵی ئـەو ناوچانەدا بە دەستەواژەی چاندن بـە ئـاو و چـاندن بـێ ئـاو گوزراشـتیان لێـدەكرێت. بۆخـۆی كاربەدەستانی كارگێڕی عوسمانی پێوانەی زەوییان بـە چـفتلك دەكـرد (كـە ٦ تـا ١٥ هیكتـار بوو، بەپێی جۆری زەوییەكە)، بە شێوەیەكی گشتی ڕەعییەت بۆی نەبوو لە یەك چفتلك زیـاتر

بەکرێ بگرێت. بڕوانە: پەراوێزی یەك لە: (خورشید باشا، ٢٠٠٩، ص١٩٢ ؛ برۆنەسن، ب٢، ٢٠٠٢، ل١٨).

(٢٨) جۆرێکی ئاودێری لە کشتوکاڵدا هەیە پێیدەوترێت ئاودێری ڕووکەش (سطحي) یان ئاودێری بەردانەوەی ئاو (الغمر)، واسطة یەکێکە لە شێوازەکانی ئەم جۆرە لە ئاودێری، کە لەو کێڵگە کشتوکاڵییەکاندا پەیرەو دەکرێت، کە لە ڕێگەی ئامراز و ئامێری تایبەتی وەك ناعوورەوە، ئاو لە ڕووبار و جۆبارەکان بەرزدەکرێتەوە بۆ سەر زەوییە کشتوکاڵییەکان. بۆ زیاتر لە سەر شێوازەکانی ئاودێری کشتوکاڵی بڕوانە: (البیاتي، ٢٠١٤، ص١٤٩–١٥٢).

(٢٩) وەزنە: یەك وەزنە پێکهاتبوو لە چوار مەن، هەر یەك مەن بریتیبوو لە هەشت ئۆقیە، یەك ئۆقیە دەیکردە ٢٨و. یەك کیلۆگرام. بڕوانە: پەراوێزی دووەم لە: (مراد، ٢٠٠٥، ص٥٧).

(٣٠) تەغار یەکێك بوو لە پێوانەکانی کێشانی گەنم لە بەغدا بەکارهاتووە، هەر یەك تەغار دەیکردە (٨٠٠) ئۆقیە. بڕوانە: (عجیمی،١٤٣٠ھ، ص٢٨).

## سەرچاوەکان:


- ڕاپۆرتی بلاَونەکراوە:

1-Glatz, and Casana, Directorate Archaeology Garmian, Sirwan Regional Project, Report field work of Archaeological survey, Report No. 6, 6-3-2017.

- کتێبی وەرگێڕدراو بۆ کوردی:

١- برۆنەسن، مارتین فان، ئاغا و شێخ و دەوڵەت، و: کوردۆ عەلی، بەرگی دووەم، (سلێمانی، ٢٠٠٢).

٢- چریکۆف، سیاحەتنامەی مسیۆ چریکۆف، کۆکراوەی: عەلی ئەسغەر عومران، و: سەلاح نیساری، چ١، (هەولێر، ٢٠١٣).

٣- دوسێری، کۆنت، گەشتی دوسێری بۆ کوردستان (١٨٣٩–١٨٤٠)، و: کارزان محەمەد، (سلێمانی، ٢٠١٣).

٤- ڕیچ، کلاودیوس جەیمس، گەشتنامەی ڕیچ بۆ کوردستان، و: مینە، چاپخانەی شڤان، (سلێمانی، ٢٠١٢).

٥- سەفەرنامەی هێنری بێندەر، (کوردستان، مێزۆبۆتامیا، ئێران)، و: ئەبوبەکر خۆشناو، (سلێمانی، ٢٠٠٦).

٦- سۆن، مەیجەر، سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، و: مینە، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، (سلێمانی، ٢٠٧).

٧- ڤیتال، کیوتیێ، قەزای خانەقین لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، و: نەجاتی عەبدوڵلا، لە چوارچێوەی کتێبی مێژووی خانەقین، ئامادەکردنی فاضل کەریم ئەحمەد، ب١، چ١، (سلێمانی، ٢٠١٧).
٨- نازم بەگ، حسێن، مێژووی میرایەتی بابان، و: حسێن حەسەن کەریم، بنکەی ژین، (سلێمانی ٢٠١٣).
٩- نەوار، عبدالعزیز سلێمان ، داوود پاشای والی بەغداد، و: عوسمان عەزیز عەللاف، چ١، (سلێمانی، ٢٠١٢).
١٠- هان، ئیستێرن، کاروانسەراکانی ڕۆژهەلأت، و: عە بدولمؤمین دەشتی، چ٢، (هەولێر،٢٠١٧).
١١- مێژوو و کوردناسی، بەرگی یەکەم، و: نەجاتی عەبدوڵلا، (هەولێر، ٢٠١٤).

- **کتێبی عەرەبی یان وەرگێڕدراو بۆ عەرەبی:**

١- الاعظمي، علي ظريف ، بغداد في القديم و الحديث، ط ٢، دار المرتضى، ٢٠٠٥.
٢- التقرير الذي تفضل بتقديمه صاحب السعادة المغفور لـه درويش باشا الذى عين لتحديد الحدود الايرانية العثمانية، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٣.
٣- الدولة العثمانية تاريخ و حضارة، مجلد٢، باشراف وتقديم أكمل الدين أوغلو، صالح سعداوى، ط ٢، (مصر، ٢٠١١).
٤- المرشد الى موطن الاثار و الحضارة ، الرحلة الرابعة، بغداد- كركوك - السليمانية، بغداد، ١٩٦٥.
٥- البديرى، خضير، موسوعة الشخصيات الايرانية في العهدين القاجاري و البهلوي (١٧٩٦-١٩٧٩ز)، ط١، (بيروت، ٢٠١٥).
٦- المنشي البغدادي، محمد بن احمد الحسيني، رحلة المنشي البغدادي الى العراق، ت: عباس العزاوي، (بغداد، ٢٠٠٨).
٧- الرۆژبياني، جميل بندي ، مدن كردية قديمة - تاريخها، جغرافيتها، رجالها، علماؤها، ادباؤها، ط١، مطبعة هەوالێ، (السليمانية، ١٩٩٩).
٨- العزاوي، عباس ، موسوعة تاريخ العراق بين احتلالين (العهد العثماني الثالث-١٨٣١-١٨٧٢ز)، المجلد السابع، الدار العربية للموسوعات.(د.ت).
٩- النجار، جميل موسى، العلاقات العثمانية الايرانية تطوراتها وتاثير العراق العثماني فيها وانعكاساتها عليه، ١٨٢٣-١٨٧٥، ط١، (بغداد، ٢٠١٦).
١٠- النجار، جميل موسى، الادارة العثمانية في ولاية بغداد من عهد الوالي مدحت باشا الى نهاية الحكم العثماني (١٨٦٩-١٩١٧ز)، مكتبة مدبولى، ط١، (مصر، ١٩٩١).

١١–بيكنغهام، جيمس، رحلتي الى العراق، ت: سليم طه التكريتي، ج٢، (بغداد، ١٩٦٨).

١٢–ثريا فاروقي و اخرون، التاريخ الاقتصادي و الاجتماعي للدولة العثمانية، ت: قاسم عبدة قاسم، دار المدار الاسلامي، (بيروت، ٢٠٠٧).

١٣–خورشيد باشا، رحلة الحدود بين الدولة العثمانية و ايران، ت: مصطفى زهران، ط١، (مصر، ٢٠٠٩).

١٤– دانتسغ، ب.م، الرحالة الروس في الشرق الاوسط، ت، معروف خزندار، (بغداد، ١٩٨١).

١٥– عجيمي، هشام بن محمد علي بن حسن، معجم مفردات و مصطلحات و تعبيرات و المكاييل و المقاييس و الموازين في الدولة العثمانية، (مكة المكرمة، ١٤٣٠هـ).

١٦– لوريمر، ج.ج، دليل الخليج، القسم التاريخي، قسم الترجمة بمكتب امير دولة قطر، مطابع علي بن علي، الدوحة (د.ت).

١٧– مختارات من كتاب الموصل و كركوك في الوثائق العثمانية، ت: خليل علي مراد، (السليمانية، ٢٠٠٥).

١٨– مديرية الاثار العامة، المواقع الاثرية في العراق، (بغداد، ١٩٧٠).

١٩– نوار، عبدالعزيز سليمان، تاريخ العراق الحديث من نهاية حكم داود باشا الى نهاية حكم مدحت باشا، (القاهرة، ١٩٦٨).

٢٠– نورس، علاء موسى كاظم ، حكم المماليك فى العراق (١٧٥٠–١٨٣١ز)، (بغداد، ١٩٧٥).

– **کتێبی فارسی یان وەرگێڕدراو بۆ فارسی:**

١– جونز ، جفرى ، تاريخ اقتصادى ايران، مؤسسة تحقيقات و توسعه علوم انسانى، (تهران، ١٣٨٧).

٢– معتمد، محمود فرهاد ، تاريخ روابط سياسيى ايران و عثمانى، ج٢، (تهران ١٣٣٤).

– **نامەی زانکۆیی:**

١– علي، غانم محمد، النظام المالي العثماني في العراق (١٨٣٩–١٩١٤ز)، رسالة ماجستير قدمت الى مجلس كلية الاداب في جامعة الموصل، شباط ١٩٨٩.

٢– البياتي، فلاح محمد ستار ، قضاء خانقين دراسة في الجغرافية الاقليمية، رسالة ماجستير قدمت الى مجلس كلية التربية للعلوم الانسانية جامعة ديالى سنة ٢٠١٤.

٣– الشعيبي، علي معجل خلف عودة ، شركة نفط خانقين المحدودة دراسة تاريخية، رسالة ماجستير قدمت الى كلية ابن رشد–جامعة بغداد سنة (١٤٢٣هـ–٢٠٠٢م).

- گۆڤارەکان:
- بەزمانی کوردی:
١- ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، بایەخی خانەقین و گەرمیان لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوە کۆنەکاندا، (گۆڤاری ژین، ژمارە-١پووشپەڕی ٢٠٠٩).
٢- تۆفیق، زرار سدیق، زانیاری مێژووی نوێ لە بارەی هەندێك شوێنی مێژوویی کوردستانەوە، (گۆڤاری ژین، ژ. ٥ لە دیسەمبەری ٢٠١٣).
٣- ڕاولنسون، هنری، سەرجەمی ئەو پەیماننامانەی بەندن بە کێشەی نێوان تورك و فارس، و: نەزەند بەگی خانی، (گۆڤاری کاروان-خولی ڕاپەڕین، ژمارە ١١ی ساڵی ١٩٩٤).
٤- عارف، زریان سالار حەمە و أمین، رحیم احمد، خانەقین و دەوروبەری لە سەرچاوەکانی مەعریفەی شارستانییەتی ئیسلامیدا، (گۆڤاری زانکۆی گەرمیان، ژمارە ١٢ بەرگی ٣ ی ساڵی ٢٠١٧).
٥- کریم، خالد محمود، تەکیە و خانەقاکانی باشووری کوردستان لە کۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانیدا، (گۆڤاری زانکۆی کۆیە، ژمارە ٣٧ی ساڵی٢٠١٥).
٦- نەریمان، مصطفی، أوراق تاریخیة کردیة في وثیقة عثمانیة، (گۆڤاری کاروان، ژ. ٤٥، حوزەیرانی ١٩٨٦).
- بەزمانی فارسی:
١- ماهری، شهروز ماشینچی، تاثیر کاروانهای زیارتی و دفن مردگان در عتبات عالیات بر مناسبات ایران و عثمانی (١٢٦٤-١٣٤٣ق )، مجله پژوشتنامه تاریخ تمدن اسلامی، شماره ١، (بهارو تابستان ١٣٩٢).
- بەزمانی ئینگلیزی
1-Glatz, C. and Casana, J., 2016. Of highland-lowland borderlands: Local societies and foreign power in the Zagros-Mesopotamian interface. *Journal of Anthropological Archaeology*.

# ملخص البحث

## خانقين واطرافها في ضوء "سياحتنامهء حدود"

م. خالد محمود كريم
كلية التربية الاساسية – جامعة طرميان

يعد كتاب رحلة الحدود "سياحتنامهء حدود" لخورشيد باشا، والذي انتهى من كتابتها في اواخر سنة (١٨٥١م) وسجل مشاهداته بشكل رسمي عن المناطق الحدودية التي تقع بين الدولتين العثمانية والايرانية، مصدراً مهماً لدراسة اوضاع كوردستان في اواسط القرن التاسع عشر، لغزارة واهمية المعلومات الواردة فيها، اذ ان اكثرية تلك المناطق كانت تشكل حدود الدولتين العثمانية و الايرانية، ومن ضمن تلك المناطق خانقين واطرافها.

وقد جاء اختيار الباحث لهذا العنوان "خانقين و اطرافها في ضوء سياحتنامهء حدود" لأجل القاء الضوء على الاوضاع العامة في خانقين و اطرافها، من خلال ماجاء في هذه الرحلة الحدودية و تقييم وتوضيح معلوماتها القيمة، والتي بمقارنتها ودعمها بكتابات الرحالة الاوربيين، وكذلك المصادر التاريخية، تعطينا صورة اوضح حول مرحلة مهمة من المراحل التاريخية لمنطقة البحث، في القرن التاسع عشر، مرحلة لم تسجل حولها المصادر التاريخية سوى القليل من المعلومات.

# Abstract

## Khanaqin and its Vicinity in "Siyahatname Hudod" of Khorshid Pasha

**Lecturer. Khalid Mahmud Kareem**
College of Primary Education – Univ. of Garmian

The borderland tour of Khorsheed Pasha which is known by 'Siyahatnamai hudod' has been written at the end of 1851 in which he has officially visited the border areas between both Ottoman and Iranian states.

It is considered one of the most significant sources due to the large amount and the importance of information it contains about the history of Kurdistan in the $19^{th}$ century that makes up a large part of the border areas between both Ottoman and Iranian states including Khanaqin and its surrounding areas.

The reason behind choosing the title of this research is to shed light on the general situation of Khanaqin and its neighbouring areas through this borderline tour as well as clarifying and evaluating its valuable information that can, together with the writings of European tourists and historical sources, provide us with a better historical picture of the research area in $19^{th}$ century. An era which the historical sources have documented the least information about.

# ڕۆڵی دەستەبژێری مافناسانی کورد لە پێشخستنی بزاڤی ڕۆشەنبیری و هزری لە باشووری کوردستان ١٩٢٥-١٩٥٨

**د. شاخەوان عەبدوڵلا صابر**
فاکەڵتی ئاداب– زانکۆی سۆران

**پێشەکی**

بوونی کۆلێژی ماف لە ئەستەمبۆڵی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی وای کردبوو ژمارەییەک لە ئارەزوومەندانی عێراقی بەمەبەستی تەواوکردنی خوێندن لە پسپۆڕی یاسا ڕوو بکەنە ئەو شارە، بەڵام بەهۆی دووری، و زۆری تێچووی ماوەی خوێندن، و ئاستەنگی هاتوچۆو مانەوە لەو شارە هەموو ئارەزوومەندانی ئەو پسۆڕییە بۆیان نەلواوە خوێندن لەو شارە تەواو بکەن. هاوکات لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم لەگەڵ ئەو پەرەسەندن و پێشکەوتنەی کە لەژیانی ڕۆژانەی خەڵکی وەدی هاتبوون ، هاوتەریب لەگەڵ ئەو پێشکەوتنەش کێشەی کۆمەڵایەتیی نوێش سەریان هەڵدا، هەموو ئەمانەش پێویستی بەدەرهێنانی یاسای نوێ بووە، هەروەها پێویستبوونی دەسەڵاتدارانی عوسمانی بەپیاوانی پسپۆڕی یاساناس بۆ ڕاییکردنی کاروباری ڕۆژانە لەدامودەزگا میرییەکان، هەموو ئەوانە لەسەر دەسەڵاتدارانی عوسمانی پێویست کردبوو کۆلێژی ماف لە ژمارەیێک ولایەتی دوورەدەست بکەنەوە، یەکێک لەوانەش عێراق بووە، کە لە ئەیلولی ١٩٠٨ بڕیاری کردنەوەی قوتابخانە (دواتر کۆلێژی) ماف درا.

قوتابخانەی ماف مەڵبەندێکی گرنگی پێگەیاندنی پسپۆڕی پێویست بووە لە بوارەکانی کارگێڕی و داد و و ڕامیاری و مافناسی، بێگومان

زۆرینەی زۆری دەستەبژێری مافناسی کورد لەماوەی سالانی توێژینەوەکە (١٩٢٥-١٩٥٨) لە دەرچووانی ئەو کۆلێژەن، ڕۆڵ و کاریگەری دیاریان هەبووە لەخزمەتکردن بەبزاڤی ڕۆشەنبیری و هزری لە کوردستان. ئەمەش لەڕێگای جۆراو جۆرەوە لەوانە: کۆمەڵە و ڕێکخراوە ڕۆشەنبیرییەکان، و دەرکردنی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و نووسینەکانیان کەناڵێکی تری بەردەست ئەو توێژە بوونە بۆ برەودان بەهەردوو بواری ڕۆشەنبیری و هزری، هاوتەریب لەگەڵ ئەو هەولانەش دەستەبژێری مافناسانی کورد لەڕێگای بەرهەمەکانیانەوە لەبواری هونەرەکانی ئەدەب لەوانەش (چیرۆک ، شیعر، و پەخشان) و بواری هزری و فەرهەنگی و سیاسی و کۆمەلایەتی، تەکانێکی گەورەیان بەبزاوتی ڕۆشەنبیری و هزری داوە لە کوردستان.

**گرنگی و بایەخی توێژینەوەکە** لەوەدا خۆی دەدۆزێتەوە کە لە چوارچێوەی توێژینەوەیێکی زانستیی تایبەت، ڕۆڵی دەستەبژێری مافناسانی کورد لە پێشخستنی جوولانەوەی ڕۆشەنبیری و هزری لە کوردستان خراوەتەڕوو.

**توێژینەوەکە** بەناونیشانی (**ڕۆڵی دەستەبژێری مافناسانی کورد لە پێشخستنی بزاڤی ڕۆشەنبیری و هزری لە باشووری کوردستان ١٩٢٥-١٩٥٨**)ە. دابەش کراوە بۆ سێ تەوەری سەرەکی، هەر تەوەرێکیش چەند بابەتێک لەخۆدەگرێ. لە تەوەری یەکەم باس لە سەرەتاکانی کردنەوەی قوتابخانەی ماف لە عێراق و پەیدابوونی دەستەبژێری مافناسانی کورد کراوە لە سالانی ١٩٠٨-١٩٢٥. هەرچی تەوەری دووەمیشە باس لەڕۆڵی ڕۆشەنبیری و هزری دەستەبژێری مافناسانی کورد دەکات لەماوەی سالانی١٩٢٥-١٩٣٨. لە تەوەری سێیەم و کۆتایی تیشک خراوەتە سەر قۆناغێکی نوێ لە ڕۆڵی ڕۆشەنبیری و هزری دەستەبژێری مافناسان لەماوەی ١٩٣٩-١٩٥٨. لەکۆتاییشدا گرنگترین ئەو دەرئەنجامانە خراونەتە ڕوو کە توێژەر لە نووسینی توێژینەوەکە پێیگەیشتووە.

## تەوەری یەکەم
## کردنەوەی قوتابخانەی ماف لە عێراق و بەدیارکەوتنی چینی دەستەبژێری مافناسانی کورد ١٩٠٨-١٩٢٥

### بابەتی یەکەم: چەمکی دەستەبژێر- النخبة- Elite

سەرەتای بەکارهێنانی چەمکی دەستەبژێر دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی (١٧) ز. ، بەگرووپگەلێکی کۆمەڵایەتی وتراوە کە باڵادەست بوون بەسەر کۆمەڵگاکانیان. بەڵام یەکەم بەکارهێنانی لە زمانی ئینگلیزیدا دەگەڕێتەوە بۆ فەرهەنگی ئۆکسفۆرد کە لە ساڵی١٨٢٣ بڵاوکرایەوە. لەکۆتایی سەدەی (١٩) بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە شێوازێکی بەربڵاوتری وەرگرت. دواتر دەستەواژەکە لە تیۆرە کۆمەڵاتییەکان برەوی زیاتری بەخۆیەوە بینی بەتایبەتی لەلای بیرمەندانی وەک (باریتۆ) و(مۆسکا). (ڕەفیق(و) عەباس ،٢٠١٧، ١٤٢).

(باریتۆ) دەستەبژێری دابەشی سەر دوو جۆر کردووە، دەستەبژێری دەسەڵات، و دەستەبژێری دەرەوەی دەسەڵات. **یەکەمیان،** دەستەبژێری دەسەڵات بریتییە لەو کەمینە هەڵبژێردراوانەی کە شوێن و پێگەیێکیان لە بەرپرسیاریەتی و حوکمڕانیی کۆمەڵگادا هەیە، مومارەسەی هێز و هەژموونی خۆیان لەڕێگای جومگە سیاسی و کارگێڕی و ئابووری و سەربازییەکانی ناو دەوڵەت و کۆمەڵگا دەکەن. بێگومان ئەم جۆرە لەدەستەبژێر لەڕێگای دوو کەناڵەوە کاریگەرییان لەسەر کۆمەڵگا جێدەهێڵن، یەکەمیان لەڕێگای پیادەکردنی دەسەڵات و هێز لەو ناوەندانەی کە کاری تێدا دەکەن. دووەمیان لەڕێگای دەسەڵات و هەژموونی فراوانیان لەناو کۆمەڵگا کە دەتوانن بەو هۆیەوە بیروڕاکانیان بچەسپێنن و هیوا و ئاواتەکانیشیان وەدی بهێنن. نموونەی ئەو دەستەبژێرەش وەک وەزیر و کادیرە پێشکەوتووەکانی ناو پارتە سیاسییەکان و پیاوانی نێو ڕیزی هێزە چەکدارەکانن. **دووەمیان،** دەستەبژێری دەرەوەی دەسەڵات، کە بەو گرووپەی ناو کۆمەڵگا

دەگوترێ کە لەدەرەوەی بازنەی دەسەڵاتن بەڵام لەڕێگای توانا و داهێنان و بەهرە هونەری و زانستی و ناو و ناوبانگ، و سەروەت و سامانی فراوان، ئەو ئەدگار و سیفەتانەی کە تێیاندایە، توانیویانە ناو و شۆرەت و شوێن و پێگەی بەرز لەناو کۆمەڵگا بەدەست بخەن. هەروەها ئەم جۆرەی دەستەبژێر لەبوارێکی دیاریکراو بەهرەمەندن، زۆرترین لێهاتوویيان لەبواری پسپۆڕیی خۆیان بەرجەستە کردووە. هەر یەک لە چینە کۆمەڵایەتییەکانی وەک مافناسان، وەرزشکاران، گەورە هونەرمەندان، رۆژنامەنووسان، و پزیشکان... هتد. لەدیارترین نموونەی ئەو جۆرە دەستەبژێرەن. (الحسن، ١٩٩٩،٦٣٤-٦٣٥).

**بابەتی دووەم: کردنەوەی قوتابخانەی ماف لە عێراق:**

دوای ساڵی ١٨٦٩ ئەو ناوچانەی کە پێیدەگوترا عێراق، کە بریتی بوو لە ویلایەتەکانی ( موسڵ، بەغدا، بەسرا) دوو ڕووداو و پەرەسەندنی گرنگی بەخۆوەبینی، یەکەمیان بریتی بوو لەدەست بەکاربوونی (مەدحەت پادشا ١٨٦٩-١٨٧٢) وەک والیی بەغدا، کە لە ئەنجامی کۆمەڵێک چاکسازی لەهەموو بوارەکان لە عێراق ئاشنا بوو بە سەرەتاکانی پێشکەوتن و نوێگەری بەتایبەتی لەبواری پەروەردە و فێرکردن. لەم چوارچێوەیەدا سەرەتاکانی بناغەی سیستەمی خوێندنی فەرمی لە عێراق داڕێژرا. (النجار، ٢٠٠١، ٣٧٨). ڕووداوی دووەم بریتی بوو لەکردنەوەی نۆکەندی سوێس، لەئەنجامی دابەزینی نرخی بارکردنی دەریایی و زیادبوونی جووڵەی بازرگانی و گواستنەوە لەنێوان ئەوروپا و ناوچەکانی تر لەوانەش عێراق، ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی کێبڕکێ لەنێوان وڵاتان لەسەر دەستەبەرکردنی بەرهەمەکانی عێراق، وەلەئەنجامی دزەکردنی سەرمایەی بێگانە لەناو چینی بۆرجوازی کۆمەڵێک پەیدا دەبن بەناوی (کۆمبرادۆر) ڕۆڵی ئابووری و سیاسیی دیاریان دەبێ لەشارە گەورەکانی عێراق بەتایبەتی لە هەردوو شاری بەسرا و بەغدا. (العبودي، ٢٠٠٦، ٢٨-٣١).

جیا لەوانەش لەو قۆناغەدا بەپێی پێوەرە ناوخۆییەکان ژمارەیێکی زۆری شار دروست دەبن. هاوکات کۆمەڵێک لەڕواڵەت و داب و نەریتە ئەوروپییەکـان خـزانە نـاو کۆمەڵگـای عێراقـی، و پەیوەنـدییەکانی ڕۆشەنبیران لەگەڵ ڕەوەندە بێگانەکان لەعێراق دروست بوون. هەموو ئەو هۆکارانە بەشێوەیێکی ڕوون ویستی خەڵکیان دەردەخست لەسەر فێربـوونی خوێنـدن و خوێنـدەواری بەشـێوەیێکی بەرچـاو بەتـایبەتی لە کۆتاییەکـانی سـەدەی (١٩) و سـەرەتای سـەدەی (٢٠)، ئەمەش دەسەڵاتدارانی عوسمانی هاندا کە ژمارەیێک قوتابخانەی سەرەتایی و ئامـادەیی لە شـارەکانی بەغـدا، بەسـرا، و موسـڵ بـکەنەوە. دواتـر بەمەبەستی ئامادەکردنیان بۆ وانەوتنەوە لەو قوتابخانانە، کردنەوەی خـانەی مامۆسـتایان بـووە پێویسـتییێکی ئەو قۆنـاغە. هەمـوو ئەم هەنگـاوانەش هۆکـار بـوون بـۆ زۆربـوونی ژمـارەی قوتابیـان و خوێندەواران. (النصيري، ٢٠١٢، ٢٠-٢٤ ).

جـێگەی ئامـاژە بـۆکردنە لە کۆمەڵگـای عێراقـی ئەو کـاتە کە سیسـتەمی دەربەگـایەتی تێـدا باڵادەسـت بـوو، داب و نەریـتە هۆزایەتییەکان پەیوەندیی نێوان تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایەی ڕێکخستووە، لەبەر سادەیی ژیان لەو کۆمەڵگایە کێشە و گرفتی ئاڵۆزبوونیان نەبووە. بـۆیەش دەبینـین دادگـای فەرمـی لە بەغـدا بۆمـاوەیێکی درێـژ لەلایەن قازییەک یاخود دووان لە ماڵەکانی خۆیانەوە لە کێشـە و ناکۆکیەکانیان دەکـۆڵییەوە. هەروەهـا لەبـواری پسـپۆڕیی خۆیـان لەلایەنـی شـەرعی ئیسـلامی، پیاوانی ئاینی تاکە چینی گوێ لێگیراو بوون، بۆیە وشـەی **(پـارێزەر- محـامي)** لە فەرهەنگی کۆمەڵگەی عێراقی ئەو کات بوونی نەبووە. بەڵام لەماوەکانی کۆتایی سەدەی (١٩)، بەهۆی ئەو پێشکەوتن و پەرەسەندنەی کە بەسەر ژیانی کۆمەڵانی خەڵکی عێراقدا هاتن کێشەو ئاریشەو ناکۆکی نوێش بوونە بەشێک لەژیانی ڕۆژانەی خەڵکی، هەموو ئەو گۆڕانکارییانەش ڕێگا خۆشکەر بوون بۆ هێنانە ناوەوەی یاسا و ڕێسـای نـوێ لەوانەش یاسـاکانی تـایبەت بەبـواری تـاپۆ و زەویـوزار.

هەروەها خاوەن بەرژەوەندیەکان پێویستییان بەخەڵکانی شارەزا هەبوو لەبواری یاسا کە بە(ئاوقاتیەکان-الاوقاتیون) بەناوبانگ بوون، تەنانەت ماوەییێک بەرلە هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی لەبەر بایەخ و گرنگی ئەو پیشەیە هەندێ لە ڕۆشەنبیران دەچوونە ئەستەمبۆڵ و بگرە پاریسیش بۆ وەرگرتنی پسپۆڕی لەم بوارە. بەڵام هەموو ئەمانە بەس نەبوون بۆ دابینکردنی ژمارەی پێویست لە پارێزەران و دادوەران بۆ دامودەزگاکانی دەوڵەت و خاوەن پێویستییەکان بەو پسپۆڕییە. لەبەر ئەوە کردنەوەی کۆلێژی ماف بووە پێویستێکی گرنگی ئەو قۆناغە، بۆیە لەسەر پێشنیازی نازم پادشای پشکنەری کارگێڕ لەکاتی سەردانی بۆعێراق لەساڵی ١٩٠٨ بڕیاری کردنەوەی (قوتابخانەی ماف) لەشاری بەغدا درا. (احمد، مجلة، (الحكمة)، العدد (٥) السنة الاولى، تشرين الثاني- كانون الاول، بغداد، ١٩٩٨، ٣٣). هەروەها پێشی دەگوترا قوتابخانەی مافی شاهنشاهی (واتە سوڵتانی). (بیات،٢٠٠٣،٣٩٨ ).

شایەنی باسە ئەم قوتابخانەیە تاوەکو کۆتایی دەسەڵاتی عوسمانی لە عێراق لەساڵی ١٩١٨ تاکە قوتابخانەی باڵا بووە. (النجار،٢٠٠٢، ٣٨٢). دوای تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی ماوەی خوێندن بەچوار ساڵ دیاری کرابوو. بەهۆی هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨) خوێندن لە قوتابخانەکە پەکی دەکەوێت. (مزعل،١٩٩٠،٢٦). لەدوای کۆتایی جەنگ بەدیاریکراوی لە ٧ی تشرینی دووەمی ١٩١٩ خوێندن لە قوتابخانەی ماف دەست پێدەکاتەوە، دوای ئەوەی دەسەڵاتدارانی بەریتانیا درکیان بەپێویستبوون بە کارمەندانی عێراقی لە پسپۆڕی یاسا و کارگێڕی کرد بۆ ڕاییکردنی کاروبار لە دامودەزگاکان. لە ١٨ی تەموزی (١٩٢٠)یش دەستەی یەکەمی قوتابیانی دەرچوون. (أحمد، ١٩٩٢،١١٧).

دەرچووانی ئەم کۆلێژە لە قۆناغی سەپاندنی (سیستەمی سەرپەرشتی کردن-ئینتیداب ١٩٢٠-١٩٣٢)، ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە لەپرۆسەی ڕۆشەنبیری و هزری. هەروەها پێگەی دیاریان هەبووە لە

نـاو دامودەزگاکـانی دەوڵەتـی عێراقـی نـوێ لەسـەر هەردوو ئاسـتی دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردن و یاسادانان. هاوکات ژمارەی پارێزەرانیش بەرەو زیادبوون دەچوو بەجۆرێک لەساڵی ١٩١٩ تەنها ٧٢ پارێزەری مۆڵەتدراو لە بەغدا هەبوون. بەڵام لەنێوان ساڵانی١٩٢٠-١٩٢٧ ژمارەی دەرچـووانی کـۆلێژی مـاف بەرز دەبێـتەوە بـۆ٢١٣ کەس. (النصـيري، ٣١٦،٢٠١٢).

## بابەتی سێیەم: بەدیارکەوتنی چینی دەستەبژێری مافناسانی کورد ١٩٠٨-١٩٢٥

بەهـۆی شـوێنی جیۆسـتراتیژی کە هەردوو کیشـوەری ئاسـیا و ئەوروپـای بەیەکـدی دەبەسـتەوە، ئەسـتەمبۆلی پـایتەختی دەوڵەتـی عوسمانی (کە لە ساڵی ١٨٧٨ کۆلێژی مافی لێکرایەوە) ببووە مەڵبەندی ئەدەب و زانسـت و هەمـوو جموجـووڵ و چـالاکیێکی ڕۆشـەنبیری و هزری و سیاسی. (ئاشنا، ٥٢،٢٠٠١). ئەو شارە بەکۆکەرەوەی هەموو چین و تـوێژە سیاسـی و نەتەوەیـی و کۆمەڵاتییەکـانی عێراقـی (لەنێویشـیدا تـوێژی ڕۆشـەنبیرانی کـوردی) ناسـرابوو. تەنـانەت سـەرچاوەیێک ئەسـتەمبۆڵی ئەوکـاتی بە**"کەعـبەی پیـاوانی عێـراق"** نـاوزەد کـردووە. (مشـتاق، ٣٦،١٩٨٩). بەجۆرێـک لەمـاوەی سـاڵانی١٨٧٢- ١٩١٢ ژمـارەی قوتابیانی عێراقی لەبواری خوێندنی باڵا لەو شارە گەیشتبووە (١٤٠٠) قوتابی. (الجمال،٢٠١٠، ١٧٢).

دەربـارەی دۆخـی کوردەکـانی ئەسـتەمبۆڵیش توێژەرێـک دەڵێ:**"کۆمەڵگایەکی کوردەوارییان پێکهێنابوو کە جگە لە کوردی باکور، کوردەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش تێکەڵ بووبوون بەو کۆمەڵگـایەی کـورد لە ئەسـتەمبۆڵدا..."**. (هـاوار،٢٠٠٠، ٤٨٧). هاوکـات شارەکەش ببووە شوێنی نیشتەجێبوونی دەیان کەسایەتیی سیاسی و ئاینی و یاسایی و کۆمەڵایەتی بەتایبەتی لە بنەماڵە ناسراو و دیارەکانی ئەو ڕۆژگارە، لەوانەش بنەماڵەی (بابان، بەدرخان، شەمزینان)، و چەند

ڕێکخراو و کۆمەڵە و ڕێکخراوی سیاسی و ڕۆشەنبیریی کوردیش لەو شارە هاتنە دامەزراندن. (ئەمین،٢٠٠٢، ٩ -١١). لەڕووی کاریگەریشەوە شارەکە بەیەکێک لەگرنگترین ناوەندەکانی بیری نەتەوەیی نوێی کوردی هەژمار دەکرا. (ئەلاکۆم، ٢٠٠٥، ٨١)، هەربۆیەش دەبینین بەشێکی بەرچاوی دەستەبژێری ڕۆشەنبیری و سیاسیی کوردستانی باشوور (لەنێویشیاندا هەندێک لە دەستەبژێری مافناسانی کورد) لە کۆتاییەکانی سەدەی (١٩) هەتا چارەکی یەکەمی سەدەی (٢٠) لەدەرچووانی خوێندنگا وکۆلێژە پێشکەوتووەکانی ئەو شارەن. بۆنموونە کەسایەتییێکی وەک (پیرەمێرد ١٨٦٧-١٩٥٠) (ناوی تۆفیق بەگی مەحمود ئاغای هەمزە ئاغای مەسرەفە. لە ساڵی١٨٦٧ لەگەڕەکی گوێژەی سلێمانی لەدایک بووە، خوێندنی ئاینی لە حوجرەکان تەواوکردووە ، وەک کارمەندی میری چەندین وەزیفەی بینیوە. خاوەنی چەندین بەرهەمە لەبواری ئەدەبی کوردی. لەساڵی١٩٥٠ لەسلێمانی کۆچی دوایی کردووە). (ئاشنا،٢٠٠١، ٤٨-٦٠)، کە یەکێک بوو لە دەستەبژێرە چالاکەکانی مافناسان ماوەی زیاتر لە چارەکە سەدەییێک(١٨٩٨-١٩٢٤) لەتورکیا ژیاوە ئاماژە بەوە دەکات کە هەرچی زانیاری و ڕۆشەنبیری خۆی هەیە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆماوەی ژیانی لە ئەستەمبۆڵ. لەم بارەیەوە دەڵێ: "**ئێمە زۆرترمان لەوێوە لە ئەستەمۆڵەوە پێگەیشتووین**". تەنانەت کاریگەری ژینگەی ڕۆشەنبیریی ئەو شارە لەسەری بەجۆرێک بووە کە زۆر ڕاشکاوانە لە وەسیەتنامەکەیدا بڵێت "**بەنیوە خوێندەواری لە سلێمانی دەرچووم و خوێندنێکی بەرزم هێنایەوە.** (ئاشنا، ٢٠٠١، ٥٢-٥٣).

ئەوەی تایبەتە بەقوتابیانی کورد لە کۆلێژی مافی ئەستەمبۆڵ، دەبینین لە سەرەتای دامەزراندنیەوە تاوەکو کۆتایی ساڵی ١٨٩٥ هەشت قوتابی عێراقی خوێندنیان لەو کۆلێژە تەواو کردووە کە یەکێکیان کوردی شاری سلێمانی بووە بەناوی عبداللە عەونی. (العزاوي، مجلة، (القضاء)، بغداد، العدد(٢)، كانون الاول، ١٩٤٧، ٧٩-٨٤). پیرەمێردیش لەنێوان ساڵانی (١٩٠١-١٩٠٥) خوێندنی ماف لە ئەستەمبۆڵ تەواو دەکات.

لەوێـش دەسـت دەکـات بەکـاری پـارێزەری. (ئاشـنا،٢٠٠١،٧٧). جەمـال بابـانیش (١٨٩٣-١٩٦٦) لەسـاڵی ١٩١٤ هەمـان کـۆلێژ تەواو دەکـات. (بابـان،١٩٩٣،١٤٤). لە کۆتاییەکـانی سـاڵی ١٩٠٨مەعـروف عەلـی ئەکبەر ناسراو بە مەعروف جیاوک (١٨٨٥-١٩٥٨) (لەساڵی ١٨٨٥ لەشاری بەغدا لە دایک بووە. دەرچووی کۆلێژی مافی بەغدایە لەساڵی١٩٢٠. لەچەند شارێکی عێراقی کـاری دادوەری کـردووە. خـاوەنی چەنـد بەرهەمـێکە. لەسـاڵی ١٩٥٨ کـۆچی دوایـی کـردووە لەشـاری هەولێـر ئەسـپەردەی خـاک دەکـرێ. (سـاڵح ، ٢٠١٢،١٣-٣٣٦)، دەگـاتە ئەسـتەمبۆڵ و دەبێـتە قوتـابی کـۆلێژی مـاف، بەڵام بەهـۆی هەڵوێسـتی دژی ئیتحادییەکـان نـاتوانێ درێـژە بەخوێنـدن بـدات و دەگەڕێتەوە بەغدا، لەساڵی١٩٢٠. کۆلێژی ماف لەو شارە تەواو دەکات. (زۆرێـک لەو سـەرچاوانەی کە بـاس لەژیـانی مەعـروف جیاوکیـان کـردووە کەوتوونەتە ئەو هەڵەیەی کە گوایە ناوبراو دەرچووی کۆلێژی مافی ئەستەمبۆڵە. بەڵام جیـاوک تەنهـا قۆنـاغی یەکەم و دووەمـی لە ئەسـتەمبۆڵ تەواوکـردووە. ساڵی١٩١٣ چۆتە قۆناغی سێیەم بەڵام نەیتوانیوە درێژە بەخوێندن بدات لەو شارە، تەنها قۆناغی چوارەمی لە بەغدا تەواوکردووە. واتە قۆناغەکانی کۆلێژی بە سێ ساڵ بڕیوە نەک چوار. بۆ زیاتر زانیاری و ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە بڕوانە: ساڵح ،٢٠١٢،٢٣-٢٧).

شایەنی باسە ئەو تایبەتمەندیەی دەستەبژێری مافناسانی کورد لە سـەرەتای سـەدەی (٢٠)ی پـێ جیـا دەکـرێتەوە بریتـی بـوو لەبـایەخ وگرنگیـدانیان بەبـواری ڕۆژنـامەگەری، وەرگرتنیـان بـووە بەو کەنـاڵە گرنگە بۆ وشیارکردنەوەی تاکی کورد لەو قۆنـاغە. بۆنمـوونە پیرەمێرد لە ئەستەمبۆڵ سەرپەرشتی دەرهێنانی ڕۆژنامەی (کورد)ی کردووە کە لەلایەن کۆمەڵەی (کورد تعاون و ترقي جمعيتي) دەردەچوو، یەکەمین ژمارەی لە ٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٠٨ بڵاوکراوەتەوە. (بۆزانیـاری دەربارەی کارە ڕۆژنامەوانیەکانی پیرەمێرد لە ئەستەمبۆڵ بڕوانە: ئاشنا،٢٠٠١،٥٤-٥٥)، کە تێدا بەرگـری لەمـافە سیاسـییەکانی گەلـی کـورد کـردووە. وە بـایەخی بەزمـان و مێـژوو و کەلتـووری نەتەوەی کـورد دابـوو. (عومەر،

٢٠٠١، ٦٨). مەعروف جیاوکیش کە بەیەکێک لەچالاکترین دەستەبژێری مافناسانی ئەو قۆناغە دادەنرێت، لە ١٨ کانونی دووەمی١٩١٢ ڕۆژنامەییێکی سیاسی بەناوی (الحقوق) بەزمانی تورکی دەرکردووە، تەنیا ستوونێکی ڕۆژنامەکە بەزمانی عەرەبی بووە. هەروەها جیاوک لە زۆرێک لە ڕۆژنامە و گۆڤارە عەرەبیەکانی ئەو ڕۆژگارەی بەغدا وتار و بابەتی دەربارەی پرسی کورد نووسیوە، زۆربەشیان وەلامدانەوە بووە بۆ ئەوانەی لەسەر ئەم پرسەیان نووسیوە. (سالح،٢٠١٢،٣٢٧-٣٣١). جەمال بابانی مافناسیش لە ٨ شوباتی١٩١٤ یەکەم گۆڤاری کوردی لەباشووری کوردستان بەناوی (بانگی کورد)ی بەهەردوو زمانی کوردی و تورکی دەرکرد، کە بایەخی بەبلاوبوونەوەی زانست و زانیاری داوە لە کۆمەڵگای کوردی. بەلام بەهۆی هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانی لەساڵی ١٩١٤ گۆڤارەکە وەستاوە لەدەرچوون. (ئەمین،٢٠٠١، ١٥٩–١٧٧).

## بابەتی چوارەم: ئەو فاکتەرانەی قوتابیانی کوردی هانداوە بۆ ڕووکردنە خوێندنی ماف

هەڵگرانی بڕوانامەی ماف لەناو کۆمەڵگا خاوەن پلەوپایە و پێگەی تایبەتی خۆیان بوونە، هەروەها بەحوکمی ئەوەی پسپۆڕیەکەیان پەیوەستی ڕاستەوخۆی بەکێشە و گرفتەکانی خەڵکی هەبووە بۆیە بەردەوام ئاگاداری ڕووداو و پەرەسەندنەکانی ناو کۆمەڵگا بوونە. پرسی بەرگریکردن لە مافی ستەم لێکراوان و گێڕانەوەی ماف بۆیان، لەگەڵ بەرگریکردن لە مافی میللەت، و جیاوکی دەرکردنی ڕۆژنامە و گۆڤار. هەموو ئەو فاکتەرانە کاریگەرییان هەبووە لەسەر قوتابیانی کورد بۆ ڕووکردنە خوێندن لەو پسپۆڕییە، تەنانەت هەندێ لەو مافناسانە لەوانەش (ئیبراهیم ئەحمەد ١٩١٤–٢٠٠٠) (احمد، گۆڤاری، (گەلاوێژی نوێ)، سلێمانی، ژمارە، (٤)، ساڵی یەکەم، تشرینی دووەم، ١٩٩٧، ٦–٧) (لەساڵی١٩١٤ لەسلێمانی لە دایک بووە، خوێندنی سەرەتایی تاوەکو دووی ناوەندی

لەو شــارە تەواوکــردووە، قۆناغەکــانی تــری ناوەنــدی و دواناوەنــدی لە بەغــدا تەواوکــردووە. لەســاڵی ١٩٣٤ لەکـۆلێژی مـاف وەرگیـراوە و لە١٩٤٠ خوێنـدنەکەی تەواوکــردووە. ئەدیــب و سیاســییێکی دیــاری کوردســتان بــووە. خــاوەنی چەنــد بەرهەمـێکە لەبوارەکـانی سیاسـی و ئەدەبـی. لە ١٩٧٥ وەک پەنابەرێـک لە لەنـدەن نیشتەجێ بووە، تاوەکو مردنی لەساڵی ٢٠٠٠). (ئەحمەد، ٢٠٠٩، ١٣-٢٠)، و(ڕەشـید باجەلان ١٩٢٠-٢٠٠١) (باجەلان، ٢٠٠٧، ٥٦-٥٧). بـواری پسـپۆڕییەکەیان پێ باشترو گرنگتربووە لەبـواری پسـپۆڕیی پزیشـکیش. بۆنمـوونە فـاکتەری وەرگرتنـی مـافی دەرکردنـی گۆڤارێـک کـاریگەریی ڕاسـتەوخۆی لەسـەر کارئەکتەرێکی بەرچاوی بوارەکانی ڕۆشـەنبیر و سیاسـی وەک ئیبـراهیم ئەحـمەد هەبـووە بـۆ ڕووکـردنە خوێنـدنی مـاف. (احمـد، (گەلاوێـژی نـوێ) سلێمانی، ژمارە. (٤)، ساڵی یەکەم،تشرینی دووەم، ١٩٩٧،٦-٧).

بەهـۆی بـوونی پێگەییێکـی بەرز لەنـاو کۆمەڵگـا لە سـاڵانی سـی و چلەکــانی ســەدەی (٢٠) و ماوەکــانی دواتــریش بەشــێک لە بنەمــاڵە خوێندەوار و دەوڵەمەند و چینە کۆمەڵایەتیە دیارەکانی تری کۆمەڵگاش تەنانەت ئاغاکانیش لە شاری هەولێر **"بەزۆری کوڕەکانیان بۆ خوێندن دەنارده کۆلیجی ماف"** (کاروانی، ٢٠٠٤، ١٥). هەروەها هۆکاری نزیکبوونی پســـپۆڕیەتی مـــاف لە بـــواری سیاســـەت و تێکەڵاوبـــوونی زۆرێـــک لەهەڵگرانـی بڕوانـامەی مـاف لەکـاری سیاسـی فـاکتەرێکی تـر بـووە بـۆ ئەوەی هەندێ لە سیاسەتمەدارانی کوردی ڕوو لەخوێندنی مـاف بکەن (بۆتانی،١٩٩٨،٤٣-٤٤).

جیا لەو هۆکارانەش بەشێک لەقوتابیـانی کـورد بـواری مافناسـییان بەڕێگاییێکی ڕاست و تەندروست زانیوە بۆ بەرگریکردن لە مافی میللەت و خەڵـک، و سـتەم لێکـراوان. لەگەڵ ڕاسـتکردنەوەی هەمـوو چەوتـی و لات و لەوێرێــک و گەڕانەوەی مــاف بــۆ خــاوەنەکەی. لەم ڕووەوە توێژەرێـک بـاس لە پـاڵنەری سـەرەکی دەکـات بـۆ ئەوەی یەکێـک لە چالاکترین دەسـتەبژێری مافناسـانی کـورد (شـاکر فەتـاح ١٩١٤-١٩٨٨) (لەساڵی ١٩١٤ لەسلێمانی لەدایک بووە. لەساڵی١٩٣٦ کۆلێژی مـافی زانکۆی بەغدای تەواو کردووە. وەکو قایمقام و بەڕێوەبەری نـاحیە لەچەندین نـاوچەی کوردسـتان

دەستبەکار بووە. خاوەنی چەندین بەرهەمە.لەساڵی ١٩٨٨ حکومەتی عێراقی شوێن بزری دەکات). ئاوێنەی ژینم، یادداشتەکانی شاکر فەتاح، سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح ٢٩،٢٠٠٣-٦١٦)، ڕوو لەخوێندنی یاسا بکات. لەم بارەیەوە دەڵێ: **"کاتێ کە خوێندنی کۆلیجی (یاسا)ی هەڵبژاردووە هەر بۆ ئەوە کە بەڕاستی یاساناس بێت و مافی گشت بپارێزێت و نەهێڵێ کەس بەدژی بەند و بڕگەکانی یاسا ببزوون و هەرچی لاری و چەوتییەک ڕوو بدات دەبێ بەپێی یاسا ڕاست بکرێتەوە، خراپەکاران سزا بدرێن و زۆرلێکراوان بەمافی ڕەوای خۆیان بگەن و هەموو لایەک بە یەکسانی بە وتەی یاسا ڕازی بن خۆشحاڵ و شاد بن"**(بیمار، ١٩٩٨،٢٨٤). مافناسێکی تریش ئەرکی سەرەکی خۆیانی بەم شێوەیە خستۆتەڕوو"**...پارێزگاری ماڵ و عەرز و ناموسی خەڵک بکات بە هەموو توانایەکیەوە، ... وەک پزیشکێک دەردیان نەهێڵێت، ... دڵسۆز بێت بۆ میللەتەکەی بەزەیی بەفەقیر و هەژاردا بێتەوە... بەچاوێکی یەکسانی سەیری هەموو میللەت بکات، ماف و یەکسانی و یاسا چییە ئەوە ئامانجی بێت"**. (محمود،١٦،٢٠٠٤).

## تەوەری دووەم
## ڕۆڵی ڕۆشەنبیری و هزری دەستەبژێری مافناسانی کورد ١٩٢٥–١٩٣٩

### بابەتی یەکەم: ڕۆڵیان لە کۆمەڵە و ورێکخراوە ڕۆشەنبیرییەکان:

دوای یەکلابوونەوەی پرسی موسڵ و لکاندنی کوردستانی باشوور بەدەوڵەتی عێراق لە ساڵی١٩٢٥، و کۆتایی هاتنی حکومڕانەتیەکەی شێخ مەحمودی حەفید زادە لە شاری سلێمانی، دواتریش دەستەبەرنەکردنی مافەکانی گەلی کورد لە چوارچێوەی پەیمانی عێراقی بەریتانی ساڵی١٩٣٠، چینی ڕۆشەنبیرانی کوردی لەنێویشیاندا دەستەبژێری مافناسانی کورد، بەباشیان زانیوە تەکانێک بەڕەوتی خەباتی ڕۆشەنبیری بدەن. لەم چوارچێوەدا بەشداربوونە لە دامەزراندنی کۆمەڵە و یانە ڕۆشەنبیرییەکان.

## ١- کۆمەڵەی زانستیی کوردان

لە ٢٧ کانونی دووەمی ١٩٢٦ هەریەک لە فایق بەگی مەعروف بەگ، ڕەمزی ئەفەندی حاجی فەتاح، و تۆفیق ئەفەندی پارێزەر، وەک دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی زانستی کوردان بەمەبەستی وەرگرتنی مۆڵەتی کارکردن داواییکیان پێشکەش بەوەزارەتی ناوخۆ کرد، وەزارەتیش بەنووسراوی ژمارە (٢٥١٧) لەبەرواری (٢٤) شوباتی هەمان ساڵ ڕەزامەندی لەسەر داواکەیان دەربڕی. (خواجە، ب٣، ١٩٧٠، ٤٤؛ کەریم، ١٩٨٥، ١٨-٢٠). دواتریش دەستەی کارگێڕی کۆمەڵەکە هەڵبژێردرا کە تێدا دەستەبژێری مافناسان پێگەی دیاریان هەیە لەناویدا، لەم ڕووەوە ناوی هەر یەک جەمال بابانی مافناس وەک جێگری سەرۆک، و ڕەفیق ئەفەندی پارێزەر وەک باوەڕپێکراوی یانەکە و، دادوەر شێخ مستەفا ئەفەندی وەک ئەندام بەرچاو دەکەون. (بۆ زانینی تەواوی ناوەکانی ئەندامانی دەستەی کارگێڕی بروانە: کەریم، ١٩٨٥، ٢١).

بەوردبوونەوە لەناوی دەستەی دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی زانستی، و دەستەی کارگێڕی، پێگەو قورسایی ئەو چینە لەناو کۆمەڵگای کوردی بەدیاردەکەوێ، هاوکات سەلمێنەری ئەو ڕاستیەشە کە ئەوان درکیان بەواقعی بارودۆخی کۆمەڵگای کوردی ئەو کات کردووە، هەوڵیان داوە لەڕێگای ئەو کۆمەڵەیەوە خزمەت بەمیللەتی خۆیان بکەن، وەنەوەکانی کورد لە نەزانین و نەخوێندەواری دەرباز بکەن.

لە شەوی دوو لەسەر سێی نیسانی ١٩٢٦ لە کۆبوونەوەیێکی جەماوەریی بەرفراوان کە لەشاری سلێمانی ڕێکخراوە ڕەفیق ئەفەندی پارێزەر لە وتارێکدا ئامانجی کۆمەڵەکەی لە بەگەڕخستنی بزاوتێکی ڕۆشەنبیری و هزری بەمەبەستی پێشکەشکردنی خزمەتی زانستی بەگەلی کورد دیاری کرد. هەروەها هۆکاری پێشکەوتنی میللەتانی گەڕاندبۆوە بۆ نەوەستان و دەستگرتن بە زانست و زانیارییەوە. دووپاتیشی کردەوە گەلان لەو ڕێگایەوە گەیشتوونەتە ئاستێکی باڵا لە پێشکەوتن. بۆیە داوا دەکات بەڕێگا و ئامرازی جۆراوجۆر وەک

کـردنەوەی قوتابخـانە، و کتێبخـانە و، دەرکردنـی ڕۆژنـامە، و نـاردنی قوتابیـانی کـورد بـۆ ئەورووپـا بۆخوێنـدن، نەزانـین و نەخوێنـدەواری لە کوردسـتان بنبـڕو قەڵاچـۆ بکـرێ. هەر لە کۆبـوونەوەکەدا پیرەمێـردیش هۆنراوەیێکی پێشکەش کردووە تێدا هاتووە:

**ئەمشەو گوڵی ئومێد وەتەنمان ئەپشکوێ**

**ملت امیدە دارە بە (زانستی) پێشکەوێ**

**زانستیە بە سویەی میلت بلند ئەکا**

**زانستییە کە ئێمە بناسێ بە اوروپا**

(بۆ بینینی تەواوی وتار و هۆنراوەکەی پیرەمێرد بڕوانە: (کەریم، ١٩٨٥، ٢٢-٢٧).

بەسەرنجدان لە وتـار و پـارچە هـۆنراوەکە ئاسـتی ڕۆشـەنبیری، و تێگەیشتنی نەتەوایەتی، و پەرۆشی ئەو چینە بۆ گەل و نەتەوەی خۆیان تێبینی دەکرێ .

بەمەبەستی برەودان بەچالاکیەکانیان، دەستەی کارگێڕی کۆمەڵەکە هەڵمەتێکی بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی و کۆمەکی ڕاگەیاندووە، لەنێو چین و توێژەکان نـاوی چەنـد مافناسـێک بەرچـاو دەکەون کە بەشـدار بـوونە لەو هەڵمەتە. (لەوانەی کە وەک دەستەبژێری مافناسان ناسراون بریتین لە: جمـال بابـان١٠٠ ڕوپـیە، ڕەفیـق ئەفەنـدی٥٠ ڕوپـیە، شـێخ مسـتەفا ئەفەنـدی١٠٠ ڕوپـیەیـان پێشکەش کردووە. کەریم، ١٩٨٥، ٢٨-٣٩). لەدوای دەسـت لەکـار کێشـانەوەی سێ لەئەندامانی دەستەی کارگێڕی کۆمەڵەکە لە ئابی ١٩٢٦سێ ئەندامی نـوێ بـۆ پڕکـردنەوەی شـوێنەکانیان هەڵبژێـردراون، یەکێـک لەوان پیرەمێرد بووە. (کەریم، ١٩٨٥، ٣٩). ناوبراو لەسـاڵی ١٩٣٢ بەدواوەش بۆتە بەرپرسـی قوتابخـانەی زانسـتی تـاوەکو داخسـتنی کۆمەڵەکەش لەسـاڵی ١٩٣٨ بەردەوام بووە لەکارەکەی. (باپیر، ٢٠١٤، ٥٨).

شـیاوی باسـە بەهـاتنی پیرەمێـرد کـار و چالاکیەکـانی کـۆمەڵەکە گڕوتین و تەکانێکی گەورەی بەخۆیەوە بینیوە. لەم چوارچێوەدا کۆمەڵە هەڵساوە بە پێشکەشکردنی پڕۆژە و چالاکی ڕۆشـەنبیریی جۆراوجۆر

لەوانەش: کردنەوەی قوتابخانەی شەوانە لە شاری سلێمانی، لەگەڵ کردنەوەی کتێبخانەیێک، و کڕینی چاپخانە، و کردنەوەی لقێکی کۆمەڵە تایبەت بەئافرەتان، و زیندووکردنەوەی یادی نەورۆز. (بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی چالاکیە ڕۆشەنبیرییەکانی کۆمەڵەکە بڕوانە : باپیر، ٢٠١٤،٥٣-٨٢).

## ٢- یانەی سەرکەوتنی کوردان

یەکێک لە دیاردە بەرچاوەکانی سالآنی سییەکانی سەدەی بیستەمی ژیانی سیاسی لە عێراق بریتی بوو لە گەشەکردنی بیروڕاکان و دروستبوونی ڕێکخستنە نەتەوەیی و چاکسازخواز و سەربازی و ڕادیکالەکان و ڕێکخراوە ڕۆشەنبیرییەکان. (الحفو، ٢٠٠٦، ٦٦-٨٢). کوردستانیش ڕیزپەڕ نەبووە لەو دیاردەیە، لەم ڕووەوە چەند ڕێکخراو و کۆمەڵە و یانەی ڕۆشەنبیری و پارتی سیاسیش هاتنە دامەزراندن کە دەستەبژێری مافناسان خاوەن بیرۆکە و بزوێنەر و داینەمۆی سەرەکی هەندێکیان بوونە. (بۆنموونە کۆمەڵەی پشتیوانی کوردان لە ١٩٣٠ هاتە دامەزراندن. ساڵی١٩٣٣ کۆمەڵەی لاوان لە شاری بەغدا دامەزرا. هەروەها لەساڵی١٩٣٧ کۆمەڵەی دارکەر لەنێو قوتابیە کوردەکانی ئامادەیی کەرکوک هاتە دامەزراندن و دوای فراوانبوونی ڕێکخستەکانیشی لەساڵی ١٩٣٩ کۆمەڵەکە گۆڕا بۆ پارتی هیوا. لەساڵی ١٩٣٨ کۆمەڵەی برایەتی لە شاری سلێمانی دامەزرا. شریف، السلیمانیة، ٢٠٠٧،١٣٤-١٥٨؛ صابر، ٢٠٠٦،٣٣١-٣٧٢) .

شوێن و پێگەی مافناسان بە بەراورد بەکۆمەڵە و یانە ڕۆشەنبیرییەکانی تر زیاتر بەڕۆشەنی لە دامەزراندنی یانەی سەرکەوتنی کوردان بەدیار دەکەوێ. لە ٩ شوباتی١٩٣٠ مافناسێکی چالاکی خاوەن پێگە و قورسایی ئەم قۆناغە ئەویش مەعروف جیاوکە، دوای بێ ئومێدبوونی لە کاری سیاسی ئاڕاستەی کاری ڕووەو بایەخ و گرنگیدان دەبێت بە بواری ڕۆشەنبیری و هزری، و پەروەردە و فێرکردنی نەوەکانی میللەتەکەی. (سالح، ٢٠١٢،٢٥٩)، ئەوەبوو لەگەڵ هەندێک کەسایەتی کورد لەنێویشیاندا ناوی هەندێ لە هاوپیشەکانی

جیاوک بەدی دەکرێ لەوانەش پارێزەر ئەحمەد موختار بەگی زەهاوی، و پارێزەر عارف بەگی پشدەری، بەمەبەستی دامەزراندنی یانەیێک داواییێکیان پێشکەش بەوەزارەتی ناوخۆ کردووە، وەزارەتیش لە بەرواری ١٩–٢٠ مایسی ١٩٣٠ بەنووسراوی ژمارەی (٦٨٩٥) مۆڵەتی کارکردنی پێداون. لە ٣٠ی مایس یانەکە بەفەرمی لە شاری بەغدا کرایەوە، دواتریش دەستەی کارگێڕی هاتە هەڵبژاردن، کە تێدا شێخ ئیبراهیم حەیدەری مافناس (١٨٦٤–١٩٣١) بەسەرۆکی کۆمەڵە، و مەعروف جیاوکیش وەک باوەڕ پێکراوی یانە، و پارێزەر عارف بەگی پشدەری، وەک ئەندام دەرچوون. (نەریمان، ٩،٢٠٠٦؛ باوەڕ، ٨،٢٠٠٤–٩). لەمەدا بەدیاردەکەوێ کە جیاوک خاوەنی بیرۆکەی دامەزراندنی یانەکە بووە.

بە وردبوونەوە لە ناوی داواکاران، و سەرۆک و دەستەی کارگێڕی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە دەستەبژێری مافناسانی کورد بەچەند هەنگاوێک لەپێشەوەی دەستەبژێرەکانی تری کۆمەڵگای کوردییەوە هاتوون، و درکیان بەگرنگی و بایەخی دامەزراندنی کۆمەڵە و یانە ڕۆشەنبیرییەکان کردووە بۆ بێدارکردنەوەی تاکی کورد، و پەرەدان بەبزاوتی ڕۆشەنبیری و هزری و تەنانەت سیاسیش لە باشووری کوردستان.

بەمەبەستی برەودان بەکار و چالاکیەکانی یانەکە و وکۆکردنەوەی یارمەتی بۆی، جیاوک بەیارمەتی و هاوکاری ئەندامانی تر لەشاری بەغدا بڕی (١٢٥٠) ڕوپیەیان کۆکردۆتەوە. هەروەها جیاوک لەلایەن یانەکەوە خۆبەخشانە نێردراوەتە شاری هەولێر و بڕی (٥٠٠٠) ڕوپیەی کۆکردۆتەوە، لەسەر تێچووی یانەکەش هەڵساوە بە لەچاپدانی هەرسێ پەرتووکی (ئیملای کوردی) کە لەنووسینی خۆی بووە، و (خولاصەیەک لە تاریخی کورد و کوردستان)ی محمد ئەمین زەکی. (ئاوێنەی ژینم، یادداشتەکانی شاکر فەتاح، سەرجەمی بەرهەمی شاکر فتاح،١١٣،٢٠٠٣). و (باربۆ). هەروەها یانەکە سەرپەرشتی لەچاپدانی هەندێ پەرتووک وناملیکەشی کردووە. (حسێن، ٢٩،١٩٩٨).

مایەی ئاماژەیە یانەی سەرکەوتن بووبووە شوێنی گردبوونەوەی ڕۆشەنبیران، و ئەو قوتابیە کوردانەشی کە لە شارەکانی تری کوردستانەوە بۆخوێندن ڕوویان لە بەغدا کردووە. لەم ڕووەوەش جیاوک هۆکارێک بووە بۆ سەرنجڕاکێشانی ڕۆشەنبیران و توێژی خوێندەواری کورد بۆ نزیکبوونەوە و پەیوەندیکردن بە یانەکە، تەنانەت یەکێک لە ڕۆشەنبیرە هەرە دیارەکانی سەر گۆڕەپانی بزاڤی ڕووناکبیری عێراقی وەکو شاعیر جەمیل سدقی زەهاوی کەوتۆتە ژێر کاریگەریی جیاوک، لەم بارەیەوە دەڵێ: "**من کوردم و کوردم خۆش ئەوێ، بەڵام چونکە ئیمان و ئومێدم بە ئتفاقتان زەعیفە هەتا ئێستا نەهاتووم، ئەمجارە لەبەر دڵی برازام و خۆشەویستم مەعرووف جیاووک هاتم**"(نەریمان، ٢٠٠٦، ١٧). بەدووریش نازانرێ هەر ئەو هۆکارەش پاڵی بە(هادی چاوەشلی ١٩١٩-١٩٩٤) نابێت کە هێشتا قوتابی کۆلێژی ماف بووە لە بەغدا لەساڵی (١٩٤٢-١٩٤١) پەیوەندی بەیانەی سەرکەوتنەوە بکات. کاتێکیش لەساڵی ١٩٤٣ دەگاتە قۆناغی چواری کۆلێژ دەبێتە ئەندامی دەستەی کارگێڕیی یانەکە، لەکاتێک وەکو خۆی ئاماژەی پێکردووە لەماوەی خوێندنی لەو شارە لەنێوان ساڵانی (١٩٤٠-١٩٤٤) پەیوەندی بەهیچ پارتێکی سیاسی نەکردووە. (جمباز، ٢٠٠٥، ٦).

جێگای باسە هەر لەسەرەتاوە یانەکە بارەگای سەربەخۆی خۆی نەبووە، وە لەتواناشیدا نەبووە کرێی بارەگا بدات، ئەمەش هۆکاری وەستانی کاروچالاکی یانەکە بووە بۆ ماوەی چەند ساڵێک. (سالح، ٢٠١٢، ٢٧٢-٢٧٤). بەڵام جیاوکماڵەکەی لەشاری بەغدا دەکاتە بارەگای یانەکە، بەجۆرێک ماوەی چواردە ساڵ لە خانووە سێ ژوورەکەی لە گەڕەکی (فەزڵ)ی شاری بەغدا دوو ژووری بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری یانەکە بەبێ بەرامبەر تەرخان کردووە. ئەو پەنجا ڕووپیەشی ڕەتکردۆتەوە کە بڕیار بووە وەک کرێی مانگانەی خانووەکەی پێبدرێ. هەروەها لەڕووی کۆمەکی یانەکەوە جیاوک دەستپێشخەر بووە، لە یەکەم

کۆبوونەوەی دەستەی کارگێڕیی یانەکە بەبڕی (٨٦٠) ڕوپیە باربووی یانەکەی کردووە. جیا لەوانەش ماوەی زیاتر لە بیست ساڵ باوەڕپێکراوی یانەکە بووە. (رەسول، گۆڤاری (ڕۆژنامەنووس)، هەولێر، ژ(٣)، ٢٠٠٥،٣٤).

**٣- یانەی سمکۆی شکاک**

لە٤ی ئازاری ١٩٣٥ دەستەیێک لەقوتابیانی کورد کە ژمارەیان حەوت کەس بوو کە پێنج لەوانە قوتابی کۆلێژی ماف بوون لە بەغدا ئەوانیش (ئیبراهیم ئەحمەد، فازیل تاڵەبانی، عارف تاڵەبانی، بەهادین عارف، و شاکر فەتاح) بوون وەک دەستەی دامەزراندنی ئەو کۆمەڵە ڕۆشەنبیرییە داواییێکیان پێشکەش بەوەزارەتی ناوخۆ کردووە بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی کارکردن. ئیبراهیم ئەحمەد خاوەنی بیرۆکەی پرۆژەکە و بزوێنەری سەرەکی ئەو دەستەیە بووە کە داواکەیان پێشکەش کردووە. خاڵی دووەمی پەیڕەوی یانەکە ئامانجەکەی بەم شێوەیە دیاری کردووە "**بڵاوکردنەوەی ڕووناکبیریی نەتەوەیی کورد و بووژانەوەی گیانی وەرزشی لەنێو لاوانی کوردا و کۆشش بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی رەوشت و ژیانی کۆمەڵایەتی و زانست لە کوردستان بەتایبەتی و لە عێراق بەگشتی**" بەڵام بە بیانۆی پێچەوانەبوونی بەندی دووەمی پەیڕەو و پرۆگرامی یانەکە لەگەڵ برگەی چوارەمی یاسای کۆمەڵە و ڕێکخراوەکان وەزارەتی ناوخۆ مۆڵەتی کارکردنی بەکۆمەڵەکە نەداوە. (مەزهەر، ٢٠٠١، ٣٣١-٣٤٤).

## بابەتی دووەم: ڕۆڵیان لە بواری نووسین لەڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان ١٩٢٥-١٩٣٨

دەستەبژێری مافناسانی کورد بایەخی تایبەتییان بەبواری ڕۆژنامەگەری داوە. لەم لایەنەوە بەئەرکی خۆیان هەڵساون بۆ خزمەتکردن بەڕەوتی ڕۆشەنبیری و هزری، لەکاتێکدا باری ئەدەبی و

ڕۆشەنبیری لەدۆخێکی پێشکەوتوودا نەبووە، لەم بارەیەوە نووسەرێک ئەو سەردەمە **"بە سەردەمی کزی و بێ خزمەتی ئەدەب و زمانی کوردی"و" کشوماتی ساڵانی سییەکان"** ناو دەبات. (بیمار، ١٩٩٨، ١٧٧). حەز و خولیای هەندێکیان فاکتەرێکی کاریگەر بووە بۆ کارکردن لەم بوارە. بۆنموونە مافناسێکی چالاکی وەک ئیبراهیم ئەحمەد پاڵنەری سەرەکی لە چوونی بۆ کۆلێژەی ماف دەگێڕێتەوە بۆ وەرگرتنی جیاوکی دەرکردنی گۆڤارێک. (احمد، گۆڤاری (گەلاوێژی نوێ)، ژمارە(٤)،ساڵی یەکەم، تشرینی دووەم، ١٩٩٧، ٦-٧). ئەوەی کاری ئەم توێژەی ئاسان کردبوو ئەوە بوو بەپێی یاسا هەڵگرانی بڕوانامەی یاسا جیاوکی دەرکردنی ڕۆژنامە و گۆڤاریان پێدرابوو. (ئەحمەد، ٢٠٠٩، ٢٤).

لە ساڵی ١٩٣٣ گۆڤاری (یادگاری لاوان) لە بەغدا بەهاوکاریی هەندێ خوێندکاری کورد لە نێویشیاندا قوتابیانی کۆلێژی ماف (ئیبراهیم ئەحمەد، شاکر فەتاح، و فازڵ ڕەئوف تاڵەبانی) دەرچووە، لەم بارەیەوە ئیبراهیم ئەحمەد دەڵێ: **" بەیارمەتی چەند نووسەرێکی لاوی تر (یادگاری لاوان)م دەرکرد کەوا پێشەکیەکەیی و نزیکەی ١/٤ ی وتار و شیعرەکانی نووسینی خۆمن بە بێ نووسینی ناوم"**.(ئەحمەد، ٢٠٠٩، ٢٤-٢٥). هەروەها شاکر فەتاحیش کە یەکێکە لە پێشەنگ و چالاکانی دەستەبژێری مافناسانی ئەم قۆناغە بۆتە سەرنووسەرو سکرتێری گۆڤارەکە. (سالح، ڕۆژنامەی (ژیان)، ٢٠٠٢،٣٤).

جێگای سەرنجە بەپێچەوانەی ئەو توێژاڵی خوێندەوارانەی کە خوێندنیان لە ئەستەمبوڵ تەواوکردووە و دوای گەڕانەوەیان لە دامودەزگا و وەزارتەکان وەک کارمەندی میری دەستبەکار بوون، پیرەمێرد خۆی بەدوور دەگرێ لەوەرگرتنی کاری میری، و خۆی تەرخان و یەکلا کردۆتەوە بۆ خزمەتکردن بەبواری ئەدەب و ڕۆشەنبیریی میللەتەکەی بەتایبەتی ڕۆژنامەگەری. ئەوە بوو لەدوای مردنی حسێن نازمی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ژیان) لە ٩ مایسی١٩٣٢، پیرەمێرد بۆتە بەڕێوەبەری چاپخانە، و سەرپەرشتی

ڕۆژنامەکەی کردووە تاوەکو وەستانی لەساڵی ١٩٣٨. (بیمار، ١٩٩٨، ١٧٦-١٧٧؛ خەزنەدار، ٢٠٠٥،١٠٠-١٠١).

لە سۆنگەی درککردنی پیرەمێرد بەگرنگی و بایەخی چاپخانە لە گەشەکردنی ڕەوتی پێشکەوتنی ڕۆشەنبیری و فەرهەنگی و بزاڤی هزری لە کوردستان، دوای ئەوەی شارەوانی سلێمانی ئامادە نەبووە مۆڵەتی چاپخانەکەی شارەوانی بۆ نوێ بکاتەوە بۆ چاپکردنی ڕۆژنامەی ژیان، ئەوەش فاکتەرێکی پاڵنەر بووە بۆئەوەی پیرەمێرد چاپخانەییەکی سەربەخۆ بکڕێ، لە ١٦ تشرینی یەکەمی١٩٣٧مۆڵەتی دامەزراندنی چاپخانە تازەکەی وەرگرتووە، بەشێوەییەکی فەرمی ڕۆژنامەکەشی بەناوی خۆیەوە تۆمار کردووە. (ئەمین، ژیان بەتەمەنترین...، ٢٠٠٢،١٥-١٦).

دەتوانین نووسینەکانی دەستەبژێری مافناسان لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بکەینە پێوەری دیاریکردنی ئاستی پێشکەوتی هزری و هۆشیاری ڕۆشەنبیری و سیاسیشیان. بەگوێرەی ئاڕاستەی نووسینەکانیان دابەشیان دەکەین بۆ ئەو بابەتانەی خوارەوە:

**١- بابەتی سیاسی**

بە سەرنجدانێکی ورد لە دۆخی کوردستانی باشوور لەدوای لکاندنی ولایەتی موسڵ بەعێراق لە ساڵی ١٩٢٥، و کارەساتی ڕەشی ٦ ئەیلولی١٩٣٠، حکومەتی عێراق جۆرێک لە سانسۆری خستۆتە سەر ڕۆژنامەکان، هاوکات بەشێوەییەکی گشتی ویستێک لەناو دەستەبژێری ڕۆشەنبیرانی کوردی هەبووە بەئاڕاستەی بایەخدان بەبواری ڕۆشەنبیری و پەروەردەیی ڕەنگ بێ ئەم هۆکارە فاکتەرێک بێ لە کەمی بابەتی سیاسی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو قۆناغە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەسەرنجدان لە نووسینەکانیان دەبینین هۆشیاریی سیاسی لەلای دەستەبژێری مافناسان لەم قۆناغە لە چڵەپۆپەدایە، لەڕێگای تێڕوانینە سیاسییەکانەوە گەرەکیان بووە دۆزی نەتەوەیی و

پرســی سیاســیی گەلەکەیــان بەرەو پێشــەوە بەرن، و بگەیێنــنە ئاســتی وڵاتان .

بۆنموونە پیرەمێرد ڕەخنە لە سانسۆری دەسەڵات دەگرێ لەسەر کــاری ڕۆژنــامەوانی و بەرتەســککردنەوەی ســنووری ئــازادی، دۆخــی کوردســتان دەشــوبهێنێ بە ســەردەمی ســوڵتان عبدالحمیــدی دووەمــی عوسمانی (١٨٧٦-١٩٠٩) لەم بارەیەوە دەنووسێ: **"لەئەوروپا ڕەئیسی وزەرا دەکەن بە....(کاریکاتور)ی دەکێشن توورە نابێ، ئێمە چووینەوە دەوری ســوڵتان عبدالحمید کە وشــەی (خەلــع)ی یاســاغ کــرد"**. (بیمار، ١٩٩٨،١٧٧).

بەڵام لووتکەی هۆشیاریی سیاسی لەلای پیرەمێرد لە هۆنراوەی **"وەفــدی کوردســتان"** ڕەنگــی داوەتەوە. ئەوەبــوو مــاوەیێکی کەم دوای کارەســاتی ڕەشــی ٦ ئەیلــولی١٩٣٠. (بــۆزانینی تەواوی هۆکــارو ڕووداوی کارەساتەکە و هەڵوێستی شاعیر و ڕۆشەنبیرانی کوردستان لە هەمبەریدا بڕوانە: ئەحمەد،٢٠٠٢، ٤٠ -٦٧)، بەدیاریکراوی لە ٦ تشرینی یەکەم کاتێک وەفدێکی شــاری سلێمانی بەســەرۆکایەتی تۆفیــق بەگــی موتەســەڕیفی شــارەکە بەبــۆنەی گەڕانەوەی لە لەنــدەن ســەردانی شــا فەیســەڵی یەکەم دەکەن، ئەم ســەردانەش پیرەمێــردی تــوورەکردووە بــۆتە ســەرچاوەی ئیلهــامی هۆنراوەی **(وەفدی کوردستان)** کەتێدا دەڵێ:

**وەفدی کوردستان میللەت فرۆشان**

**هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان** (ئاشنا، ٢٠٠١، ١٦٠).

هەروەها لەپێشەکی گۆڤاری یادگاری لاوان کە لە لایەن ئیبراهیم ئەحمەد نووسراوە **"بۆنی بەیانێکی سیاسی لێ دێت"**، کە لە قاڵب و جوغزێکی ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتی داڕێژراوە. لاوانی بەداینەمۆ و هێزێکی کارگەری نێو کۆمەڵگا هەژمار کردووە، هانی گەنجانی داوە تــاوەکو پــێگەی خۆیــان لەنــاو ڕیزەکــانی جــووڵانەوەی نەتەوەیــی و نیشــتیمانی دیــاری بــکەن، و ببــنە هەڵگــری بەیــداخی پێشــکەوتن و ڕوونــاککردنەوەی شــەوە دەیجوورەکــان. و داواشــی کــردووە منداڵانی

کورد **"هەر لە سەرەتاوە زمانیان بە کوردی بپشکوێ"**. (کەریم، ١٩٧٨،٢٨-٢٩).

هەروەها لەژمارە یەکی گۆڤاری (ڕووناکی) (شیت مستەفا ١٩١٣-١٩٧٣)ی مافناس (لەساڵی١٩١٣ لە هەولێر لەدایک بووە. دەرچووی کۆلێژی مافی زانکۆی بەغدایە لە١٩٣٤. لەچەند شارێکی کوردستان کاری دادوەری کردووە. لەساڵی١٩٧٣ کۆچی دوایی کردووە. (موکریانی، ٢٠٠١، ٢٢). کە هاوکات مدیر مسؤولی گۆڤارەکەش بووە، بابەتێکی بەناوی **"وحی قومیت و تجدد اجتماعی"** بڵاوکردۆتەوە. کە تێدا تیشک دەخاتە سەر گرنگی و بایەخی بیری نەتەوایەتی لەژیانی میللەتان، لەدیدی ئەودا ئەگەر ڕۆحی قوربانی و لایەنی نەتەوەیی بەهێز نەکرێ هیچ میللەتێک ناتوانێ بەرگری لە بوون و مانەوەی خۆی بکات، و هەموو **کات"بە ذلی و اسارەتی ئەژی"**. (وەرگیراوە لە: موکریانی، ٢٠٠١).

### ٢- بابەتی ئەدەبی

دەستەبژێری مافناسان ڕۆڵێکی بەرچاویان گێڕاوە لەخزمەتکردن بەبواری هونەرەکانی ئەدەبی کوردی بەهەموو لقەکانیەوە لەوانەش، شیعر و چیرۆک و پەخشان و پەندی پێشینان و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی. بۆنموونە پیرەمێرد بەهۆی شارەزابوونی لە زمانەکانی فارسی و ئاشنابوون بەئەدەبی تورکی، هەندێ شارەزایی لەبزووتنەوە ئەدەبییەکانی ئەوروپا پەیدا کردووە بەتایبەتی ڕێبازی ڕۆمانتیکی. (خەزنەدار، ٢٠٠٥، ١٠٢). لە بواری زمانەوانیش هەوڵی دەرخستنی ڕەگوڕیشەی زمانی کوردی داوە، لەڕێگای هێنانەوەی بەڵگە و نیشانەی دروست، سەربەخۆیی و کۆنیەتی زمانی نەتەوەکەی ساغ کردۆتەوە، هاوکات لە فاکتەرەکانی فەرامۆشکردن و بێ خزمەتی زمانەکەی کۆڵیوەتەوە. (وەرگیراوە لە: ساڵح، ڕۆژنامەی (ژیان)، ٢٠٠٥، ١٦).

جیا لەوەش پیرەمێرد ڕچەشکێن بووە لە بوارەکانی تری هونەرەکانی ئەدەب. بۆ نموونە تەنیا لە ژمارەکانی (٣٢١-٤٠٠)ی

ڕۆژنامەی ژیان (١٩) شیعر و، چیرۆکی دیرۆکی (مەم وزین)ی بە ١٤ بەش و (دوانزە سوارەی مەریوان)ی بە (٩) بەش بڵاوکردۆتەوە، زیاد لەوەش یەکەم وتار نووسی ڕۆژنامەکە بووە بە جۆرێک لەو ژمارانەی کەباس کران لە کۆی (٦١) وتار (٥٤)یانی نووسیوە.(وەرگیراوە لە:ساڵح، ڕۆژنامەی (ژیان)، ١١،٢٠٠٥) . لەوانەیە وتاری" **ادیسون کێ بو چی کرد؟**" جێگای سەرنج و تێرامان بێ، چونکە لووتکەی شارەزایی و بەئاگایی ئەو زاتە لەدونیای دەرەوە دەردەخا. تەنانەت ئاگاداری ئەوەش بووە ئەدیسۆن" **امسال لە عمری ٨٥ساڵیدا وفاتی کرد**". هەروەها ئەدیسۆنی بە "**خادمی بەشەریەت**" ناساندووە ٠ وە لەڕێگای ئەو وتارەوە خوێنەری کوردی زانیویەتی ئەو زانایە "**رقی لە چ بووە**" و" **دوا رۆژی چۆن دیوە**". (ژیان)، ژ(٣٢٧) ،٢٣حوزەیران ١٩٣٢؛ ژ(٣٢٩)٧، تموز ١٩٣٢. وەرگیراوە لە: ساڵح، ڕۆژنامەی (ژیان)، ٢٠٠٥).

لە بواری نووسینی (پەخشان)یش شاکر فەتاح جێی دەستی دیارە. بۆ نموونە لەپەخشانی "**هاوارە وطنە خۆشەویستەکەمان**" کە لەشێوەی گفتوگۆیێکی کراوەی نێوان دایک و کوڕێکە بەشێوازێکی ئەدەبی جوان دارێژراوە. بنچینەی بیرۆکەکەش لە بایەخدان بەزانست و مەعریفە سەرچاوەی گرتووە، بەدەرمانی دەردی کۆمەڵێک لە کێشەکانی کۆمەڵگای کوردی ئەوکات لێکدراوەتەوە. (ژیان)، ژ(٥٢)، ٣، شباط ١٩٢٧. وەرگیراوە لە: ساڵح، ڕۆژنامەی (ژیان)، ٢٠٠٢). هەروەها پەخشانی "**سکاڵای پیرەمێردێکی بەختیار**" ی بە "**کوردییەکی پەتی و جوانی بێ هاوتاوە نوسیوێتەوە**" (کەریم، ٥٥،١٩٧٨).

### ٣- بابەتی ئابووری- کۆمەڵایەتی

بە بەراورد بە بوارەکانی تری دەستەبژێری مافناسان کەمتر لایان لەبواری ئابووری کردۆتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شەنوکەوی هەندێ پرسی ئابووریشیان کردووە سەرنج و تێبینیی خۆشیان خستۆتەڕوو. هەرچی بواری کۆمەڵایەتیشە کۆمەڵێک دید و تێڕوانین و چارەسەری

تەندروستیان بۆ هەندێ دیاردەی کۆمەڵایەتیی نێو کۆمەڵگای کوردی هەبووە بوێرانە بیروڕای خۆیان خستۆتەڕوو، کە ڕەنگ بێ دەستبردن بۆ هەندێ پرسی کۆمەڵایەتی ناو کۆمەڵگای کوردی لەو سەروبەندەدا کارێکی سانا نەبووبێ بەڵام ئەوان سڵیان لە کۆسپ و لەمپەر و ئاستەنگەکان نەکردۆتەوە. ڕاشکاوانە بیروڕای خۆیان دەربڕیوە. بۆنموونە شیت مستەفا لەبابەتی "**بو کورو کجەکانی خومان**" پەسنی خووڕەوشتی بەرز و چاکی کچانی سەردەمەکانی پێشوو دەکات، لە هەمان کاتیشدا ڕەوشی ئافرەتانی کورد دەداتە بەر نووشتی ڕەخنە و کچانی ئەو سەردەمی بە "**ترسنۆک**" وەسف کردووە، و گلەیی ئەوەیان لێدەکات کە وەک پێویست ڕێز لە کات ناگرن، زیاتر کاتەکانی خۆیان "**بەخورایی رادەبویرن وەکو جاران نەماون**". (ڕوناکی) ژ(٢)، ساڵی یەکەم، پێنج شەمە،٣١ تشرینی یەکەم ،١١،١٩٣٥. وەرگیراوە لە: موکریانی، ٢٠٠١).

لە نووسینێکی تردا هەمان نووسەر لە دەردێکی کوشندەی سییەکانی سەدەی ڕابردوو دواوە کە "**بێ ئیشی**" بووە، لە نووسینەکەدا دەردەکەوێ ناوبراو ئاگاداری سەرژمێری ڕێژەی بێکاری بووە لە هەندێ وڵاتانی ئەورووپی، بەتایبەتی ئینگلتەرا و ئەڵمانیا. باسی لەوە کردووە کە ئەو وڵاتانە زۆر بەرشتی کاریان کردووە بۆ نەهێشتنی ئەو دیاردە کۆمەڵایەتیە. هەروەها تێبینی ئەوەی کردووە کە ئەو هەوڵانە چارەسەری کاتین. پێشی وابووە چارەسەری ڕیشەیی بۆ ئەو نەخۆشییە گەورەیە نەدۆزراوەتەوە، هەروەها هۆکاری سەرەکی بێکاری لە زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان نابینێ، بەڵکو زۆربوونی "**الاتی میکانیکی**" **بە سببیکی جوهری**" دەبینێ لە زیادبوونی ئەم "**بەڵا گەورە**"یە هەروەها چارەسەری ئەم دیاردەیە لە کەمکردنەوەی هەندێ ئامێرەکان دەدۆزێتەوە. (ڕوناکی)، هەولێر، ژ(١)، ساڵی یەکەم، پێنج شەمە،٢٤ تشرینی یەکەم، ١٩٣٥، ١٠. وەرگیراوە لە: موکریانی، ٢٠٠١).

پیرەمێردیش لە نووسینەکانیدا لە ڕۆژنامەی ژیان بایەخی بەئافرەت و پێگەی ئەو توێژە گرنگەی کۆمەڵگا داوە. داواشی کردووە

بەهۆی خوێندن و خوێندەواریەوە بێنە مەیدان، لەڕێگای خستنەوەی وەچەیێکی چاک خزمەت بەمیللەتی خۆیان بکەن. بڕواشی وابووە بە بێ پەروەردەکردنی نەوەییکی چاک و تەندروست نیشتیمان پێش ناکەوێ وەک دەڵێ:

**تا سویە ی کچانمان بەرز نەبی لە ادراکا**

**اولادی چاک پێ ناگا و وطن تەرقی ناکا**

(ژیـــان) ژ(٣٢٤)، ٢حـــوزەیران١٩٣٢. وەرگیـــراوە لە: ســـاڵح، ڕۆژنـــامەی (ژیان)،٢٠٠٥).

لە وتاری "**موقعی افرەت لە المانیادا**" پەسنی ئافرەتانی ئەڵمانی کردووە، و پێیوابووە ئەوان لەپیاوانی وڵاتی خۆیان زیاتر بەگوڕترن. تەنانەت" **لەم جنکی جیهانیەدا بە قدر پیاو خذمتی ولاتەکەی کردووە**" دواتر دۆخی ئافرەتانی ئەڵمانیا و کوردستانی بەراورد کردووە وای بۆ چـووە کە ئافرەتـانی ئەڵمـان وەک کوردسـتان قورسـاییان بەسـەر پیاوەکانیانەوە نییە، چونکە ئافرەتی ئەڵمانی "**نانی خوی بەبازوی خوی پیـدا اکـات**". (ژیـان) ژ، (٣٥١)، ١٢ کـانونی دووەم١٩٣٣. وەرگیـراوە لە: سـاڵح، ڕۆژنامەی (ژیان)، ٢٠٠٥).

ئەگەرچی پیرەمێرد زیاتر وەک ئەدیب و ڕۆشـەنبیرێکی سـەردەمی خۆی بەدیارکەوتووە بەڵام خاوەنی ئایدیا و دیدی ئابووریی بەهێزە . لەڕاستیدا دید و تیڕوانینە ئابوورییەکانی پیرەمێرد لە وتاری "**بوچ فیری پـارە پەیـدا کـردن نەبـین؟**" زیـاتر بەدیـار دەکەوێ، کە بـاس لە هاوینەهەوارەکانی ناوچەی پێنجوێن دەکات کە چۆن لە ساڵی پێشوو لەئەنجامی سەردانی شا فەیسەڵ بۆ ئەو شوێنە بایەخی پێدراوە. بۆیە داوا لە پـارەدار و دەوڵەمەنـدەکانی کوردسـتان دەکـات لەڕێگـای دەسـتەبەرکردنی هەنـدێ خزمەتگـوزاریی سـادە، بـایەخی زیـاتر بەو شـوێنانە بـدەن. بەگـوێرەی ڕای ئەویـش ئەوا "**لەریـدا هـیە زور کـس لەعـراق و سـوریەوە بین بۆ دیدەنی و نشـیمنی او شـوینە**". هەروەهـا

دووپاتیشی دەکاتەوە کە ئەو تەنیا پێنچوێنی مەبەست نییە بەڵکو شوێنە گەشتیارەکانی تریش ئەگەر ڕێگای هاتوچۆی گونجاویان بۆ بچێ "**همو فریشتەی اسمان سویند اخون کە او أو و هوا و میوەیە نەک لە لبنان لە عراق و سوریە نیە**". (ژیان) ژ(٣٦٧)، ١٥ حوزەیران ١٩٣٣. وەرگیراوە لە: سالح، ڕۆژنامەی، (ژیان)،٢٠٠٥). لە وتاری "**کەیشتە تینمان وا هاوار ئەکەین**" هاواری خۆی لەدۆخی خراپی دانیشتوانی گوند و دێهاتەکان دەردەبڕێ داوا دەکات فریای دۆخی خراپی"**لادی یی داماو و زراعی کار ناتەواو بکەون...**". مەترسی خۆشی لەئاکام و دەرئەنجامە مەترسیدارەکانی دیاردەی هەژاری ناشارێتەوە، پێشی وایە لە ئەگەری چارەسەر نەکردنی سەردەکێشێ بۆ نەمانی باوەڕ و ئاینی بابای هەژار وەک دەڵێ: "**انسان اوندە فەقیر بو ایمانیشی نامینی لی ي بسینی (کاد الفقر أن يكون كفرا)**".(ژیان)، ژ(٣٧١)، ٢٧ تموز١٩٣٣. وەرگیراوە لە: سالح، ڕۆژنامەی (ژیان)، ٢٠٠٥).

## بابەتی سێیەم: بەرهەمەکانی دەستەبژێری مافناسانی کورد ١٩٢٥- ١٩٣٨

دەستەبژێری مافناسان وەک توێژێکی زیندووی کۆمەڵگای کوردی ڕۆڵی دیاریان هەبووە، لە نووسینی پەرتووک لە بوارە جۆر بەجۆرەکانی وەک" ئەدەبی، ، کۆمەلایەتی، و سیاسی"، گەرەکیان بووە لەو کەناڵەوە خزمەت بەگەلەکەی خۆیان بکەن.

کە باس دێتە سەر بەرهەمەکانی دەستەبژێری مافناسانی کورد ناوی مەعروف جیاوک لە پێشەنگەکانە. لە ساڵی ١٩٢٥ لەژێر ناوی (جیاوک الکردي) کتێبی( القضیە الكردية- پرسی کورد)ی لەچاپ داوە کە (١٠٩) لاپەڕەیە. وەکو لە پێشەکی ئاماژەی پێکردووە لەسەر داوای هەندێ لەدۆست و هاوڕێکانی ئەو وتارانەی کۆکردۆتەوە کە لە ڕۆژنامەکانی بەغدا بڵاوی کردبوونەوە. تێدا بابەتەکانی کورد و سنووری عێراق و پرسی موسڵ پانتاییێکی گەورەیان لەو پەرتووکە

داگیـر کـردووە. پاشـان هەنـدێ پـرس و بـابەتی سیاسـی تـایبەت بە مێژووی کوردی رووژاندووە. (الکردي، ١٩٢٥، ١-١٠٩). لە هەڵسـەنگاندنی پەرتووکەکە توێژەرێک بەباشترین سەرچاوەی دادەنێ لەمەڕ مێژووی کوردسـتانی باشـوور لە ناوەڕاسـتی سـەدەی (٢٠). (ڕەسـول، ڕۆڵـی رامیاری...، ٢٠٠٥، ٣٧). تەنیا خستنە پاڵی نازناوی (الکردي) لەپاڵ ناوەکەی لەو ڕۆژگارە بەڵگەییەکی حاشا هەڵنەگری زیندوویێتی هەستی نیشتیمانی و نەتەوایەتی نووسەرەکەیەتی.

جیاوک لە ساڵی١٩٣٧، پەرتووکێکی تری بڵاوکردۆتەوە بەناوی (نیابتي في ١٩٢٨-١٩٣٠) کە تێدا باس لەکار و چالاکی و گفتوگۆکانی دەکات لەماوەی ئەندامیەتی وەک نوێنەری شاری هەولێر لەنێوان (١٩٢٨-١٩٣٠) لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق. (جیاوک، ١٩٣٧،٣-٢٤٠). دەکرێ وەک سەرچاوەییێکی ڕەسەن و ناوازە و دەگمەن سەیر بکرێ بۆ زۆرێک لەو پرسانەی کە لەئەنجومەنی نوێنەران گەنگەشە کراون لەماوەی ئاماژە بۆکراو. هەروەها جیاوک جیا لە بواری سیاسی، لە هەندێ بواری تری زمانەوانی و هونەرەکانی ئەدەب بەرهەمی هەبووە، لەم ڕووەوە خەمـی زمـان و ڕێنووسـی کـوردیش بـووە. ئەمەش دەرخەری ئەو ڕاستیەیە کە دەستەبژێری مافناسان بەهرە و تواناکانیان تەنها لە بوارێکدا قەتیس نەبووە، بۆنموونە لەساڵی١٩٣٠ پەرتووکی (ئیملای کوردی) نووسیوە کە تێدا باسی چۆنیەتی نووسینی زمانی کوردی کردووە. پەسنی نووسینی کوردی دەکات بەپیتی عەرەبی نەک لاتینی، داواشی لە نووسەرانی کورد کردووە هەر بەو پیتە بنووسن. (جیاوک،١٩٣٠. وەرگیراوە لە: نەریمان، ١٩٧٧،٢٦). هەر دەربارەی کێشـەی نووسینی کوردی (ساتح ئەلحوسەری ١٨٧٩-١٩٦٨) پرس و ڕاوێژی بەهەندێ شارەزای کوردی ئەم بوارە کردووە، یەکێک لەوانەش جیاوک بووە. (سالح،٢٠١٢، ٣٠٥-٣٠٦). بەدووریش نازانرێ هۆکاری ئەو پرس و ڕاوێژ پێکردنە بەجیاوک هەر بۆ نووسینی ئەو پەرتووکە بگەڕێتەوە، ئەگینا ئەو پسپۆڕی بواری زمان نەبووە.

لە بواری هونەرەکانی ئەدەب لە دوای ئیسماعیل حەقي شاوەیس جیاوک دووەم ڕۆشەنبیری کورد بووە کە پەند و قسەی نەستەقی کوردی لە چوارچێوەی پەرتووکێک کۆکردۆتەوە بەناوی (هەزار بێژو پەند). (بیمار، ١٩٩٨، ٢٢٨)، لە ساڵی ١٩٣٨ لە بەغدا بڵاوکراوەتەوە. کە وەک لە ناونیشانەکەی دیارە هەزار پەند و قسەی نەستەق و پێشینانی کوردی لەدوو تویی (٩١) لاپەڕەدا کۆکردۆتەوە بەپێی پیتەکانی هیجا پەندەکانی ڕیزبەند کردووە. (جیاوک، هەزار بیژو پەند، ١٩٣٨، وەرگیراوە لە: نەریمان، ٥١،١٩٧٧).

لە سییەکانی سەدەی (٢٠) لە سەروبەندی برەوسەندنی، هەردوو بیرۆکەی فاشیەت و نازیەت، و دەستدرێژییەکانیان بۆسەر ماف و ئازادییەکانی گەلانی تر. و چەکەرەکردنی هزری ڕەگەزپەرستی و بەپیرۆزگرتنی ڕەگەز، و مۆرکردنی ڕێکەوتنامەی سەعد ئاباد لەساڵی ١٩٣٧ وەک هەوڵێکی هەرێمایەتی بۆ خەفەکردنی دەنگی کورد و توندوتۆڵکردنی سنوورەکان. لەو ساڵەدا ئیبراهیم ئەحمەد نۆبەرەی بەرهەمی سیاسی خۆی لەشێوەی نامیلکەییێک بەناوی (الاکراد والعرب)ی بڵاوکردەوە. تێبینی ئەوە کراوە ئەو مافناسە زوو درکی بەمەترسی و ئاسەوار و کاریگەرییە خراپەکانی دەمارگیری نەتەوەیی و ڕەگەز پەرستی کردبێ. بۆیە داوای لە ڕۆشەن فکرانی هەردوو نەتەوەی کورد و عەرەب کردووە خۆ بەدوور بگرن لە "**دەمارگیری نەتەوەیی کوێرانە**" هەروەها نووسەر دژایەتی و بەگژدا چوونەوەی بیروڕا ڕەگەز پەرستیەکانی بە پێویستێکی گرنگی ئەو قۆناغە زانیوە، و پێدەچێت نووسەر قەناعەتێکی ڕەهای بە(برایەتی کورد و عەرەب) هەبووبێ و پانتاییێکی گەورەی نووسینەکەی لەم چوارچێوەدا دەخولێتەوە بۆیەش نووسەر جەختی لەوە کردۆتەوە کە گەلی کورد ، لەڕێگای هاوکاری و لێک تێگەیشتن لەگەڵ گەلانی تر هەوڵدەدات ژیانێکی شایستە و ئازادانە بۆ خۆی فەراهەم بکات و بەشدار بێت لە دروستکردنی ژیاری جیهانی نوێ هەروەک چۆن لە سەردەمەکانی

پێشوو جێ نەخشی دیار بووە لە خزمەتکردن بەژیار و شارستانیەتی ئیسلامی. بەپێی بیروڕای نووسەریش بە بەراورد بەگەلانی تری ناوچەکە، پەیوەندییەکانی نێوان کورد و عەرەب هەر لە سەرەتای هاتنی ئاینی ئیسلام باشتر بووە. نووسەر پێداگیری لەسەر داڕشتنی برایەتییەکی پتەو دەکاتەوە لەنێوان هەردوو گەلی کورد و عەرەب بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پیلان و پڕۆژەکانی وڵاتانی ئیستعماری لە ناوچەکە. جیا لەو بابەتەش بەکورتی باسی لە تاوانەکانی کەمالییەکان کردووە بەرامبەر بەگەلی کورد، وە ڕاستی و ڕەوایەتی شۆڕشە کوردییەکانی ئەو ماوەیەی سەلماندووە بەتایبەتی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران ١٩٢٥، بەرپەرچی نەیارانی شۆڕشەکانیشی داوەتەوە. ئەگەرچی ئەم نامیلکەیە ناوی نووسەرەکەی بەسەرەوە نەبووە و بەدەستەواژەی خوازراوی **(فريق من شبان الكرد)** دەرچووە. (احمد، ٢٠٠٤،١-٣٤). بەڵام لەسەر نووسینی ئەم بەرهەمە نووسەر دووچاری نارەحەتی و تەنانەت ڕووبەڕووی دادگاش بۆتەوە. هەروەها دەرچوونی نامیلکەکە کاربەدەستانی تورکیاشی قەڵس کردووە، بەرادەییێک هاوزەمان لەگەڵ دەرچوونی لەسەر داوای باڵیۆزخانەی تورکیا لە بەغدا نامیلکەکە کۆکراوەتەوە و سووتێنراوە. (هاوار، ٢٠٠٧، ٣٥٩).

لە دەمی باسکردنی بەرهەمی دەستەبژێری مافناسانی کورد لە بواری ئەدەبی و بەتایبەتی ئەدەبی منداڵان، و لە بوارەکانی فەرهەنگ وەرگێڕان و گەشتنامە و بەسەرهات، لەپێش هەموویانەوە ناوی شاکر فەتاح دێ ، بەجۆرێک ناوبراو کە هێشا خوێندکاری کۆلێژی ماف بووە خاوەنی کۆمەڵێک بەرهەم بووە لەو بوارانەی کە باس کران. بۆنموونە نووسەر پێشەنگ بووە لە بواری ئەدەبی منداڵان وە بەشداری کاریگەریان هەبووە لە دانانی بنچینەی ئەدەبی منداڵان لەناو کوردا، ئەمەش لەڕێگای نووسین وەرگێڕان لەم بوارەدا لەوانەش چیرۆک و ئامۆژگاری منداڵان کە ئامانج لێی وەک خۆی ئاماژەی پێکردووە " **پێگەیاندنی منالانی کوردە، لەسەر بنچینەیەکی زانست و فەن و گیانی**

**نیشـــتمانپەروەری**". (شـــاکر فتـــاح، ٢٠٠٤،٣٤٦). لە مەیـــدانی نووســـینی فەرهەنگـــیش لە ســـاڵی ١٩٣٤ (فەرهەنگـــۆک)ی بەچـــاپ گەیانـــدووە کە فەرهەنگێکـی ئینگلیـزی کـوردی و کـوردی ئینگلیـزیە. (لەبـواری چیـرۆکیش یەکەم بەرهەمـی وەرگێـڕاوی لە ١٩٣٣ بەنـاوی (خـانووی تـازە) بڵاوکـردەوە، کە نامیلکەیێکی (٢٠) لاپەڕەیە لەنووسینی کامل گەیلانی. دووەم هەوڵیشـی بریتی بـووە لەنووسینی پەرتووکی (چیرۆک بۆمنداڵان) کە چەند چیرۆکێکی وێنەداری بۆ منداڵان لەخۆگرتووە لە ساڵی١٩٣٥ چاپکراوە. نەریمان، ١٩٧٧، ٣٥-٤٤).

شـــاکر فەتـــاحیش لە بـــواری ئەدەبـــی گەشـــتنامە کە هەنـــدێک خستوویانەتە چوارچێوەی ئەدەبی بەسـەرهات (سـیرە) . (نەریمـان، ١٩٧٧، ٢٧٠)، لە پێشـەنگەکانی نووسـەرانی کـوردی دێ. بـایەخ و گرنگـی ئەو گەشـــتنامە و بەســـەرهات و یادنامـــانە لەوەدایە کە نووســـەر زۆر بەســـەلیقەییێکی وردەوە ڕۆژانە زانیارییەکـــانی دەربـــارەی ســـنووری جوگرافی، مێژووی ناوچەکە و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی و نـاوداران و کـار و پیشـەی دانیشـتوان و تەنـانەت هەندێ جار کەش و هەوای ئەو ناوچانەشی باس کردووە، کە سەردانی کردوون، لەسەر بەرگی هەموو پەرتووکە گەشت نامەکانیشدا نووسیویە: "**دیاری یە بۆ لاوانی کورد**". (سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح، ٢٠٠٣، ٢٩-٢٤٧). ئەمەش نیشـانە و بەڵگەی بایەخی نووسەرە بەو توێژە گرنگەی نەتەوەکەی. هەروەهـا بەشێک لە یاداشـــتەکانی لەژێـــر نـــاوی (یادنـــامە) تۆمـــارکردووە کە بـــریتین لە یـادەوەری ئەو گەشـتانەی لەنێوان سـاڵانی (١٩٣٠-١٩٣٢) بۆ دەرەوەی وڵات ئەنجامی داون. (سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح، ٢٠٠٤ ،١٢٦).

پیرەمێردیش شوێن دەستی دیارە لەبواری نووسینی هونەرەکانی ئەدەب، لەوانەش شـــیعر، و چیـــرۆک. لە ســـاڵی (١٩٣٥) هەڵدەســـتێ بەکۆکردنەوەی داستانی مەم و زین لەسەر شێوەی تێکەڵەییێک شیعر و پەخشان، دوای ئەوەی لەساڵی١٩٣٣ بەئەڵقە لە ژمارەکانی (٣٦٦-٣٧٦) ڕۆژنـامەی ژیـان بڵاویکردبوونەوە، لەدوو تـوێی نـامیلکەییێکی بچـووک لەچـاپی داونەتەوە . (عـارف، ١٩٨٧،٨٠). لە سـاڵی١٩٣٥ داسـتانی دوانـزە

سوارەی مەریوانی بەشیعر بڵاوکردۆتەوە. هەر لەهەمان ساڵدا بەرگی یەکەمی دیوانی مەولەوی بەناوی (ئەسڵ و ڕۆح)، لە هەورامییەوە بەهۆنراوە کردووە بەسۆرانی. (نەریمان، ١٩٧٧،٤٢).

**تەوەری سێیەم**
**قۆناغێکی نوێ لە ڕۆڵی ڕۆشەنبیری و هزریی دەستەبژێری مافناسانی کورد ١٩٣٩–١٩٥٨**

**بابەتی یەکەم : ڕۆڵی دەستەبژێری مافناسانی کورد لە پێشخستنی ژیانی ڕۆشەنبیری و هزری ١٩٣٩– ١٩٥٨**

ئەوەی تێبینی کراوە لەو قۆناغەدا دەستەبژێری مافناسانی کورد هەم لەڕووی چەندێتی (ژمارە) زۆر دەبن، هەم لەڕووی چۆنیەتی بەهۆی زیادبوونی جموجووڵ و چالاکیان کاریگەریان زیاتر دەبێ، لەم قۆناغە گۆڕانکاریی گەورە بەسەر هزر و بیرکردنەوەی دەستەبژێری مافناساندا هاتووە، و جێی دەستیان لەسەر گەشەسەندنی بزاڤی ڕۆشەنبیری و هزری زۆر بەڕوونی بەدیار دەکەوێ. بێگومان کاریگەری ئەو بارودۆخە گشتییەی کە کوردستان و عێراق و ناوچەکەی گرتبۆوە ڕۆڵیان هەبووە لەسەر دیاریکردنی ئاڕاستەی هزری بەشێک لەدەستەبژێری مافناسان، لەوانە ڕووداوەکانی جەنگی دووەمی جیهانی (١٩٣٩–١٩٤٥) و سەرکەوتنی بەرەی هاوپەیمانان بەسەر نازیەت و فاشیەت، ئەم ڕووداوانەش هاوکات بوون لەگەڵ هەڵکشان و پەرەسەندنی ئاڕاستەی چەپڕەوی، و دژایەتیکردنی سیاسەتی داگیرکاری و ئیستعمار لە عێراق و وڵاتانی تری ناوچەکە. (فاتح رسول، ٢٠٠٥، ٣١٣-٣١٦). لەم ڕووەوە (جەرجیس فەتحوڵا ١٩٢٣–٢٠٠٦)ی مافناس ئاماژە بەوە دەکات لە ساڵانی١٩٣٩–١٩٤٠ لاوانی کورد بەشێوەییێکی گشتی ڕوو لەئاڕاستەی چەپڕەوی بوونە. (فتح الله، ٢٠٠١، ٢١-٢٢).

لەم قۆناغەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە بەشێک لە دەستەبژێری مافناسان بەئاراستەی بیری چەپڕەوی ڕۆیشتوون. بۆنموونە لە گەرمەی ڕووداو و پەرەسەندنەکانی جەنگ فایق هۆشیار وتارێکی حەوت لاپەڕەیی لەسەر ژیان و تێکۆشانی لینین نووسیوە بە"**پیاوی ناودار، و سەرۆکی بێهاوتا** "ی وەسف کردووە. (گۆفاری گەلاوێژ ، (بەغدا)، ژمارە(٥-٦)،ساڵی١٩٤٢. وەرگیراوە لە: تۆفیق (و) کەریم،٢٠٠٤، ١٦١-١٦٣). (نافیع یونس ١٩٢٩-١٩٦٣) یش، کە هێشتا قوتابی دوا قۆناغی کۆلێژی ماف بووە لەساڵی ١٩٤٦بەشداربووە لە دەرکردنی ڕۆژنامەی (ئازادی) زمانحاڵی حزبی شیوعیی عێراق. (المالح، ٢٠٠٨، ٢١).

لەڕووی هزری سیاسیشەوە جیا لە (عەونی یوسف ١٩٠٨-١٩٨٨) کە دەرچووی کۆلێژی ماف بووە، بەشێک لەقوتابیانی کۆلێژی مافی زانکۆی بەغدا لەپێشەنگی هەمووشیاندا (ساڵح حەیدەری کە لەنێوان ساڵانی١٩٤٣-١٩٤٤ قوتابی کۆلێژی ماف بووە). (لە ساڵی١٩٢٢ لە هەولێر لەدایک بووە، لەساڵی ١٩٤٠ بۆتە خوێندکاری کۆلێژی مافی بەغدا. دوای چەند هەفتەیێک وازی لە خوێندنی ماف هێناوە. لەساڵی١٩٤٣-١٩٤٤ دەبێتەوە خوێندکاری ماف. بەهۆی دەستگیر کردن و چاودێریەوە وازی لەخوێندن هێناوە و لەساڵی ١٩٦٠-١٩٦١ کۆلێژی ناوبراوی تەواو کردووە. لە ٢٠٠١، کۆچی دوایی کردووە). (گۆمەتاڵی، ٢٠١٢، ٢٩-٢٤٠)، ڕۆڵی گرنگ و پێشەنگیان هەبووە لەناو ڕێکخستنەکانی ئەو کۆمەڵە و ڕێکخراوانەی کە ئاراستەیێکی چەپڕەوانەیان هەبووە لەوانەش کۆمەڵەی میللەت ١٩٤٣ و یەکێتی تێکۆشین ١٩٤٣-١٩٤٤، و هەردوو پارتی شۆڕش و ڕزگاری ١٩٤٥-١٩٤٤. (لەوانەش: ساڵح حەیدەری، ڕەشید عبدالقادر ، عەونی یوسف، جەوهەر حسێن مەلا دزەیی. (مختارات من مذكرات صالح الحيدري، ٢٠٠٤، ٣٥٧-٤١١). هەروەها دەستەبژێری مافناسان ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لە دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کورد لە ١٦ ئابی ١٩٤٦. (لە کۆنگرەی یەکەمی پارتەکە لەشاری بەغدا هەر یەک لە مافناسان ڕەشید عبدالقادر، عەونی یوسف، ڕەشید باجەڵان، حمزە عبدالله، وەک ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی دەستنیشان

کـــران. شـــریف، ٢٠٠٧، ٢٢٤-٢٢٥). بۆنمـــوونە مافناســـێکی وەک (حمـــزە عبداللـە ١٩١٤-١٩٩٨). (لە سـاڵی ١٩١٤ لە باشـقەڵا لە شـاری وان لەدایـک بـووە. دەرچـووی کـۆلێژی مـافی زانکـۆی بەغـدایە لە ١٩٣٥. دوای هـاتنی بـۆ باشـووری کوردستان لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو لەگەڵ مەلا مستەفا تێکەڵ کاری حزبایەتی بـووە. لە سـاڵی ١٩٥٩ بەیەکجـاری وازی لەکـاری حزبـی هێنـاوە. لەسـاڵی ١٩٩٨ لەشـاری سـلێمانی کـۆچی دوایـی کـردووە. (حەیـدەری و (ئەوانیتـر)، ٢٠١٤ ، ٦١٣-٦٣٧)، وەک چەپڕەوێـک لە بـواری کـرداری ڕۆڵــی دیـاری هەبـووە لە دامەزرانـدنی پـارتەکە. لە کـۆنگرەی یەکەم دەبێـتە سـکرتێر، تـاوەکو دوورخستنەوەی لە ڕیزەکانی لەساڵی١٩٥٣ کاروباری پارتەکەی ڕایی کردووە .(اسسرد، ٢٠٠٨، ٢٤-٤٥).

جیـــا لەوانەش دەســـتەبژێری مافناســـان بـــوونەتە هەوێنـــی گۆڕانکـارییێکی چلۆنـایەتیی گەورە لەژیـانی پارتـایەتی، زادەی بـازدانێکی نەوعـی گەورەش بـوونە لەگەشـەکردنی هـزری سیاسـیی کـوردی. بـۆ نموونە لەدەمی بەستنی کۆنگرەی سێیەمی پارتی دیموکراتی کورد لە ساڵی١٩٥٣ ئیبراهیم ئەحمەدی مافناس بەیارمەتی هەندێ لە هاوکارانی نـــاوی پارتەکەیـــان گۆڕیـــوە بـــۆ پـــارتی دیمـــوکراتی کوردســـتان. وەسەرچاوەییێکیش ئەو هەنگاوە بە "**کودەتاییێکی شۆڕشگێڕانە**" دەبینێ لەگـۆڕینی بیرکـردنەوە و هـزری "**گەل**" بـۆ "**نیشـتیمانی نەتەوایەتـی**". بێگومان مەبەستی ئیبراهیم ئەحمەد ئەوەبوو ئاڕاستەی کاری پارتەکە لەپارتێکی کوردییەوە بگۆڕێ بۆ پارتێکی کوردستانی وەک زەمینەیێک بۆ هاتنە ناوەوەی ئەو کەمینە نەتەوەیی و ئاینییانەی کە لە کوردستان دەژیان، لەوانەش تورکمان و ئاشوورییەکان. (اسسرد، ٢٠٠٨، ٤٣-٤٥).

(یـونس رەؤوف- دلـدار١٩١٧-١٩٤٨). (لەسـاڵی١٩١٧ لە کـۆیە لەدایـک بـووە. لە بنەمـاڵەی خـادم سـوجادەیە. خوێنـدنی سـەرەتایی لە کـۆیە و ناوەنـدی و دواناوەنـدی لە هەولێـر و کەرکـوک تەواو کـردووە، لەسـاڵی ١٩٤٥ کـۆلێژی مـافی تەواوکـردووە. (لە١٢ تشـرینی دووەمـی) ١٩٤٨ کـۆچی دوایـی کـردووە). (بابـان، ٢٠٠٦،٨٧٤-٨٧٦). یشـاعیر و مافنـاس جـێ دەسـتی بەسـەر ڕوخسـاری

هـزری نەتەوەیـی گەلـی کـوردەوە زۆر بەڕوونـی دیـارە، لەم ڕووەوە (ئاسەف ڕەؤوف) (لەساڵی ١٩٠٦ لەدایک بووە، ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری چەند پارت و کۆمەڵەیێک بووە، وەک "خۆیبوون، کۆمەڵەی منەوەران، و دارکەر"، وە دۆستی نزیکی کۆمەڵێک سیاسی و ئەدیب و شاعیران بووە، لەوانەش فایق بێکەسی شـاعیر. بـێکەس لە وەرزی هـاوین لەسـەربانی مـاڵی ئەوان شـیعری ئەی مـانگی نووسـیوە. تەنـانەت نـوکتەو گـاڵتەوگەپی زۆریـان لەنێـوان هەبـووە. لەسـاڵی ١٩٤٨ بەدیاریکراوی بیست ڕۆژ بەر لەکۆچی دوایی دڵداری برای ئەویش مردووە. دیوانی زەینەب خان کچە کورد ١٩٠٠-١٩٦٣، ئامادەکردنی: حیکمەت حەمید مەلا رەئووفە فەندی خـادم سـوجادە، پێشـەکی و پێداچوونـەوە و ڕێکخسـتنی: عەبدوڵلا زەنگەنـە، ٢٠١٨، ٧-١٧٨)، ی مافناسـی بـرای ڕۆڵـی دیـار و بەرچـاوی هەبـووە لە کەڵکەڵە و فۆرمەڵەبوونی هزری نەتەوەیی لەلای دڵداری برا بچووکی کە هێشـتا هەر لەقۆنـاغی سـەرەتایی بـووە. بەجۆرێـک وانەی یەکەمـی هزری نەتەوەیی لە (ئاسەف)ی برای وەرگرتووە. تەنانەت ئەو هەستەی لەلای دڵـدار دروسـت کـردووە کە حەزی کـردووە لەنـاو کۆڵانەکـان هاواربکـات "**مـن کـوردم، مـن کـوردم**" و هـانی داوە لە قوتابخـانەدا گرووپێکـی نەتەوەیـی دروسـت بکـات بەنـاوی "**بەچەشـێر**" . (علاء الدین، ١٩٨٥، ٢٦-٣٣).

بێگومـان ئەم ڕەوشـەش کـاریگەریی ڕاسـتەوخۆی هەبووە لەسـەر دیـاریکردنی ڕواڵەتەکـانی هـزری نەتەوەیـی لە قۆناغەکـانی داهـاتووی ژیانی دڵدار، بەجۆرێک دەتوانین لایەنێکی گرنگی گەشەسـەندنی هـزری نەتەوایەتـی کـوردی لەلای دەسـتەبژێری مافناسـان لەو قۆنـاغە لە هۆنراوەی (ئەی ڕەقیب)ی دڵدار تێبینی بکەین، کە باس لە خۆڕاگری و زینـدوویێتی نەتەوەکەی دەکـات بەرامـبەر بەو سـتەمەی کە بەدرێژایـی ڕۆژگـار لێـی کـراوە، بێگومـان ئەو هـۆنراوەیە "**بەنرخترین شـیعری نیشتمانییە و دڵداری بە هەموو کوردستان ناساند**". (علاء الدین، ١٩٨٥، ١٧٢). لەبەر بەهێـزی و گرنگیـی نـاوەڕۆکی هـۆنراوەکە سـەرچاوەیێک بەسـروودی (مارسـیلێز) ڕۆژگـاری شۆڕشـی فەڕەنسـی سـاڵی ١٧٨٩

چواندووە. جیا لەوەش لە ساڵی ١٩٤٦ کراوەتە سروودی نیشتیمانی کۆماری کوردستان لە شاری مەهاباد (خەزنەدار، ٢٠٠٦، ٥٢-٥٣).

لەو قۆناغەدا مافناسان سەرنجێکی گەورەیان لەسەر مەیدانی ڕۆژنامەگەری بووە، لەم چوارچێوەدا لە ٢٦ کانونی یەکەمی ١٩٣٩ پیرەمێرد وەک درێژە پێدەری ڕۆژنامەی ژیان ڕۆژنامەی (ژین)ی دەرکرد، تاوەکو کۆچی دوایی لە ١٩ حوزەیرانی ١٩٥٠ توانی (١٠١٥) ژمارەی لێ دەربکات. (بیمار، ١٩٩٨، ١٧٧). ئیبراهیم ئەحمەدیش کە پاڵنەری سەرەکی بۆ ڕووکردنە کۆلێژی ماف وەرگرتنە ئیمتیازی گۆڤارێک بووە. لە کانونی یەکەمی ١٩٣٩ خەونەکەی هاتە دی کاتێک یەکەم ژمارەی لە گۆڤاری گەلاوێژ دەرکرد. لەماوەی دە ساڵدا (کانونی یەکەمی ١٩٣٩- ئابی ١٩٤٩) (١١٦) ژمارەی لێ دەرچووە، گۆڤارەکە ڕۆڵی کاریگەری هەبووە لەبەرەو پێشچوونی بزاڤی ئەدەبی و فەرهەنگی و هزری لە باشووری کوردستان.(بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی دەرچوونی گۆڤاری گەلاوێژ و ڕۆڵی لە گەشەکردنی بزاڤی ئەدەبی و ڕووناکبیری بگەڕێوە بۆ: ئەمین محەمەد، ٢٠٠٤، ٨-١١٠).

مایەی ئاماژە بۆکردنە گۆڤاری گەلاوێژ بە تاکە گۆڤاری کوردی دادەنرێ کە دەستەبژێری مافناسان زۆرترین بابەتیان تێدا بڵاوکردۆتەوە بەجۆرێک کەمن ئەو ژمارانەی بابەتی ئەوانی تێدانەبێ. تەنانەت هەندێ ژمارە پێنج بابەتی لە نووسەرانی ئەو چینەن. ( وەکو ژمارەکانی، (٣-٤)، ساڵی، (٣)، مارت و نیسان١٩٤٢؛ ژمارە، (١١-١٢)، ساڵی (٣)، تشرینی دووەم و کانونی یەکەم، ١٩٤٢؛ ژمارە(٢)، ساڵی ٦ ، شوبات ١٩٤٥؛ ژمارە، (١)، ساڵی (٧)، کانونی دووەم ١٩٤٦؛ ژمارە (٦) ساڵی (٩)، حوزەیران ١٩٤٨. بۆ بینینی ببیلیۆگرافیای گۆڤاری گەلاوێژ بڕوانە: ئەمین محەمەد، ٢٠٠٤، ١-١٢٢).
هەروەها هەندێ لە دەستەبژێری مافناسان لەبواری نووسین زیاتر لە ڕێگای گەلاوێژەوە بەدیار کەوتوون لەوانەش: (عەونی یوسف)، (دڵدار)، (محمد رسول هاوار ١٩٢٤-٢٠٠٦)، (فایق هۆشیار١٩٢١-٢٠٠٢)، (موکەرەم تاڵەبانی١٩٢٣-)، و(ئەحمەد شاڵی١٩٢٤-١٩٧٧). بەگوێرەی

زۆریـی بابەتەکانیـان هەریەک لە : پیرەمێـرد، ئیبـراهیم ئەحـمەد، فـایق هۆشیار، شاکر فەتاح، دڵدار، محمد ڕسوڵ هاوار. لەدیارترین مافناسانن کە زۆرترین نووسینیان لە گەلاوێژدا بڵاوکردۆتەوە. لە دوای ئەوانیش هەریەک لە: ئەحـمەد شـاڵی، عەونـی یوسـف، مـوکەڕەم تاڵەبـانی، دێـن بەڕێـژەی کەمتـر بابەتیـان لەو گۆڤـارە بڵاوکـردۆتەوە . (ئەمـین مـحەمەد، ٢٠٠٤، ١-١٢٢).

دەسـتەبژێری مافناسـان ڕۆڵـی دیاریـان هەبـووە لە دەرچـوونی گۆڤاری شەفەق لە ١٥ کانوونی دووەمی ١٩٥٨ کە گۆڤارێکی ئەدەبی و زانستی و کۆمەڵایەتی بووە بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی هەر نیو مانگ جارێک لە کەرکوک بڵاوکراوەتەوە. (جەباری، ٢٠٠٤،١٠٠). لە حەوت مـانگی یەکەمـی تەمەنـی دەسـتەی نووسـەرانی گۆڤـارەکە بەم شـێوەیە بـووە، خـاوەن ئیمتیـاز و سەرنووسـەر، عبدالقادر شـێخ محمد بەرزنجی، دەستەی نووسەران پێکهاتبوو لە : ئیبراهیم ئەحمەد، مارف بەرزنجی، عەلی کەمال باپیر ئاغا، مارف خەزنەدار، و عبدالصمد خانەقا. (جەمـال خەزنەدار، (ڕۆژنـامەی بـارزان، (ئەمریکـا)، ژ(٤٧)، تشـرینی یەکەم، ٢٠٠٦). بەوردبـوونەوە لە نـاوی دەسـتەی نووسـەران دەبینـین دەسـتەبژێری مافناسان ڕۆڵی دیاریان هەبووە لە دەرچواندنی گۆڤارەکە، بەجۆرێک لە کۆی پێنج ئەندامی دەستەی نووسەران سیانیان لەو توێژەن. ئەوانیش هەریەک لە ئیبراهیم ئەحمەد (عبدالصمد خانەقا-١٩٢٧-١٩٧٧) و (مارف بەرزنجی ١٩٢١--١٩٦٣). گۆڤارەکە هۆکارێک بووە بۆ بەدیارکەوتنی توانـا ئەدەبییەکـانی مافناسـێکی وەک مـارف بەرزنجـی کە بە"**یەکەمـین قوتـابی دەرچـووی شـەفەق**" هەژمـار کراوە، لەڕێگای شـەفەقەوە توانـا ئەدەبییەکـانی خـۆی دۆزیـوەتەوە"" **و نـاو و ناوبـانگی ئەدەبـی پەیداکرد**"ووە. (خەزنەدار، ٢٠٠٩، ٢٣٤). ئیبراهیم ئەحمەدیش هەڵسـەنگاندنی ئەو بابەتانەی پێ سپێردرابوو کە بۆ گۆڤارەکە ڕەوان دەکران تاوەکو بڕیـار لەسـەر بڵاوکـردنەوە یـاخود پـێچەوانەکەی بـدات. لەم ڕووەوە یەکێـک لەدەسـتەی نووسـەرانی گۆڤـارەکە (مـارف خەزنەدار) دەڵـێ: " **یـارمەتییەکی باشـی (گۆڤـارەکەی) دەدا، بەشـێکی زۆری کەرەسـتەی**

**بڵاوکـردنەوەی دەخوێنـدەوە. بیـروڕای ئەو لەبـابەت بڵاوکـردنەوەی بەرهەم گرنگ بوو، هەموومان ڕێزمان لێدەنا"**. (خەزنەدار ، ۲۰۰۹، ۲۳٤).

لەوقۆناغەدا جیا لە بابەتە سیاسی و ئەدەبییەکان دەبینین بەشێک لە سـەرنجی دەسـتەبژێری مافناسـان ڕووەو بـابەتە کۆمەڵایەتییەکـان بووە، لەوانەش پرسی خوێندنی ئافرەتان، کێشەی موڵکایەتیی زەویوزار، ناکۆکی و ململانێی ئاغا و جووتیار، لەگەڵ ڕەخنەگرتن لە داب و نەریتە کۆمەڵایەتییە چەوت و باوەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی، و هەوڵدان بۆ دۆزینـەوەی ڕێگەچـارەی گونجـاو بۆیـان. بۆنمـوونە مـارف بەرزنجـی بەنازناوی (شوان) تاوەکو ژمارە حەوت گۆشەیێکی تایبەتی لە گۆڤاری (شەفەق) هەبووە بەناوی (ئەلف وبێ) لەهەر ژمارە و بابەت و گرفتێکی کۆمەڵایەتی کوردەواری بەزمـانێکی کوردی پاراو خسـتۆتە بەر دیدی خـوێنەران، چارەسـەری گونجاویشـی بـۆ دۆزیـوەتەوە. (مـارف بەرزنجـی شەهید (پشکۆ)، ۱۹۹۳، ۲۸۷).

نوری تاڵەبانیش کە هێشتا قوتابی قۆناغی چوارەمی کۆلێژی مـاف بووە ڕەخنەی توندی لە یاسای (دەعوای عـەشائری) گرتووە، هاوکات دژی ئەوە بـووە لە یەک وڵاتـدا دوو یاسـای جیـا بـۆ دانیشـتوانەکەی بەرکار بن، یاسـاییک بۆ لادێ نشینەکان و یەکێک بۆ شـارییەکان، لەم بـارەیەوە دەڵـێ: **"ئـێمە لە سـەدەی بیسـتەما ئەژیـن، وە ئەم چەشـنە یاسایانە پاشماوەی سەدەکانی ناوەڕاستن"** (تاڵەبانی، گۆڤاری،(هیوا)،بەغدا، ژمـارە، (٥)، سـاڵی،(۱)، تشـرینی دووەم، ۱۹٥۷، ۳۹-٤۱. وەرگیـراوە لە: حسـێن، ڕۆژنامەوانیی کوردی گۆڤاری هیوا ۱۹٥۷-۱۹٦۳، ب۱، ۲۰۱۰).

شـاکر فەتـاحیش باسـی لە ڕۆڵ و پـێگەی ئـافرەت کـردووە لەنـاو کۆمەڵگـای کـوردی بەدرێژایـی سـەردەمە مێژووییەکـان، دواتـر باسـی لەکـاریگەری ئافرەتـان کـردووە لەپێشـەوایەتیکردنی جـووڵانەوەیێکی کـۆمەڵایەتی گەورە بـۆ نەهێشـتنی کێشـە خێزانـی و کۆمەڵایەتییەکـان لەسـەر بنچینەیێکـی زانسـتیی تەندروسـت و نـوێ. هاوکـات مەترسـی خۆشـی نەشـاردۆتەوە لە تەشـەنەکردنی هەنـدێ دیـاردە و ئاریشـەی

تایبەت بەئافرەتانی شارنشین و ئۆرستۆکراتیەکان لەوانەش: زۆرداریی ناو خێزان، و بایەخدان بەجلوبەرگ و خشڵی گرانبەها و دەرمانی خۆ جوانکردن، دانیشتن و وەرزش نەکردن. وە مەترسی گواستنەوەی هەندێ لەو دیاردانەی بۆ ناو ئافرەتە گوند نشینەکانیش باس کردووە. (فتاح، بەشی (٢)، گۆڤاری (نزار) بەغدا، ژمارە(٣)، ساڵی یەکەم (٣٠) نیسان، ١٩٤٨، ١٩-٢١. وەرگیراوە لە: ساڵح،٢٠٠٠).

ئەگەرچی نووسینەکانی دەستەبژێری مافناسان لەبواری ئابووری بە بەراوردکردن بە بوارەکانی تر کەمتر لای لێکراوەتەوە، بەڵام بە وردبوونەوە لێیان ئاماژەکان ئەوە دەردەخەن کە سەرەتاییکی بابەتی و زانستییانەی بیری ئابووری لەلای ئەو دەستەبژێرە چەکەرەی کردووە. بێگومان بابەتی تووتن لەسەر ئاستێکی باڵا لە کۆتایەکانی ڕۆژگاری پادشایەتی بەهۆی خراپیی سیاسەتی حوکمەت لەم بارەیەوە جێگای بایەخ و سەرنجی توێژی ڕۆشەنبیران لە نێویشیاندا مافناسانی کورد بووە. لەم چوارچێوەدا محمد سعید خەفاف ( ١٩٢٤-) ی مافناس لە زنجیرە وتارێکی پێنج ئەڵقەییدا ناوچەکانی چاندنی تووتن و مەڵبەندەکانی پشکنین و دیاردەی دزەکردنی بەرهەمەکەی بۆ دەرەوەی بەڕێوەبەرایەتی وەرگرتن و فرۆشتنەوەی بە کەسانی تر، و هۆکارانی ئەو دیاردەی شی کردۆتەوە. دواتر تیشکی خستۆتە یاسای ئینحساری تووتنی ساڵی ١٩٣٩. بەگوێرەی لێکدانەوەی ئەو یاسایە زیانی بۆ جووتیاران هەبووە. ڕەخنەشی لە بڕیاری گواستنەوەی پشکنینی تووتن لەمەڵبەندی قەزاکان بۆ ناوەندی شارەکان گرتووە. هاوکات باسی پرۆژەی پاڵەفتەکردنی تووتنی کردووە. (خفاف، گۆڤاری، (نزار)، بەغدا، ژمارەکانی(٤-٥-٦-٧-٨)، ساڵی یەکەم، ١٩٤٨. وەرگیراوە لە: ساڵح،٢٠٠٠).

مسعود محمدی جەلی زادە (١٩١٩-٢٠٠٢ ) بە یەکێک لە دیارترین مافناسانی ئەو قۆناغە هەژمار دەکرێ لە خولی سیانزەی ئەنجومەنی نوێنەران (٢٤ کانونی دووەم ١٩٥٣-٢٨ نیسان١٩٥٤) نوێنەری شاری هەولێر بووە. بابەتی تووتنی لەناو ئەنجومەن وروژاندووە، دواتریش

زنجیره وتارێکی پانزه ئەڵقەیی بەزمانی عەرەبی لە ڕۆژنامەی (الدفاع)ی شـــاری بەغـــدا بڵاوکـــردۆتەوە. هەردوو هەوڵەکەی جەلـــی زادە دەنگـــدانەوەی گەورەی هەم لەنـــاوخۆی ئەنجـــومەن و هەم لەئاســـتی جەمـاوەریش هەبـووە تەنـانەت بەهـۆی بڵاوبـوونەوەی وتارەکـانەوە دانەییێکـی ئەو ڕۆژنـامەیە لە دە فلسـەوە گەیشـتۆتە دووسـەد و پەنجـا فلس، و حکومەت ناچار کراوە بەڕێوەبەری گشتی ئینحساری توتن لەکارەکەی دوور بخاتەوە. (محمد، ١٩٩٢، ٢٩٧-٢٩٩). لەبەر ئەنجامی ئەو هەوڵەی، وە لەبەر شـــارەزایی لەبـــوواری ئـــابوری کوردســـتان لە ســـەرەتاکانی شۆڕشـــی ١٤ تەمـــووز ١٩٥٨ لەســـەر داوای وەزیـــری کشتوکاڵی ئەوکات (هدیب حاج حمود) جەلی زادە دەبێتە ئەندامی ئەو لیژنەی کە پێکهێنرابوو بۆ دانانی یاسای چاکسازی کشتوکاڵ. (شریف، ١٩٨٨، ٢٩-٣٠).

تایبەتمەندێکی تری ئەو قۆناغە، ئەوەبوو کە هەندێ لەدەستەبژێری مافناسـانی کـورد هەوڵیـان داوە پـێگە و پۆسـتی خۆیـان لە دامودەزگـا یاسایی و کارگێڕیەکان بقۆزنەوە بۆ خزمەتکردنی بزاڤی ڕۆشـەنبیری و هزری لە کۆمەڵگای کوردی. بۆنموونە مەعروف جیاوک ماوەی بوونی بە موتەسەڕیفی سلێمانی (٧ ئاب ١٩٤٤- ٣ نیسان ١٩٤٦) (بابان، ٢٠٠٢، ٩٥)، پۆسـتەکەی قۆسـتۆتەوە بـۆ خزمەتکردنـی بـواری ڕۆشـەنبیری لە شـــارەکە لەکاتێکـــدا وەک خـــۆی ئامـــاژەی پێـــداوە ئەوەی لەپیشـــەی پارێزەرایەتی لەشاری بەغدا دەستی کەوتووە "٥-٦ **هێندەی مانگانەی متەســـەرفێتییەکەتی**"بەڵام ئەو پارێزگـــاریەتەکەی هەڵبـــژاردووە. لەم ڕووەوەش لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٥ڕێگری کردووە لە هەندێ مامۆستای کورد لەیەکێک لەقوتابخانە دوا ناوەندیەکانی سلێمانی بەعەرەبی قسە بکەن، و هانی داون بەزمانی دایک قسە بکەن چونکە قوتابیەکان کێشەی تێنەگەیشتنیان هەبووە لەزمانی عەرەبی. خزمەتێکی تـری ئەو مافناســە بەشــاری سـلێمانی بریتـی بـووە لە بایەخـدان بەمەڵبەندێکی مەعریفی و هزری، و کەناڵێکی گرنگی خۆ ڕۆشەنبیرکردن ئەویـش دامەزرانـدنی کتێبخـانەی گشـتی سـلێمانی بـووە. هاوکـات

بەشداریش بووە لەبارکردنی کتێبخانەکە بەپەرتووک (نەبەز، ٢٠١٧، ٢٠٧-٢٠٩).

هادی چاوەشلی مافناس لەساڵی١٩٤٥ بۆ ماوەی ساڵ و نیوێک بەڕێوەبەری ناحیەی تەیناڵ بووە، لەوکاتەش شێخ مەحمود لە گوندی داری کەلی نیشتەجێ بووە، شێخ بیروڕای وابووە کە هۆکاری دواکەوتنی گەلی کورد لە کاروانی شارستانیەت نەخوێندەواری بووە بۆیە داوای کردنەوەی قوتابخانەیێکی لە گوندی (ئۆبلاغ) لە هادی چاوەشلی کردووە، ئەویش پەیوەندی بە مەعروف جیاوکی موتەسەڕیف دەکات، ناوبراو ڕەزامەندی لەسەر داواکە دەردەبڕێ، هەر ئەوکات بڕیاری دروستکردنی قوتابخانەکە دەدرێ. (جمباز، ٢٠٠٥، ٧-٨). بەمەبەستی پەرەپێدانی پرۆژەی خوێندن و خوێندەواری لە شاری خانەقین ڕەشید باجەلانی مافناس لەساڵی ١٩٥١ بەشداربووە لە دروستکردنی قوتابخانەی (التفیض)ی ناحکومی، و خۆبەخشانەش وانەی گوتۆتەوە (باجەلان، ٢٠٠٧، ٧٩).

لەلایەنی خۆشیەوە شاکر فەتاح لەکاتی دەستبەکاربوونی وەک کارگێڕی لادێ یاخود بەڕێوبەرەی ناحیە لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستان، هەستی بەوە کردووە لەو ناوچانە بزاڤی ڕۆشەنبیری و هزری وەک پێویست نەبووە، وە لە سۆنگەی هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی هەڵساوە بەدەرهێنانی ڕۆژنامە لەو ناوچانەی کە تێدا دەستبەکار بووە، بەشێوەیێکی تاکە کەسی بە خەتی خۆی نووسیویەتەوە. بۆنموونە کاتێک لە ئاکرێ بووە ڕۆژنامەی (ئاکرێ)ی لە ساڵی١٩٥٠ دەرکردووە لە بانگەوازێکدا دەڵی: "**...هیچ ڕۆشەنبیرییەکی ئاراستەکراو لە ناوچەی ئاکرێدا لەئارادا نییە**". (ئاوێنەی ژینم، یادداشتەکانی شاکر فەتاح، سەرجەمی بەرهەمی شاکرفتاح، ٢٠٠٣، ٤٩٥)، ڕۆژنامەکانیشی لە شوێنە گشتیەکان هەڵواسیوە، داوای لەدانیشتوان کردووە ڕۆژنامەکە بخوێننەوە: " **تکا دەکەین ئێوەیش ڕەنجمان بە با مەدەن: بیخوێننەوە، یاخود بۆ کەسانی تریشی بخوێننەوە**"(ئاوێنەی ژینم، یادداشتەکانی شاکر

فەتاح، سەرجەمی بەرهەمی شاکر فتاح ، ٢٠٠٣، ٣٣٣). تێدا سەرەڕای هەواڵی ناوەخۆ و ناوچەکە هەواڵی دەرەوەش بەرچاو دەکەوێ، ئەمەش دەرخەری ئەو ڕاستییە کە ئەو مافناسە ئاگاداری ڕووداو و پەرەسەندنە سیاسییەکانی دەرەوەش بووە بەتایبەتی هەواڵەکانی جەنگی جیهانی دووەم. دەکرێت ئەو ڕۆژنامانە وەک سەرچاوەیێک سوودیان لێوەربگیرێ بۆ زانینی زانیاریی دەگمەن لەسەر هەندێ لایەنی ئەو ناوچانە، لەو ڕۆژنامانەش: ڕۆژنامەی خورماڵ ١٩٤٠، باسەڕە ١٩٤٢، چەمچەماڵ١٩٤٦، و ئاکرێ ١٩٥٠ ( ئاوێنەی ژینم، یادداشتەکانی شاکر فەتاح، سەرجەمی بەرهەمی شاکر فتاح، ٢٠٠٣، ٢٤٨-٥٣٩).

جیا لەوانەش مافناسان هەڵساون بە ئەنجامدانی هەندێ چالاکی کۆمەلایەتی. بۆنموونە لەکاتی لافاوەکەی سلێمانی١٩٥٧ لەشاری کفری لێژنەیێک بۆکۆکردنەوەی پیتاک بۆ لێقەوماوان پێکهێنراوە هەریەک لە مافناسان محمود عبدالکریم و عبدالقادر علي، و سەرۆکی یانەی سەرکەوتنی کوردان محمود بەگی بابانی مافناس لە کەرکوک ئەندامی ئەو لیژنەیە بوونە. (گۆڤاری، (هیوا)، بەغدا، ژمارە، ژ(٥)، ساڵی،(١)،تشرینی دووەم، ١٩٥٧، ٤١. وەرگیراوە لە:حسێن، ڕۆژنامەوانیی کوردی گۆڤاری هیوا ١٩٥٧-١٩٦٣، ب١، ٢٠١٠). جەمال بابانیش بەهەمان بۆنەوە ساڵی ١٩٥٧ چیرۆکی (پەڵە هەورێکی چڵکن) نووسیوە لەساڵی ١٩٥٨ هاتۆتە چاپکردن و قازانجی فرۆشی پەرتووکەکەشی بۆ قوربانی و لێقەوماوانی شارەکە تەرخان کردووە. (بابان، ڕۆژنامەی ژین، ژ(١٣٨١)، ١٣ شوبات ١٩٥٨).

## بابەتی دووەم: بەرهەمەکانی دەستەبژێری مافناسانی کورد ١٩٣٩-١٩٥٨

لەم قۆناغەشدا دەستەبژێری مافناسانی کوردی کۆمەڵێک بەرهەمیان لە بوارەکانی ئەدەبی و سیاسی خستۆتە بەر دیدی خوێنەرانی کورد.

لەساڵی١٩٤٠ پیرەمێرد بەرگی دووەمی دیوانی مەولەوی (ئەسڵ و ڕۆح)، لە هەورامیـیەوە کردۆتەسـەر شـێوە زاری سـۆرانی. بەڵام لەبواری وەرگێڕان لووتکەی داهێنانی  پیرەمێرد لە وەرگێڕانی ڕۆمانی (کەمانچەژەن) لە زمانی تورکیەوە بۆ کوردی خۆی دەدۆزێتەوە، کە لەسـاڵی١٩٤٢ لەدوو بەرگـدا بڵاوکـراوەتەوە. (نەریمـان، ١٩٧٧،٥٤-٥٧)، چیرۆکەکە لەبنچینەدا لەنووسینی نووسەری بەناوبانگی دانیمارکی (هانز کریستیان ئاندرسن)ە، تۆفیق بەگی میر ئاڵا وەریگێڕاوەتە سەر زمانی تـورکی. گرنگـی و سـەرکەوتنی ئەو هەوڵەی پیرەمێـرد لەوەدا خـۆی دەدۆزێـتەوە کە پرۆسـەی وەرگێـڕان بـۆ زمـانی سـێیەم زۆر گرانتـر و ئاڵۆزترە لە وەرگێڕان بۆ زمانی دووەم. جیا لەوەش پیرەمێرد کۆمەڵێک نموونە و پەند و ئەفسانە و دەستەواژەی کوردی تێکەڵ بە وەرگێڕانەی کـردووە، ئەمەش وایکـردووە بەرهەمەکە تـام و بـۆیێکی خۆمـاڵی بـدات. (حسـین، ڕۆژنـامەی،(یەکگرتـوو)،هەولێـر، ژ(١٩٢)،١٩حـوزەیران ١٩٩٨). لە بـواری نووسینی چیرۆکیش دوو چیرۆکی بڵاو کردۆتەوە یەکەمیان بریتـی بـوو لە چیرۆکـی (محمـود ئاغـای شـیوەکەڵ. (ئاشـنا، ٢٠٠١، ٦١). دووەمیـان چیرۆکـی (گـاڵتەوگەپ)ە لە سـاڵی١٩٤٧ بەچـاپی گەیانـدووە، چەنـد چیرۆکێکی کۆمیدی لەخۆگرتووە. (نەریمان،١٩٧٧،٦٣).

هەرچـی مافنـاس زەیـد ئەحـمەد عوسـمانە (١٩٢٢-١٩٧٩) سـەرچاوەیێک بەیەکێـک "**لە ڕۆشـەنبیرترین ڕۆشـەنبیرانی شـاری هەولێـر**"ی ئەو قۆنـاغەی هەژمـار کـردووە، لەسـاڵی ١٩٤٦ لەقـاهیرە بەناوی خوازراوی (محمد شێرزاد) پەرتووکێکی لەدووتوێی (٤٦) لاپەڕە بەنـاوی (نضـال الاکـراد- خەبـاتی کـورد) لەسـەر کیسـەی خـۆی چـاپ کــردووە. (رسـول، اربیـل....، ٢٠٠٥،١١١ -١١٢). بێگومـان بڵاوکـردنەوەی پەرتـووکێکی سیاسـی لەو سـەروبەندەدا لەسـەر مـافە نەتەوەییەکـانی کورد خـۆی لەخۆیدا هەنگـاوێکی بـوێرانە بـووە (عوسمان، ٢٠١١، ٥٢)، کە تێدا نووسـەر بەشـێوەیێکی کـورت و پوخـت باسـی لە ڕەوشـی سیاسـی کورد لەهەرچوار پارچەی کوردسـان، و کـوردانی رووسـیای کـردووە ،

بەڵام پانتـــاییێکی گەورەی تەرخـــان کـــردووە بـــۆ باســـکردنی دۆخـــی کوردستانی عێراق. (عوسمان، ٢٠١٠، ٨-١٣٤).

لەبواری نووسینی چیرۆک و پەخشان شاکر فەتاح خاوەنی چەند بەرهەمـێکە. (لەوانەش لەسـاڵی١٩٤٧ پەرتـووکی (پرشـنگ)ی بڵاوکـردۆتەوە کە کۆمەڵە پەخشانێکی لەخۆی گرتووە. لەهەمان ساڵ چەند چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشی لەژێر ناوی (شـەبەنگە بەرۆژ) لەچاپداوە. ساڵێک دواتر کۆمەڵە پەخشـانێکی تری بەنـاوی (هـاوڕێی منـداڵان) چـاپکردووە). (نەریمـان، ١٩٧٧، ٦٢-٦٤). هەروەهـا لەهەنگاوێکدا بەمەبەستی ناساندنی کۆمەڵێک بیرمەند و داهێنەر و زاناو کەســـایەتی بەناوبـــانگی جیهـــانی بەخـــوێنەری کـــورد شـــاکر فەتـــاح لەپەرتووکێکدا بەنـاوی (گەورە پیـاوان) لەسـاڵی ١٩٤٨ باسـی لە یـانزە داهێـنەر و نـاودار کـردووە. لەوانەش: ئەدیسـۆن، ولبەرفـورس، گراهـام بیل، گوتەمبەرگ، کریستۆف کۆلۆمبس و غاندی... هتد. لە پێشـەکیەکەیدا ئامـانج لەنووسـینی ڕوون دەکـاتەوە، دەڵـێ: "**مەبەسـتم لەو نووسـراوە بڵاوکـردنەوەی گیـانی گەورەیـی و پیشـکەوتنە لەنـاو کوردەواریـدا**". (سـەرجەمی بەرهەمـی شـاکر فتـاح، ٢٠٠٤، ٤٢٥-٤٨٢). لەبـواری کـۆمەڵایەتیش لەساڵی ١٩٥٨ پەرتووکی (ئافرەتی کوردی) چاپکردووە، کە تێدا چەند پرســـگەلێکی تـــایبەت بەو تـــوێژە گـــرنگەی کۆمەڵگـــای ورووژانـــدووە. هاوکـات باسـی لە هەنـدێ ئـافرەتی نـاوداری کـورد کـردووە لەوانەش : حەپسەخانی نەقیب و ڕەوشەن بەدرخان. (نەریمان، ١٩٧٧، ١٠٥).

لەسـاڵی ١٩٥٤ مەعـروف جیـاوک وەک پـارێزەرێکی مـافی کـوردان قەڵەمەکەی خســـتۆتەکار بـــۆ بەرگریکـــردن لە مـــافە نەتەوەییەکـــانی گەلەکەی. ئەوە بـوو لەدوای ڕووخـانی کۆمـاری کوردسـتان لە شـاری مهابـــاد، گەڕانەوەی بارزانییەکـــان بـــۆ ناوچەکانیـــان، و دواتـــر دوورخسـتنەوەیان لە ڕەوشـێکی خـراپ ژیانیـان گـوزەر کـردووە. بۆیە چەند جارێک بارزانییەکان و خودی شێخ ئەحمەدی بـارزان، داوایـان لە جیاوک کردووە دەنگیان بگەیێنێتە بەرپرسە باڵاکانی حکومەتی عێراقی، لەلایەنـی خۆشـیەوە جیـاوک داوای لـێ کـردوون بڕیـاری لێبـووردن بۆ

بارزانییەکـان دەربـکەن، و بگەڕێنـدرێنەوە ناوچەکانیـان هاوشـێوەی خەڵکی ئەو شوێنانەی کە هەڵساون بە ئەنجامدانی ڕاپەڕین و شۆڕش دژی حکومەتی عێراقی لەوانەش خەڵکانی ناوچەکانی (ڕومەییە و سوق الشیوخ، سەماوە...هتد)، لەم سۆنگەیەوە جیاوک هەڵساوە بەنووسینی پەرتـووکی **(مأسـاة بـارزان المظلومـة - مەرگەسـاتی بـارزانی سـتەم لێکراو)**، کە تێدا جگە لەبابەتی بەرگریکردن لە بارزانییەکان، لەباسێکی تێروتەسـەل بەهێنـانەوەی ژمـارەیێکی زۆری بەڵـگە باسـی لە هەوڵـی ئینگلیزەکـان کـردووە بـۆ دروسـتکردنی قەوارەیێـک بـۆ ئاسـوورییەکان لەسـەر خـاکی کوردسـتان. (جیـاوک، ٢٠٠١، ١٥-١٥٩). نووسـینی ئەو پەرتووکە جگە لەڕووی بایەخی مێژوویی وەک سەرچاوەیێکی ڕەسەن، هاوکـات بـوێری و ئـازایەتی جیـاوک دەردەخـات لە بەرگریکـردن لە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی. بێگومان بەرگریکردن لە بارزانییەکان لە ماوەی (١٩٥٣-١٩٥٤) کارێکی ئاسان نەبووە، لەکاتێکدا بووە کە بارزانییەکان کەوتـوونەتە بەر خەشـم و قینـی حکـومەتی عێراقـی، دووچـاری چەرمەسـەری و مەینەتیـی زۆر بـوونەتەوە، ئەو کـارەش **"هەر لە مافپارێزێکی وەک مەعروف جیاوک وەشاوەتەوە"**. (سالح ، ٢٠١٢ ، ٣١٧).

لەساڵی (١٩٥٦) ئیبراهیم ئەحمەد ڕۆمانی (ژانی گەل)ی نووسیوە، و پێشکەشی گەلانی جەزائیری کردووە. بەڵام بەرهەمەکە ڕەنگدانەوە و ئاوێتەبوونی واقعی دۆخی کوردستان و بزاڤی ڕزگاریخوازیەکەی بووە لەو قۆنـاغەدا. ئەم جـۆرە بـابەتەش دەچێـتە جـوغزی **"ئەدەبـی شۆڕشگێڕییەوە"**.(ئەحمەد، ٢٠٠٩، ٨٠-٨٢).

**ئەنجام:**

لەڕێگای ئەم توێژینەوە گەیشتینە چەند ئەنجامێک دەتوانین لەو خاڵانەی خوارەوە کورتیان بکەینەوە.

١- هەریەک لە کۆلێژی ماف لە ئەستەمبۆل، و کۆلێژی مافی بەغدا دوو ناوەندی سەرەکی دەرچوونی دەستەبژێری مافناسانی کوردن. بەلام بەحوکمی نزیکی و ئاسانبوونی هاتوچۆ، هەرزانیی تێچووی چوار ساڵی خوێندن، کۆلێژی مافی بەغدا مەڵبەندی سەرەکی پێگەیاندنی دەستەبژێری مافناسانی کورد بووە.

٢- دەستەبژێری مافناسانی کورد بەگوێرەی قۆناغەکان ڕێگاو شێواز و میکانزمی جۆراوجۆریان بۆ خزمەتکردنی بواری ڕۆشەنبیری و هزری لەناو کۆمەڵگای کوردی گرتۆتەبەر، لەوانە پێکهێنانی ڕێکخراوو کۆمەڵە ڕۆشەنبیرییەکان ئەم هەنگاوەشیان دەتوانین بە بازدانێکی نەوعی لە پێشکەوتنی کاری ڕێکخراوەیی ئەم چینەی دابنێین. هاوکات ڕەنگدانەوەی هەستی بەرپرسیارانەیان بووە لەهەمبەر ئەو قۆناغە هەستیارەی کە گەلی کوردی پێدا ڕەت بووە (١٩٢٥-١٩٥٨). هەروەها تێبینی ئەوە دەکرێ دەستەبژێری مافناسان بۆ پێشخستنی ڕەوتی مەعریفی و ڕۆشەنبیری و هزری قورسایێکی زۆری هەوڵەکانیان خستۆتە سەر بواری ڕۆژنامەگەری، بەباشترین هۆکاریان زانیوە بۆ بێدارکردنەوەی میللەتی خۆیان، هاوکات بە ڕێگاییێکی خێریان زانیوە بۆ گەیاندنی بیروڕا و هزری خۆیان بەخوێنەرانی کوردی. نموونەی هەرە دیاریشمان لەم لایەنەوە هەوڵەکانی هەریەک لە پیرەمێرد، جەمال بابان، مەعروف جیاوک، و ئیبراهیم ئەحمەدن.

٣- لە بواری ڕۆشەنبیری و هزریی دەستەبژێری مافناسانی کورد شوێن دەستیان بەسەر ڕوخساری بزاڤی ئەدەبی و ڕووناکبیری و هزری سیاسی کوردستانی باشوور هەبووە. بۆنموونە پیرەمێرد وەک بیرمەند و قوتابخانەییێکی گرنگی ئەدەبی کوردی بەدیار کەوتووە. لە بواری هزری سیاسیش هەریەک لە حمزە عبدالله، ئیبراهیم ئەحمەد شوێن دەستیان بەسەر کایەی هزری سیاسی کوردی زۆر بەڕوونی دیارە، بەتایبەتی ئەوەی دواییان

توانیویەتی بۆماوەیێک سەرۆکایەتی ڕەوت و ئاڕاستەییێکی دیاریکراو بکات لە مێژووی بزاڤی ناسیۆنالیستی و نەتەوەیی کوردی. هەرچی ساڵح حەیدەریشە زیاتر وەک مونەزیرێکی ڕەوتی چەپ و هەڵگری ئایدیای مارکسی بەدیارکەوتووە، و یەکێک بووە لەپێشەنگی هەڵگرانی ئاڕاستەی بزاڤی چەپڕەوی لە کوردستان.

٤- لەنێو هونەرەکانی ئەدەب بابەتی شیعر و چیرۆک پشکی شێریان بەرکەتووە لە نووسینەکانی دەستەبژێری مافناسانی کورد، زۆرترین سەرنجیان لەسەر ئەو دوو بوارە بووە، بەتایبەتی چیرۆک هەریەک لە پیرەمێرد و ئیبراهیم ئەحمەد لە پێشەنگی ئەو بوارەن. بە وردبوونەوە لە ناوەڕۆکیشیان تێبینی ئەوە دەکرێ کە بەشێکیان مۆرکێکی نەتەوەیی ڕووتیان پێوە دیارە. دوای بڵاوبوونەوەی بیری چەپ و مارکسیزم بەشێوەییێکی بەربڵاو و لەنێو ڕۆشەنبیرانی کوردی لەنێویشیاندا دەستەبژێری مافناسان، بەشێک لەو چیرۆک و شیعرانە ڕەنگدانەوە و ئاوێتەبوونی هزری هەڵگرانی ئەو ئاڕاستەیە بوون.

٥- کاریگەریی دەستەبژێری مافناسانی کورد لەسەر کایە ڕۆشەنبیری و ئەدەبی و هزریەکە زیاتر لەدوای ساڵی ١٩٣٩، هەست پێدەکرێ ئەوەش زادەی چەند فاکتەرێکی جۆراوجۆرن لەوانەش بەپلەی یەکەم زۆربوونی ژمارەی مافناسان، و ڕەخساندنی هەلومەرجێکی گونجاو و لەبارتر لەبەردەمیان. ئەمەو سەرباری گۆڕانگاری و پەرەسەندنە سیاسییەکانیش لەوانەش هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهانی، و سەرکەوتنی بەرەی پێشکەوتووخواز و مەسەلەی ڕەخساندنی ئازادیی سیاسی و دیموکراسی و گەشەسەندنی ژیانی پارتایەتی و ڕێکخراوەیی لە هەموو عێراق. نابێ ڕۆڵی گۆڤاری گەلاوێژ لەیاد بکرێ لەگەشەسەندنی بزاڤی ڕۆشەنبیری و ئەدەبی وزری کوردی کە مافناسان بە بەراورد بەبڵاوکراوەکانی تر زۆرترین بەشدارییان لەو گۆڤارە بووە. لەماوەی دە ساڵەی دەرچوونیدا تین و تاوێکی بەگوڕی داوەتە کایە مەعریفیەکە. هاوکات زەمینەیێکی لەباری ڕەخساند بۆ

بەرەو پێشەوە چوون و تەنەنانەت ناساندنی توانا ئەدەبییەکانی ژمارەیێک لە مافناسان.

٦- ئەگەرچی بەگوێرەی هەندێ لەو تیۆرە کۆمەڵایەتیانەی کە بۆ دەستەبژێران دانراون، دەستەبژێری مافناسان وەک گرووپ گەلێکی کۆمەڵایەتی دەچنە خانەی (دەستەبژێرانی دەرەوەی دەسەڵات) زۆرینەیان ئەرک و بەرپرسیاریەتێکی وا گەورەیان نەبووە لە پرۆسەی حوکمڕانی و دەسەڵات، لەم ڕووەوە باڵاترین پۆست کە پێی گەیشتبن ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران بووە. بۆیە تاکە چەکی دەستی ئەوان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی واقیعی کۆمەڵگای کوردی تەنها قەڵەمەکەیان بووە. ئەوان لەناوەندی بڕیار و دەسەڵات نەبوون تاوەکو تێزە هزرییەکانیان لەم بوارە وەربگێڕن بۆ واقعێکی بەرجەستەکراو. بەڵام درکیان بەو کۆسپ و لەمپەرانەش کردووە کە هاتۆتە پێشیان لەکاتی خستنەڕووی کێشەو گرفتەکانی کۆمەڵگا. وە لەڕێگای نووسینەکانیانەوە بوێرانە ڕووبەڕووی کێشە کۆمەڵایەتییەکان و دیاردە چەوتەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی بوونەتەوە. هاوکات بەرگریکارێکی سەرسەختی مافەکانی ئافرەت، و نەهێشتنی دیاردەی نەخوێندەواری، و پشتگیری و بەرگریکاری مافەکانی هەژار و چەوساوان بەتایبەتی جووتیاران بوونە. دەربارەی ڕۆشەنبیریی ئابووریش ئەگەرچی بابەت و بەرهەمیان زۆر کەم بووە لەم بوارە، بەڵام تێبینی سەرەتاییێکی زانستی بیری ئابووری لەلای دەستەبژێری مافناسان دەکرێ.

## لیستی سەرچاوەکان

### یەکەم: کتێبە بەڵگەنامەییەکان

١- بيات، فاضل، دراسات في تاريخ العرب في العهد العثماني رؤية في ضوء الوثائق والمصادر العثمانية، ط١، دار المدار الاسلامي، بيروت، ٢٠٠٣.

### دووەم : یاداشت و بیرەوەری

### أ- بەزمانی کوردی

١- ئاوێنەی ژینم، یادداشتەکانی شاکر فەتاح، سەرجەمی بەرهەمی شاکر فتاح کۆکردنەوە و ڕێکخستنی، ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، ب (١)، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣.
٢- حەیدەری، مومتاز، (و ئەوانیتر)، قامووسی ناوە نەمرەکان، ب١، چ١، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٤.
٣- خەزنەدار، مارف، ڕۆژگاری من دروست بوون ١٩٤٩-١٩٦٠ یاداشتی مارف خەزنەدار، چ ١، ب٢، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٩.
٤- عوسمان، مەحمود ئەحمەد، چراخان و شەوە زەنگ (بیرەوەری)، وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە، ئیسماعیل بەرزنجی، چ١، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١١،.
٥- محمد، مسعود ، گەشتی ژیانم، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٢.
٦- محمود، محمد سعید، یاداشتەکانم، ئەزموونی ژیانم لەبواری ئیدارە و تیشکێک بۆسەر ڕابردوو، دار الحکمة، لندن، ٢٠٠٤.
٧- نەبەز، جەمال، بیرەوەریینامەی ئەو ڕۆژانەی جارەکی دیی ناگەڕێنەوە، کۆبەرهەم ژمارە (١٤)، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠١٧.
٨- هاوار، محەمەد ڕەسول،بیرەوەری،(سەرجەمی بەرهەم)،ب١،ئامادەکردنی، سدیق ساڵح، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧.

### ب- بەزمانی عەرەبی

١- مختارات من مذكرات صالح الحيدري ، ط٢، مطبعة رنج، السليمانية، ٢٠٠٤.
٢- مشتاق، طالب، اوراق ايامي، ط٢، بغداد، ١٩٨٩.

### سێیەم: پەرتووک

### أ- بەزمانی کوردی

١- ئاشنا، ئومێد ، پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێ بە ژیان و بەرهەمەکانی ب١، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

٢- ئەحمەد، ئامانج حەسەن، برایم ئەحمەد، ڕۆڵی لە بزاڤی رزگاریخوازی و رووناکبیریی گەلی کورددا، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٩.
٣- ئەحمەد، ئەحمەد حسێن، شەڕی بەردەرکی سەرای سلێمانی ٦ ی ئەیلولی١٩٣٠، ئامادەکردنی، ئەحمەد حسێن ئەحمەد، چاپخانەی ژیر، سلێمانی،٢٠٠٢.
٤- ئەلاکۆم، ڕۆهات، کوردەکانی ئەستەمبۆڵی کۆن، وەرگێڕانی، ئەحمەد تاقانە، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.
٥- ئەمین محەمەد، محەمەد دلێر ، ڕۆڵی گۆڤاری گەلاوێژ لە گەشەکردن و پێشخستنی ئەدەبی کوردیدا، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٤.
٦- ئەمین، نەوشێروان مستەفا، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی ڕۆژنامەوانیی کوردی ١٨٩٨-١٩١٨، ب١، چاپ و ئۆفسێتی دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١.
٧- ..............، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی ڕۆژنامەوانیی کوردی سالانی نێوان دوو جەنگی جیهانی ١٩١٨-١٩٣٩، ب٢، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٨- ..............، ژیان بەتەمەنترین ڕۆژنامەی کوردی ١٩٢٦-١٩٣٨، چ١، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٩- بابان، جەمال ، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٤، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
١٠-باپیر، شوان ئەحمەد، کۆمەڵەی زانستی کوردان، (١٩٢٦-١٩٣٩) توێژینەوەیەکی مێژووییە لەکار و چالاکییەکانی کۆمەڵەکە، پێداچوونەوەی، شاخەوان عبداللە صابر، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٤.
١١-باجەلان، بەهار ڕەشید، ڕەشید باجەلان، ١٩٢٠-٢٠٠١، تێکۆشەرێکی دێرینی کوردایەتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧.
١٢-باوەڕ، ئەحمەد، کۆمەڵی یانەی سەرکەوتن، چ١، لە چاپکراوەکانی شارەوانی کەلار، کوردستان، ٢٠٠٤.
١٣-بۆتانی، کاکەمەم، کاکی کاکان مرۆڤ و رووناکبیر و شۆڕشگێڕ، ب١، خەباتی سیاسی سالانی ١٩٢٤-١٩٦١ سەرکردەی نەمر عومەر دەبابە، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشەنبیری، هەولێر، ١٩٩٨.
١٤-بیمار، عبدالرزاق ، پەخشانی کوردی، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٩٨.
١٥-تۆفیق (و) کەریم، مستەفا سالح، محەمەد نوری، فایەق وشیار یاساناس و نووسەر و نیشتیمانپەروەر، ئامادەکردنی، محەمەمەد نوری تۆفیق (و) مستەفا سالح کەریم، سلێمانی، ٢٠٠٤.

١٦-جەباری، سمکۆ، کۆی بەرهەمە کوردییەکانی نووسەری شەهید جەبار جەباری، کۆکردنەوە و لەسەرنووسینی، سمکۆ جەباری، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤.
١٧-حسێن، هیمدادی ، ڕۆڵی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی هونەرەکانی ئەدەبی کوریدا، چ١، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٨.
١٨-..............، ڕۆژنامەوانیی کوردی گۆڤاری هیوا ١٩٥٧-١٩٦٣ لێکۆڵینەوە و ئامادەکردن، هیمدادی حوسێن، ب١، چ١، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠.
١٩-خەزنەدار، مارف، مێژووی ئەدەبی کوردی، ب٥، نێوانی هەردوو جەنگی یەکەم و دوەمی سەدەی بیستەم١٩١٤-١٩٤٥، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.
٢٠-..............، دیجلەی هـزرم، ب١، چ٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.
٢١-خواجە، ئەحمەد، چیم دی و شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی مەزن، ب٣، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی١٩٧٠.
٢٢-دیوانی زەینەب خان کچە کورد ١٩٠٠- ١٩٦٣، ئامادەکردنی، حیکمەت حەمید مەلا ڕەئووفە فەندی خادم سوجادە، پێشەکی و پێداچوونەوە و ڕێکخستن، عەبدوڵڵا زەنگەنە،چ١، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر،٢٠١٨.
٢٣-ڕەسوڵ، فاتح، بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ لە کوردستان، چ٢، چاپخانەی چوار چرا، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٢٤-سالح، ئازاد عوبێد، ڕۆڵی سیاسی و کارگێڕی و ڕووناکبیریی مەعروف جیاوک ١٨٨٥-١٩٥٨، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢.
٢٥-سالح، ڕەفیق، نزار گۆڤارێکی سیاسی کوردی و عەرەبییە، مجلة اسبوعية سياسية جامعة تصدر باللغتين العربية والكردية (١٩٤٨/٣/٣٠-١٩٤٩/٢/١٥)، ئامادەکردنی، ڕەفیق سالح، لێکۆڵینەوە و پێڕستکاریی، سدیق سالح، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.
٢٦-..............، ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە، (١-٨١)، ب١، ئامادەکردنی ڕەفیق سالح، لێکۆڵینەوەی، سدیق سالح، چ١، کۆمپیتەرو چاپ و ئۆفسێتی دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٢٧-..............، ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە (٣٢١-٤٠٠)، ب٤، بەشی١، ئامادەکردنی، ڕەفیق سالح، لێکۆڵینەوەی، سدیق سالح، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥

٢٨-عارف، حسێن، بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥--١٩٨٣چ١، هەولێر، ١٩٨٧.
٢٩-علاء الدین، عبدالخالق ، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، بەغدا، ١٩٨٥.
٣٠-عوسمان، زەید ئەحمەد، (محەمەد شێرزاد) خەباتی کورد، وەرگێران و نووسینی پێشەکی و پەراوێز، سامی قادر، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٠.
٣١-عومەر، فاروق عەلی، ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا بەراییەکان ١٩١٤-١٩٣٩، وەرگێرانی، تاریق کاریزی، عبداللە زەنگەنە دەقە ڕۆژنامەوانییە کوردییەکانی ساغ کردۆتەوە، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
٣٢-فەتاح، شاکر، سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح، کۆکردنەوە و ڕێکخستنی، ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، ب٢، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤.
٣٣-کاروانی، بەکر شاکر ، عەلی فەتاح دزەیی شاعیر و نووسەرو تێکۆشەر، چ١، چاپخانەی ڕۆشەنبیری، هەولێر، ٢٠٠٤.
٣٤-کەریم، غەفوور میرزا، یادگاری لاوان و دیاری لاوان، چاوگێڕانێک بە باری رۆشنبیری کوردستانی عیراقد لە ساڵەکانی ((سی))دا چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا، ١٩٧٨.
٣٥-..............، تەقەلڵایەکی دڵسۆزانە بۆ لە ناوبردنی نەخوێندەواری لەکوردستانا و کۆمەڵی زانستی لە سلێمانی، مطبعة دار جاحظ، بغداد، ١٩٨٥.
٣٦-کۆی بەرهەمە کوردییەکانی نووسەری شەهید جەبار جەباری، کۆکردنەوە و لەسەرنووسینی، سمکۆ جەباری، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤.
٣٧-گۆمەتاڵی، بورهان حاتەم، ساڵح حەیدەری ١٩٩٢-٢٠٠١، رۆڵی سیاسی و ڕووناکبیریی، چ١، هەولێر، ٢٠١٢.
٣٨-مارف بەرزنجی شەهید (پشکۆ) کۆکردنەوە و ڕێکخستنی، سامان مارف بەرزنجی، عومەر مەعروف بەرزنجی، پێشەکی و پەراوێز و ساغکردنەوەی عومەر مەعروف بەرزنجی، چاپخانەی رۆشەنبیری، هەولێر، ١٩٩٣.
٣٩-مەزهەر، کەمال، چەند لاپەڕەیەک لەمێژووی گەلی کورد، ب٢، ئامادەکردنی، عبدالله زەنگەنە، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
٤٠- موکریانی، کوردستان موکریانی، ڕووناکی ١٠/٢٤ /١٩٣٥ - ٥/١٦ /١٩٣٦ یەکەمین گۆڤاری کوردیی شاری هەولێر، ئامادەکردن و پێشەکی، کوردستان موکریانی، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

٤١-نەریمان، مستەفا سەیید ئەحمەد، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی ١٧٨٩-١٩٧٥،لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردی، بەغدا، ١٩٧٧.
٤٢-..............، یانەی سەرکەوتنی کوردان١٩٣٠ -١٩٦٢، ئامادەکردن و پێداچوونەوەی، ئازاد هیدایەت دەلۆ، چاپخانەی ئەرابخا، کەرکوک، ٢٠٠٦.
٤٣-هاوار، م. ڕەسوڵ، کورد و باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووهەمی جیهان،ب١، هەتا کۆتایی شەڕی یەکەم ، ج١، چاپخانەی خاک، سلێمانی ،٢٠٠٠.

**ب- بەزمانی عەرەبی**

١- احمد، ابراهيم ، الاكراد والعرب، ط٤، د. م. ط، ٢٠٠٤.
٢- أحمد، ابراهيم خليل، تطور التعليم الوطني في العراق (١٨٦٩-١٩٣٢) ط١، مطبعة جامعة البصرة، ١٩٩٢.
٣- اسسرد، فريد، اتجاهات السياسة الكردية بعد الحرب العالمية الثانية، السليمانية، ٢٠٠٨.
٤- بابان، جمال، بابان في التاريخ ومشاهير البابانيين، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٩٣.
٥- الجمال، محمد جبار إبراهيم، بنية العراق الحديثة تأثيرها الفكري والسياسي ١٨٦٩-١٩١٤، مراجعة ، أ. د، كمال مظهر أحمد، مطبعة إيلاف، بغداد،٢٠١٠.
٦- جمباز، طارق، القانوني، هادي الجاوشلي مواقف كوردية مجهولة ١٩٢٠-١٩٩٦، ط١، كوردستان، ٢٠٠٥.
٧- جياوك معروف ، نيابتى في ١٩٢٨-١٩٣٠، مطبعة الزمان، بغداد، ١٩٣٧.
٨- ..............، مأساة بارزان المظلومة، ط٢، دار أراس، اربيل،٢٠٠١.
٩- الحفو، غانم محمد، وجوه وقضايا سياسية من تاريخ العراق المعاصر، دار ابن الاثير للطباعة والنشر، الموصل، ٢٠٠٦.
١٠-رسول، إسماعيل شكر ،أربيل دراسة تاريخية في دورها الفكري والسياسي ١٩٣٩-١٩٥٨، ط٢، مطبعة بينايي، السليمانية، ٢٠٠٥.
١١- شريف، طارق ابراهيم، شخصيات تتذكر، ج١، مطبعة الثقافة والشباب، اربيل، ١٩٨٨.
١٢-شريف، عبدالستار طاهر،الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكوردية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨، ط٢، السليمانية، ٢٠٠٧.

١٣-صابر، سروه أسعد، كوردستان الجنوبية ١٩٢٦-١٩٣٩ دراسة تأريخية- سياسية، ط١، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، السليمانية، ٢٠٠٦.
١٤-العبودي، ستار نوري، المجتمع العراقي في سنوات الإنتداب البريطاني، ط١، مؤسسة دار الكتاب الاسلامي، بغداد، ٢٠٠٦.
١٥-فتح الله، جرجيس، رجال ووقائع في الميزان ، حوار اجراه، مؤيد طيب و سعيد يحيى، ط١، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١.
١٦-الكردي، جياوک، القضية الكردية، ط١، مطبعة الاستقلال، بغداد،١٩٢٥.
١٧-مزعل، جمال اسد ، نظام التعليم في العراق، مطبعة التعليم العالي جامعة الموصل،الموصل،١٩٩٠.
١٨-النجار، جميل موسى ، الادارة العثمانية في ولاية بغداد من عهد الوالي مدحت باشا الى نهاية الحكم العثماني١٨٦١-١٩١٧، ط٢، دار الشؤون الثقافية، بغداد، ٢٠٠١.
١٩-..............، التعليم في العراق في العهد العثماني الاخير ١٨٦٩--١٩٩٨، ط١، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ٢٠٠٢.
٢٠-النصيري، عبدالرزاق أحمد، دور المجددين في الحركة الفكرية والسياسية في العراق، ط١، مكتبة عدنان، بغداد، ٢٠١٢.

**چوارەم: توێژینەوە**

**أ- بەزمانی کوردی**

١- رەسول، ئیسماعیل شوکر، ڕۆڵی رامیاری و رۆژنامەنووسیی مەعروف چیاووک١٨٨٥-١٩٥٨، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویيە ، گۆڤاری (ڕۆژنامەنووس) ، ژ(٣)، هەولێر، ٢٠٠٥.

**ب- بەزمانی عەرەبی**

١- احمد، كمال مظهر، رأي للمناقشة، الاطار الزمني لتأريخ العراق الحديث والمعاصر، مجلة،(الحكمة)، العدد، (٥)، السنة الاولى، تشرين الثاني- كانون الاول، بغداد، ١٩٩٨.

**پێنجەم: فەرهەنگ و ئەنسکلۆپیدیا**

**أ- بەزمانی کوردی**

١- ڕەفیق، (و) عەباس، هاوکار، گەیلان ، فەرهەنگی زانستی رامیاری، چ ٢، چاپخانەی ئاسیا، سلێمانی، ٢٠١٧.

**ب- بەزمانی عەرەبی**

١- بابان، جمال، اعلام كرد العراق، مطبعة شڤان، السليمانية، ٢٠٠٦ .

٢- الحسن، احسان محمد، موسوعة علم الاجتماع، ط١، دار العربية للموسوعات، بيروت، ١٩٩٩.

**شەشەم : خولاوەكان**

**أ- گۆڤار**

**یەکەم: بەزمانی کوردی**

١- احمد، ابراهیم، گەلاوێژی دێرین چۆن هەڵهات؟، گۆڤاری (گەلاوێژی نوێ) سلێمانی، ژمارە(٤)، ساڵی یەکەم، تشرینی دووەم، ١٩٩٧،

**دووەم: بەزمانی عەرەبی**

١- العزاوي، عباس، كلية الحقوق في بغداد، تاريخ تأسيسها، مجلة، (القضاء)، بغداد، العدد(٢)، كانون الاول، ١٩٤٧.

**ب- ڕۆژنامە**

١- بابان، ج ، پەڵە هەورێکی چڵکن، ڕۆژنامەی ژین، ژ (١٣٨١) ١٣ شوبات ١٩٥٨.

٢- جەمال خەزنەدار، سەربوردەی دوو ئەستێرەی پرشنگداری ڕۆژنامەگەریی شاری کەرکووک (ڕۆژنامەی بارزان، (ئەمریکا) ژ(٤٧) تایبەت بەکەرکوک، تشرینی یەکەم، ٢٠٠٦.

٣- کریم، حسین سالار، لە یادی (٤٨) ساڵەی کۆچی دواییدا وتەیێک لەمەڕ پیرەمێرد و کەمانچەژەن، ڕۆژنامەی (یەکگرتوو)، هەولێر، ژ (١٩٢) ١٩ حوزەیران ١٩٩٨.

## ملخص البحث

## دور نخبة من الحقوقيين الكورد في تقدم الفكر والثقافة في جنوب كوردستان ١٩٢٥-١٩٥٨

**د. شاخوان عبدالله صابر**

كلية الاداب – جامعة سوران

كانت لكلية حقوق اسطنبول (الصرح القانوني العريق)، إسهام كبير في تخريج عدد كبير من رجال القانون في العراق، ويرجع لها الفضل في تهيئة واعداد الكوادر القانونية المتخصصة لتولي الوظائف العامة في الإدارة والقضاء، والاعداد لممارسة مهنة المحاماة، ونشر الثقافة القانونية في إرجاء الإمبراطورية مترامية الاطراف، ويرجع لها الفضل في ظهور اللبنة الأولى للنخبة القانونية العراقية.

كانت لحاجة العراق الماسة إلى الكوادر القانونية في أواخر العهد العثماني دافع قوي لفتح مدرسة الحقوق في العراق في سنه ١٩٠٨ من قبل سلطات الباب العالي، أسوة ببعض الولايات العثمانية الأخرى. والتي تعد بداية للتعليم الجامعي الحديث، وقد أمدت كلية الحقوق بغداد عبر مسيرتها الحافلة العديد من رجال القانون العراقيين (ومن ضمنهم النخبة القانونية الكوردية)، فقد كان لخرجها إسهام كبير في بناء الحياة الثقافية والفكرية والقانونية، وخدموا بلادهم في مجالات الإدارة والقانون والسياسة.

خلال مدة الدراسة (١٩٢٥-١٩٥٨) كانت للنخبة القانونية الكوردية مساهمات جادة وبارزة في مجالي الثقافة والفكر، وذلك من خلال مشاركتهم الفعالة في تأسيس الجمعيات والنوادي الثقافية، وفي مجال إصدار الصحف والمجلات وكتاباتهم فيها، علاوة على تأليف الكتب في شتى المجالات الأدبية والسياسية والفكرية، وقد حققت النخبة القانونية الكوردية نقلة نوعية في مجال تطورها الثقافي والفكري منذ سنه ١٩٣٩، وأصبح لهذه الفئة وزن ثقافي وسياسي على الساحة الكوردستانية، وتجلى ذلك من خلال مساهماتهم الفعالة في دفع عجلة الواقع الثقافي والفكري.

اقتضت طبيعة البحث أن يقسم إلى ثلاثة مباحث رئيسة، كل مبحث يحوى عدة مواضيع. وقد عني المبحث الأول بدراسة (**فتح مدرسة الحقوق في العراق، وظهور النخبة القانونية الكوردية ١٩٠٨-١٩٢٥**) وشكل موضوع (**الدور الثقافي والفكري للنخبة القانونية الكوردية خلال ١٩٢٥-١٩٣٨**) عنوانا للمبحث الثاني. وجاء المحور الثالث والأخير ليسلط الضوء على (**مرحلة جديدة في النشاط الثقافي والفكري للنخبة القانونية الكوردية١٩٣٩-١٩٤٥**). أما **الخاتمة** فقد تضمنت أهم ما توصل إليه الباحث من استنتاجات.

Abstract

**The Role of Kurdish Legal Elite in the Advancement of Thought and Cultur in the South of Kurdistan**

**Dr. Shakhawan Abdullah Sabir**

College of Arts – Univ. of Soran

The College of Law of Istanbul had a significant role in the graduation of a large number of jurists in Iraq. It has been credited for the preparation and the graduation of the specialized legal cadres to undertake public positions in the administrative and the judiciary offices. Also it prepared generations of practitioners for the profession of law and spreading the legal culture throughout the vast empire. It is as well credited with the emergence of the foundational bricks of the Iraqi legal elite.

Iraq's urgent need for lawmakers during the late Ottoman time pushed the authorities to open the school of law in Iraq in 1908, like some other Ottoman states which was the beginning of modern university education. Through its long history, the College of Law in Baghdad has provided many Iraqi law-makers (including the Kurdish legal elite). Its graduates have made a significant contribution to establish the cultural, intellectual and legal life and served their country in the fields of administration, law and politics.

During the period of the study (1925-1958), the Kurdish legal elite had important and outstanding contributions in the fields of culture and thought through their active participation in the establishment of cultural associations and clubs. They worked in publishing newspapers and magazines, and in writing books in various fields of literature and politics. Since 1939, the Kurdish legal elite has achieved a qualitative leap in the cultural and intellectual development. This elite has become an important factor in the development of the cultural and political realms through their active contributions to advancing the cultural and intellectual aspects of the community.

The nature of the research necessitated its division into three main parts, each one containing several topics. The subject of the first part is (opening the law school in Iraq, and the emergence of Kurdish legal elite 1908-1925), while (the cultural and intellectual role of the Kurdish legal elite during 1925-1938) is the title of the second part. The third and last part highlighted (a new stage in the cultural and intellectual activity of the Kurdish legal elite 1939-1945). The main findings of the research were presented in the conclusi.

# زمانی کوردی
# وەک دیاردەیەکی ئێتنیکی

**پ. د. ڕەشاد میران**
کۆلێژی ئەدەبیات
زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر

**پێشەکی**

زمان دیاردەیەکی کۆمەڵییە، زمانی تاکە کەسێک هەرگیز نەبووە و نییە؛ هەمیشە دەگوترێ زمانی کۆمەڵگا، نەتەوە یان میللەت - بۆیەش زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە. کۆمەڵناسان چەندین نیشانە و مۆرکیان داناون بۆ دیاردەی کۆمەڵایەتی، لەوانە: بابەتیبوون، گشتگیری، ناچاری، مێژوویی، بەردەوامی... و ئەگەر سەرنج بدەین هەموو ئەو مۆرکانە بەسەر زمانەوە هەن – جا هەر زمانێک بێت .

زمان هەروەها دیاردەیەکی ئێتنیکیشە، چونکە زمان هەمیشە نەتەوەییە - هەر نەتەوە و میللەتێک، هەر گرووپێکی ئێتنیکی زمانی تایبەت بە خۆی هەیە؛ بگرە ئەوە زمانە، زێتر لە هەموو دیاردەکانی تر، ناسنامەی نەتەوەیی هەر گرووپێک دیاردەکات. لە زانستی ئێتنۆگرافیادا، زمان لەناو مەرج و مۆرکە ئێتنیکییەکاندا جێگەی هەرە شیاوی گرتووە (مەرج و مۆرکە ئێتنیکییەکان : ناوی نەتەوەیی، زمان، خاک، مێژوو، کولتوور، سایکۆلۆگیای هاوبەش...) ؛ دواجار، زمان دیاردەیەکی کولتووریشە- هەموو توخمەکانی کولتووری ماددی و کولتووری گیانی (مەعنەوی) بە زمانی هاوبەشی ئیتنۆسەکە لە ژیانی ڕۆژانەدا پیادە دەکرێن... بۆیە، هەرچەندە زمان خۆی توخمێکی کولتووری گیانییە، بەڵام لەبەر گرنگی و بایەخی هەمیشە دەگوترێ "زمان و کولتوور" .

لە ئاستی تاکەکەسیش، زمان پەیوەستە بە فیکرەوە و هەرگیز بێ یەکدیی نابن- هەرکەسێک ئەوەی بە زمان دەریدەبڕێ لە فیکر و

هۆشـیەوە سـەرچاوەی گرتـووە؛ بۆیـە هەمیشـە زمـانی تاکەکەسـێک ئاوێنەیەکی ڕوونی فیکر و لۆگیکی ئەو کەسەیە...

زمـانی کـوردیش لـەم بنەمایانـە بـەدەر نییـە . بـۆ دەرخسـتنی تایبەتمەنـدی و ڕۆڵ و کاریگـەریی زمـانی کـوردی، گرنگـە بـزانین پەیوەندییەکانی ئەو زمانە بە دیاردەکانی تری ئێتنۆکۆمەڵایەتییەوە لە کۆمـەڵگای کوردیـدا چـین و بـە چ میکانیزمێـک بـەڕێوەدەچن، وەکـو دیاردەکانی: ناو و ناونان، ئایین، ڕاگەیاندن ...

**زمانی هاوبەش**

زمـان دیاردەیـەکی کۆمەڵایەتییـە، هـەموو جـۆرە کۆمـەڵبوونێکی خـەڵک دەبێ زمـانێکی هـەبێت و هاوبـەش بێت بۆ هـەموو ئەندامانی – بـەبێ زمـانی هاوبـەش خـەڵک نـاتوانن پێکـەوە بـژین . ئەمـە بێگومـان نەتـەوەش دەگرێتـەوە، چونکـە نەتـەوە دیاردەیـەکی کۆمەڵایـەتی – مێژووییە، بۆیە زمانی هاوبەش مەرجێکی بنەڕەتییە بۆ نەتەوە . نەک هـەر ئـەوە، بـەڵکو لەبەرئـەوەی زمـان، لەهـەمان کاتـدا، دیاردەیـەکی کولتووریشـە و کولتـووریش هەمیشـە نەتـەوەییـە، کەواتـە زمـانیش هەمیشـە نەتەوەییـە و هەرلەبـەر ئەوەشـە زمـان بـووە بـە مـەرج و مۆرکێکی گرنگی نەتەوە (ئێتنۆس) / د. ڕەشاد میران ؛ ٢٠٠٩، ل١٢/ ؛ هـەر لـەم ڕووەشـەوە دەبـێ بڵێـین کـە زمـان ئەگـەرچی تـوخمێکی کولتوورە، بەڵام لەبەر دەور و بایەخی یەکجار گرنگی، بەڕادەیەکی باش سەربەخۆیە و بۆیەش هەمیشە پێکەوە ناویان دێت و دەگوترێ : زمان و کولتوور- چونکە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و کولتووری هەمیشە بەڕێگەی زمانی نەتەوەییەوە پیادە دەکرێن .

هەموو دیاردە و لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایـەتی و کولتووری لـە زمـانی هاوبەشـی ئەنـدامانی ئێتنۆسـدا ڕەنگدەدەنـەوە، لـە سـۆنگەی ئەوەشـەوە ئێتنۆگرافیـا پشـت، بەتایبـەتی، بـە زمـان دەبەسـتێت بـۆ دیارکردنی ڕادەی دووری و نزیکی و خزمایەتی لەنێوان ئێتنۆساندا ـ بۆ

ئەمەش ئەم زانستە زمانانی ئێتنۆسانی دابەشکردووە بەسەر چەندین خێزانەزمان کە تیایاندا زمانە لێک نزیکەکان پۆلینکراون.

زمانی هاوبەشی هەر ئێتنۆسێک، وەکو دیاردەیەکی ئاسایی، چەندین دیالێکت و شێوەزاری دەبێ ؛ جاری واش هەیە، ئەم دیالێکت و شێوەزارانە، تابلێی جیاواز و لێک دوورن، بەڵام ئەمە نابێت بە گرفت بۆ زمانی هاوبەش بەتایبەتیش ئەگەر ئێتنۆس زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو، واتە زمانی نووسینی هەبێ . لەم ڕووەوە، ئێتنۆسی کورد زمانێکی هاوبەشی هەیە کە پێیدەگوترێ (زمانی کوردی)، ئەو زمانەش چەندین دیالێکت و شێوەزار دەگرێتەخۆ کە بەگشتی ئەم دیالێکتە سەرەکییانەن :

- کرمانجیی باکوور
- کرمانجیی باشوور
- لوڕی
- گۆران / د. زەرێ یوسوپۆڤا؛ ٢٠٠٥، ل١٢/
- زازا / زبیر بلال اسماعیل؛١٩٧٧، ص٦٣- ٦٥/

وەکو دەزانین ئەم دیالێکتانە بەڕادەیەکی باش لێک دوورن، دەتوانین بڵێین گرفتی لێکگەیشتن لەنێوان ئاخێوەرانی ئەم دیالێکتانەدا هەیە و ئەوەی گرفتەکەش گەورەتر دەکات نەبوونی زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردییە ؛ کورد بە چەند زمانێکی ئەدەبی دەنووسێ و، لەهەمان کاتدا، چەند ڕێنووسێکی جیاوازیش بەکاردێنێ : زۆربەی زۆری ئاخێوەرانی کرمانجیی باکوور بە ئەلفوبێی لاتینی دەنووسن، کرمانجیی باشوور بە ئەلفوبێی عەرەبی، کوردەکانی رووسیا و قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاست بە ئەلفوبێی ڕووسی (کیریلی) و زۆریشیان بەم دوایییە بەلاتینی دەنووسن ... ئەمەش کێشەیەکی کولتووری – کۆمەڵایەتی – سیاسیی گەورەی دروستکردووە بۆ کورد کە خۆشی، واتە ئەم کێشەیە، لەڕاستیدا زادە و بەرهەمی ڕەوشی سیاسیی دابەشکراوی نەتەوەی کوردە.

لێرەدا، ئەگەرچی نموونەی ئێتنۆسانی خاوەن زێتر لە یەک زمانی ئەدەبیمان هەیە – وەکو : نەرویجییەکان بە دوو زمانی ئەدەبی دەنووسن و دەخوێننەوە (بوکمۆل) و (نینۆشک)، هەروەها ئەرمەنییەکانی ولاتی ئەرمەنستان و ئەوانەیش کە لە ولاتە ڕۆژئاواییەکان دەژین – دوو زمانی ئەدەبی لێک جیا بەکاردێنن/ *V.P.Berkov;1983,p.5; C.A. Arutunov.1986,p.32* / و ڕەنگە نموونەی تریش هەبێت... لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم ڕەوشەی زمانی ئەدەبیی کوردی هەرگیز ئاسایی نییە، بگرە گرفت ئامێزە و دەبێ چارەی گونجاوی بۆ بکرێ – چونکە ئەمە گرفتێکە لە یەکێک لە گرنگترین و کاریگەرترین مەرج و مۆرکە ئێتنیکییەکانی ئێتنۆس – مانەوە و بەردەوامبوونی ئەم گرفتە لە توخمێکی لەم بابەتەدا کاریگەریی خراپی دەبێت لەسەر چارەنووسی ئێتنۆسەکە ؛ بەگوتەیەکی تر، بۆ ئێتنۆسێکی وەکو کورد – ئەمە بابەتێکی ستراتیژییە و پەیوەندیی بە مان و نەمانی نەتەوەیەکەوە هەیە و چارەکردنی پێویستی بە بڕیارێکی سیاسیی بوێرانە هەیە و دەسەلات دەبێ، بەتایبەتی لەم بوارەدا، دووربێت لە هەموو هەست و ئینتیمایەکی ناوچەگەری، زانستانە و نەتەوەییانە بڕوانێتە ئاست و ڕادەی پێشکەوتنی مێژوویی ناوچە و دیالێکت و شێوەزارەکان، چونکە دەسەلاتی سیاسی دەتوانێ دەوری باڵا ببینێ لە هاندان یان تەگەرەخستنە بەردەم پرۆسەی دروستبوون و گەشەکردنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوودا.

*****

هیچ کەس و هیچ شتێک بێ ناو نییە، ناوەکانیش دەبێ لە زمانە هاوبەشەکەی ئێتنۆسەکەوە بن، تەنانەت ئەگەر ناوەکانیش لە زمانی ترەوە وەرگیرابن، ئەوا هەر دەبن بە ناوی نەتەوەیی و ناوەکان (بێگومان ناوی کەسی) بە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتیی ناونانەدا هەڵدەبژێردرێن...

**ناوی کەسی Anthroponym**

ئەوەش بوارێکی ترە کە لە ڕوانگەی زانستەوە، بەشێکە لە زمان، چونکە ناوی کەسی پێش هەموو شتێک بریتییە لە وشە، ئەگەرچی سیمانتیکای ئەم وشەیە، واتە مانا و ناوەرۆکی بەکەمترین ڕادە لەسەر ستروکتور و بنیادی زمانەکە دەوەستێت/ Alim Gafurov;1987,P.3 /، لەمەدا زێتر هۆکاری سۆسیۆکولتووری دەور دەبینێ.

ناو، ناوی مرۆڤ، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و، وەکو باوە، هەر میللەتە ناو بەزمانی نەتەوەیی خۆی بۆ ئەندامەکانی هەڵدەبژێرێ. بەڵام زۆر جاران، لەبەر گەلێ هۆ و هۆکاری مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسی، ناوی سەربە زمانێکی تری بێگانە لەناو میللەتێکدا بڵاودەبنەوە. نموونەش بۆ ئەمە زۆرن؛ نزیکەی هەر هەموو میللەتانی موسڵمان ناوی عەرەبی، یان بە ڕەچەڵەک عەرەبی، بەکاردێنن، کوردیش وەکو میللەتێکی موسڵمان لەم ڕێسایە بەدەر نییە.

سەبارەت بەو ناوە "عەرەبی" یانەی لە کوردەواریدا باون، دەتوانین بڵێین کەوا هەرگیز لەخۆوە هەڵنەبژێردراون، بەڵکو لە زۆر لایەنەوە سایکۆلۆژیا و مینتالیتێتی (عەقڵیەت) مرۆی کورد دەردەبرن- لەلایەکەوە سایکۆلۆژیای پڕ عەقیدەی ئیسلامی، لەلایەکی تریشەوە شێوازی بیرکردنەوە و عەقڵیەتی باوکسالاری، هەردووکیشیان سیمای هەرە دیار و کاریگەری کۆمەڵگای کوردین / د. ڕەشاد میران ؛ ١٩٩٧، ل ١٢٢- ١٢٣/. هەروەها هەندێ لایەنی تریش لە ناوەکانی ئەندامانی کۆمەڵگای کوردیدا ڕەنگدەدەنەوە، وەکو: ڕووداوی مێژوویی و سیاسی و دیاردەکانی سروشتی وڵاتەکەیان، ئەوەش نەتەنیا بۆ کورد، بەڵکو دیاردەیەکی گشتییە و هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. لە کۆمەڵگای کوردیدا، ناوی کەسیی ئەندامەکانی دیاردە و ڕووداوەکانیان ڕەنگداوەتەوە. شانبەشانی ئەوەش، ناونانی منداڵی تازە لەدایکبوو، خۆی لە خۆیدا، پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتییە و مەراسیمی ئایینی دەگرێتەخۆ. جاران، دەبوایە مەلایەک ناوی هەڵبژاردراو بەگوێی منداڵەکەدا بانگبدات-

حـاڵەتی واش دەبـوو کە مەلا نـاوەکەی بەدڵ نەدەبـوو، دەیگـۆڕی و ناوێکی موسڵمانانەتری بە گوێی منداڵەکەدا بانگدەدا – باوک و دایکیشی بێدەسەڵاتانە بەناوەکەی ڕازیی دەبوون. کەواتە، ناو و پرۆسـەی ناونـان مانا و ناوەرۆکی ئاینی، واتە سۆسیۆکولتووریی بەخۆوە گرتبوو . ئەم نـاوە ئیسـلامییە هەڵبژێـردراوانە ئەگەرچـی عەرەبـی بـوون بەڵام لە ڕێرەوی مێژوویەکی درێژدا مۆرکی کوردیزمیان وەرگرتووە. ئەم جۆرە نـاوانە بەڕادەیەک لەکۆمەڵگـای کوردیـدا بـڵاون کە وایلێهـاتووە بڵێـین ئەمـانە تـایبەتن بەکـوردەوە، وەکـو: قـادر، ڕەشـید، عەبـدوڵڵا، سـلێمان، جەبار، ڕەسـوڵ، مەولـود، عەزیـز... هتد، نـاوی ژنـانیش حەلیمە، فاتیمە، بەدیـــعە... هتـــد؛ جـــگە لەوەش، زۆر لەوانە گـــۆڕانی فۆنۆتیکییـــان بەسەرداد ێ/K.K.Kurdoev ;1985.p.194 /، وەکو– عەوڵا، ڕەشۆ، قەدۆ، فاتێ، حەلێ... هتد، ئەم نـاوانە و گەلێکی تـریش، نەک هەر سیمای کوردییـان وەرگرتـووە، بەڵکـو بەهـۆی ئەو گـۆڕانە فۆنـۆتیکییەوە تەواو بـووین بەکوردی و کورد بێ ئەوەی گومـان لە کوردیبوونیـان بکـات بەکاریـان دێنێ.

نـاو و ناونـان، وەکـو دیـاردە و پرۆسـەیەکی کـۆمەڵایەتی، وەکـو گوتمـان، لەڕێـڕەوی مێژوویەکـی درێـژدا گۆڕانیـان بەسـەردا دێـت و دەکەونە ژێـر کـارتێکردنی ڕووداو و هۆکـاری جۆراوجـۆرەوە– واتە مێژووی خۆیان هەیە.

سـەبارەت بەناونـان، هەر زوو دەتـوانین بڵێـین زۆر کەمبـۆتەوە و شێوەی پرۆسەی جارانی نەماوە. هەرچی دیاردەی نـاوە، ئەوا دەتوانین سەرنج بدەین کە دوای ئەوەی نـاوی ئیسـلامی (عەرەبی) لە کۆمەڵگـای کوردیـدا بەجـۆرێکی سـەرەکی بـاوی هەبـوو، لە سـاڵانی چلەکـانی ئەم سـەدەیەوە خەڵکـی زێتـر نـاوی کوردییـان بەکارهێنـاون، بەتـایبەتیش ئەوانەی پەیوەندییان بەو ڕووداوە مێژوویی– سیاسـییانەوە هـەبووە کە دەوریـان بینیوە لـە بەرزبوونـەوەی ئاسـتی هوشـیاریی نەتەوەیـی کـورد بەگشـتی "ڕاپەڕیـن و شـۆڕش و بـزووتنەوە چەکـدارییەکان"؛ نـاوی وا

هاتنە ئاراوە کە ڕاستەوخۆ مانا و ناوەرۆکی کوردایەتییان دەربڕیوە، یان دیاردەکانی سروشتیی کوردستانیان نیشانداوە، وەکو : ئازاد، خەبات، سیروان، کوردستان، مەهاباد، ئەڤین، سەفین، فێنک... هتد. کەواتە ناوی ئەندامانی میللەتێک، کۆمەڵگایەک دەتوانن ببن بە ئاماژە بۆ ئەو قۆناغە مێژوویی – کۆمەڵایەتییەی کە ئەو میللەتە تیایدا دەژی.

بەهەمان جۆر، لەو ساڵانەی دوایی و بەپێوەندی بەو مەینەتییانەوە کە بەسەر میللەتی کورددا هاتن لە کوردستانی باشوور، بەرزبوونەوە و زێدەبوونی هوشیاری ئایینیی خەڵک شێوەی پرۆسەیەکی دیاری وەرگرتووە و بۆیەش دەبینین، دیسان جارێکی تریش، ناوی ئیسلامیی عەرەبی ئەوا دێنەوە پێش. لە ناوێکی وەکو "محەمەد نەوزاد"دا زۆر بەئاسانی دەتوانین دوو نەوەی سەر بە "ئایدیۆلۆگیا" ی جیاواز بەدی بکەین.

لێرەدا، گرنگ بەلای ئێمەوە ئەوەیە کە مرۆی کورد کاتێک ناوی ئیسلامیی عەرەبی بۆ منداڵەکەی دادەنیێ، ئەوا لەو ناوانە دەبێت کە لە کوردەواریدا بڵاون ؛ یان دەتوانین بڵێین ئەو ناوانەی "بووین بە کوردی" ؛ هەروەکو لەسەرەوە بینیمان، ناوی کەسی Anthroponym لە کاتێکدا خۆی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، هەروەها دەور و بایەخی نەتەوەیی هەیە و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەبێت بەجۆرێک لە شەقڵ و سیمای نەتەوەیی بۆ ئێتنۆسێک .

**ناوی ئێتنیکی Ethnonym ( ناوی نەتەوەیی )**

ئێتنۆنیم یەکەمین و گرنگترین نیشانەی هەبوونی ئێتنۆسە ؛ وەکو ئاشکرایە بەبیێ ناو ناکریێ باس لە دیاردەکە بکریێ – بۆیەش هەموو دیاردەیەک، لەهەمان کاتدا ئێتنۆسیش، ناوی تایبەتیی خۆی هەیە . تایبەتمەندیی سەرەکیی ئێتنۆنیم لەوەدایە کە ناوێکی مێژووییە، چونکە لەگەڵ دروستبوونی ئێتنۆسەکەدا دەبیێ و گوزارش لە لایەنێکی گرنگی مێژووی ئەو ئێتنۆسە دەکات، وەکو : سەرکردەیەک

(باپیرەگــەورە) — ئوزبێــک، رووس (روســلان)، چیــک (چــێخ)، رۆمــان (رۆمیلیۆس) ؛ ناوی شوێن ( ولات) — قیرگیز، ئوکراینا/

V. Kazlov ;2/1974 , 86 / ؛ یاخود جاری واهەیە ناوی ئێتنۆسێک لە تایبەتمەندیی لایـەنێکی کولتـوورییەوە دروستدەبێ وەکو، بۆ نموونـە، جلوبــەرگ — قەرەقــەلپاخ ( واتــە — کــلاو ڕەش)/ برومليــه، بــودولنی ؛ ١٩٨٨، ص ٧١/ ؛ گـەلێک لـە نـاوە ئێتنیکییـەکانی ئێسـتاکەش بـەمانای (مرۆڤ) دێن کە لە زمانانی کۆنی ئێتنۆسـەکانەوە ماونەتـەوە، وەکو بۆ نموونـە نـاوی ئێتنۆسـی ( تـورک) هـەروەها(دۆیچ) / *بــروملیه*، هـەمان ســەرچاوە، ٦٨ / — ئــەوەش لــەوەوە هــاتووە کــە لــە ســەرەتای دروستبوونی ئـەم ئێتنۆسانەدا، ئەمانـە، هـەر تـەنیا خۆیانیـان بـە مرۆڤ زانیوە و ئێتنۆس و خەڵکی تریان بە شتی تر داناوە، نەک بە مرۆڤ .

بـەلام بەگشـتی، مـەرج نییـە مانـای هـەموو ئێتنۆنیمـەکان دیـار و ئاشکرابن ؛ ئەوەش چونکە زۆربەی هەرە زۆریان گەلێ کۆن و لە زمانە دێرینەکانــەوە ماونەتــەوە و ئاســان نییــە ماناکانیــان ڕوون بکرێنــەوە، یــەکێکیش لەمانـە ئێتنـۆنیمی (کـورد)- ئەگـەرچی مانـای ئێتنـۆنیم گـەلێ گرنگە و، وەکو گوتمـان، پەیوەندیی بە مێژووی ئێتنۆسـەکەوە هەیـە و ڕوونکردنەوەی چەندین لایەنی مێژوویی و زمانەوانی ئاشکرا دەکات .

دەتوانین سەرنج بدەین کە هەندێ ئێتنۆس دوو جۆر ئێتنۆنیمیان هەیە / د. ڕەشاد میران ؛ ٢٠٠٩، ل٤٨/ :

– ئیندۆئێتنۆنیم، ناوی نەتەوەیی خۆیی (ناوخۆ)، واتە ئەو نـاوەی ئێتنۆســەکە لەناوخۆیـدا بۆخـۆیی بـەکاری دێنـی و خـۆی بـەم نـاوە دەناسێنێ ؛ جۆری دووەمیش:

– ئێکزۆئێتنۆنیم، ناوی دەرەکی، واتە ئەو ناوەی خـەڵکی تـر، لـە دەرەوە، ئەو ئێتنۆسەی پێدەناسن . نموونەیەکی دیار و بەناوبانگی ئـەم حاڵەتـەش ئێتنـۆنیمی ئـەو ئێتنۆسـەیە کـە ئێمـە بـە (ئـەڵمان ) دەیناسـین، کەچی ئەندامانی ئەم ئێتنۆسە خۆیان بەخۆیان دەڵێن (دۆیـچ) — لێرەدا، نــاوی (ئــەڵمان)، کەواتــە، ئێکزۆئێتنۆنیمــە و نــاوی (دۆیچ)یــش

ئیندۆئێتنۆنیم؛ نەهەر ئەوەندە، بەڵکو وەکو دەردەکەوێت ئەم ئێتنۆسە زێتر لە یەک ئێکزۆئێتنۆنیمی هەیە، ئەوەتا ڕووسەکان بەم ئێتنۆسە دەڵێن (نێمیتس)، ئینگلیزەکان پێیاندەڵێن (جێرمەن)، سویدییەکان – (تیسک)، ئیتالییەکان – (تیدیسکۆ)، سربییەکان - (شڤاپ)، فەڕەنسییەکان و گەلێ لە ئێتنۆسانی تریش پێیاندەڵێن (ئەڵمان)... ئەم هەموو ناوە دەرەکییە (ئێکزۆئێتنۆنیم)، کەچی خۆشیان بەخۆیان دەڵێن (دۆیچ) و وڵاتەکەشیان (دۆیچلاند)/ U.V.Bromley; 1983, 46 / – ئەمەش ئەگەرچی حاڵەتێکی تایبەتە، بەڵام ڕوونکردنەوەی خۆشی هەیە ؛ وەکو ئاشکرایە، خێڵ و هۆزە جەرمانییەکان، کە هاتن بۆ ئەوروپای ڕۆژئاوا و پایتەختی ئیمپراتۆریای ڕۆمانییان گرت و وێرانیانکرد، کۆنفدراسیای خێڵەتییان هەبوو و پێکهاتبوو لە خێڵ و هۆزەکانی : نێمیتس، تیسک، تیدیسکۆ، جێرمەن، ئەڵمان، شڤاپ، فرانک، ڤەندال و ... ئەمانە هەریەکە لە ناوچەیەکی ئیمپراتۆریاکە نیشتەجێبوون و ئێتنۆسانی دەوروبەریش بەناوی ئەو خێڵانەی لێیانەوە نزیکبوون ئەمانەیان ناسیوە و بۆیەش لە ئەنجامدا چەندین ناوی دەرەکیی بۆ ئەم ئێتنۆسە دروستبوون . هەر بەم بۆنەیەشەوە، خێڵەکانی (فرانک) کە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئیمپراتۆریای ڕۆمانییان داگیرکرد، واتە ئەو شوێنانەی ئێستاکە وڵاتی فەڕەنسا پێکدێنن، ناوەکەیان (فرانک) لە ئەنجامدا بوو بە ئێتنۆنیمی ئێتنۆسی فەڕەنسی – دوای ئەوەی ئەم خێڵە جەرمانییە لەناو دانیشتوانی زمان لاتینیی ئەم ناوچانەدا توایەوە، کەچی ناوەکەی هەر مایەوە و بوو بە ئێتنۆنیم، لەهەمان کاتیشدا، ئەم ئێتنۆسە– مەبەست فەڕەنسییە، ناوی (ئەڵمان) بۆ ئێتنۆسی هاوسێی بەکاردەبا کە ئێتنۆنیمی خۆیی لە توخمێکی ئەوەوە بۆ ماوەتەوە / هەمان سەرچاوە / . هەرچی سەبارەت بە ڤەندالەکانە، ئەوان بوون کە شاری ڕۆمایان تەخت و وێرانکرد و بەوپەڕی دڕندەیی قەلاچۆی خەڵک و دانیشتوانەکەیان کرد، کەچی ناوەکەیان نەبوو بە ئێتنۆنیم، خۆیی یان دەرەکی، بەڵکو وشەی (ڤەندالیزم) ئێستاشی لەگەڵدابێ مانای دڕندەیی و وەحشیەت دەدات .

- ئێتنۆنیمی (کورد) یش، لەڕووی ڕیشە و ڕەچەڵەکەوە، گرفت ئامێزە ؛ تاکو ئێستاش مانای ئەم وشەیە دیارنییە، هەندێ هەوڵ و تۆژینەوە لەسەر ئێتنۆنیمی (کورد) ئەنجامدراون، بەڵام بەڵگەی سەلمێنەر بۆ لێکدانەوەکان بەدەستەوە نادەن . سەبارەت بە شێوە و ڕوخساری ئەم ئێتنۆنیمە، لە سەرچاوەکانەوە دەردەکەوێت کە سەرەتا ئەم ناوە (کارد) بووە – ئەویش لە کتێبەکەی مێژوونووس و سەرکردەی جەنگیی یۆنانی کسینۆفۆن دا هاتووە بە ناوی (ئاناباسیس) کاتێک باسی کاردوخەکانی ناوچەی هەکاری دەکات ساڵی ٤٠١ پ. ز . لێرەشدا، هەرزوو دەبێ ئەوە روون بکەینەوە کە لە ناوی (کاردوخ)دا (وخ) بەشێکی ڕەسەنی ناوەکە نییە، بەڵکو ئەمە، وەکو زمانەوانی گەورەی ڕووس (مار) سەلماندوویەتی – نیشانەی کۆیە لە زمانانی یافیتیدا، یان وەکو ڤیلچێڤسکی دەڵێ لە زمانی ئەرمەنیدا/ ئۆ. ل. ڤیلچێڤسکی ؛ ٢٠٠٠، ل١٣٩/، بۆیە ناوەکە (کارد) دەمێنێتەوە و ئەوەش تابلێی لە ناوی (کورد)ەوە نزیکە و درەنگتر، لە دەوروبەری چەرخی ساسانی، ناوی (کورد) یان بەزمانی پەهلەوی (کرد) پەیادەبێ.

جێگەی باس لێرە ئەوەیە کە ناوی (کورد) ئیندۆئێتنۆنیمە و لەهەمان کاتیشدا ئێکزۆئێتنۆنیم، چونکە وەکو چۆن کوردەکان خۆیان بەم ناوە دەناسێنن، ئاواش خەڵکی تر کورد بەم ناوە دەناسن ؛ بەڵام دەبێ سەرنجی ئەوەش بدەین کە بەشێک لە کوردان لەبری (کورد) ناوی (کرمانج) بەکاردێنن ... ئێستاش گوێمان لێدەبێت هەیە دەڵێ : ئەز کرمانجم ! یان وەکو لە سەدەی حەڤدەوە (ئەحمەدی خانی) دەڵێ:

ئەز مامە د حیکمەتا خودێ دا
کرمانج د دەولەتێ دنێ دا ...

لێرەدا، ئەمە هیچی تر ناگەینێ جگە لەوەی کە ناوی (کرمانج) جۆرێک بووە لە ئێتنۆنیم و زێتریش ڕێی تێدەچێ کە ئیندۆئێتنۆنیم بووبێ، لەبەر ئەوەی هەرگیز نەمانبیستووە، نە ئێستا و نە لە

ڕابردووش، خەڵک و ئێتنۆسی تر بە ئێمەیان گوتبێ – کرمانج . دیارە لە ئەنجامدا، وردەوردە ناوی (کورد) کە دەوری ئێکزۆئێتنۆنیمیشی بینیوە جێگەی (کرمانج)ی گرتۆتەوە ... کەچی ئاسەواری ئەمەی دوایی ئێستاش هەر ماوە و بەکاردێ . وشەی (کرمانج)یش ماناکەی، بەهەمان جۆر، دیار نییە، ئەگەرچی کوردناسی ڕووس ڤ. مینورسکی لێکدانەوەیەکی بۆ ئەم وشەیە هەیە بەڵام، بە ڕای ئێمە، گەلێ سەلمێنەر نییە.

بەم بۆنەیەشەوە، جەخت لەسەر ئەوە دەکەین کە ئێتنۆنیمی (کورد) بابەتێکی گرنگی ئێتنۆگرافیای کوردە و پێویستی بە دیراسە و تۆژینەوەی زانستییە ؛ ڕوونکردنەوەی مانا و ڕەچەڵەکی ئەم وشەیە گەلێک لایەنی شاردراوەی مێژوو و زمانی ئێتنۆسی کورد دەردەخات .

**ئایین**

ئایین دیاردەیەکی کولتوورییە، توخمێکی کولتووری گیانییە و کولتووریش هەمیشە نەتەوەییە... با ئەو ئایینە لە بنەڕەتدا لە ئێتنۆسی ترەوە وەرگیرابێ، بەڵام هەر دەبێتە ئایینێکی نەتەوەیی، چونکە ئایین بەشێکی گرنگی کولتووری نەتەوەییە/ د. ڕەشاد میران ؛ ١٩٩٧ ل١٢٦/.

زمان، وەک گوتمان، دیاردەیەکی ئێتنۆ کۆمەڵایەتییە. ئایینیش هەمان مەودای سەرتاپاگیریی زمانی هەیە لەناو میللەتان و توخمێکی کولتوورە، کولتووری گیانی.

مەودای سەرتاپاگیریی ئایین لەوەدایە کە دەبێت بە شتێک زیاتر لەئایین، زێتر لە تەنیا پەرستن و بەجێهێنانی ڕەوشتی دینی؛ بەڵکو دەخزێتە ناو فیکر و هزر و دەروونی مرۆڤەوە، ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانی ملکەچی خۆیی دەکات، بەمەشەوە ئایین سەرلەبەری ژیانی کۆمەڵایەتی هەڵدەسووڕێنێ/ ڕەشاد میران: ١٩٩٣، ل٧٤/ . ئایین توخمێکی هەرە گرنگی کولتووری گیانییە بۆیەش، کەواتە، هەمیشە نەتەوەییە، تەنانەت ئەگەر ئایینەکە لە بێگانەشەوە وەرگیرابێت، ئەوەش

چونکە، کولتوور بەهۆی زمانەوە لە ژیانی ڕۆژانەدا پیادە دەکرێ، زمان و کولتووریش دوو نیشانە و ماکی ئێتنیکیی هەرە گرنگی میللەتانن.

ئاینی ئیسلام، لە سۆنگەی ئەوەوە کە بە مێژوو و بەرەچەڵەک عەرەبییە، بنەما و یاساکانی بەزمانی عەرەبی داڕێژراون، بۆیە ئاسایییە لەلایەن میللەتانی تری ناعەرەبەوە، لەمانە کوردیش، وەک ئایینێکی عەرەبی سەیر بکرێ، واتە وەکو توخمێکی کولتووری بێگانە. ئەمەش لایەنی ڕاستیی خۆی هەیە، هەر نەبێ لەبەر زمانەکەی کە زمانی عەرەبییە و، ئەو زمانە، جێپەنجەی بەسەر زمان و کولتووری ئەو میللەتانەوە تا بڵێی دیار و ئاشکرایە. بەڵام ئەمە لەگەڵ ئەو تێزەی ئێمەدا ناگونجێ، ئەوەی لە سەرەوەدا باسمانکرد و دەڵێ: ئایین توخمێکی کولتوورییە و کولتووریش هەمیشە نەتەوەییە. لێرەدا ئێمە، بۆ سەلماندنی ئەو تێزەمان، پەنا دەبەینە بەر ژیانی واقیعیی کوردەواری.

لەگەڵ ئەوەشدا کە زمانی کوردی لەڕێی ئایین و شەریعەتی ئیسلامییەوە (عەرەبیزم)ی زۆری تێکەوتووە، کەچی زمانی کوردیش شانبەشانی عەرەبی نزیکەی لە هەموو سرووتێکی ئایینی و تەنانەت لە هەندێ فەرزیشدا بەکاردەبرێ، وەکو: مارەکردن، تەڵقیندانی مردوو (ئەگەرچی مەلا هەمان گوتەکان لەم دوو حاڵەتەدا بەعەرەبیش دووپات دەکاتەوە)، نزاکردن، مەولود، جەژن.. هتد؛ نەهەر ئەوە، بەڵکو تەنانەت بەشێکی نوێژیش کە فەرزێکی ئیسلامیی سەرەکییە، بەکوردی دەبێ وەکو: نییەتهێنان بۆ نوێژکردن (بەبێ نییەتهێنان نوێژەکە بەتاڵە)؛ هەروەها دوعاکردنی دوای نوێژ ؛ لە تەوافی کەعبەشدا مرۆی کورد دوعا و نزاکانی بە کوردی دەڵێ. کەواتە دەتوانین بڵێین زمانی کوردی، بەڕادەیەکی باش، خزاوەتە نێو ئایینی ئیسلامەوە لە کۆمەڵگای کوردیدا.

بێگومان ئەم پرۆسەیەش هەر بەردەوام دەبێ و مرۆی کورد، بەحوکمی وردە وردە زیدەبوونی هوشیاریی نەتەوەیی و زانینی گرنگی و بەهای زمانی نەتەوەیی، تا دێ زێتر و زێتر ئایینەکەی بەزمانی خۆی

پیادە دەکات و ئەوەش، بەڕای ئێمە، هەرگیز دژی بنەما و یاساکانی شەریعەتی ئیسلامی نییە.

کەواتە، لێرەشدا زمانی کوردی دەوری ئێتنۆکۆمەلایەتیی خۆی بینیوە و بووە بە مۆرکێکی نەتەوەیی بۆ دیاردەیەکی سۆسیۆکولتووریی وەکو ئایین .

**ڕاگەیاندن**

ڕاگەیاندن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، بگرە دەزگایەکی بنیادیی سستەمی کۆمەڵایەتییە لە هەر کۆمەڵگایەکدا؛ بەتایبەتیش ئیمڕۆکە ژیان بەبێ ڕاگەیاندن هەرگیز بەڕێوەناچێ، بۆیەش دەبێ ڕاگەیاندن بە زمانی نەتەوەیی بێت ...

کۆمەڵگا پێکهاتووە لە چەندین دەزگای بنیادیی کە هەموویان پێکەوە ڕێکخستنێکیان دروستکردووە بۆ پاراستنی کۆمەڵگا و بەڕێوەبردنی ژیانی کۆمەڵایەتی تیایدا- ئەو ڕێکخستنە پێیدەگوترێ "سستەمی کۆمەڵایەتی" . ئەم سستەمەش بە شێوەیەکی ڕەها وەستاوە لەسەر پەیوەندیی یان پەیوەندییەکان لەنێوان تاکەکان و لەنێوان دەزگاکانی کۆمەڵگا، هەروەها لەگەڵ دەرەوەی کۆمەڵگاشدا؛ بۆیە لە کورتترین پێناسەدا هاتووە کە کۆمەڵگا بریتییە لە "پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان" / د. ڕەشاد میران؛ ٢٠١٧، ل٤٠ / .

ئەم پەیوەندییانەش، وەکو گوتمان، فەراهەم دەبن بەڕێگای دەزگا کۆمەڵایەتی (فەرمی و نافەرمی)یەکانەوە - هەر لە پەیوەندیی خوێنەوە (خێزان و خزمایەتی) بگرە تا دەزگاکانی پەروەردە، ئایینی، سیاسی، ڕاگەیاندن، کولتووری، جەنگی .../ پ. د. ڕەشاد میران ؛ ٢٠١٦، ل٥٤- ٥٥ / .

کەواتە ڕاگەیاندن یەکێکە لە دەزگا کۆمەڵایەتییەکان و ئەرکی پەیوەندیکردن جێبەجێ دەکات و هەردوو شێوەی هەیە: فەرمی و نافەرمی ... دیاریشە کە پەیوەندیکردن بە ڕێگەی زمانەوە دەبێ .لەم

<u>ڕووەوە ڕاگەیاندن زێتر لە هەموو دیاردەکانی تر کار بە زمان و لەسەر زمان دەکات؛ ڕۆڵی گەورە دەگێڕێ لە برەودان بەو شێوازە زمانەی بەکاریدێنێ لە کاری ڕاگەیاندندا- خوێنەر و بیسەر و بینەران لێیەوە فێری چەمک و گوزارشت و تەنانەت ڕێنووسیش دەبن</u>...

ڕاگەیاندن، ئیمڕۆکە، گەیشتووە بە ئاستێک کاریگەریی لەسەر تەواوی ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵگا و تاکەکانی هەیە؛ زێدەڕۆیی نابێ بڵێین ڕاگەیاندن ژیان بەڕێوەدەبات . بەم بۆنەیەشەوە، یەکێک لە ناسناوەکانی قۆناغی ئێستا، لەپاڵ پۆستمۆدێرنیزم، ناوی" قۆناغی ڕاگەیاندن "ـە ؛ یان، وەکو پسپۆران دەڵێن، سیمای سەرەکیی ڕۆژگاری پۆستمۆدێرنیزم - زێدەبوونی دەور و کاریگەریی ڕاگەیاندنە ؛ ئەمە لەپاڵ سیمایەکی تری ئەم قۆناغە کە بریتییە لە "زمانێکی پاراو، ڕوون و ئاسان " / د. ڕەشاد میران؛ ٢٠١٢، ل٩٧/ .

ئێمەش، لە کۆمەڵگای کوردیدا، درک بەو دەور و کاریگەرییەی ڕاگەیاندن دەکەین و بەشێکی زۆری ژیانی ڕۆژانەمان پەیوەستە بەو دیاردەیەوە و تەنیا ئاماژەکردن بۆ تەلەڤزیۆن، مۆبایل و ئینتەرنێت ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ- ئەمە جگەلە ڕۆژنامە، گۆڤار، کتێب، ڕادیۆ، ڕیکلام و شێوازەکانی تری ڕاگەیاندن. لێرەدا، ئێمە ئەگەرچی ناتوانین کۆمەڵگای کوردی، لەبەر گەلێ هۆ و هۆکار و دیاردە، بە کۆمەڵگای قۆناغی پۆستمۆدێرنیزم لە قەڵەم بدەین، بەڵام ڕاگەیاندنی کوردی، بەم ڕۆڵ و کاریگەرییەی، دەکرێ وەکو نیشانەیەکی هەنگاونان بەرەو ئەم قۆناغە تەماشا بکەین ... ئەم هەنگاوەش پێش هەموو شتێک پێویستی بە فەراهەمبوونی زمانێکی ئاستی شیاو هەیە کە، بەداخەوە، ئەم جۆرە زمانە لە کوردستاندا هێشتا نەڕەخساوە- نزیکەی هەر دەزگایەکی ڕاگەیاندنە زمانی کوردیی تایبەت بە خۆی هەیە... هەندێ جار ڕێنووسیشیان جیایە ! .

ئەم بارە، دەزگای ڕاگەیاندن و میدیاکاران دەخاتە پێش ئەرکێکی پیرۆز و، لەهەمان کات، قورسیشەوە. لەلایەک ئەمە واتای کارکردنە لە

بواری تێپەڕاندنی قۆناغێکی مێژوویی، لە کۆمەڵگایەکی نیمچە خێڵەکی و نیمچە دەرەبەگیی سیخناخ بە بەهای ئایینییەوە بەرەو ئاستێکی پێشکەوتووتر و نزیککردنەوەی لە کۆمەڵگایانی سەردەم- ئەمەش ئەرکێکی مێژووییە و مایەی شانازییە بۆ میدیاکاران... لەلایەکی تریشەوە، میدیاکاران خۆیان دەبێ لە ئاست ئەو ئەرک و قۆناغەدا بن، چونکە ئەمانیش ڕۆڵەی ئەم کۆمەڵگایە و بەرهەمی واقیعە کۆمەڵایەتییەکەن، هەڵگری هەمان کولتوور و ستریۆتایپی باون ؛ ئەمان کە کاردەکەن لەسەر بوارەکانی فیکر و هوشیاری و کولتوور، پێویستە بسەلمێنن کە لە خەڵک هوشیارتر و بەئاگاترن، نابێ تارمایی ستریۆتایپەکانیان بەسەرەوە دیاربن- ئەمەش ئەرکە هەرە قورسەکەیە، چونکە واتای گۆڕینی خودی خۆی میدیاکار دەگەیێ . بۆ ئەم ئەرک و قورساییەی ڕاگەیاندن و میدیاکارانیش بێگومان پێویست بە زمانێکی پاراو و پێشکەوتوو دەکات- ڕاگەیاندن و زمانێکی کرچ و کاڵ و لاواز نەگوتراوە. ڕاگەیاندن بەو دەور و کاریگەرییەی، دەتوانێ دەسپێشخەر بێت لە هەنگاونان بەرەو داهێنانی زمانی ستاندارتی کوردیی هاوبەش- ئەویش بە سوودوەرگرتن لە زار و شێوەزارەکان، هەروەها بە فشارخستنە سەر دەسەڵات بۆ بەدەمەوەهاتنی بەرەو ئەم پرسە ستراتیجییە نەتەوەییە .

بەبێ زمانێکی پێشکەوتوو ڕاگەیاندن ناتوانێ دەور و کاریگەریی بنوێنێ لە پرۆسەی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی و کولتووریدا کە یەکێکە لە ئەرکە سەرەکی و هەرە گرنگەکانی ...

**ئەنجام**

١- زمانی هاوبەش مەرجێکی بنەڕەتییە بۆ نەتەوە . نەهەر ئەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی زمان، لەهەمان کات، دیاردەیەکی کولتووریشە و کولتووریش هەمیشە نەتەوەییە، کەواتە زمانیش هەمیشە نەتەوەییە و هەرلەبەر ئەوەشە زمان بووە بە مەرج و مۆرکێکی گرنگی نەتەوە (ئێتنۆس)

٢- ڕەوشی زمانی ئەدەبیی کوردی گرفت ئامێزە و دەبێ چارەی گونجاوی بۆ بکرێ – ئەوەش چونکە گرفتێکە لە یەکێک لە گرنگترین و کاریگەرترین مەرج و مۆرکە ئێتنیکییەکانی نەتەوە، مانەوە و بەردەوامبوونی ئەم گرفتە لە توخمێکی لەم بابەتەدا کاریگەریی خراپی دەبێت لەسەر چارەنووسی ئێتنۆسەکە

٣- هیچ کەس و هیچ شتێک بێ ناو نییە، ناوەکانیش دەبێ لە زمانە هاوبەشەکەی ئێتنۆسەکەوە بن، تەنانەت ئەگەر ناوەکان لە زمانی تریشەوە وەرگیرابن، ئەوا هەر دەبن بە ناوی نەتەوەیی و ناوەکان (بێگومان ناوی کەسی) لە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتیی ناوناندا هەڵدەبژێردرێن...

٤- ئەو ناوە (عەرەبی)یانەی لە کوردەواریدا باون، لەخۆوە هەڵنەبژێردراون، بەڵکو لە زۆر لایەنەوە سایکۆلۆژیا و مینتالیتێتی (عەقڵیەت) مرۆی کورد دەردەبڕن- لەلایەکەوە سایکۆلۆژیای پڕ عەقیدەی ئیسلامی، لەلایەکی تریشەوە شێوازی بیرکردنەوە و عەقڵیەتی باوکسالاری، هەردووکیشیان سیمای هەرە دیار و کاریگەری کۆمەڵگای کوردین...

٥- ئێتنۆنیمی (کورد) بابەتێکی گرنگی ئێتنۆگرافیای کوردە و پێویستی بە دیراسە و تۆژینەوەی زانستییە ؛ ڕوونکردنەوەی مانا و ڕەچەڵەکی ئەم وشەیە گەلێک لایەنی شاردراوەی مێژوو و زمانی ئێتنۆسی کورد دەردەخات .

٦- . ئایین توخمێکی هەرە گرنگی کولتووری گیانییە، بۆیەش کەواتە هەمیشە نەتەوەیییە، تەنانەت ئەگەر ئایینەکە لە بێگانەشەوە وەرگیرابێت، ئەوەش چونکە کولتوور بەهۆی زمانەوە لە ژیانی ڕۆژانەدا پیادە دەکرێ، زمان و کولتووریش دوو نیشانە و ماکی ئێتنیکیی هەرەگرنگی میللەتانن...

٧- ئەگەرچی زمانی کوردی لەڕێی ئایین و شەریعەتی ئیسلامییەوە (عەرەبیزم)ی زۆری تێکەوتووە، بەڵام زمانی کوردیش شانبەشانی عەرەبی نزیکەی لە هەموو سرووتێکی ئایینی و تەنانەت لە هەندێ فەرزیشدا بەکاردەبرێ...

٨- ڕاگەیاندن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، بگرە دەزگایەکی بنیادیی سستەمی کۆمەڵایەتییە لە هەر کۆمەڵگایەکدا؛ بەتایبەتیش ئیمڕۆکە ژیان بەبێ ڕاگەیاندن هەرگیز بەڕێوەناچێ، بۆیەش دەبێ ڕاگەیاندن بە زمانی نەتەوەیی بێت ...

٩- ئەگەرچی ناتوانین کۆمەڵگای کوردی، لەبەر گەلێ هۆ و هۆکار و دیاردە، بە کۆمەڵگای قۆناغی پۆستمۆدێرنیزم لە قەڵەم بدەین، بەڵام ڕاگەیاندنی کوردی، بەم ڕۆڵ و کاریگەرییەی، دەکرێ وەکو نیشانەیەکی هەنگاونان بەرەو ئەم قۆناغە تەماشا بکەین ... ئەم هەنگاوەش پێش هەموو شتێک پێویستی بە فەراهەمبوونی زمانێکی ئاستی شیاو هەیە ...

١٠-ڕاگەیاندن بەو دەور و کاریگەرییەی، دەتوانێ دەسپێشخەر بێت لە هەنگاونان بەرەو داهێنانی زمانی ستاندارتی کوردیی هاوبەش- ئەویش بە سوودوەرگرتن لە زار و شێوەزارەکان، هەروەها بە فشارخستنە سەر دەسەڵات بۆ بەدەمەوەچوون بەرەو ئەم پرسە ستراتیجییە نەتەوەیییە.

## سەرچاوە

**بە زمانی کوردی:**

١- د. ڕەشاد میران ؛ دەور و بایەخی زمانی کوردی لە پرۆسەی ئێتنۆکۆمەڵایەتیدا . گۆڤاری (زانکۆ) ژمارەی تایبەت بە کۆنگرەی زانستیی سێیەمی زانکۆی سەلاحەدین ١٩٩٧، بەرگی ١، هەولێر ١٩٩٨
٢- د. زەری یوسوپۆڤا- شێوەی سلێمانی زمانی کوردی ؛ وەرگێرانی لە رووسییەوە د. کوردستان موکریانی، هەولێر ٢٠٠٥ بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان
٣- د. ڕەشاد میران ؛ ئێتنۆگرافیا و یەکێتیی ئێتنیکیی کورد . هەولێر، دەزگای ئاراس ٢٠٠٩
٤- ئۆ. ل. ڤیلچێڤسکی ؛ نەژادی کورد . وەرگێرانی لە زمانی ڕووسییەوە د. ڕەشاد میران، چ٢، هەولێر٢٠٠٠
٥- ڕەشاد میران: ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا، ستۆکهۆڵم ١٩٩٣
٦- د. ڕەشاد میران؛ ڕاگەیاندن و کاریگەرییەکانی لەسەر تاک و کۆمەڵگا . گوڵان ژ . ( ١١١٩) ساڵی ٢٠١٧
٧- پ. د. ڕەشاد میران ؛ سۆسیۆلۆگیای ڕاگەیاندن . هەولێر ٢٠١٦
٨- د. ڕەشاد میران؛ مەعریفە و تاک و کۆمەڵ - لە ڕوانگەی سۆسیۆلۆگیای مەعریفەوە . هەولێر ٢٠١٢

**بە زمانی عەرەبی:**

٩- زبير بلال اسماعيل ؛ تاريخ اللغة الكردية . بغداد ١٩٧٧
بروملیه، بودولنی ؛ الاثنوس والتاريخ . ترجمة طارق معصراني، موسكو دار التقدم، ١٩٨٨

**بە زمانی ڕووسی:**

10- V.P.Berkov. Yazikovoe Polojenie v Narvegia, v kn. Isledovania v Yazikoznania i Ethnografia (yozik I etnos). Leningrad, Nauka,1983.p.5
11- C.A.Arutunov,, Etnichskie Protsesi e Yazik,,- Rasi e Narodi,, 15/1985, Nayka, Moskva, 1986.p.32
12- Alim Gafurov,, Imia i Istoria - ob iminakh arabov, persov, tajikov i turkov-slovar,, Moskva Nauka, 1987.p.3.
13- K.K.Kurdoev,, Sobstvinie Imina V Kurdiskom Yazike",v kn.,,Strani i Narodi Blejnevo i Srednevo Vostoka,,. Kurdovedine, XIII, Eerivan. 985.p.194-195
14- V. Kazlov; promlema Etnychskovo samosoznanya . Sovetskaya Etnografya, 2/ 1974 , 86
15- U.V.Bromley; Ocherki Teori Etnosa. Moskva, Nawka 1983

## ملخص البحث

## اللغة الكوردية كظاهرة اثنية

**أ.د. رشاد ميران**
كلية الاداب — جامعة صلاح الدين

من اجل معرفة خصوصية اللغة الكوردية، علاقتها وتاثيرها على الظواهر الاثنية- السوسيولوجية الاخرى في المجتمع الكوردي، اقتصرنا في هذا البحث على الظواهر مثل : الاسم و التسمية، الدين، الاعلام .

اللغة هي من ابرز العلامات الاثنية للشعوب، اذ هي احدى العناصر المهمة للثقافة ولذلك مرتبطة عضويا بالعناصر الثقافية- الاجتماعية الاخرى . وقد حاولنا في هذا البحث ان نبين دور وتاثير اللغة الكوردية في الاسماء والعملية الاجتماعية في اختيارها لافراد المجتمع الكوردي ؛ و وجدنا انه بالرغم من ان اغلبية الاسماء ذات جذور عربية، وذلك بتاثير الدين الاسلامي، الا ان اللغة الكوردية قامت باضافة بعض من خصوصيتها "اللفظية" الى هذه الاسماء ... وكذلك في ما يتعلق بدورها في مجال الدين، اذ ان العبادات والمراسيم الدينية، بالاحرى اغلب جزئياتها، تجرى باللغة الكوردية .

ان نشوء وتنامي دور الاعلام الكوردي قد مهد له الطريق للقيام بدور قومي بارز، بالاخص، في مجال اللغة ؛ و ذلك كونه في علاقة متواصلة ومباشرة مع افراد المجتمع، فكان على مؤسسة الاعلام الكوردي (الرسمي و غير الرسمي) القيام بدور مكمل لدور المؤسسات الاخرى في عملية تطوير اللغة الكوردية .

Abstract

**Kurdish Language as an Ethnic Phenomenon**



**Prof. Dr. Rashad S. Miran**
College of Arts – Univ. of Saladin


Language is a social phenomenon, individual languages has never existed, it has been always called the language of community, nation or country. For this reason, language is meant to be a social phenomenon. A sociologists has provided some intimations for these phenomena (subjectiveness, generality, compulsion, historical, continous,…) and if we pay good attention to these abstracts, they are all obtainable in a language – no matter which.

Language is also an ethnic phenomenon, because it has always been national - every nation or ethnic groups have their own specific language; as each language identifies the nationality of each group. In the Ethnographic field, language has taken a ethnic requisite factors (ethnicity requisites :Ethnonym, language, land, history, culture,..). Language also is a cultural phenomenon – every material & nonmaterial cultural element is used in daily life and practices by the language; so even though language itself is a nonmaterial cultural element but due to the importance and significance of it, it's called "Language & Culture".

The Kurdish language also has all these factors. To reveal the significance and influence of Kurdish language, it's important to acknowledge what the relationships of this language is with the other Ethnosociological abstracts in the Kurdish community and by which mechanisms are they performed ; name or classifying, religion, media… There's no individual or material unnamed, while the names are supposed to be taken from ethnic languages, and even if they weren't, it will eventually derive as a national name and will be chosen through a social process of naming.

Religion is a cultural phenomenon, a nonmaterial cultural element, and culture is always national… Even if this certain religion was originally taken from other ethnics, but it stays as a national religion, because religion is an important portion of a nation's culture.

Media is a social phenomenon, which is a structural organization in every society; specifically today, life without media will cease, as in why media is obliged to be in national languages.

# زەرادەشت وار و سەردەمێ وی

## پرتا دووێ: ئاڤێستا

**د.عەبدولرەحمان مزووری**

ئەندامێ ئەکادیمیا کوردی

ئاڤێستا Avesta پەرتووکا ئێکانەیا دینێ زەرادەشتییە. د ژێدەرادا ناڤێ وێ ب گەلەک تەخلیتان وەک: ئەویستا، ئیستا، ئیستاه، ئوستاق، بستاق، ئابستاق، بستاه، ئابستا، ئاپستاک، ئوستاک ... هاتیە (مشکور، ١٣٢٥ ش، ب ٤٩) . ب هزرا ڤەکولەرێ ئەلمان کارل ف. گێلدنەر Karl F. Geldner رەهێن پەیڤا ئاڤێستاAvesta فارسی و کوردی، ئاڤێستاک Avestak و ئاپەستاکێن Apastak پەهلەوی، دگەهنە پەیڤا هندوئیرانییا کەڤن ئوپاستا Upasta ، ب ئانکویا: ئاڤاهیێ قاهیم و راوەستای Ave . کورتکرنا ئاڤاهییە، sta ژی کورتکرنا وەستانێیە. (Geldner,1886, Teil.1, p. 63)

ڤەکولەرێ ئیرانی محەمەد تەقی بهار ئانکویا ئاڤێستا هەر مینا گێلدنەرGeldner لێکدایە و نڤێسیە: بنیانِ جا أُفتاد ومُحکم. ئانکو ئاڤاهیێ جهگرتی و قاهیم (بهار، ١٣٧٦ ش، جـ ١ ب ٣٨).

دکەڤرنکراندیێن سەردەمێ هەخامەنشیدا (٥٥٩ ــ ٣٣٠ ب. ز) مینا فردریش شپیگل Fr. Spiegel دبێژێ، پەیڤا ئوباشتاUbashta ب ئانکویا قانون هاتیە (Spiegel, 1863, p. 48). مخابن شپیگل Spiegel نە نڤێسیە دکەڤرنکراندیێن کیش شاهێ هەخامەنشیدا (ئەخمینیدا) ئەو پەیڤ هاتیە. ب هزرا ڤەکولەرێ ئەلمان گوستاڤ ئوپەرG. Oppert پەیڤا Abastäm ئەوا د ستونا نەمرە: ٤ دا، ریزا: ٦٤ یدا، ژ کەڤرنکراندیێ بێستون Bistun Inscription، کەڤرنکراندیێ داریوشێ ئێکێدا (٥٢١ ــ ٤٨٦ ب. ز) هاتی، رامان ژێ ئاڤێستا Avesta یە (Browne, 1977, Vol: 1, p. 78). لێ فردریش



ڤەکولەرێ ئیرانی هاشم رضی

ئەندریاس Fr. Andreas دبێژێ پەیڤا ئاڤێستا ژپەیڤا Upastä هندوئیرانیا کەڤن، ب ئانکویا شوڤا بنەتار ground text هاتیە (Ibid) .

پێتریا ڤەکولەران ل وێ هزرێنە ئاڤێستاAvesta وڤیداVeda هەردوو ل ئێک دەڤەر و ئێک دەمدا، ل دەڤەرا ئاریاڤارتا (ئاریاناڤیج)، د سەد سالیا پازدێ هەتا چاردێدا، دەوروبەرێ ١٥٠٠ ـــ ١٤٠٠ ب. ز هاتینە ڤەهاندن و ستراندن (عبدالرحمن مزوری، ٢٠١٧، پرتا: ١، ب ٣٠٠).

مینا دپشکا ئێکێدا ژ ڤێ ڤەکولینێ د سەرمەڕا بووری، ئیسکەندەرێ مەقدونی (٣٥٦ – ٣٢٣ ب. ز) پشتی شەڕێ گاوگامێلاGaugamela (گرگوملی) و کەڤتنا شاهێ هەخامەنشی داریوشێ سێ Darius III سالا ٣٣١ ب. ز، پەرتووکا ئاڤێستا کو ژ ٢١ نەسکا naska (پەرتووکا) پێکهاتبوو، سۆت. بلاشێ ئێکێ Blash I یێ ئەشکانی (٧٨ ـ ٥١ ب. ز) تشتێ مای کوومکرەڤە. د سەردەمێ ساسانییادا، ب فەرمانا ئەردەشیرێ پاپەکان Ardashir-i päpakän ( ٢٤١ – ٢٢٦ ز) موبەدانێ موبەد تەنسەر Tansar ، بو جارا دووێ ب کوومکرنا وێ رابوو. د غەزەواتێن عەرەبێن موسلماندا جارەکا دن، هاتە سۆتن و ژناڤبرن (مشکور، ١٣٦٩ ش، ب ٦٨. پورداود، ١٣٥٤ ش، ب ٣٣ ـ ٣٤).

هەر د سەردەمێ ساسانیادا (٢٢٦ ــ ٦٥٢ ز) خەتێ ئاڤێستایی، دبێژنێ خەتێ دەپیری، ژ ٤٤ تیپان هاتەچێکرن، ئاڤێستا پێ دهاتە نڤێسین. هەتا ڤێ داویێ ژی پشکا ئاڤێستا ل ئیرانێ و هندستانێ مایی، پێ دهاتە نڤێسین (عسکری، ٢٠٠٣، ب ٢٧٨ ـ ٢٧٩).


پندار نیک گفتار نیک کردار نیک

خرده اوستا

جزوی از نامهٔ مینوی

اوستا

تفسیر و تألیف

پور داود

از سلسلهٔ انتشارات انجمن زرتشتیان ایرانی بمبئی

انجمن ایران لیگ بمبئی

از نفقهٔ پشوتن مارکر

حق طبع محفوظ است

ڤەکولەر ولیەمز جاکسون W. Jackson نڤیسیە: پشتی کەتنا دەولەتا ساسانی سالا ٦٥٢ ز، دوو لسەر سێ ٣/٢ ژپەرتووکا ئاڤێستا نەما و ژناڤچوو (Jackson, 1892, part: 1, p. 14).

د سەسالیا حەفتێ وهەشتێ زاینیدا (٦٣٥ ــ ٧٤٩ ز)، دەمێ هاتنا غەزەواتێن عەرەبێن موسلمان بو سەرداگرتنا وەلاتێ ئیرانێ. هنەک ئیرانیێن زەرادەشتی ب دیلیێ و بندەستیێ رازینەبوون، مشەختی هندستانێ بوون. هنەک پەرتووکێن خوییێن دینی وهنەک نەسکێن ئاڤێستایێ ژی دگەل خو برن. د سەد سالیا نوزدێ و هێرڤەدا ئەو پەرتووک ژلاییێن ڤەکولەرێن ئەورووپی و ئیرانی ڤە، هاتنە توژاندن و چاپکرن (پورداود، ١٩٢٦، ب ٩ ، ٢٤) .

ئەڤرو تنێ پێنج نەسک/پەرتووک ژ کووما بیست و ئێک نەسکان ماینە، ئەڤن: یەسنا27 Yasnä هاتن (فەسلن) ١٧ ژێ گاتا Gäthä نە، ڤیسپەرەد Visparad ، ڤێندیدادVendidäd ، یەشتان Yashts ، خوردە ئاڤێستاAvestä Khürda . کو د موڤکێن داهاتیدا کت کت، دێ هنەک ل سەر وان ئاخڤین.

کەڤنترین دەسنڤیسا ئاڤێستایێ بدەست مە کەتی، دزڤڕیتە سەد سالیا سێزدێ، ب خەتێ کەیخسرو ئیسفەندیار بەهرام ل بومبەی Bombay /هندستانێ، سالا ١٢٨٨ ز هاتیە نڤیسین، ل موزەخانا کوپنهاگن Kopenhagen ل دانیمارک پاراستیە (Stausberg, 2002, B: 1, p. 76). ڤەکولەرێ روس سوکولوڤ S. N. Sokolov ژی کەڤنترین دەسنڤیسا ئاڤیستایێ، زڤراندیە سەد سالیا سێزدێ سالا ١٢٧٨ ز، لێ مخابن جهێ




وێ دیارنەكریـــــە (ســـــوكولوف، وەرگێڕانــی: هــەورامانی، ١٩٨٨، ب ٢٤). دوورنییـــــە هـــــەردوو ئێـــك دەسنڤێسبن.

بەیـــــت و ڤـــــەهینوكێن ئاڤێسـتایێ، مـوڤكێن وێ، دەمـەكێ درێــژ، ژ لایــێ موبــەد و پیرێــن زەرادەشــتی ڤــە، وەك هــوزان و سروودێـــن دینـــی د هاتنـــە ژبـــەركرن. نفشـــەكی تەســـلیمی نفشـــێ دوڤـــدا دكـــرن، تـــا د سەردەمێ هەخامەنشـیاندا (٥٥٩ - ٣٣٠ ب. ز) بـو جـارا ئێكێ هاتنـە كوومكرن و پاراستن (عسكری، ٢٠٠٣، ب ٢٧٢).

مێژووڤانێ رومانی پلینیوسێ كالترPlinius the Elder (٧٩ ز مرییە) ژ نڤێسەرێ گریكی هێرمیوسHermias (٣٤١ ب. ز مرییە) ڤەگوهاستیە: كو پەرتووكـــا دینییـــا زەرادەشـــتی هەلبەســـتە (وڤەهاندنـــە)، وی ئانكـــو هێرمیوس، پەرتـووك دیتیـە و ب هوركاری خاندیـە (هاشم رضی، ١٣٧٨ ش، ب ٢٠٩).

زمانێ ئاڤێستایێ تایەكێ كەڤنارێ زمانێن هندو ئارییە Indo-Aryan (هنـدو ئیرانییـە)، ئـەوژی ئـانكو هنـدوئاری، تـایێ روژهـەلاتێ زمانێـن هندوئـەوروپیێن Indo-European ئوراسـیا Eurasia بـو (دوسـتخواە، ١٣٧٠ ش، جــ ١ ب: نـوزدە). ڤەكولـەرێ ئـەلمان كریسـتیان بـارتولومێ Ch. Bartholomae گەهشـــتیە وێ راســـتیێ، كـــو زمـــانێن ئاڤێســـتا Avesta وڤیداVeda ، دفونوتیك و رەهـ و رەڤێسـێدا هەڤپشـكن ( Browne,1977, Vol: 1, p. 59).




ڤەکولەرێ ئنگلیز ئەدوارد براون E. Browne نڤێسیە: زانایان جێمس دارمستێتەر J. Darmesteter و کلێمان هەوار Cl. Haurt ل وێ هزرێنە، رەهێن گەلەک پەیڤ و زاراڤێن نهوییێن روژئاڤایێ ئیرانێ (کوردستانێ)، دگەهنە زمانێ ئاڤێستا و دبێژنێ زاراڤێ میدیا نو Modern Medic و پەهلەوی Pahlavi.

پەیڤا کرمkirim د ئاڤێستا و کوردیدا وەکو خو دمینە، د فارسیدا دبیتە کونەمkunem . پەیڤێن: بەرزین berzin ، ئەزمezem ، گات gath ... د زاراڤێن روژئاڤایێ ئیرانێدا (کوردیدا) وەکو خو دمینن: کرkir ، بەرز berz، ئەز ez ، گوتgut ...هتد (Browne,1977, Vol: 1, p. 26-27).

مەگو ئاڤێستا کەڤن ژ ٢١ نەسکا/پەرتووکا پێکهاتبوو (هاشم رضی، ١٣٧٨ ش، ب ٢٢٣ ـ ٢٢٤)، ئەڤەنە:

ـ نەسکا ئێکێ: سۆتکەر sutker ، شودکەر shudker

ـ نەسکا دووێ: ڤەرشت مانسەر varsht-mänsar ، ڤەهشت مەنتەر vahisht-mantar

ـ نەسکا سێ: بەغbagh ، بەک bak

ـ نەسکا چارێ: دامدات dämdät

ـ نەسکا پێنجێ: ناتەر nätar

ـ نەسکا شەشێ: پاچەک pädjak ، پاجەمpädjam

ـ نەسکا حەفتێ: رەتوش ـ تائی ratush-täi

ـ نەسکا هەشتێ: بەریشbarish

- نەسکا نەهێ: کەش ـ کیسروب kash-kisrob
- نەسکا دەهێ: ڤیشتاسپ ـ ساست vishtasp-säst
- نەسکا یازدێ: ڤەشتەگvashtag ، ڤەشتی vashti
- نەسکا دووازدێ: چیترادات chiträdät
- نەسکا سێزدێ: سپند spend
- نەسکا چاردێ: بەغان ـ یەشت baghän-yasht
- نەسکا پازدێ: نیکاتوم nikätum ، نیاروم nyärum
- نەسکا شازدێ: گەنباسەر ـ نیجەت ganbasar-nidjat
- نەسکا هەڤدێ: هوسپارەم huspäram
- نەسکا هەژدێ: سەکاتومsakätum ، ئاسکارامäskäräm
- نەسکا نوزدێ: ڤێندیداد vendidäd
- نەسکا بیستێ: هادوختhädoxt
- نەسکا بیست و ئێکێ: ستوت ـ یەشت stot-yasht

ئەڤ بیست و ئێک نەسکە، وەکهەڤ ل سەر (سێ) پرتا: گاتانیک Gätänik ، داتیک Dätik و هاتەک ـ مانسەریک Hätak-mänsarik د پشککریبوون، هەر پرتەکێ ٧ نەسک دگەهشتنێ. ب کورتی ناڤەروکا نەسکێن گاتانیک ل سەر هزر و کارێن جیهانا ئەسمانییە، نەسکێن داتانیک ل سەر هزر و کارێن جیهانا ئەردییە، نەسکێن هاتەک ـ مانسەریک ل سەر هزر و کارێن هەڤپشکێن دنێڤبەرا هەردوو جیهانادایە (پورداود، ١٣٥٤ ش، ب ٢٢٨).

د پەرتووکا: دینکەرد Dinkard دا، پشکا: ١٣، موڤکا: ١ یێدا هاتیە: ئەڤ ناڤەروکێن مە بو هەرسێ پشکان گوتین، پێتر کارەکێ دیتانیە (تیورییە)، چمکی د کەتواریدا (واقعیدا) گەلەک جاران ناڤەروکێن هەرسێ پشکان، ژ تخوبێن خو دەردکەڤن و تێکهەلدبن (هاشم رضی، ١٣٧٨ ش، ب ٢٤٢).

### ئێک. پرتێن ئاڤێستا:

(بیست و ئێک) نەسکێن ئاڤێستا ل سەر (سێ) پرتان هاتینە پشککرن، هەر پرتەکێ (حەفت) نەسک بەردکەڤن، هوسا:



ڤەکولەرێ ئیرانی، ئیبراهیم پورداود

#### أ. گاتانیک Gätänik:

ناڤێ وێ ب پەهلەوی گاسانیک Gäsänik هاتیە. ژ نەسکێن: ١، ٢، ٣، ١١، ١٣، ٢٠، ٢١ پێکهاتیە (پورداود، ١٣٥٤ ش، ب ٣٠). گات، گوت، گوتن ... درست ئەڤە گوتنێن زەرادەشتینە، سەبەق و سروودێن دینینە، ژ ڤەهاندنا زەرادەشتی بخونە (Bode, 1952. جعفری، ١٩٩٦). ناڤەروکا وان ل سەر پەسن، پێگوتن، مەزنی ودلوڤانیا ئاهورامەزدانە، دوعا و دەروزن، هیڤی و داخاز و لاڤەلاڤن ژێ (بهار،١٣٧٦ ش، جـ ١ ب ٤٥).

#### ب. داتیک Dätik :

ژ نەسکێن: ١٢، ١٤، ١٥، ١٦، ١٧، ١٨، ١٩ پێکهاتیە (هاشم رضی، ١٣٧٨ ش، ب ٢٢٨). داتیک، دات، داد ... ب ئانکویا: قانون، رێبار و وەکهەڤی هاتیە (فرەوشی، ١٣٥٨ ش، ب ١٤٢). داتیک پەخشانن (روشانن) نەڤەهاندن، ل ڤێ جیهانێ روونکرنا رێیا مروڤایە. د چڤاکیدا قانونن، رێدارن، بریارێن تورە وتیتالێن بلندن، نیشادانێن دەلال رابون و روونشتنێ نە، جوان تاشاندن و پەروەردەکرنا خورت و لاوانە (اوشیدری، ١٣٧١ ش، ب ٢٧٠).

#### جـ هاتەک ـ مانسەریک Hätak-mänsarik :

موبەد روستەم شەهزادی (مانسەریک) مینا ئاڤێستایێ نڤیسیە: مانتریک mänthrik، (هاتەک) ژی هاڤێتیە (شەهزادی، ١٣٨٤ ش، ٢٨) ژ


کتابِ سومِ دینْ‌کرد

متنی به زبانِ پهلوی

سرسخنانی چند در باره‌یِ:

اخلاقْ‌آیینیک، تکوینِ جهان، پزشکی، اخترشناسی، دینْ‌دادشناسی، حکمتِ خسروانی، کلام، فلسفه، حقوقِ مدنی، کسانِ اسطوره‌ای و...........

آراستاری، آوانویسی، یادداشت‌ها و ترجمه بر اساسِ دینْ‌کردِ چاپِ مدن.

از
فریدون فضیلت

انتشاراتِ فرهنگِ دهخدا

تهران: ۱۳۸۱

نەسكێن: ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩، ١٠ پێكهاتیە (هاشم رضی، ١٣٧٨ ش، ب ٢٢٨) . هاتەك ژ پەیڤا (هات) ب ئانكویا: فەسل هاتیە. مانسەریک ژپەیڤا ئاڤێستایی mänthran ب ئانكویا: گوتنێن پیروزێن خودێ هاتیە (بهرامی، ١٣٦٩ش، جـ ٢ ب ١١٢٨). ناڤەروكا ڤێ پشكێ، دوعا و داخاز وهیڤینە.. مروڤ ژ چێكەرێ (خالقێ) جیهانێ د هەرچار دانێن سالێدا دكەت. دەمێن هەروژێن (هەروییێن) نڤێژا دەسنیشاندكەت. دگەل هنەك تیتال، رێدار، رێ و رەسمێن دنێن دینی (اوشیدری، ١٣٧١ ش، ب ٢٨١. مشكور، ١٣٢٥ ش، ب ٨١).

## دوو. نەسكێن ئاڤێستا ژ باڕوڤێ رزگاربووی:

### ١.یەسناYasnä :

كەڤنترین پشكا ئاڤێستا ئەڤرو مایی یە. یەسنا ئانكو: پەسن، پەرستن، پێگوتن و نڤێژ (بهرامی، ٢٠٠٠، جـ ٣ ب ١١٦٨). مەزدیەسنا ئانكو مەزداپەرست، پەرستنا مەزدا (ئاهورا) خودێ ئێكانەیێ زەرادەشت، بەرامبەر دێویەسنا ب ئانكویا دێوپەرست. د ئاڤێستادا یەسنە Yasna هاتیە، د زمانێ سانسكریتیدا یەجنە Yadjna هەر ب ئانكویا بوری هاتیە (هاشم رضی، سالا چاپێ تونە، ب ٢٥٣. اوشیدری، ١٣٧١ ش، ب ٥١١). ب هزرا ڤەكولەر هاشم رضی رەهێن پەیڤا (جەژنە/جەژن) یا فارسی و كوردی ... دگەهنە یەسنە و یەجنە (هاشم رضی، سالا چاپێ تونە، ب ٢٥٤).

یەسنا ٧٢ هاتن/فەسلن، ١٧ هات ژێ گاتانە. گەلەک جاران گاتا دگەل یەسنا هاتینە چاپكرن، جارنا ژێ جودا هاتینە چاپكرن. بو نموونە


ڤەکولەرێ ئەلمان کارل گێلدنەر

ڤەکولەران: ئیبراهیم پورداود، حوسێن وەحیدی، ئابتین ساسانفەر وعەلی ئەکبەر جەعفەری ... گاتا جودا ژ یەسنا چاپکرینە. جەلیل دوستخواە، هاشم رضی و قەوی دل عەسکری ... دگەل یەسنا چاپکرینە.

**گاتا Gäthä :**

گاتا و یەسنا وهنەک یەشت پێکڤە، کەڤنترین پشکێن ئاڤێستایێنە. ل گوور ئاڤێستا ساسانی ئەڤە پشکا گاتانیکە Gäthänik ، ژحەفت نەسکان پێکهاتیە مینا د سەرمەڕا بووری. ب هزرا پێتریا ڤەکولەرێن ئاڤێستایێ وەک: کارل گێلدنەر K. Geldner ، کریستیان بارتولومێ Ch. Barthoiomae ، هانس رایشلت H. Reichelt ، ئیبراهیم پورداود، هاشم رضی ... (گاتا) گوتنێن زەرادەشتی بخونە (Geldner, Bartholomae,1904, Band: 2, p. 29. 1905, p. 5).

د کەڤندا هەلبەست و ڤەهینوک بوون، پیر و موریدان ژبەردکرن. ب سەرڤەچوونا زەمانی کێش و قافیا پێتریا رێزێن وان ژ بەرێکچوون، مینا پەخشانێ (روشانێ) لێهاتینە. ناڤەروکا وان پەسن، دوعا و پەرستنا ئاهورامەزدایە (هاشم رضی، سالا چاپێ تونە، ب ١٥٣) .

**٢.ڤیسپەرەد Visparad :**

ب رەنگێ ڤیسپەرەتVisparat ژی ب ئانکویا: رێبەرێ گشان، رێبەرێ هەمیان هاتیە (بهرامی، ٢٠٠٠، جـ ٣ ب ١٣٥٨، ١٣٦٢). ئەڤ پەسنە بو خودێ و بو زەرادەشتی ژی تێگوتن (Mills, 1887, p. 333-346).




ڤیســــپەرەد ژ ٢٤ هاتا/فەســــلا پێکهاتیە (Geldner, 1886, Teil: 2, p. 36). پوتە و گرنگییێ ب مروڤان، جانەوەران، داروباران، گژو گیا و خورستیێ ددەت (پورداود، ١٣٥٧ ش، ب ٢١).

**٣. یەشتان Yashts:**

یەشــــتان کوومــــە، کتــــا وێ یەشتە Yasht . یەشت و یەسنە دگەهنە پـەیڤا ئاڤێستایی یـەز Yaz ب ئانکویـا: پەسن، پەرستن و نڤێژ (بهرامی، ٢٠٠٠، جـ ٣ ب ١١٥٦)... مینا د سەرمەڕا بووری.

هژمـارا یەشـتێن ئەڤـرو مایـن ٢١ یەشتن. ئەو بخو دڤێ ٣٠ بانـە، چمکی ل گوور روژهژمێرا (کالێندەرا) ئیرانـێ، هەیڤ ٣٠ روژن، هەر روژەک ژی بناڤێ یەشتەکێیە (هاشم رضی، سالا چاپێ تونە، ب ٣١٥). ب ئاخڤتنەکا دن ٩ یەشت نەماینە وهاتینە ژ ناڤبرن.

جوداهیا بەلیا د نێڤبەرا یەسنا و یەشتاندا ئەوە: ب گشتی یەسنا پەسن، پەرستن و نڤێژن بو هەر تشتەکێ ئەسمانی یان جیهانی بیت. لـێ یەشــت پەســن، پەرســتن و نڤێــژن تنــێ بــو ئاهــورامەزدا و ئامیشەسپەندان[1] وخودایێن دن (أوشیدری، ١٣٧١ ش، ٥١٢).

یەشتا (دوو) پشکن، یەشتێن کەڤنارێن دگەهنە سەردەمێ خێلێن ئارییێن کوچەر وەک: ئەناهیتاAnähitä هێزا ئاڤێ و جوانییێ (یەشت ٥)، میتراMithrä چەڤەنگێ روناهییێ (یەشت ١)، فرەوەشی Frawashi هێزا زێرەڤانییێ و پاراستنێ (یەشت ١٣)، ڤایو Vayu هێزا بای و باهوزان (یەشت ١٥)، ڤرترەگنا Vrtraghnä هێزا شکوهـ و سەرکەتنێ (یەشت ١٤) ... ئو یەشتێن ب درێژیا بەلاڤبوونا دینێ زەرادەشتی هاتینە نڤێسین، ئانکو درەنگتر پەیدابووین (مهرین، ١٣٦٤ ش، ب ١٧ ـ ١٨).


COMMENTAR

ÜBER

DAS AVESTA

VON

FRIEDRICH SPIEGEL.

ERSTER BAND.

DER VENDÎDÂD.

WIEN, 1864.

DRUCK DER K. K. HOF- UND STAATSDRUCKEREI.

LEIPZIG, VERLAG VON W. ENGELMANN.

ناڤەروکا (یەشتا) ل سەر پەسن، پێگوتن و پەرستنا ئاهورامەزدایە و فریشتایە (مەلائیکەتایە)، ب هیڤیا وەرگرتنا کامیرانیێ و جاویدانیێ پشتی داویا ڤێ جیهانێ. ناڤەروکا هنەکان گەلەکا کەڤنارە مینا مە گوتی، دگەهیتە خورەوشت و تیتالێن خێلێن ئاریێن هندوئیرانی ل وارێ وانێ کەڤن (ئاریاناڤیج) ل ئاسیا ناڤەراست (پورداود، ١٣٠٧ ش، جـ ١ ب سی وهشت).

هێژا ئیبراهیم پورداود پەرتووکا (یشتها) ب دوو پرتان، دگەل وەرگێرانا وێ یا فارسی ل بومبەی/هندستانێ، د سالێن ١٣٠٧ ـ ١٣١٠ ش/١٩٢٨ ـ ١٩٣١ ز. ێدا چاپکرن. جارا دووێ بەهرام فرەوەشی هەر لبا (پورداود) ل تەهران، انتشارات دانشگاه تهران، سالا ١٣٤٧ ش چاپکر. جارا سێ هەر لبا ناڤبری، ل تەهران، انتشارات اساطیر، سالا ١٣٧٧ ش چاپکر.

**٤. خورده ئاڤێستا Khürda Avestä :**

ئانکو ئاڤێستا بچووک. ناڤەروکا وێ ل سەر دوعا و نڤێژا، روژێن پیروز، جەژنێن دینی، روژا گرێدانا کوشتیێ Koshti [٢] (شوتکێ)، هەلکەتێن کەیف و زێمارێن بەهدینانە/ زەرادەشتیانە (پورداود، ١٣١٠ ش، ب ٢٦).

ڤەکولەرێن ئاڤێستایێ ل وێ هزرێنە، موبەدێ موبەدان ئازەربادێ مێهرسپەندان ل سەردەمێ شاهێ ساسانی شاپورێ دووێدا (٣١٠ ــ ٣٧٩ز) ب فەرمانا شاهی، جارەکا دن ئاڤێستا کوومکریە، لبا خورده


AVESTA
THE
SACRED BOOKS OF THE PARSIS
EDITED BY
KARL F. GELDNER
III
VENDÎDÂD
1982
PARIMAL PUBLICATIONS
Oriental Publishers & Book-Sellers
DELHI - AHMEDABAD

ئاڤێستا نهو ل بەردەستێ مە ژی، (مێهرسپەندان) ژ ئاڤێستا مەزن و کەڤنار هەلبژارتیە (پورداود، ١٣١٠ ش، ب ٤١).

ابراهیم پورداود، وەرگێرا فارسیا (خورده ئاڤیستا) ل بومبەی/هندستانێ، انتشارات انجمن زرتشتیان ایرانی، سالا ١٣١٠ ش/ ١٩٣١ ز چاپکریە.

موبەد ئەردەشیرێ ئازەرگوشەسپ، خورده ئاڤێستا ب زمانێ ئاڤێستایی و وەرگێرا وێیا فارسی، ل تەهران چاپخانا ئاریا سالا ١٣٤٩ ش چاپکریە. سالا ١٣٦٤ ش وەرگێرا وێ یا ئنگلیزی ژی ل لەندەن چاپکر.

**٥. ڤێندیداد Vendid□d :**

د زمانێ ئاڤێستادا ناڤێ وێ: ڤی ـ دەئێڤو ـ داتایە Vi-daevo-datä . ڤی ئانکو دژ، دەئێڤو هەر دێوە، داتا دادە، قانونە. پەیڤ کورتبوویە بوویە ڤێندیداد ب ئانکویا: قانونا دژی دێوان (هاشم رضی، ١٣٧٦ ش، جـ ١ ب ١٥٨).

ناڤەروکا وێ ب گشتی قانون، رێباز و شەریعەتێ دینێ زەرادەشتیە/دینێ موغانە. هزر و باوەرن، تیتال و رێورەسمن. تژی ئالیێن فیقهی، نوژداری، جیوگرافی، چیڤانوکی، خودێ پەرستی و ستێرناسییە...هتد (هاشم رضی، ١٣٧٦ ش، جـ ١ ب ٤٤).

ڤێندیداد ژ ٢٢ فەرگەردان/فەسلان پێکهاتیە. ڤەکولەرێ ئەلمان فردریش شپیگل د پەرتووکا خوودا: Avesta, die Heiligen Schriften der Parsen, erster Band, Der Vendidäd ئەوا ل لایپزیک سالا ١٨٥٢ چاپکری، ژ ناڤێ وێ دیارە د پرتا ئێکێدا ڤێندیداد چاپکریە. دیسان: ئیرواد. ئی.


AVESTA

DIE

HEILIGEN SCHRIFTEN DER PARSEN

AUS DEM GRUNDTEXTE ÜBERSETZT, MIT STETER RÜCKSICHT AUF DIE TRADITION

VON

Dr. FRIEDRICH SPIEGEL.

ERSTER BAND:

DER VENDIDAD.

MIT ZWEI ABBILDUNGEN.

LEIPZIG.

VERLAG VON WILHELM ENGELMANN.

1852_ 63.

ئانیتاErvad. E. Anita لبەکا ڤێندیداد، ل بومبەی/هندستانێ دگەل وەرگێڕەکا ئنگلیزی، د دوو پرتادا، سالا ١٩٠٧ چاپکریە. هاشم رضی، وەرگێڕەکا فارسیا ڤێندیداد ل تەهران، انتشارات فکر روز، سالا ١٣٧٦ ش، د چار پرتادا چاپکریە.

**سێ. شروڤێن ئاڤێستا:**

گەلەک شروڤە، ئارش و وەرگێڕان .. ل سەر ئاڤێستا هاتینە کرن وەک:

**أ. زەند ئاڤێستا:**

زەند zand ب زمانێ پەهلەوی ئارش، روهنکرن و شروڤەیە (Mackenzie, 1971, p. 98. فرەوشی، ١٣٥٨ ش، ب ٦٥٨). د ئاڤێستادا ب رەنگێ زەنتی و ئازێنتی Zanti, Äzainti هاتیە (بهرامی، ٢٠٠٠، جـ ١ ب ٢٠٣). زەند ئاڤێستا ب چ رەنگا ئاڤێستا نینە، ئارش و شروڤا وێیە. شروڤەکاران رێزەکا ئاڤێستایێ دنڤێسی، د بندا رێزەکا ئارش و شروڤا وێ ب پەهلەوی دنڤێسی. زەند ئاڤێستا ب پەهلەویا ئەشکانی د سەردەمێ ئەشکانیادا (٢٥٠ ب. ز ــ ٢٢٦ ز)، ب پەهلەویا ساسانی د سەردەمێ ساسانیادا (٢٢٦ ــ ٦٥٢ ز) هاتیە نڤێسین (هاشم رضی، ١٣٧٨ ش، ب ٢٠٦ ـ ٢٠٧. محمد معین، ١٣٧١ ش، جـ ٥ ب ٦٥٦).

**ب. پازەند Päzand :**

شروڤەکرنا زەند ئاڤێستایە، ئانکو شروڤا شروڤێیە، ب زمانێ پەهلەوی. پەیڤێن ئارامیێن د زەند ئاڤێستادا هاتینە دیتن، هەموو بو زمانێ پەهلەوی هاتینە وەرگێڕان و شروڤەکرن. مخابن پێتریا پازەندێ

ZENDAVESTA

OR

THE RELIGIOUS BOOKS OF THE ZOROASTRIANS

EDITED AND TRANSLATED
WITH A DICTIONARY, GRAMMAR &c.

BY

N. L. WESTERGAARD,

KNIGHT OF THE DANEBROG.
PROFESSOR OF ORIENTAL LANGUAGES IN THE UNIVERSITY OF COPENHAGEN,
MEMBER OF THE DANISH ROYAL ACADEMY OF SCIENCES AND HONORARY MEMBER OF THE BOMBAY
BRANCH OF THE ROYAL ASIATIC SOCIETY &c. &c.

VOL I

THE ZEND TEXTS.

COPENHAGEN.

PRINTED BY BERLING BROTHERS.
SOLD BY GYLDENDAL.
1852—54.

نەمایــە و ژناڤچوویــە (اوشــیدری، ١٣٧١ ش، ب ١٩١. هاشم رضی، سالا چاپێ تونە، ب ٢٠٣).

### جـ دینکەرد Dinkard :

دبێژنێ دینکەرتDinkart ژی، ئانکو کریارێن دینی، کارێن دینی (فرەوشـــــــــی، ١٣٥٨ ش، ب ١٤٦. دوســتخواه، ١٣٧٠ ش، جــ ٢ ب ٩٨٧). ئــارش و شــــروڤەیە ب زمـــانێ پەهلـــەوی ل ســـەر ئاڤێســـتایێ. موبـــەد ئـــازەر فەرنبـــەغ کـــوڕێ فەرروخـزاد، د سەد سالیا نەهێ زاینیـدا، ل سـەردەمێ خـەلیفێ عەبباسـی مەئمونیـدا (٨١٣ ــ ٨٣٣ ز) نڤێسـیە (West, 1897, Vol: 1, p. 34). د سـەد سـالیا دەهێدا مێژووڤـان المسعودی (علي بن الحسين، ٩٥٧ ز مرییە) باسـی پەرتووکـا (دینکـەرد) کریە و نڤێسـیە: زەرادەشـت شـروڤەیەک بـو ئابسـتا (ئاڤێسـتا) چێکـر، دگوتـێ: زەنـد .. موبـەدان وهەربـەدان شـروڤەیەکا دن ل سـەر وێ شروڤێ چێکر دگوتـێ: ئـەکرەدە. پشـتی ئیسکەندەرێ (مەقدونی) بسـەر فارسدا گرتی، شروڤا (ئەکرەدە) سۆت (المسعودي، ١٩٩٣، ب ٩٦) .

ئاشـــکەرایە زەرادەشـــت چ شـــروڤە بـــو ئاڤێســـتا نەنڤێســـینە. (مەسـعودی) جهێ باوەڕییـە، تنێ دنڤێسـینا نـاڤێ (ئـەکرەدە)دا شـاشـە، راستیا ناڤێ وێ (دینکەرد)ە.

لبا ئورگینالا دینکەردا پەهلـەوی ژ(نەهـ) پەرتووکـان پێکهاتیە. بـو نموونـە پـەرتووکا (سـێ) کـو فریـدون فەزیلـەت F. Fazilat وەرگێڕایـە فارسـی ٦٤٢ بەرپـەلێن مەزنـە. پـەرتووکا ئێکـێ و دووێ نەماینـە، هـەر (حەفتێن) دن ماینە وهاتینە وەرگێڕان و چاپکرن (هاشم رضی، سالا چاپێ تونە، ب ٢٥٥. مهرین، ١٣٦٤ ش، ب ١٩).


THE VENDIDÂD.

A NEW EDITION
PREPARED BY
ERVAD EDULJEE KERSASPJEE ANTIA
*Lecturer in Zend at the Sir Jamsetjee Jejeebhoy Madressa*
AND PUBLISHED
BY THE
TRUSTEES OF THE PARSEE PUNCHAYET
FROM THE
SIR JAMSETJI JEJEEBHOY TRANSLATION FUND.

BOMBAY:
Originally printed in 1901 at the Duftur Ashkara Oil Engine Press, Fort, and reproduced in 1950 by offset by G. S. Kohli at the N.I.P. Press Ltd., 6 Tulloch Road, Apollo Bunder, Bombay 1.
1901

**د. شایست ناشایست**

**: Shäyist Näshäyist**

پـــەرتووک ب پەهلـــەوییا ساسـانیە، ئانکویـا وێ: هـەژی و نەهـــەژی (رەوا و نەرەوا)یـــە (Mackenzie, 1971, p. 79). شـروڤەکرنا وان بویـەر و تشـتایە ئەوێن د ئاڤێستادا هاتین و قانونی و هەژینـە، ئـو ئـەوێن چێنـابن و حەرامن و نەهەژینە.

ب هـزرا ڤەکولـەر جیهـانگیر تاڤادیـال Tavadia, . نڤیسـەرێ وێ جود ـ دێوداد Jud-dewdad کورێ میدیوماهـە Medyomah ، پێتریا پەرتووکێ بـەری ئیسـلامێ د سـەردەمێ ساسانیادا (٢٢٦ ـ ٦٥٢ ز) هاتیە نڤێسین (Tavadia, 1930, p. 1-2, 15) .

ناڤـەروکا پـەرتووکێ: چەوانیـا ژ لەشــێ مریــان دوورکــەتنێ، رێورەسمێن سیدرە وکوشتی Koshti ل بەرکرنێ، زاد خـارن و ڤەخـارن و خوشوشتنێ، گونەهـ و شاشی و توبەکرنێ، ڤەکرنـا رێیا بەحشـتێ و گەهشتنێیە ... هتد (مزداپور، ١٣٩٠، ب پانزە).

**هـ ماتیکان هزار داتستانMätikän-e Hazär Dätastän :**

ئـانکو هـزار بابـەتێن دادڤـانیێ و(عەدالـەتا دینـی). نڤێسـەرێ وێ فەرروخ مـەرد کورێ بەهرامـە Farrox-mard pusar-i Bahräm ، هەرئـەوی نڤێسـەری پـەرتووکا: داتسـتان دینیـک Dätestän-i-dinik ژی ب پەهلـەوی نڤێسیە. (ماتیکان ..) ل سەردەمێ شاهێ ساسانی خسرو پەرویز (٥٩٠ ـ ٦٢٨ ز) هاتیە دانان (شهزادی، ١٣٨٦ ش، ب ٥٥ ـ ٥٦).

ناڤەروکا وێ: قانونێن[٣] زەرادەشتینە ئەوێن د ئاڤێستادا هاتین، بو زمانێ پەهلەوی هاتینە وەرگێڕان و شروڤەکرن وەک: قانونێن ئەردی و ئاقاری، ژن ئانین و بەردانێ، کەنیزە و کوولە کڕین و فروتنێ، پارە قەرکرنێ و زڤڕاندنێ ... ب کورتی ئەو قانونێن ئەوێن وەلاتی، د وی سەردەمیدا پێدڤی، درست هزار قانونن (مهرین، ١٣٦٤ ش، ب ١٩. شهزادی، ١٣٨٦ ش، ٦٠ ـ ٧٠).

**و. ڤیچەرکەرتی دینیک Vicharkart-i Denik :**

پەرتووک ب زمانێ پەهلەوییە. (ڤیچەر) ئارش و شروڤەیە (فرەوشی، ١٣٥٨ ش، ب ٥٩٩)، ئانکو ناڤێ پەرتووکێ: شروڤەکرنا دینییە. ناڤەروکا وێ: ل سەر کار و تیتالێن بلند و باش، جانەوەرێن زیاندار (خرەفستەران Xrafstar )[٤]، جانەوەرێن بهادار (سە، هەسپ، ئەلهو، کروسک/کەلەشێر)، سزایێن کارێن چاک و خراب ... و شروڤەکرنا ٦٣٠ پەیڤ و زاراڤێن ئاڤێستایێنە ب پەهلەوی (مشکور، ١٣٢٥ ش، ب ١٠٦). موبەد مدیوماهـ کوڕێ ئاراسپە Medyömäh pusar-i Äräspe ژ لبێن جوداییێن ئاڤێستایێ و زەندێن وێ وەرگێڕاینە. پەرتووک د سەد سالیا چارێ زاینیدا، د سەردەمێ ساسانیادا هاتیە نڤیسین (پورداود، ١٣١٠ ش، ب ٧٨). دەستور (موبەد) پشوتن جی بەهرام جی سەنجانا p.Sanjana لبەکا وێ ل بومبەی/هندستانێ سالا ١٨٤٨ چاپکریە. کریستیان بارتولمێ لبەک چاپکریە ئەڤەیە:

Bartholomae, Ch.: Die avestischen Texste des Vicharkart-i Denik, in Indogermanische Forschungen, Strassburg, 1901.

**ز. نیرەنگستان Nirangistän :**

ئانکو زانین، نڤشتی، حەمایل، دوعا و رێورەسمێن دینی (Mackenzie, 1971, p. 58). گەلەک ژێ وەرگێڕا پەهلەویا نەسکا هەڤدێیە، نەسکا هوسپارەم Huspäram ژ ئاڤێستایێ. مخابن ناڤێ نڤێسەرێ پەرتووکێ ناهێتە زانین، ل سەردەمێ شاهێ ساسانی ئانوشیروانێ کوڕێ قوبادێ ئێکێ (٥٣١ ـ ٥٧٩ ز) هاتیە نڤیسین (پورداود، ١٣١٠ ش، ب

٧٦. مشكور، ١٣٢٥ ش، ب ١٠٠ ـ ١٠١). دستور پشوتن سەنجانا P, Sanjana. لبەكا وێ ل بومبەی/هندستانێ سالا ١٨٩٤ چاپكریە. دیسان سوهراب جەمشید بولسارا S, Bulsara. چاپەكا دن ل بومبەی/هندستانێ سالا ١٩١٥ چاپكریە.

**ح. ئەئوگێمیدە ـ ئەجا Aogemida-ajdä :**

٢٩ بەندن/فەسلێن جوداجودانە ژ ئاڤێستا كەڤنار[٥] هاتینە وەرگرتن، بو زمانێن پەهلەویا ساسانی و سانسكریتی هاتینە وەرگێڕان. ناڤەروكا وان: ل سەر راستی و حەقیا مرنێیە، پەند و شیرەتێن دینییە، دەربازبوونا جانێن پاقژ و بژونە د سەر پرا سینوتێ را (پرا صیراتێ را) ... هتد (مشكور، ١٣٢٥ ش، ب ١٠٤ ــ ١٠٥). مخابن نڤێسەرێ وێ ناهێتە زانین. چمكی ب پەهلەویا ساسانیە، لەوان د سەردەمێ واندا هاتیە نڤێسین.

ژ پەرتووكێن دنێن پەهلەوی یان سانسكریتی و پێوەندی ب ئاڤێستایێڤە هەی وەك: فەرهەنگی ئەویم و ئەیوك Farhang-i awim-u ayuk كو هزار پەیڤێن ئاڤێستایێنە ب پەهلەوی و سانسكریتی. ئافەرینەگانی دەهمانÄfarinaghän-i Dahmän هنەك بابەتێن خوردە ئاڤێستایێنە و ئاخڤتنن ل سەر حەفت ئامیشەسپەندان، ب پەهلەوی. چیتک ئابستاكی گاتان Chitek äbstäk-i Gäthän هنەك گاتانە ب پەهلەوی ژ ئاڤێستا هاتینە هەلبژارتن و وەرگێڕان ... هتد. ل گوور ئاگەهیا من، تا نهو ناڤێ ٧٥ پەرتووكێن پەهلەوی د ژێدەرادا هاتیە. مخابن هنەكان بەس (ناڤ) هەیە و زانین ل سەر تونە.

**سەرپێژک**

ئاڤێستاÄvestä پەرتووکا ئێکانەیا دینێ زەرادەشتیە، هەموو پەرتووکێن دنێن دینێ زەرادەشتی وەرگێرن، فەروزن یان شروڤەنە ل سەر وێ. بنکێ ناڤەروکا ئاڤێستا ل سەردەمێ زەرادەشتی بخو ل وارێ ئەسلیێ مللەتێن هندوئیرانی، ئەوێ د مێژوویێدا دگوتنێ ئاریاناڤیچ Äriänävich یان ئاریاڤارتا Äriävärtä، دەوروبەرێ ١٥٠٠ ــ ١٤٠٠ ب. ز، هاتیە ڤەهاندن. درست هەڤچاخێ پەرتووکا ڤید Vedal یا ب زمانێ سانسکریتیێ نێزی زمانێ ئاڤێستایێ، هاتیە دانان. پاشی د سەردەمێن دوڤدا و تا داوییا دەولەتا ساسانی (٦٥٢ ز)، موغان و مووبەدێن زەرادەشتی، گەلەک ل سەر پەرتووکا بنگەهیا ئاڤێستایێ، زێدەکر.

ل گوور ژێدەرێن ئیرانی ئاڤێستا ژ لایێ ئیسکەندەرێ مەقدونی و تالانکەرێن عەرەب ڤە، هاتە سۆتن و ژناڤبرن. تنێ چارێکا وێ (٤/١) مایە، پێنج نەسک Nask (پەرتووک) ژ کوومـا بیست و ئێک نەسکان ماینە. پەرتووکێن/نەسکێن ژ ئاڤێستایێ ماین ئەڤن: یەسناYasnä ، گاتاGäthä ژی کو گوتن و سرووودێن زەرادەشتی بخونە، پرتەکا وێنە. یەشتانYashts ، ڤیسپەرەد Visparad ، ڤێندیداد Vendidäd ، خوردە ئاڤێستاÄvestä Khürda . یەسنا و گاتا و هنەک فەسلێن یەشتان، کەڤنترین پشکێن ئاڤێستایێنە.

**پەراوێزەکان**

[1] ئامیشەسپەندان Ameshaspand : ژپەیڤا (ئامیشە) ب ئانکویا جاویدان ونەمر (سپەند) ئانکو پیروز. پیروزێن نەمر فریشتەنە/ملیاکەتن دەردوری ئاهورامەزدا. ئەڤە حەفت فریشتەنە: سروشsrosh (وەحی و ئیلهاما ئاهورا، سەروکێ ئامیشەسپەندان)، ئەشاashä (راستی)، ڤەهومەنە vahumaneh (هزرا چاک)، خشەتراxshathrä (دەسهەلات/شەهرەیاری)، ئارەمەئیتی ärmaeti (پارسایی/خودێ پەرستی)، هائوروتاتhäurutät (کوکی/تەکوزی)، ئامریتات ämretät (نەمری) (آزینی فر، ١٣٨٤ ش، ب ٤٩. مهرین، ١٣٦٤ ش، ب ٢٢ ـ ٢٣). بەرئەقل هەردوو فریشتێن داویێ هائوروتات و ئامریتات بناڤێن: هاروت و ماروت کەتینە دپەرتووکێن ئیسلامێدا. دیسان هەر حەفت مەلائیکەتێن بووری بناڤێن: جبرائیل، میخائیل/میکائیل، اسرافیل ... کەتینە نێڤ دینێن مللەتێن سامیدا.

[2] کوشتی Koshti : بەندکەکە زەرادەشتی ژهریا سپی یان لوکەی چێدکەن. ژ ٧٢ داڤان درێسن و ڤەهونن، ئەڤە ژی ئاماژەیە بو ٧٢ هاتێن/فەسلێن یەسنا. خورتێ زەرادەشتی (کورِ یان کچ) دژیێ ٧ ــ ١٥ سالیدا دەمێ کوشتیێ دهاڤێتە ناڤتەنگا خو، دڤێ (سێ) گرێیان لێدە نە زێدەتر. ئەڤەژی ئاماژەیە بو: هزرا چاک، گوتنا چاک، کارێ چاک (ل دەڤەرا بەهدینان باشوورێ کوردستانێ، تا ئەڤرو دەمێ بووکێ ڤەدگوهێزن، بەندکەکێ دهاڤێنە پشتێ وسێ گرێیان لێددەن). پشت ژیێ ١٥ سالیێ خودان دشێت بکەیفا خو گرێیان زێدەکەت ( وحیدی، ١٣٥٩ ش، ب ٤٢- ٤٣. مزداپور، ١٣٨٢ ش، ب ١٠٣). کوشتی Koshti ب وەرگێرانێ (metathesis) درست شوتکا Shotik بەهدینیە. ب هزرا ڤەکولەر بابان سەقزی شوتکا بەهدینی یاتژی گرێ، هەمان شوتکا زەرادشتیە (چاڤپێکەتن دگەل هێژا بابان سەقزی، بەرلین، روژا ٢٠٠١/٠٧/٢٠).

[3] قانون ژ پەیڤا یونانی canon هاتیە وەرگرتن. قانون ژ یاسا راستترە. یاسا پەیڤەکا مەغولییە، مەغولی و قانون کوجا مەرحەبا؟

[4] خرەفستەرXrafstar : پەیڤەکا پەهلەوییە ئانکو جانەوەرێن زیاندار (فرەوشی، ١٣٥٨ ش، ب ٦٢٧)، نەمازە کێز، خشوک (زەواحف)، کولی، مێش و مۆر ... هتد. د ئاڤێستادا دبێژنێ Xrafstara خرەفستەرە (بهرامی، ١٣٦٩ ش، جـ ١ ب ٤١٧). خویایە ئەڤ جانەوەرە زیانێ دگەهیننە ساخلەمیا مروڤان، چاندنێ و دەخل و دانی، نەساخیێن وەک مەلاریا، کولارەش (طاعونێ) و بێڤاری (تیفوئید) ... ژێ چێدبن و بەلاڤدکەن. د دینێ بەهدینان‌دا/زەرادەشتیدا ئەڤە جانەوەرێن ئەهریمەنینە،

خێرە بێنە کوشتن و ژناڤبرن. جارنا هەوێن کوشتنا وان د دانەکێ سالێدا، تێنەکرن (پورداود، ١٣٨٠ ش، ب ١٧٨ ودوڤدا. دوستخواه، ١٣٧٠ ش، جـ ٢ ب ٩٧٣ ـ ٩٧٤).

[٥] ئاڤێستا کەڤنار: ژپرتێن یەسنا، گاتا وهنەک فەسلێن یەشتان پێکهاتیە. ئانکو ئەو ئاڤێستا د سەردەمێ زەرادەشتیدا وهەخامەنشیادا هاتیە گوتن، ژبەرکرن، کوومکرن و پاراستن، ئەوا کەڤنارە. ئاڤێستا پشتی هەخامەنشیان وهێرڤە تا کوتاهیا ساسانیان هاتیە کوومکرن و پاراستن دبێژنێ: ئاڤێستا درەنگتر/متأخر (پورداود، ١٣١٠ ش، ب ٢٧. اوشیدری، ١٣٧١ ش، ب ٣٥ ــ ٣٦. دوستخواه، ١٣٧٠ ش، جـ ١ ب سێزدە).

**ژێدەر و دەهمەن:**


١. أزینی فر، قاسم، ١٣٨٣ ش، نیگاهی گزرا بە زرتشت و تعالیم او، انتشارات آرویج، تهران.
٢. أوشیدری، جیهانگیر، ١٣٧١ ش، دانیشنامە مزدیسنا، شرکت نشر مرکز، تهران.
٣. بهار، محمد تقی، ١٣٧٦ ش، سبک شناسی، إنتشارات مجید، تهران.
٤. بهرامی، إحسان، ١٣٦٩ ش، فرهنگ و اگەهای اوستائی، اوستائی ــ انکلیسی، نشر بلخ، تهران.
٥. پورداود، ابراهیم، ١٣٠٥ ش، تاریخچە مهاجرت زرتشتیان بە هندوستان، انتشارات انجمن زرتشتیانی ایرانی، بومبئی.
٦. پورداود، ابراهیم، ١٣٠٧ ش، یشتها، انتشارات انجمن زرتشتیان ایرانی، بومبئی.
٧. پورداود، ابراهیم، ١٣١٠ ش، خردە اوستا، انتشارات انجمن زرتشتیان ایرانی، بومبئی.
٨. پورداود، ابراهیم، ١٣٥٤ ش، گاتاها، انتشارات دانشگاە تهران، تهران.
٩. پورداود، ابراهیم، ١٣٥٧ ش، ویسپرد، انتشارات دانشگاە تهران، تهران.
١٠. پورداود، ابراهیم، ١٣٨٠ ش، فرهنگ ایران باستان، انتشارات اساطیر، تهران.
١١. جعفری، علی اکبر، ١٩٩٦، سرودهای پاک زرتشت، انتشارات انجمن دوستداران اشو زرتشت، برلین.
١٢. دوستخواە، جلیل، ١٣٧٠ ش، اوستا کهنترین سرودهای ایرانیان، انتشارات مروارید، تهران.
١٣. سوکولوف، اس، ان، ١٩٨٨، زمانی ئاڤێستا، وەرگێرانی: محەمەد ئەمین هەورامانی، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا.

١٤. شهزادى، موبد رستم، ١٣٨٤ ش، قانون مدنى زرتشتيان در زمانى ساسانيان، انتشارات فروهر، تهران.
١٥. شهزادى، موبد رستم، ١٣٨٦ ش، گفتارى درباره كتاب: ماتيكان هزار داتستان، انتشارات فروهر، تهران.
١٦. عسكرى، مازيار قوى دل، ٢٠٠٣، پژوهشى در شناخت اوستا و ايين زرتشتى، انتشارات پارس، لوس انجلس.
١٧. فرەوشى، بهرام، ١٣٥٨ ش، فرهنگ زبان پهلوى بە فارسى، انتشارات دانشگاه تهران، تهران.
١٨. محمد معين، ١٣٧١ ش، فرهنگ فارسى ـ أعلام، مؤسسه انتشتارت امير كبير، تهران.
١٩. مزداپور، كتايون، ١٣٨٢ ش، دفتر پژوهشهاى فرهنگى، تهران.
٢٠. مزداپور، كتايون، ١٣٩٠ ش، شايست ناشايست ــ متنى بە زبان پهلوى ساسانى، پژوهشگاه علوم انسانى و مطلعات فرهنگى، تهران.
٢١. مزورى، عبدالرحمن، ٢٠١٧، گوتارا: زەرادەشت وار و سەردەمێ وى، كوڤارا: ئەكاديميا كوردى، هژمارا: ٣٧، هەولێر.
٢٢. المسعودي، علي بن الحسين، ١٩٩٣، التنبيه والإشراف، منشورات دار مكتبة الهلال، بيروت.
٢٣. مشكور، محمد جواد، ١٣٢٥ ش، گفتارى درباره دينكرد، چاپخانه تونه، تهران.
٢٤. مشكور، محمد جواد، ١٣٦٩ ش، ايران در عهد باستان، سازمان انتشارات اشرفى، تهران،
٢٥. مهرين، مهرداد، ١٣٦٤ ش، دين مزدائى، سازمان انتشارات فروهر، تهران.
٢٦. هاشم رضى، سالا چاپێ تونە، گنجينه اوستا، سازمان انتشارات فروهر، تهران،
٢٧. هاشم رضى، ١٣٧٦ ش، ونديداد، انتشارات فكر روز، تهران.
٢٨. هاشم رضى، ١٣٧٨ ش، اوستا كهنترين گنجينه مكتوب ايران باستان، انتشارات بهجت، تهران.
٢٩. وحيدى، حسين، ١٣٥٩ ش، دين پايه زرتشتى، سازمان چاپ خواجه، تهران.
30- Bartholomae, Christian, 1905, Gätäs des Avesta Zaräthustras, Verlag von Karl J. Trübner, Strassburg.
31- Browne, Edward G., 1977. Aliterary History of Persia, Cambridge University Press, London.
32- Bode, Framroz a. Nanavutty, Pilo. 1952, Songs of the Zarathustra, puplished by: George Allan a. Unwin, London.

33- Geldner, Karl F., 1886, Avesta die Heiligen Bücher der Parsen, W. Kohlhammer Verlag, Stuttgart.

34- Geldner, Karl F., 1904, Avesta Literatur im Grundriss der Iranichen Philologie, Verlag von Karl J., Trübner, Strassburg.

35- Jackson, Williams, 1892, An Avesta Grammer in Comparison with Sanskrit, W. Kohlhammer Verlag, Stuttgart.

36- Mackenzie, D. N., 1971, A concise Pahlavi Dictionary, Oxford University Press, London.

37- Mills, Heyworth, 1887, Sacred Books of the East- The Visparad, Oxford University Press, London.

38- Reichelt, Hans, 1968, Avesta Reader-Texts, Notes, Glossary a. Index, Walter der Gruter u. Com., Berlin.

39- Spiegel, Friedrich, 1863, Avesta die Heiligen Schriften der Parsen, Verlag von Wilhelm Engelmann, Leipzig.

40- Tavadia, J.,1930, Shäyast-Ne-Shäyast, A Pahlavi Text on Religious Customs, Friederischen der Gruyter u. Com., Hamburg.

41- West, Edward W., 1897. Pahlavi Texts, Clarendon Press, London .

## ملخص البحث

## زرادشت موطنه وعصره

### القسم الثاني: كتاب الاڤيستا

**د. عبدالرحمن مزوري**

عضو الاكاديمية الكوردية

الآفيستا Ävestä هو كتــاب الديانـة الزرادشـتية الأوحـد، والكتب الدينيـة الزرادشـتية الأخرى هي شروحـات او ترجمـات او تعليقـات حولـه. ألـف نـواة الآفيستا زمـن زرادشـت في موطن الأقوام الهندوإيرانية الأصلي، الذي كـان يعرف تاريخياً بآريانـافيج Äriänävich (او آرياڤارتـا Äriävärtä ) ، ذلـك فـي حـدود ١٥٠٠ ـــ ١٤٠٠ ق. م. زمـن تـأليف الفيـدا Veda بالسانسكريتية القريبـة مـن لغـة الآفيستا. ثـم اضـاف المُغـان والموابـدة رجـال الـدين الزرادشتيين، الكثير الى الكتاب الأصلي في العصور المتأخرة وحتى نهاية الدولة الساسـانية في ٦٥٢ م.

تعـرض الآفيسـتا وفـق المصــادر الإيرانيــة الــى عمليـات الحـرق والتبديـد مـن قبـل الاسكندر المقدوني والغزاة العرب. ولم يبق منـه إلاّ الربـع، خمسـة نُسُك Nasks (او كتـب) من مجموع احدى وعشرون نُسُكٍ، حجم الكتـاب الأصـلي. فالكتب الباقيـة مـن الآفيسـتا هـي: اليسنا Yasnä الذي يضم الجاتـا Gäthä وهي اناشيد واحاديث زرادشـت نفسـه، والفيسبَرَد Visparad واليشْـت Yashts والفنديـداد Vendidäd والخـورده آفيسـتا Khürda Ävestä . ويعتبر كل من اليسْنا مع الجاتـا وبعض فصول اليشت من اعرق اجزاء الكتـاب.

Research Summary

**Zuradesht, His Home and Age**
**Part 2 : The Avesta**

**Dr. Abdul-Rahman Mizuri**
Member of Kurdish Academy

The Avesta is the only Zoroastrian religion book, and the other Zoroastrian religious books are the explanations, translations or comments about Avesta. The kernel of the Avesta is time of Zoroastrianism in the original Indo- Iranian homeland, which was known historically as Arianavich (or Arianavarta) within 1500-1400 BC., the time which in it the Vedas had been written in Sanskrit language which was so close to the language of the Avesta. Then in later times, the Zoroastrian clergies, Mogus and Mobads, added a lot of texts to the original book and that addition was continuous until the end of the Sassanid state in 652 AD.

According to Iranian sources, the Avesta was exposed to incineration and destruction by Alexander the Great and the Arab invaders. Leaving only a quarter, five Nasks (or books) of the total of twenty-one Nasks, the original size of the Avesta.

Thus the remaining books of the Avesta are: Yasna, which includes the Gatha, which are chants and Zoroaster's own speeches, Visparad, Yashts, Vendidad and khurda Avesta. All of Yasna is considered including the Gatha and some of the Yashts chapters as the most ancient parts of Avesta

# یاسای گۆڕینی مێژووی
# (زایینی بۆ کوردی) و (کوردی بۆ زایینی)

**پ.د. وریا عومەر ئەمین**
ئەکادیمیای کوردی

لە ڕێی ئەم خشتەیەوە ڕۆژ و مانگی کوردی بەرانبەر زایینی و زایینی بەرانبەر کوردی دەستنیشان دەکرێت. ڕیزی لای ڕاست کە بە (ڕەنگی سوور) نووسراوە مانگە کوردییەکانە. ڕیزی لای چەپ کە بە (ڕەنگی سەوز) نووسراوە مانگە زاینییەکانە.

بۆ نموونە گەر بمانەوێ بزانین (١٤ی تەمموز) لە ساڵنامەی زایینیدا دەکەوێتە چ مانگ و چەندی ئەو مانگەی ساڵنامەی کوردی. دەچینە ژێر مانگی تەمموز دەبینین بەرانبەرە کوردییەکەی (٢٣ ی پووشپەڕ) ە.

(٢٦ ی نەورۆزی کوردی) دەکەوێتە (١٥ی نیسانی زایینی).

(٢٩ ی شوباتی زایینی) دەکەوێتە (١٠ ی ڕەشەمێی کوردی).

(٢٤ ی جۆزەردانی کوردی) دەکەوێتە (١٤ی حوزەیرانی زایینی).

(١٠ ی بەفرانباری کوردی) دەکەوێتە (٣١ی کانوونی یەکەمی زایینی).

(٥ ی ئەیلوولی زایینی) دەکەوێتە (١٤ ی گەلاوێژی کوردی) .

١ ـ یاسای گۆڕینی مێژووی زایینی بۆ کوردی:

ئەگەر ساڵە زایینییەکە پێش ٢١ ی ئازار بوو، (٦٩٩)ی دەخرێتە سەر. ئەگەر دوای (٢٠ ی ئازار) بوو ، (٧٠٠) ی دەخرێتە سەر.

| زایینی بۆ کوردی | |
|---|---|
| پێش ٢١ ی ئازار | + ٦٩٩ |
| دوای ٢٠ ی ئازار | + ٧٠٠ |

بۆ نموونە بۆ دەستنیشانکردنی:

١ ـ مێژووی کوردیی بەرانبەر (١٤شوبات ٢٠١٥) ی زایینی:

١٤ی شوبات پێش (٢١ ی ئازار) ـە ، (٦٩٩) ی دەخرێتە سەر.

٢٠١٥ز+ ٦٩٩ = ٢٧١٤ ک



| شباط | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | اذار | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 |  |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕەشەمێ | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 |  | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 |  |
| شباط | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | اذار | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 |  |  |
| ڕەشەمێ | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 |  | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 |  |  |
| كانون ثانى | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 | شباط | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 |  |
| ڕێبەندان | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 |  | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 |  |
| كانون اول | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 | ك2 | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 |  |
| بەفرانبار | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 |  | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 |  |
| تشرين ثانى | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | ك1 | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 |  |
| سەرماوەز | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 |  | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 |  |
| تشرين اول | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 | ت2 | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 |  |
| گەلاڕێزان | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 |  | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 |  |
| ايلول | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | ت1 | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 |  |
| ڕەزبەر | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 |  | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 |  |
| اب | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 | ايلول | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 |
| گەلاوێژ | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 |  | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 |
| تموز | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 | اب | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 |
| خەرمانان | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 |  | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 |
| حزيران | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | تموز | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 |
| پووشپەڕ | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 |  | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 |
| مايس | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 | حزيران | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 |
| جۆزەردان | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 |  | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 |
| نيسان | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | مايس | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 |
| گوڵان | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 |  | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 |
| اذار | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 | نيسان | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 |
| نەورۆز | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 |  | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 | 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 | 30 | 31 |

ڕۆژ و مانگی کوردی و زایینی بەرامبەر یەک

بەپێی خشتەی مانگ و ڕۆژی بەرانبەر (١٤ ی شوبات) دەکەوێتە (٢٥ ی ڕێبەندان). بەمجۆرە مێژووە کوردییەکە دەبێتە (٢٥ ڕێبەندان ٢٧١٤).

٢ ـ مێژووی کوردیی بەرانبەر (١ نیسان ١٩٥٨):

(١ی نیسان) دەکەوێتە دوای (٢٠ ی ئازار). (٧٠٠) دەخرێتە سەر.

١٩٥٨ز+ ٧٠٠ = ٢٦٥٨ ک

بەپێی خشتەی مانگ و ڕۆژی بەرانبەر (١ ی نیسان) ی زایینی دەکەوێتە (١٢ ی نەورۆز) ی کوردی. بەمجۆرە مێژووە کوردییەکە دەبێتە (١٢ نەورۆز ٢٦٥٨).

٢ ـ یاسای گۆڕینی مێژووی کوردی بۆ زایینی:

ئەگەر مێژووەکە لە (١ ی نەورۆز تا ١٠ی بەفرانبار) بوو ، ئەوە (٧٠٠) لە ساڵە کوردییەکە دەردەهێنرێت. ئەگەر (دوای ١٠ی بەفرانبار) بوو ، (٦٩٩) ی لێ دەردەهێنرێت.

| کوردی بۆ زایینی | |
|---|---|
| ١ی نەورۆز تا ١٠ ی بەفرانبار | ـ ٧٠٠ |
| ١١ ی بەفرانبار تا ٣٠ی ڕەشەمێ | ـ ٦٩٩ |

بۆ نموونە بۆ دەستنیشانکردنی:

١ ـ مێژووی زایینیی بەرانبەر (٢٥ ڕێبەندان ٢٧١٤) ی کوردی:

(٢٥ی ڕێبەندان) دوای (١٠ی بەفرانبار) ـە، (٦٩٩) ی لێ دەردەهێنرێت.

٢٧١٤ک ـ ٦٩٩ = ٢٠١٥ز

بەپێی خشتەی مانگ و ڕۆژی بەرانبەر ، (٢٥ ڕێبەندان) دەکەوێتە (١٤ی شوبات). بەمە مێژووە زایینییەکە دەبێتە (١٤شوبات ٢٠١٥).

٢ ـ مێژووی زایینیی بەرانبەر (١٢ نەورۆز ٢٦٥٨):

(١٢ی نەورۆز) دوای (١ی نەورۆز) ـە ، (٧٠٠) ی لێ دەردەهێنرێت.

٢٦٥٨ک ـ ٧٠٠ = ١٩٥٨ز

بەپێی خشتەی مانگ و ڕۆژی بەرانبەر ، (١٢ی نەورۆز) دەکەوێتە (١ی نیسان). بەمجۆرە مێژووە زایینییەکە دەبێتە (١ نیسان ١٩٥٨).

ناو و ڕیزبەندی مانگەکانی زایینی و کوردی بەرانبەر یێک:

| ز | کوردی | ڕۆژ | مانگی زایینیی بەرانبەر | زایینی | ڕۆژ | مانگی کوردیی بەرانبەر |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | نەورۆز | ٣١ | ٢١ ئازار– ٢٠ نیسان | کانوونی ٢ | ٣١ | ١١ بەفرانبار ـ ١١ ڕێبەندان |
| ٢ | گوڵان | ٣١ | ٢١ نیسان – ٢١ ئایار | شوبات | ٢٩/٢٨ | ١٢ ڕێبەندان ـ ١٠ ڕەشەمێ |
| ٣ | جۆزەردان | ٣١ | ٢٢ ئایار ــ ٢١ حوزەیران | ئازار | ٣١ | ١١ ڕەشەمێ ـ ١١ نەورۆز |
| ٤ | پووشپەڕ | ٣١ | ٢٢ حوزەیران– ٢٢ تەمموز | نیسان | ٣٠ | ١٢ نەورۆز ـ ١٠ گوڵان |
| ٥ | خەرمانان | ٣١ | ٢٣ تەمموز – ٢٢ ئاب | ئایار | ٣١ | ١١ گوڵان ـ ١٠ جۆزەردان |
| ٦ | گەلاوێژ | ٣١ | ٢٣ ئاب ـــ ٢٢ ئەیلوول | حوزەیران | ٣٠ | ١١ جۆزەردان ـ ٩ پووشپەڕ |
| ٧ | ڕەزبەر | ٣٠ | ٢٣ ئەیلوول ــ ٢٢ تشرین١ | تەمموز | ٣١ | ١٠ ـ پووشپەڕ ـ ٩ خەرمانان |
| ٨ | گەڵاڕێزان | ٣٠ | ٢٣ تشرین١ ــ ٢١تشرینی٢ | ئاب | ٣١ | ١٠ خەرمانان ـ ٩ گەلاوێژ |
| ٩ | سەرماوەز | ٣٠ | ٢٢ تشرینی٢ ـ ٢١ کانون١ | ئەیلوول | ٣٠ | ١٠ گەلاوێژ ـ ٨ ڕەزبەر |
| ١٠ | بەفرانبار | ٣٠ | ٢٢کانون١ ــ ٢٠کانون٢ | تشرینی ١ | ٣١ | ٩ ڕەزبەر ـ ٩ گەڵاڕێزان |
| ١١ | ڕێبەندان | ٣٠ | ٢١ ک٢ – ١٩ شوبات | تشرینی ٢ | ٣٠ | ١٠ گەڵاڕێزان ـ ٩ سەرماوەز |
| ١٢ | ڕەشەمێ | ٣٠/٢٩ | ٢٠ شوبات – ٢٠ ئازار | کانوونی ١ | ٣١ | ١٠ سەرماوەز ـ ١٠ بەفرانبار |

**سەرچاوە:**

وریا عومەر ئەمین ( ٢٠٠٢) ساڵنامەی کوردستان. ئاراس. هەولێر.

ــــــــــ (٢٠٠٨) تحدید العلاقات البنیویة للتقویمین المیلادي والهجري وتأسیس نظام للتقویم الکوردي . منشورات مؤسسة سبیرس. مطبعة حجي هاشم. اربیل.

## ملخص البحث

### قوانين تحويل التقويم الميلادي الى الكوردي والكوردي الى الميلادي

**أ.د. وريا عمر أمين**

الاكاديمية الكوردية

يعتمد التقويمين الكوردي والميلادي على النظام الشمسي الذي يمثل دورة كاملة للارض حول الشمس، ومدتها ٣٦٥ يوماً و ٥ ساعات و ٤٨ دقيقة و٤٦ ثانية. تشير تواريخ التقويم الشمسي إلى موقع الارض من الشمس.

التقويم الكوردي فصلى يبدأ مع الانقلاب الربيعي في ٢١ اذار من كل سنة. مقسمة الى ١٢ شهرا . منها ٣١ يوما لكل من الاشهر الستة الاولى و ٣٠ يوما للاشهر الخمسة التالية وللشهر الاخير ٢٩ يوما للسنة البسيطة و ٣٠ يوما للسنة الكبيسة.

يبدأ التقويم الميلادى في ١ كانون الثاني. مقسمة الى ١٢ شهرا. لسبعة اشهر منها ٣١ يوما ولخمسة اشهر منها ٣٠ يوما وللشهر الأخير ٢٨ يوما في السنة البسيطة و ٢٩ يوما في السنة الكبيسة.

هذا البحث صياغة لقوانين رياضية يمكن بواسطتها تحويل اي تأريخ من التقويم الميلادي الى الكوردي و بالعكس.

Abstract

**Rules of Converting Gregorian Calendar to Kurdish and Visa Versa**

**Prof. Dr. Wirya Omar Ameen**
Kurdish Academy

Kurdish and Gregorian calendars both are solar, whose dates indicate the position of Earth on its revolution around the Sun . based on a 365- day common year.

Kurdish Calendar is seasonal, its year begins on the day in which the March equinox occurs. It consists of 12 months, the first six of which are 31 days, the next five 30 days, and the final month 29 days in a normal year and 30 days in a leap year.

Gregorian Calendar begins on the 1st January. It is divided into 12HYPERLINK "https://www.timeanddate.com/calendar/months/" months of irregular lengths. 11 of the months have either 30 or 31 days ،while the second month, February ،has only 28 days during the common year. Every four years is a leap year ،when one extra day, is added to February.

In this work mathematical equations are formed, by which a date in Kurdish Calendar could be converted to Gregorian and visa versa .

# کاریگەریی شێوەکانی ڕووی زەوی لەسەر فراوانبوونی شاری شەقڵاوە بەبەکارهێنانی هەستکردن لە دوور و GIS

**م. ی. هۆزان صادق مەولود**
بەشی جوگرافیا/ کۆلێژی ئەدەبیات
زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر

**پوختە:**

ئامانج لەم توێژینەوەیە بریتییە لە نیشاندانی فراوانبوونی شاری شەقڵاوە لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨٧-٢٠١٧) دا، وە شیکارکردنی هۆکارە کاریگەرەکان لە سەر فراوانبوون و ئاڕاستەی شارەکە لە نێوان ئەو ماوەیەدا، گرنگیی توێژینەوەکە لەوەدایە تێیدا کاریگەریی شێوەکانی ڕووی زەوی لەسەر فراوانبوونی شارەکە خراوەتە ڕوو بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بتوانرێت شارەکە بە ئاڕاستەی ئەو ناوچانە فراوان بکرێت کە گونجاو و لەبارن بۆ بنیادنانی نشینگە مرۆییەکان، بۆ ئەم مەبەستەش وێنەی ئاسمانی (Satellite image) لە جۆری (لاندسات ٧ -ETM) و نموونەی بەرزونزمی ژمارەیی (DEM) بە وردی (٣٠م) تایبەت بە ناوچەی لێکۆڵینەوە دەستەبەر کرا، دواتر کاریگەریی لێژی و شێوەکانی ڕووی زەوی لە سەر فراوانبوونی ڕووبەری شارەکە و ئاڕاستەکەی ڕوونکرایەوە، توێژینەوەکە بە چەند دەرئەنجامێک گەیشت لە گرینگترینیان: شارەکە بە هۆی کاریگەربوونی بە شێوەکانی ڕووی زەوی شێوەیەکی درێژکۆڵەیی وەرگرتووە، شارەکە بە هۆی کەمیی پلەکانی لێژی زیاتر بە ئاڕاستەی باکوری ڕۆژئاوا فراوان بووە.

**پێشەکی**

لە ئێستادا دیاردەی فراوانبوونی شارەکان بووەتە دیاردەیەکی ڕوون و بەرچاو لە زۆرێک لە پارچە جیاجیاکانی سەر ڕووی زەوی، وە ئەم فراوانبوونەش لە تەواوی قۆناغەکان بە یەک ئاست نییە و، بەڵکو لە هەندێک قۆناغ و بە هۆیەک لە هۆیەکان فراوانبوونەکە زۆرە و لە هەندێک قۆناغی تریش بە پێچەوانەوە دووچاری بەربەست و لەمپەری جیاجیا دەبێت، یەکێک لەم لەمپەر و بەربەستانەی دووچاری فراوانبوونی شارەکان دەبێتەوە بریتییە لە شێوەکانی ڕووی زەوی ، کە لە زۆر باردا تایبەت لە ناوچە شاخاوییەکان شوێنەواری زەق بە سەر فراوانبوونی سەنتەرە شارنشینییەکان جێدێڵێت، دیارە شاری شەقڵاوە بە هۆی پێگەکەیەوە کە کەوتۆتە ناوچەیەکی شاخاوی؛ بە ڕوونی و لە تەواوی قۆناغەکانی گەشەکردن و فراوانبوونیدا کاریگەر بووە بە شێوەکانی ڕووی زەوی ، بۆیە پێویست دەکات بە دروست و وردی مامەڵە لەگەڵ دۆخی شارەکە بکرێت و پلانی گونجاو بۆ فراوانبوونەکەی دابڕێژرێت.

شاری شەقڵاوە پێگەیەکی شاخاوی هەیە و دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێر بە دووری (٤٥ کم)، ڕووبەری شارەکە لەساڵی (٢٠١٧)دا گەیشتۆتە (٧,٨ کم$^{٢}$). شاری شەقڵاوە لە ڕووی ئەسترۆنۆمییەوە دەکەوێتە سەر خاڵی یەکتربڕی بازنەی پانی (١٣ ٢٤ ٣٦°) و هێڵی درێژی (١٧ ١٩ ٤٤°)، وە لە ڕووی جوگرافییەوە دەکەوێتە دۆڵی نێوان هەردوو زنجیرە چیای سەفین لە بەشی باشووری ڕۆژئاوا و چیای سۆرک لە باکوری ڕۆژهەڵات.

**گرنگی توێژینەوە:**

گرنگی توێژینەوەکە لەوەوە دەردەکەوێت کە باسی شار و فراوانبوونی – شاری شەقڵاوە- وەک نموونە دەخاتە بەرباس، وە کاریگەریی شێوەکانی ڕووی زەوی لە سەر فراوانبوون و ئاڕاستەی شارەکە شیکار دەکات ئەمەش لە چوارچێوەی شیکارکردنی قۆناغە

جیاوازەکانی فراوانبوونی شارەکە، بەمەش توێژینەوەکە خوێندنەوەیەکە بۆ واقعی شارەکە و ئاڕاستەکردنی لە داهاتوودا بە ئاڕاستەیەکی دروست بۆ ئەوە بتوانرێت شارەکە بە جۆرێک فراوان بێت کە هاوکۆک بێت لەگەڵ سروشتی ناوچەکە.

**نەخشەی (١) شوێنی شاری شەقڵاوە بە گوێرەی پارێزگای هەولێر**




## گریمانەی توێژینەوە:

توێژینەوەکە گریمانەی ئەوە دەخاتە ڕوو کە شارەکە کاریگەر بووە بە هۆکارە جیۆمۆرفییەکان، بە جۆرێک ئەم هۆکارانە لە لایەک بوونەتە بەربەست لە بەردەم فراوانبوونی شارەکە، لە لایەکی تریش بوونەتە هۆکاری ئاڕاستەکردنی شارەکە بە ئاڕاستەیەکی دیاریکراو، بۆیە وا پێویست دەکات لە داهاتوودا ڕێوشوێنی گونجاو و هەنگاوی تەندروست بنرێت بۆ ئاڕاستەکردنی شارەکە.

**ئامانجی توێژینەوە:**

ئامانج لەم توێژینەوەیە بریتییە لە نیشاندانی قۆناغەکانی فراوانبوونی شاری شەقڵاوە و دیارخستنی هۆکارە کاریگەرەکان لە سەر سنووردارکردن و ئاڕاستەکردنی شارەکە لە ماوەی قۆناغە جیاوازەکاندا و پراکتیزەکردنی ئەنجامە دەستهاتووەکان لە ئاڕاستەکردنی شارەکە بە ئاڕاستەیەکی دروست.

**داتا و کەرەستەکان**

بەکارهێنانی سەرچاوەکانی هەستکردن لە دوورەوە وەک (نموونەی بەرزونزمی ژمارەیی و وێنە ئاسمانییەکان) بۆ توێژکردنی شار و بەشاربوون (تحضر) بە یەکێک لە سەرچاوە کارا و کردارییەکان هەژمار دەکرێت، لەم سۆنگەیەوە نموونەی بەرزونزمی ژمارەیی (DEM) بە وردی جیاکاری (٣٠م) دەستەبەرکرا (earthexplorer.usgs.gov) و لە بەرنامەی (ArcGIS 10) و بە بەکارهێنانی تولّی (Spatial analysis) نەخشەی (بەرزونزمی و لێژی) بەهۆیەوە ئامادەکرا، هەروەها وێنەی ئاسمانی بە وردی (٣٠م) لە نێوان سالآنی (١٩٨٧ - ٢٠١٧) بەردەستکرا کە لە ماوەی (١٩٨٧/٨/٢٧و ١٩٩٧/٨/٢٥ و ٢٠٠٧/٦/١٥ و ٢٠١٧/١٢/١١) وەرگیراون و لە بەرنامەی (Erdas Imagine 2011) بە بەکارهێنانی تولّی (Layer Stack) باندەکانیان لێکدرا، دواتر ڕووبەری شاری شەقڵاوە لە هەر چوار قۆناغ دەرهێنراو لە پاشانیش کاریگەری هەر یەک لە (بەرزو نزمی و لێژی) لە سەر ڕووبەری شارەکە لە هەر یەک لە قۆناغەکان دیار کرا.

**تەوەری یەکەم:**

## ڕەگەزە ژینگەییەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە

### ١/ جیۆلۆجیای ناوچەی لێکۆڵینەوە

ناوچەی لێکۆڵینەوە دەکەوێتە سەر باڵی باکوری ڕۆژهەڵاتی چەماوەی قۆقزی سەفین، بەمەش ناوچەی لێکۆڵینەوە لە ڕووی تەکتۆنییەوە دەکەوێتە پشتێنەی پێچە بەرزەکان لە چوارچێوەی ڕەسیفی ناجێگیر (Buday, 1980, p.18).

لەم توێژینەوەیەدا کاریگەری جیۆلۆجیا لە سەر فراوانبوونی شاری شەقڵاوە لە هەردوو لایەنی لاری و ڕەقی چینە بەردەکانی پێکهاتە جیۆلۆجییەکان دیار دەخرێت، پێکهاتە جیۆلۆجییەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە لە ڕووی (لاری) و (ڕەقی) چینە بەردەکانیان جیاوازن، ئەم جیاوازییەش بە ڕوونی ڕەنگدانەوەی لە سەر فراوانبوونی شاری شەقڵاوە بە شێوە و ئاڕاستەیەکی دیاریکراو هەبووە، بە جۆرێک بە هۆی بەرزیی پلەی لاری و ڕەقیی پێکهاتەی (بێخمە) لە باشووری ڕۆژهەڵات، کە تێکڕای لارییەکەی دەگاتە زیاتر لە (٤٥) (Omar, 2005) و پێکهاتەیەکی ڕەق و پتەوە و چینە بەردەکانی بارستەیین (کتلي) لە جۆری تاوێری لایمستۆن و دۆڵەمایتین (Bellen et al., 2004) ، هەروەها پێکهاتەی (پیلاسپی) لە باکوری ڕۆژئاوا کە تێکڕای لارییەکەی دەگاتە نزیکەی (٥٠) (Omar, 2005) تاوێرەکانی لە جۆری لایمستۆن و دۆلەمایتی قوڕین (مولود، ٢٠١٤، ص١٤) ئەمە بووەتە هۆی بە دەرکەوتنی دوو پێکهاتەکە لە شێوەی بەربەستی چیایی، لە بەرانبەردا پێکهاتەی (کۆلۆش) کە لە دۆڵی شەقڵاوە و پێکهاتەکانی (ئینجانە و مقدادیە) لە دۆڵی ماوەران بە دەردەکەون، وە بە هۆی کەم ڕەقیی تاوێرەکانیان، کە پێکهاتەی کۆلۆش لە تاوێرەکانی لمی و قوڕی و لیتەیی و بڕێک لە بەردی کۆوەبوو (المدملکات) (Dawoody, 2004) و پێکهاتەی ئینجانە و مقدادیە لە تاوێرەکانی قوڕی و لمی پێکدێت (Shaikh, Saleh and Abdo, 1975) بە گشتی تاوێری هەر سێ پێکهاتەکە

پلەی ڕەقییان لە نێوان مام ناوەند ڕووەو بێهێزدایە، بەمەش هەردوو هۆکاری لاری و ڕەقی پێکهاتە جیۆلۆجییەکان بە هۆکارێکی کاریگەر لە سەر فراوانبوونی شاری شەقڵاوە هەژمار دەکرێت، بە جۆرێک بە هۆی لاریی چینە بەردەکانی هەردوو پێکهاتەی بێخمە و پیلاسپی و ڕەقییان لە لایەک و کەم ڕەقیی چینە بەردەکانی پێکهاتەکانی (کۆڵۆش و ئینجانە و مقدادیە) لە لایەکی تر شارەکە دوور لە هەردوو پێکهاتەی بێخمە و پیلاسپی و بە پانتایی پێکهاتەی (کۆڵۆش) بە تایبەتی فراوان بووە.

**نەخشەی (٢) جیۆلۆجیی ناوەی لێکۆڵینەوە**




سەرچاوە:

Zoran stevanovic and Miroslav Markovic, Hydrogeology of Northern Iraq, Minara Press, erbil, vol. 1, annex (22).

**٢/ جیۆمۆرفۆلۆجیا**

لــە ڕووی جیۆمۆرفۆلۆجییــەوە ناوچــەی لێکۆڵینــەوە دەکەوێتــە پشـتێنەی چیـا بـەرزەکان، کـە بـەرزی و لێـژی چیاکـان تێیـدا زۆرە و ئاراستەی چیاکان لە باکوری ڕۆژئاوا بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتە، ناوچەی لێکۆڵینەوە دەکەوێتە دۆڵێکی درێژکۆڵەیی دەورەدراو بە زنجیرە چیای (سەفین) لە باشووری ڕۆژئاوا و چیای (سۆرک) لە باکوری ڕۆژهەڵات، وە شارەکە بەهۆی کاریگەربوونی بەو هەڵکەوتە جوگرافییە شێوەیەکی درێژکۆڵەیی وەرگرتووە.

سـەبارەت بـە پلـەکانی لێـژی؛ بـە گـوێرەی پـۆلێنی (Peter Csima) (Jozsef Szabo, 2010, p.182) پـۆلێنکرا، بـە تێـڕوانین لـە نەخشـەی (٣) ڕووکاری ناوچەی لێکۆڵینەوە لە ڕووی پلەکانی لێژییەوە جیاوازی تێیدا بەدی دەکرێت، لەو ڕووەی پلەکانی لێژی بە ئاراسـتەی هـەردوو چیـای ناوبراو زیاد دەکات بە جۆرێک تێکڕای پلـەکانی لێژی لـە لاپاڵی چیـای سـەفین زیـاترە لـە (٣٥٪)، لـە بەرانبـەردا لـە سـنووری شـاری شـەقڵاوە تێکڕای پلەکانی لێژی لە نێوان (٠-٢٥٪) دایە کە دەکاتـە (٠-١٤°). وە بـە دیاریکراوی بەشی باکوری ڕۆژئـاوای شـارەکە پلـەکانی لێژی لـە نێوان (٠-١٢٪) دەبێـت کـە بـە نزیککـراوەیـی دەکاتـە (٠ -٧ °) ، وە بەشـی باشووری ڕۆژهەڵاتی بە گشتی لێژاییەکەی لە نێوان (٥-٢٥٪) واتـا: لـە نێوان (٣-١٤°) دایە.

**نەخشەی (٣) بەرزونزمی و لێژیی ناوچەی لێکۆڵینەوە**




سەرچاوە:

بەکارهێنانی نموونەی بەرزونزمی ژمارەیی DEM بە وردی جیاکاری (٣٠ م) لە بەرنامەی (GIS).

**تەوەری دووەم:**

**کاریگەریی شێوەکانی ڕووی زەوی لەسەر فراوانبوونی شاری شەقڵاوە**

**١/ قۆناغەکانی فراوانبوونی شاری شەقڵاوە**

وەک زانراوە شار لە ماوەی گەشەکردنیدا بە چەند قۆناغێک تێپەڕ دەبێت، وە ئەم گەشەکردنەش لە گشت قۆناغەکاندا بە یەک ئاست و قەبارە ڕوو نادات وەک ئەوەی لە یەکێک لە قۆناغەکانیدا وە بە هۆی هۆکارێک یان چەند هۆکارێک گەشەکردنەکە زۆر و خێرا بێت یان بە پێچەوانەوە.

لێکۆڵینەوە لە شار و فراوانبوونەکەی یەکێکە لەو بابەتانەی لە کاتی ئێستادا گرنگیی تایبەتی پێدەدرێت و جەختی لێدەکرێتەوە، چونکە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە نیشتەجێبوونی مرۆڤەوە هەیە، لەم سۆنگەیەوە لەم توێژینەوەیەدا هەوڵدراوە قۆناغەکانی فراوانبوونی شاری شەقڵاوە بە گوێرەی کاریگەربوونی بە جیۆمۆرفی ژینگەکەی بخرێتە بەرباس و ئاستی کاریگەربوونی پێیەوە دیار بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە فراوانبوونی شارەکە بە بەکارهێنانی وێنە ئاسمانییەکان (glovis.usgs.gov) لە چوار قۆناغی جیاواز لە ماوەی نێوان سالآنی (١٩٨٧ - ٢٠١٧) توێژ کرا، بە جۆرێک ڕووبەر و ئاراستەی شارەکە لە هەر یەک لە قۆناغەکاندا لە ڕوویەک و کاریگەربوونیان بە شێوەکانی ڕووی زەوی لە ماوەی (٣٠) ساڵدا لە ڕوویەکی تر توێژ کراوە، ئەمەش بە مەبەستی زانینی فراوانبوونی شارەکە و ئاستی کاریگەربوونی بە یەکە جیۆمۆرفی و هۆکارە فیزیکییەکانی تری وەک (بەرزو نزمی و لێژی).

دەکرێت هەر چوار قۆناغی فراوانبوونی شارەکە بەم شێوەیە بەرچاو بخرێت:

**قۆناغی یەکەم (١٩٨٧ تا کۆتایی ١٩٩٦)**

بە سەیرکردن لە خشتەی (٣) و نەخشەی (٤) دەردەکەوێت ڕووبەری شاری شەقڵاوە لەم قۆناغەدا تا ڕادەیەک بچووکە و

گەیشتۆتە (٣,٧ کم٢)، بە ڕێژەی (٤٧,٤٪) لە کۆی گشتی ڕووبەری دوا قۆناغ (٢٠١٧)، شاری شەقڵاوە لەم قۆناغەدا جگە لە بەشێکی کەم نەبێت بە تەواوەتی کەوتۆتە دۆڵی نێوان هەردوو چیای (سەفین و سۆرک).

**نەخشەی (٤) قۆناغەکانی فراوانبوونی شاری شەقڵاوە**




سەرچاوە:
بەکارهێنانی وێنەی ئاسمانی بە وردی جیاکاری ٣٠م لە بەرنامەی (GIS)

**خشتەی (٣) ڕووبەری شاری شەقڵاوە بە گوێرەی قۆناغەکان**

| قۆناغ | ڕووبەر کم٢ |
| --- | --- |
| قۆناغی یەکەم ١٩٨٧ | ٣,٧ |
| قۆناغی دووەم ١٩٩٧ | ٤,٤ |
| قۆناغی سێیەم ٢٠٠٧ | ٥,٩ |
| قۆناغی چوارەم ٢٠١٧ | ٧,٨ |

سەرچاوە: بەکارهێنانی وێنەی ئاسمانی لاندسات ٧ لە بەرنامەی (GIS)

**قۆناغی دووەم (١٩٩٧ تا کۆتایی ٢٠٠٦)**

ڕووبەری شارەکە لەم قۆناغەدا بە کەمی گۆڕانی بەسەر هاتووە، ئەمە بە هەمان شێوە سەبارەت بە ئاڕاستەکەشی، بە جۆرێک ڕووبەری شارەکە لەم قۆناغەدا گەیشتۆتە (٤,٤ کم$^{2}$)، وە سەبارەت بە ئاڕاستەی فراوانبوونەکەی زیاتر بە ئاڕاستەی باکوری ڕۆژئاوا فراوان بووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کەمیی پلەکانی لێژی بە ئاڕاستەی ناوبراو.

**قۆناغی سێیەم (٢٠٠٧ تا کۆتایی ٢٠١٦)**

لەم قۆناغەدا ڕووبەری شارەکە زیاتر فراوان بووە، ڕووبەرەکەی گەیشتۆتە (٥,٩ کم$^{2}$)، بە گشتی شارەکە بە ئاڕاستەکانی باکوری ڕۆژئاوا لە چوارچێوەی دۆڵی نێوان هەردوو چیای سەفین و سۆرک و ئاڕاستەی باکوری ڕۆژهەڵات لە دەربەندی شەقڵاوە ڕووەو لاپاڵی چیای سۆرک فراوان بووە.

**قۆناغی چوارەم (٢٠١٧)**

دەکرێت بە قۆناغی ئێستاش بناسێنرێت، لەم قۆناغەدا شارەکە بەراورد بە قۆناغی یەکەم دوو هێندە زیادی کردووە، واتا: ڕووبەرەکەی گەیشتۆتە (٧,٨ کم$^{2}$)، لەم قۆناغەدا شارەکە بە گشت ئاڕاستەکان بە دەر لە ئاڕاستەی باشووری ڕۆژئاوا ڕووەو لاپاڵی چیای سەفین گەشەی کردووە.

**٢/ ئاڕاستەکانی فراوانبوونی شاری شەقڵاوە**

بە تێڕوانین لە قۆناغەکانی فراوانبوونی شاری شەقڵاوە دەردەکەوێت شارەکە بە شێوەی درێژکۆلەیی (هێڵی) گەشەی کردووە، ئەم شێوازەش بە شێوەی درێژکۆلەیی لەگەڵ دۆڵ یان ڕووبار درێژ دەبێتەوە ، شارەکە بەم شێوازە گەشەی کردووە ئەمەش بە هۆی بوونی دۆڵێکی درێژکۆلەیی لە نێوان دوو زنجیرە چیا، بە جۆرێک شارەکە بە درێژایی قۆناغەکانی گەشەسەندنی بە ڕێژەیەکی بەرچاو لە باشووری ڕۆژهەڵات ڕووەو باکوری ڕۆژئاوا هەنگاوی ناوە، هەرچی

تایبەتـە بـە ئاڕاسـتەی فراوانبوونەکـە بـە تێـڕوانین لـە نەخشـەی (٥) دەردەکـەوێت شـارەکە زیـاتر ڕووەو ئاڕاسـتەی بـاکوری ڕۆژئـاوا بـە هاوتـەریبی لەگـەڵ لاپـاڵی هـەردوو چیـای سـەفین و سـۆرک گەشـەی کـردووە و نێوانـەی نێـوان چـەقی شـارەکە تـا ئەوپـەڕی بـە ئاڕاسـتەی بـاکوری ڕۆژئـاوا (٥٦٥٣ م) دەبێـت، کـەچی نێوانەکـە بـە ئاڕاسـتەی باشـووری ڕۆژهـەڵات دەگاتـە (٢٩٤٥م)، ئەمـەو؛ شـارەکە لـە کۆتـایی قۆنـاغی یەکـەم تـا قۆنـاغی چـوارەم (٢٠١٧) بـە نزیکـەی (٣٠٥٠ م) بـە ئاڕاستەی باکوری ڕۆژئاوا فراوان بووە، کەچی لە ماوەی هـەمان قۆنـاغ ئاستی فراوانبوونەکە بە ئاڕاسـتەی باشـووری ڕۆژهـەڵات تـەنها (٣٨٠م) بووە.

**نەخشەی (٥) ئاڕاستەکانی فراوانبوونی شاری شەقڵاوە**




سەرچاوە: نەخشەی (٤) لە بەرنامەی (GIS)

ئەم حاڵەتە بە ئاڕاستەی هەردوو چیای (سەفین و سۆرک)یش هەر ڕاستە، بە جۆرێک ئاڕاستەکە زیاتر ڕووەو چیای دووەم هەنگاوی ناوە، کاتێک بە تێڕوانین لە نەخشەی (٥) دەبینرێت فراوانبوونی شارەکە بە تێکڕا ڕووەو چیای سۆرک لە کۆتایی قۆناغی دووەم تا قۆناغی چوارەم گەیشتۆتە (٥٩٠ م)، کەچی ئەم فراوانبوونە ڕووەو چیای سەفین لە هەمان ماوەدا زۆر کەمترە و بە تێکڕا دەگاتە نزیکەی (١٧٠ م).

**٣/ کاریگەریی بەرزونزمی لە سەر فراوانبوونی شاری شەقڵاوە**

بە تێڕوانین لە نەخشەی (٦) دەردەکەوێت؛ بە هۆی بوونی هەر دوو چیای (سەفین) لە بەشی باشووری ڕۆژهەڵات و (سۆرک) لە بەشی باکوری ڕۆژئاوادا شارەکە هاوتەریب لەگەڵ لاپاڵی هەردوو چیایەکە و بە درێژایی دۆڵی نێوانیان درێژ بووەتەوە ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تر، وەک لە تەواوی قۆناغەکان دەردەکەوێت شارەکە هێڵی بەرزیی یەکسانی (١١٠٠ م) تێپەڕ نەکردووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە شارەکە لە تەواوی قۆناغەکان ڕووەو ئەو ناوچانە گەشەی کردووە کە بەرزییان کەمە تایبەت ڕووەو هێڵی بەرزیی یەکسانی (٩٠٠ م) ڕووەو خوارەوە.

**٤/ کاریگەریی لێژی لە سەر فراوانبوونی شاری شەقڵاوە**

هۆکاری لێژی لە پاڵ هۆکارەکانی تر بە یەکێک لە کاریگەرترین هۆکارەکان هەژمار دەکرێت لە سەر فراوانبوونی ڕووبەر و ئاڕاستەی شارەکان، بەو مانایەی زیادبوونی لێژیی ڕووی زەوی هۆکارێکی بەربەستە لە بەردەم فراوانبوونی ڕووبەری شارەکان و ئاڕاستەیان، ئەمە سەرباری ئەوەی بە هۆی زۆریی پلەی لێژییەوە تێچوونی بنیادنانی نشینگە مرۆییەکان زیاد دەبێت و شێوازەکەشی دەگۆڕێت، بۆ نموونە: بنیادنانی نشینگەکان لە سەر ئەو ڕووانەی پلەی لێژییان لە نێوان (٠–٥٪) واتا: نزیکەی (٠– ٣°) دایە ئاسان و ئابوورییانەیە، وە لە

ئەو ڕووەی پلەی لێژییەکەی لە نێوان (٥-١٢٪) واتا: نزیکەی (٣ -٧°) کەمێک پێویستی بە ڕێکخستن دەبێت، وەک ڕاستکردنی زەوی و دروستکردنی پلیکانە (Jozsef Szabo,2010, p.182) لە بەرانبەردا کاتێک پلەکانی لێژی بگاتە (٢٥٪) واتا: نزیکەی (١٤°) ئەوا دەست نادات بۆ بنیادنانی نشینگەکان ئەگەر بە شێوەیەکی گونجاو دیزاین نەکرێت، وەک پلیکانە و دیواری پاڵپشت (Jozsef Szabo,2010).

**نەخشەی (٦)**

**قۆناغەکانی فراوانبوونی شاری شەقڵاوە بە گوێرەی بەرزونزمی**




سەرچاوە: بە بەکارهێنانی نموونەی بەرزونزمی ژمارەیی بە وردی جیاکاری (٣٠ م) لە بەرنامەی (GIS)

**نەخشەی (٧)**

**کاریگەریی لێژی لە سەر قۆناغەکانی فراوانبوونی شاری شەقڵاوە**




سەرچاوە: بە بەکارهێنانی نموونەی بەرزونزمی ژمارەیی بە وردی جیاکاری (٣٠ م) لە بەرنامەی (GIS)

بە تێڕوانین لە نەخشەی (٧) و خشتەی (٤) دەکرێت ئەم ڕاستییانە پێشچاو بخرێت:

– لە (قۆناغی یەکەم) شاری شەقڵاوە لە سەر ڕوویەک بنیاد نراوە پلەی لێژییەکەی بەراورد لەگەڵ قۆناغەکانی تر بەرزە و بە گشتی پلەی لێژییەکەی لە نێوان (٥-٢٥٪) واتا: نزیکەی (٣-١٤°) دەبێت، بە جۆرێک دەستەی لێژی (٥-١٢٪) ڕووبەرەکەی گەیشتۆتە (١,٧ کم$^2$) بە ڕێژەی (٤٥,٩٪) و دەستەی لێژی (١٢-٢٥٪) ڕووبەرەکەی گەیشتۆتە (١,٢٨ کم$^2$) و بە ڕێژەی (٣٤,٥٪).

- لە قۆناغی دووەمدا پلەکانی لێژی گۆڕانێکی ئەوتۆیان بەسەر نەهاتووە، کەچی لە قۆناغی سێیەمدا شارەکە ڕووەو ئاراستەی باکوری ڕۆژئاوا هەنگاوی ناوە کە پلەکانی لێژی تێیدا تا ڕادەیەک نزمە و لە نێوان (٠-١٢٪) دەبێت، بە جۆرێک ڕووبەری هەردوو دەستەکە نزیکەی (٧٠٪) ی کۆی گشتی ڕووبەری شارەکە دەبێت، بە جۆرێک دەستەی لێژی (٠-٥٪) بە ڕووبەری (١.٢٥ کم$^{2}$) و بە ڕێژەی (٢١,١٪) و دەستەی (٥-١٢٪) بە ڕووبەری (٢,٧ کم$^{2}$) و بە ڕێژەی (٤٥,٧٪).

- بە هەمان شێوەی قۆناغی پێشووتر شارەکە لە قۆناغی چوارەم لە ڕووی پلەکانی لێژییەوە بە ئاراستەی ئەو ناوچانە ئاراستەی گرتووە کە پلەکانی لێژی تێیدا تا ڕادەیەک کەمە، بە گشتی پلەی لێژییەکەی لە نێوان (٠-١٢٪).

**خشتەی (٤)**

**قۆناغەکانی فراوانبوونی شاری شەقڵاوە بە گوێرەی دەستەکانی لێژی**

| | قۆناغەکانی فراوانبوونی (کم$^{2}$) | | | |
|---|---|---|---|---|
| دەستەی لێژی (٪) | ١٩٨٧ | ١٩٩٧ | ٢٠٠٧ | ٢٠١٧ |
| ٠- ٥ | ٠,٦٧٧ | ٠,٨٨ | ١,٢٥ | ١,٥٩ |
| ٥-١٢ | ١,٧ | ٢ | ٢,٧ | ٣,٤ |
| ١٢-٢٥ | ١,٢٨ | ١,٤٨ | ١,٨٢ | ٢,٤٣ |
| ٢٥-٣٥ | ٠,٠٣٣ | ٠,٠٥٥ | ٠,١٢١ | ٠,٣٢ |
| ٣٥ و زیاتر | ٠ | ٠ | ٠,٠١٧ | ٠,٠٦٦ |
| کۆی گشتی (کم$^{2}$) | ٣,٧ | ٤,٤ | ٥,٩ | ٧,٨ |

سەرچاوە: بەکارهێنانی نەخشەی (٧) لە بەرنامەی (GIS)

- شارەکە لە قۆناغە جیاوازەکانیدا زیاتر ڕووەو ئاراستەی باکوری ڕۆژئاوا گەشەی کردووە، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کەمیی پلەکانی لێژی بە ڕووی ئەم ئاراستەیە، وە ئەمەش دەکرێت بکرێت بە پێوەرێک بۆ پلانی داهاتووی ئاراستەکردنی شارەکە.

- بە ڕوونی دەردەكەوێت كە پلەكانی لێژیی بەرز (٢٥٪ ڕووەو ژوور) واتا: نزیكەی (١٤° و زیاتر) بە لەمپەری سەرەكی هەژمار دەكرێت لە بەردەم فراوانبوونی شارەكە بە تایبەت بە ئاڕاستەی هەردوو لاپاڵی چیای سەفین و سۆرك و بەشی ناوەڕاستی شارەكە كە بە دۆڵی شینكان دەناسرێت.

لەمەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی كە پلەكانی لێژی بە هۆكاری سەرەكی هەژمار دەكرێن لە سەر فراوانبوونی شاری شەقڵاوە، بە جۆرێك شارەكە لە قۆناغەكانی گەشەسەندنیدا بە ئاڕاستەی پلە لێژییە كەمەكان ئاڕاستەی گرتووە.

### ٥/ كاریگەری شێوەكانی ڕووی زەوی لە سەر فراوانبوونی شاری شەقڵاوە

یەكێك لە هەرە هۆكارە سەرەكییەكانی كاریگەر لە سەر دیاریكردنی شوێنی بنیادنانی شارەكان و ئاڕاستەكردنیان بریتییە لە شێوەكانی ڕووی زەوی وەك چیا و دۆڵ و دەشتەكان، لەو ڕووەی شارەكان بە گشتی لە پانتایی دۆڵ و ڕووە كەم لێژەكان بنیاد دەنرێن، چونكە شێوەكانی زەوی لۆكاڵی (Local landforms) بە درێژایی مێژوو ڕۆڵێكی دیاریان هەبووە لە دیاریكردنی شوێنەكان بۆ بنیادنانی نشینگەكان (Kuldeep Pareta and Sanjay Prasad, 2012) شاری شەقڵاوەش بە هۆی بوونی دۆڵێكی درێژكۆڵەیی و كەم لێژ لە نێوان زنجیرە چیای سەفین و چیای سۆرك بنیادنراوە و بە درێژایی قۆناغەكانی فراوانبوونی كاریگەر بووە پێی.

بە تێڕوانین لە هەردوو نەخشەی (٥) و (٦) دەردەكەوێت كە شارەكە لە تەواوی قۆناغەكانی گەشەسەندنیدا بە ڕێژەیەكی بەرچاو كاریگەر بووە بە شێوەكانی ڕووی زەوی، وە دەكرێت شێوەكانی ڕووی زەوی بەم جۆرە بناسرێن:

**یەکەم: چیاکان**

ئەم یەکەیە چیای سەفین و سۆرک لەخۆ دەگرێت، یەکەی چیاکان بە کاریگەرترین یەکەی جیۆمۆرفی لە سەر فراوانبوونی شاری شەقڵاوە هەژمار دەکرێت، بە جۆرێک لە قۆناغی یەکەمدا شارەکە لە بەرزیی (٩٥٠-١٠٠٠ م) لە بناری چیای سەفین بنیادنراوە، ئەم بەرزییە لە ماوەی هەر سێ قۆناغی (دووەم و سێیەم و چوارەم) بە کەمی گۆڕانی بە سەر دێت و دەگاتە (١٠٥٠ م)، هەرچی تایبەتە بە چیای سۆرک سنووری شارەکە تەنها لە دوو قۆناغی کۆتاییدا دەگاتە لاپاڵی چیای سۆرک، بە جۆرێک لە قۆناغی سێیەم دەگاتە بەرزیی (٩٠٠ م) و لە قۆناغی چوارەمیش (١٠٠٠ م)، سەبارەت بە پلەی لێژی، لە چیای سەفین وەک لە نەخشەی (٧) دەردەکەوێت پلەکانی لێژی لاپاڵی باکوری ڕۆژهەڵاتی زیاترە لە (٣٥٪) واتا: نزیکەی (٢٠ْ) ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت کرداری بنیادنان لە لاپاڵی چیاکە نا ئابووریانەیە وەک لە قۆناغەکانی فراوانبوونی شارەکەش دەردەکەوێت، بۆیە بە هۆی بەرزیی پلەکانی لێژی شارەکە بەدوور لە ئاڕاستەی لاپاڵی چیاکە و هاوتەریب لەگەڵ بناری چیایەکە گەشەی کردووە، بە جۆرێک لە کۆی هەر چوار قۆناغدا تەنها (٠,٥٢٧ کم²) بە ڕێژەی (٦,٧٪)ی ڕووبەری شارەکە کەوتۆتە چوارچێوەی چیای سەفین، لە بەرانبەردا و سەبارەت بە پلەکانی لێژی لە لاپاڵی باشووری ڕۆژهەڵاتی چیای سۆرک بە گشتی لە نێوان (٢٥-٣٥٪) دایە، وە تەنها لە قۆناغی سێیەم و چوارەمدا سنووری شارەکە گەیشتۆتە لاپاڵی چیایەکە، بە جۆرێک ڕووبەری فراوانبوونەکە گەیشتۆتە (٠,٢٣ کم²) و بە ڕێژەی (٢,٩٪) ی ڕووبەری گشتی شارەکە، ئەم فراوانبوونەش لە دەستەی لێژی (١٢-٢٥٪) ڕوویداوە نەخشەی (٧).

**دووەم: دۆڵەکان**

بە گشتی دۆڵەکان بە هۆی گونجاویی ئاووهەوا و بوونی سەرچاوە ئاوییەکان لە لایەک و لەیاری خاک و کەمیی لێژی بە ناوچەیەکی گونجاو بۆ کۆبوونەوەی سەنتەرە ئاواکارییەکان هەژمار

دەکرێن، هەردوو دۆڵی شەقڵاوە و ماوەران بە یەکێک لە کاریگەرترین شێوەکانی ڕووی زەوی هەژمار دەکرێت لە سەر فراوانبوونی شاری شەقڵاوە، لە دۆڵی شەقڵاوە بە هۆی بوونی ڕوویەکی تا ڕادەیەک کەم لێژ بە تایبەتی لە بەشەکانی باکوری ڕۆژئاوا کە پلەکانی لێژی لە نێوان (٠-١٢٪) وە بە گشتی لە (٢٥٪) تێپەڕ نابێت، هەروەها سەبارەت بە دۆڵی ماوەران کە شارەکە بە هۆی دەربەندی شەقڵاوەوە بە ئاڕاستەیدا درێژ بووەتەوە، پلەکانی لێژی تێیدا تایبەت لەو بەشەی کە شاری شەقڵاوەی تێدا بنیادنراوە لە نێوان (٠-١٢٪) دایە، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی شارەکە بە ڕێژەیەکی بەرفراوان لە ڕووی دۆڵەکە گەشە بکات، بە جۆرێک نزیکەی لە (٩٠٪) ڕووبەری شارەکە لە هەر چوار قۆناغەکەدا کەوتۆتە چوارچێوەی ئەم یەکەیە.

سەبارەت بە ئاڕاستەکردنی شارەکە بۆ مەبەستی بنیادنانی نشینگە مرۆییەکان لە قۆناغی داهاتوودا و بە خوێندنەوەی هۆکارە کاریگەرەکانی سەر فراوانبوونی شارەکە لە هەر یەک لە (جیۆلۆجیا، بەرزونزمی، پلەی لێژی و شێوەکانی ڕووی زەوی) دەکرێت بگوترێت: باشترین شوێن بۆ ئاڕاستەکردنی شارەکە و فراوانبوونی لە قۆناغەکانی داهاتوو بریتییە لە: دۆڵی نێوان زنجیرە چیای سەفین و سۆرک بە ئاڕاستەی باکوری ڕۆژئاوا ئەمە لە لایەک، دۆڵی ماوەران بە هەردوو ئاڕاستەی باکوری ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژهەڵات لە لایەکی تر، چونکە ئەم دوو ناوچەیە لە ڕووی پلەی لێژییەوە گونجاو و لەبارن بۆ بنیادنانی نشینگە مرۆییەکان و پلەی لێژی تێیاندا لە (١٢٪) تێپەڕ ناکات، ئەمە بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی تا بکرێت نشینگەکان زیاتر بە شێوازی ستوونی بنیاد بنرێن و سنووربەزێنی نەکرێتە سەر خاکە کشتوکاڵییە لەبارەکان، ئەمەش بە هەڵسەنگاندنی دۆخەکە و ڕەچاوکردنی بنەما و پرێنسیپە دروست و پێشخستنی پێویستییە سەرلیست و لە پێشینەکان، ئەمەو هەردوو لاپاڵی چیای سەفین و سۆرک بە ناوچەیەکی نالەبار لە سەر ئاڕاستەکردنی شارەکە بە ئاڕاستەیاندا لە قەڵەم دەدرێت، چونکە

پلەی لێژی تێیاندا بەرزە تایبەت چیای سەفین کە زیاترە لە (٣٥٪) واتا: (٢٠°)، ئەمە سەرباری ئەوەی جۆری تاوێرەکانی لە پێکهاتەی (بێخمە)دا ڕەق و بارستەیین (کتلي)، وە لە بەرانبەردا لاپاڵی چیای سۆرک زیاتر لە پێکهاتەی جەرکەس پێکدێت و ئەگەری ڕوودانی کرداری خلیسکانی بەردینی تێیدا بەدی دەکرێت (یوسف و السعدی، ٢٠١٠)، لە نێوان ئەم دوو ناوچەیەشدا دۆڵی شەقڵاوە بە ئاراستەی باشووری ڕۆژهەڵات بە ناوچەیەکی مام ناوەند لە ڕووی لەبار و گونجاوییەوە لە قەڵەم دەدرێت، ئەمەش دیسان بە هۆی لێژییەوە کە بە گشتی پلەی لێژیی ڕووەکەی لە نێوان (١٢-٢٥٪) دەبێت.

لەمەی خرایە ڕوو دەرکەوت باشترین ئاراستە بۆ بنیادنانی نشینگە مرۆییەکان لە شاری شەقڵاوە بریتییە لە هەردوو ئاراستەی (ڕۆژهەڵات و باکوری ڕۆژئاوا)، بە پێچەوانەوە ئاراستەی باشووری ڕۆژهەڵات لەباریی شوێنی بە مام ناوەند و هەردوو لاپاڵی باشووری ڕۆژئاوای چیای سۆرک و لاپاڵی باکوری ڕۆژهەڵاتی چیای سەفین لەباریی شوێنیان بە نالەبار هەژمار دەکرێت، هەروەها دەرکەوت کە شێوەکانی ڕووی زەوی بە هۆکاری سەرەکی لە سەر فراوانبوون و ئاراستەکردنی شارەکە هەژمار دەکرێن، بە جۆرێک یەکەی چیایی بووەتە بەربەست لە سەر فراوانبوونی شارەکە، لە بەرامبەردا یەکەی دۆڵەکان بە هۆکاری یارمەتیدەر لە سەر فراوانبوون و ئاراستە وەرگرتنی شارەکە لە قەڵەم دەدرێن.

**دەرئە نجامەکان:**

باسەکە بە کۆمەڵێک دەرئەنجام گەیشتووە کە دەکرێت ئاماژە بە گرنگترینیان بکرێت :

١- ناوچەی لێکۆڵینەوە لە ڕووی جیۆلۆجییەوە دەکەوێتە سەر باڵی باکوری ڕۆژهەڵاتی چەماوەی قۆقزی سەفین، بەمەش ناوچەی لێکۆڵینەوە لە ڕووی تەکتۆنییەوە دەکەوێتە پشتێنەی پێچە بەرزەکان لە چوارچێوەی رەسیفی ناجێگیر.

٢- لە ڕووی بەرزو نزمییەوە ناوچەی لێکۆڵینەوە دەکەوێتە دۆڵێکی درێژکۆڵەیی نێوان دوو چیا، کە بە ڕوونی ڕەنگدانەوەی لە سەر شێوەی فراوانبوون و ئاڕاستەی شارەکە جێهێشتووە.

٣- لە ئەنجامی دەرخستنی قۆناغەکانی فراوانبوونی شاری شەقڵاوە دەرکەوت پلەکانی لێژی و بەرزو نزمی و شێوەکانی ڕووی زەوی کاریگەریی دیار و ڕوونیان لە سەر فراوانبوونی شارەکە و ئاڕاستەکەی هەبووە.

٤- دەرکەوت کە یەکەی چیاکان بە هۆکاری بەربەست لە سەر فراوانبوونی شارەکە هەژمار دەکرێت، لە بەرانبەردا بە درێژایی هەر چوار قۆناغ شارەکە بە ڕێژەی هەرە زۆر لە چوارچێوەی دۆڵەکان پەلوپۆ و گەشەی کردووە.

**پێشنیازەکان:**

١- باش وایە ئاڕاستەکردنی شارەکە بە دوور بێت لە ئاڕاستەی هەردوو لاپاڵی چیای سەفین و سۆرک، بە هۆی سەختی و لێژیی لاپاڵەکانیان.

٢- بە هۆی گونجاویی ئاڕاستەی باکوری ڕۆژئاوا لە ڕووی لەباریی شوێنی بۆ بنیادنانی نشینگە مرۆییەکان بە باش دەزانرێت ئاڕاستەی شارەکە بە ئاڕاستەی ناوبراو چڕ بکرێتەوە، ئەمە بە لەبەرچاوگرتنی بنەما و پرێنسیپە دروستەکان و پێشخستنی پێویستییە سەرلیست و لە پێشینەکان.

٣- چڕکردنەوەی هەوڵەکان بۆ زیاتر ئامادەکردن و ئەنجامدانی باس و توێژینەوەی هاوشێوەی توێژینەوەی بەردەست لە سەر شارەکە و شیکردنەوەی هۆکارە کاریگەرەکان لە سەر فراوانبوونی.

**سەرچاوەکان: یەکەم: سەرچاوە عەرەبییەکان**

١/ تێزی ماستەر و دکتۆرا

١- مولود، هوزان صادق، ٢٠١٤. الأشكال الأرضية في منطقة سهل هرير وأحواضها النهرية مع تطبيقاتها، رسالة ماجستير مقدمة إلى كلية الآداب جامعة صلاح الدين، أربيل (غير منشورة)، ١٤٥ ص.

٢/ گۆڤارە زانستییەکان

١- يوسف، لؤي داود و السعدي، سعد نعمان، ٢٠١٠. تحليل استقرارية المنحدرات الصخرية المحيطة بمنطقة شقلاوة، مجلة الجيولوجية والتعدين، مجلد ٦ ، عدد١، ص ١٧-٣٠.

**دووەم: سەرچاوە بیانییەکان**

پەرتووکەکان/١

1- Szabo, Joszef, 2010. Anthropogenic geomorphology, Springer, Hungary, 297 pp.

2- Buday, Tibor, 1980. The Regional Geology of Iraq, Dar Al-Kutib publishing house, University of Mousl, 445 pp.

3- Bellen, V.R.C et al., 2004. Stratigraphic lexicon of Iraq, CNRS Edition, 239 pp.

4- stevanovic, Zoran and Markovic, Miroslav, 2003. Hydrogeology of Northern Iraq, Minara Press, erbil, vol. 1,130 pp.

٢/ تێزی ماستەر و دکتۆرا

1- Omar, Abdullah A., 2005. An Integrated Structural and Tectonic study of the Binabawi-Safin-Bradost Region in Iraqi Kurdistan, UnPub. Ph.D. thesis, University of Salahaddin, 293 pp.

2- Al-Dawoody, A.N., 2004. Gravity study in the Harir area Iraqi Kurdistan Region, UnPub. M.Sc. Thesis, College of Science, Salahaddin University, 89 pp.

٣/ گۆڤارەکان

1- Al-Shaikh, Z.D., Saleh, S. A. and Abdo, H.P., 1975. Contribution to the Geology of Shaqlawa-Harir area, Journal of The Geological Society of Iraq, Special Issue.

2- Pareta, Kuldeep and Prasad, Sanjay, 2012. Geomorphic effect on Urban expansion, India Geospatial fourm, pp 1-9.

٤/ نەخشەکان

1- LANDSAT -7 ETM.

2-Digital Elevation Modeling (30 M).

٥/ سایتی ئینتەرنێت

1- www.glovis.usgs.gov

2- www. earthexplorer.usgs.gov

## ملخص البحث

## تأثير الأشكال الأرضية على توسع مدينة شقلاوه بإستخدام تقنيات الإستشعار عن بعد ونظم المعلومات الجغرافية.

**م.م. هوزان صادق مولود**
قسم الجغرافية – كلية الاداب – جامعة صلاح الدين

الهدف المتوخى من هذه الدراسة هو إظهار التوسع المساحي لمدينة شقلاوة خلال سنوات (١٩٨٧-٢٠١٧)، وتحليل العوامل المؤثرة على توسع المدينة وإتجاهاتها خلال تلك السنوات، تكمن أهمية الدراسة هذه كونها توضح تأثير الأشكال الأرضية على توسع المدينة خلال العقود الثلاثة المنصرمة لكي يكون توسعها في المراحل القادمة توسعا صحيحا بحيث يتناسب مع بيئة المدينة بما فيه بناء المشاريع السكنية، وبغية تحقيق ذلك تم الحصول على المرئيات من نوع (لاندسات 7 – ETM) و نموذج التضرس الرقمي ذات الدقة التميزية (٣٠م)، ثم بعد ذلك تم تحديد مساحة المدينة وإتجاهاتها من جهة وتحليل تأثير الإنحدار والأشكال الأرضية عليهما من جهة أخرى، وقد توصلت الدراسة لمجموعة من الاستنتاجات أهمها: أخذت المدينة شكلا طوليا كونها متأثرة بالأشكال الأرضية، لاسيما وادي شقلاوة منها، هذا؛ وقد تركز توسع المدينة بإتجاه الشمالي الغربي، ويعزى ذلك إلى قلة درجات الإنحدار في ذلك الإتجاه.

Abstract

**Landforms Impact on the Shaqlawa City Expansion, Using Remote Sensing and GIS**

**Asst. Lecturer. Hozan Sadiq Mawlod**

Geography Dept. – College of Arts – Univ. of Saladin

The main goal of this investigation is to show the spatial expansion of the Shaqlawa city during the years (1987-2017), and to analyze the factors influencing the expansion of the city and its direction during those years. The importance of this investigation is that it illustrates the impact of landforms upon the expansion of the city so that it could be expanded towards the areas that are suitable for human settlements, In order to achieve this, the satellite image and digital elevation modeling (30 m) are obtained, Then the influence of slope degree and landforms on the expansion of the city area are analyzed. The investigation has reached at a set of conclusions; the most important of them are the followings: being affected by the geomorphic units, the city has taken a linear shape. The concentration of the city expansion is towards the northwest, due to the lack of slope degree in that direction.

# سەرەتایەکی مێژوویی
# بۆ گۆرانیی و موزیکی کوردی

**م. ی. چیایی کەمال سەعدی**
بەشی موزیک/ کۆلێژی هونەرە جوانەکان
زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر

**پێشەکی**

زاناکانی بواری شارستانیەتە کۆنەکان و رۆژهەڵاتناسەکان کۆک و هاوڕان لەسەر ئەوەی هەموو کۆمەڵگایەکی سەر ڕووی ئەم زەمینە خاوەن شارستانیەتێکی تایبەتی ڕێژەیی خۆیانن، ئەم ڕێژەییەش واتای ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە شارستانیەتی هیچ کۆمەڵگایەک و میللەتێک و تاکێک، جێگر نییە و دەکرێت کەم تا زۆر گۆڕانکاری بەسەردابێت، ئەمانەش بەهۆی ئەم گۆڕانکاری و پێشکەوتنانەوە دەبێ کە لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر یا لە نەوەیەک بۆ نەوەیەکی تر دێنە ئاراوە و پشتاو پشت و دەماو دەمیش دەگوێزرێنەوە، زۆر ئەستەم و هەڵەیە کە شارستانیەتەکان لەسەر کۆمەڵەیەک یان میللەتێک ناوزەد بکەین و ئەوانی تری لێ بێبەری بکەین، بۆیە کاتێک دەکەوینە هەوڵی دۆزینەوەی ڕاستی و دروستیی خاوەندارێتەکە ناچاردەبین لەڕێگای بەراوردکاری، ڕاستییەکان بدۆزینەوە. (د. وهیب ابی فاضل، ۲۰۰۷، ص۹).

کەواتە بۆ زانینی سەرەتاکانی مێژووی سەرهەڵدانی گۆرانی و موزیکی کوردیش، دەبێ دووبارە پەنا بەرینەوە بۆ مێژووی کۆنی ناوچەکە، ئەمەشیان خۆی لە دووتۆی وڵاتی نێوان دوو ڕووبار (بلاد مابین النهرین) و عیراقی کۆن دەبینێتەوە، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کوردستان بەشێک بووە لەم ناوچەیە، سەرەڕای ئەوەی پێکەوەژیان و بازرگانی و جەنگیش بە بەردەوامی لە ناوچەکەدا

بەگشتی و لە نێوان باشوور و باکووریشدا بەتایبەتی هەبووە کە کوردستانی ئەمڕۆیە. ( فاضل قەرەداغی، ٢٠٠٤، ل١٩٧).

ولاتی نێوان دوو ڕووبار بەهۆی فراوانی و جۆراو جۆری لە پێکهاتە جوگرافیەکەی، چەندین نەتەوە و میللەتی جیاواز لەسەری دەژین، وەک عەرەب، کورد، تورکمان، ئاشووری، کلدانی، کرستیان.... تادوایی، ئەمە وێڕای ئەوەی بەهۆی بازرگانیکردنەوە خەڵکێکی ڕۆژئاوایی زۆر ڕووی لەم ناوچەیە کردووە هەم بۆ مەرامە بازرگانیەکە و هەم مانەوەیان تیایدا، وەک : هیندۆ ئەوروپییەکان، سامییەکان، ئارییەکان... تادوایی. ئەم فرە نەتەوە و میللەتیەش بۆتە هۆی دروستبوونی شارستانیەتێکی هەمەچەشن و دەوڵەمەند لە ناوچەکەدا، بۆیە موزیک و گۆرانی و سەما و ئەدەب لەم ناوچەدا پشکی شێری بەرکەوتووە و دەوڵەمەندتر دێتە بەرچاو لە هی ناوچەکانی تری دەوروبەری، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەم ناوچانە هەر میللەت و نەتەوەیەک هەڵساوە بە نمایشکردنی هونەر و ئەدەب و کەلتووری تایبەت بەخۆی و هەر نەتەوە و میللەتێکیش ئازاد بووە لەوەی چ جۆرە هونەر و کەلتوورێک دەهێنێ یا دەگێڕێتەوە بۆ ئەو ولاتەی کە لێوەی هاتووە یان هەرناوچەیەک بێ، ئەم هێنان و بردنەش لە میللەتێکەوە بۆ میللەتێکی تر و نەوەیەک بۆ نەوەیەکی تر پشتاو پشت و دەماو دەم گوێزراونەتەوە و جۆرێک لە تێکەلاوی و لێکچوونی هونەر و داب و نەریت و گۆرانی و موزیکی دروستکردووە کە ناتواندرێ وا بەئاسانی لێک جیا بکرێنەوە، تەنها لەڕێگای بەڵگە مێژووییەکان و بیر و سەرنجی ڕۆژهەلاتناس و شوێنەوارە هەڵکەندراو و داتاشراوەکانەوە نەبێ، ئەوانیش ڕێژەیەکی زۆر کەمیان ماونەتەوە، ئەمەش هەر بەهۆی ئەوەوە بووە کە هەندێکیان لەناوچوونە و هەندێکیشیان بەهەمان شێوەی هونەر و ئەدەبەکەوە کەوتوونەتە بەر هێرشی چاوتێبڕین و شالاوی بەتالانبردن، لەلایەن هۆز و نەتەوە و میللەت و ولاتە زلهێزینەکانی ناوچەکەوە.

**گرفتی توێژینەوە:**

گرفتی ئەم توێژینەوەیە بریتییە لە گەڕان بەدوای بنەچەی گۆرانی و موزیکی کوردی و لێکۆڵینەوەی بە بەراورد لەگەڵ گۆرانی و موزیکی گەلانی عێراقی کۆن و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە ئایا گۆرانی و موزیکی کوردی بنەچە و ڕەگداکوتانی تایبەت بەخۆی هەیە تاکو بە هونەرێکی ڕەسەن دابنرێت یاخود ئەمیش بەشێک بووە لە گۆرانی و موزیکی عێراق و تایبەتمەندیی خۆی نەبووە. بۆیە ئەم بابەتە خۆی لەخۆیدا لە هەندێ گۆرانی و موزیکی کوردی بۆ هەندێکی تر دەگۆڕێ و هەریەکێک لەوانە جێگەی هەڵوەستەکردنە و دەبێ لەبەر ڕۆشنایی پێوەرە زانستییەکان و ڕای شارەزایان لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکەین.

کەمیی سەرچاوە لەبارەی لێکۆڵینەوە لە سەرەتاکانی مێژووی گۆرانی و موزیکی کوردی و نەبوونی موزەخانەیەکی دەوڵەمەند بۆ بینین و شیکردنەوەی وێنە و هەڵکەندراوەکان هەروەها نەبوونی ئەرشیفێکی تایبەت و نۆتە و کاسێت و تۆمارکراوەکانیش هۆکار و گرفتێکی ترن بۆ زانینی سەرەتاکانی گۆرانی و موزیک. ( ڕزگار خۆشناو، ١٩٧٩، ل٧٢).

**گرینگی توێژینەوە:**

ئەم توێژینەوەیە بە توێژینەوەیەکی زانستیی دەگمەن هەژمار دەکرێت کە تیشک بخاتەسەر مێژووی گۆرانی و موزیکی کوردی کە دواتر وەک سەرچاوەیەکیش دەتواندرێت کتێبخانەی کوردی پێ دەوڵەمەند بکرێ، لە هەمانکاتدا وەک ئەرشیفێکی کۆکراوەش سوودی لێ وەربگیردرێت، لەگەڵ هەموو ئەمانەی سەرەوەش لایەنێکی گرنگی کلتووری نەتەوەکەمان بە نەوەی نوێ دەناسێنێ.

**ئامانجی توێژینەوە:**

دۆزینــەوەی شوناســی گــۆرانی و مــوزیکی کــوردی لــەڕێگای خستنەڕووی بەڵگە و بیر و بۆچوونی مێژوونووسـان و سـەرچاوەکان، یەکێکە لـە گرینگترین ئامانجـە سـەرەکییەکانی ئـەم توێژینـەوە، دەتوانین لەڕێگایانەوە سەرەتای مێژووی گۆرانی و موزیکی کوردی دەستنیشـان بکەین، و ئامانجی ناونیشانەکە کە بریتییە لە (سەرەتایەکی مێژوویی بۆ گۆرانی و موزیکی کوردی) بهێنێتەدی.

**شێواز و جۆری توێژینەوە:**

لەم توێژینەوەدا ڕێبازی توێژینەوەی وەسفیمان بەکار هێناوە.

**سنووری توێژینەوە:**

سنووری شوێنی: عیراقی کۆن ( میزۆپۆتامیا ).

سنووری بابەتی: مێژووی موزیکی کوردی.

## تەوەری یەکەم: سەرەتای سەرهەڵدانی گۆرانی و موزیک:

هەر لە سەرەتای دروستبوونی مرۆڤایەتیدا، گۆرانی [1] و موزیـک بەشـێکی گرینگـی لـە ژیـانی مرۆڤایەتیـدا دامـاڵیوە و مـرۆڤ گـۆرانی و موزیکی دەکاربردووە، ئەم ڕاستییانەش لـەڕێگای وێنـە و داتاشـراوەکان سەلمێندراوە، (محمود سامي حافظ، ١٩٧٩، ص١٥٤).

هەروەها مێژوونووسەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە مرۆڤ هـەر لـە سـەرەتای ســەدەی بـەردینیی کۆنــەوە گــۆرانی و چەپڵـە و هەڵپـەڕکێی کردووە، ئەمەشیان دەگەڕێتەوە بۆ پێش جێگیربوون و نیشـتەجێبوونی لـە شـوێنەکان و فێربـوونی خوێنـدن و نووسـین، لەوێـدا هـەڵساوە بـە لاساییکردنەوەی دەنگە سروشتییەکانی وەک دەنگی با و شوڕەی ئاوی هەڵقوڵاوی سـەر چیاکان و لوورەی با و ... هیتر، دەنگی باڵندەکانیش وەک بولبول و کـەناری و پۆڕ و سووسکە، و ئـەم لەرەلـەرە و سـۆزە مرۆڤـی هانـداوە کـە لەڕێگـەی قـوڕگی ئـاوازێکی مـوزیکی هاوشـێوەی ئەمان لاسایی بکاتەوە، (طارق حسون فريد، ١٩٩٠، ص٣٣).

شارەزایان و زانا و پسپۆڕ و پزیشکانی بواری مرۆیی، پێیانوایە کە موزیک دیاردەیەکی خۆڕسکە و هەمیشە لەناخی مرۆڤدا بوونی هەبووە و پێویستی بە فێرکردن و ئامادەباشی و خۆ ڕاهێنان نەبووە، یەکێکە لەو شتانەی کە ئاوێتەی ناخ و داڕێژراوی یاسا و شێوازی هونەری خواکردەیە و خۆکردە نییە. هەروەها وزەیەکی شاراوەیە لە گیان و مێشک و قوڕگ و پەنجەی ئادەمیزاد بوونی هەیە، بۆیە ئادەمیزاد بەرلەوەی هۆنراوە و موزیکی زانیبێت زووتر درکی بە ریتم و گۆرانی کردووە، وەک چۆن منداڵ کاتێک زمانی دەپژێ و دەکەوێتە گڕوگاڵ و هەست و هۆشی واڵا دەبێ، دەتوانێت بڕە بڕە ئاوازی پچڕ پچڕ بۆخۆی بڵێت، یا لاسایی ئەو دەنگانە بکاتەوە کە گوێی لێیان دەبێت. . ( هنری جورج فارمر، ١٩٤٠، ص٢٢).

زۆرێک لە زاناکان لە هەموو بوارەکاندا وەک بواری (موزیکۆلۆجی ـ ئیثنۆموزیکۆلۆجی ـ سۆسیۆ لۆجی)، هەوڵی ئاشنابوونیان داوە لەم بوارەدا، هەربۆیەش ئاراستەکان و بۆچوونەکانیان لەم بارەیەوە جۆراو جۆر و بێ ئەژمارن، لەوانە زانای بەناوبانگ هێربێرت سپێنسەر (Herbert Spencer) دەڵێ ((موزیک لە زمانی قسەکردنەوە گەشەی کردووە و سەرەتای دروستبوونی گۆرانیش لە ئەنجامی قسەکردن لە تۆنێکی بەرزەوە پەرەی سەندووە))، لەبارەی ئەم بۆچوونەشەوە زۆرێک لە زاناکان هاوڕان لەگەڵ هێربێرت لەوانەش زانای بەناوبانگ ژان ژاک ڕۆسۆ (Jean-Jacques Rousseau). بەپێچەوانەی سپێنسەریش چارڵس دارۆین (Charles Robert Darwin) دەڵێ (( گۆرانی گوتنی مرۆڤ سەرەتا لاساییکردنەوەی ئاژەڵەکان بووە، بەتایبەتی دەنگی باڵندەکان، کاتێک لە وەرزی بەهاردا نێر و مێیەکان لەیەکتری نزیک دەبنەوە و بەجریواندن میلۆدی خۆشەویستی بۆیەکتری دەچڕن)). هەروەها دارۆین پێیوایە کە گۆرانی چڕینی مرۆڤیش لە خۆشەویستیی نێوان کوڕ و کچەوە پەیدا بووبێت. (محەمەدی حەمە باقی، ٢٠٠٩، لا١٥).

بەلام ریچارد ڤالاشیک (Richard Vale) لە یەکەم بلاوکراوەیدا لە ساڵی (١٨٩٢) دەیسەلمێنێ کە سەرەتای موزیک لە ڕیتمەوە سەری هەڵداوە، و کارڵ بۆشێر (Karl Bucher) لە یەکێک لە پەرتووکەکانی بەناوی (کارکردن و ڕیتم) لە ساڵی (١٨٩٦) پشتگیری لە بۆچوونەکەی ڤالاشیک دەکات و دەڵێت ((ڕەسەنایەتی کردەوەی موزیک یەکگرتنەوەی ڕیتمە لەگەڵ جووڵەیە)). هەروەک فیساگۆرس (Pythagoras) ٦٠٠٠ ساڵ پێش ئێستا وتوویەتی ((ئەم جیهانە ژمارە و ئاوازە))، واتە هەر لە سەرەتای دروستبوونی گەردوونەوە تا دروستبوونی مرۆڤ و هەڵسان و هەناسەدان و خواردن و نوستن و هەموو جووڵەیەک، ڕیتم کاریگەری و ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت، بە شێوازێکی خۆڕسک و بەبێ ویستی تاک ریتم بووەتە هۆکاری بەردەوامیی تاکەکەس. ( سید شحاته محمد سلیمان، ٢٠٠٦، ص٧٥).

کەچی کۆرت زاکس (Curt Sachs) بەپێچەوانەی ئەمانەوە دەڵێت: ((ئەم قسانە هەڵەن کە دەڵێن موزیک بەهرەیەکی خوداییە یان خەلاتی پاڵەوانانە، یا موزیک داهێنانی مرۆڤێکی بلیمەتە، یا مرۆڤ بەهۆی باڵندەکانەوە فکری بۆ دۆزینەوەی موزیک بردووە، و مرۆڤ لە هاوار و بانگکردنەوە فێری گۆرانی بووە))، ئەمانە هیچیان پەیوەندییان بە ڕاستی و دروستی ئەم بابەتەوە نییە. ئەم بۆچوونەش لای کۆرت زاکس لەمەوە سەری گرتووە کە بەدواداچوون بۆ سەرەتای سەرهەڵدانی گۆرانی و موزیک لە ژیانی سەرەتایی مرۆڤ و ڕۆژگاری بەردینی کارێکی دژوار و ئاستەمە، چونکە ئەگەر ئامێری موزیکیشیان هەبووبێ ئەوا لە کەرەستەی زۆر سادە و ساکار دروست کراون و کەرەستەکی وایان نەبووە کە بەرگەی ئەم هەموو ساردی و گەرمی و هەزاران ساڵە بگرێ و بمێنێتەوە، بۆیە تاکە سەرچاوە بۆ دۆزینەوەی سەرەتای مێژووی گۆرانی و موزیک، گەڕانەوەیە بۆ شوێنەوار و ئاسەوارە کۆنەکان و هەڵکەندراوەکان.

بۆ زیاتر پشت ڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونانەی سەرەوەش خۆشبەختانە لە ڕێگای هەوڵ و توێژینەوە یەک بەدوای یەکە بەردەوامەکان توانرا هەندێ لەم کەرەستە و ئامێرانەی موزیکی چاخەکانی بەردینی بدۆزرێنەوە، ئەگەرچی ئەم کەرەستە و ئامێرانەی کە دۆزراونەتەوە شێواون بە شێوەیەک کە ناتواندرێت بە ڕێژەیەکی زۆر جێگیر باسیان لێوە بکرێت، بەڵام لە هەمان کاتدا بەهۆیانەوە دەتواندرێت هەندێ لە ئەفسانە و وتەکان بسەلمێنن بۆنموونە ئەگەر سەیری ئەم ئێسکەی وێنەی ژمارە (١) بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە مرۆڤی سەرەتایی لەڕێگای ئێسکەوە جا چ هی مرۆڤ بێ یا هی ئاژەڵەکان، توانیویەتی ئامێرێکی موزیکی دروست بکات و لە ڕێگای ئەم ئامێرەوە چەند دەنگێک یا (تۆنێکی) موزیکی دەرببڕێت بۆ دامرکانەوەی حەزەکانی یان تێرکردنی هەست و نەستی.

هەروەها مێژوونووسەکان و لێکۆڵەرەکان پەنایان بردەبەر لایەنێکی تر کە شیکردنەوەی تیۆرییە و دیارترین ئەم تیۆرانەش ئەوانەن کە پشت بەئەفسانەکان دەبەستن بۆ شرۆڤەکردنی بنچینەکانی موزیک. وەک لە وێنەی ژمارە (٢) دا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو ئەفسانانەی دەڵێن مرۆڤی سەرەتایی لەڕێگای سروشت و با و بۆرانەوە یاخود ڕوونتر بڵێین کاتێک ( با) بەناو چڵە دارە کلۆرەکان هاتوچۆی کردووە و دەنگیان لێوە دەرچووە، هەر لەم کاتەوە مرۆڤ بەدوای دەنگەکانەوە گەڕاوە و ئامێری هەوایی لێیان دروست کردووە.

سەبارەت بە بەکارهێنانی ئامێرەکانی ڕیتمی ئەم کاتەش، ئەگەر سەرنج بدەینە وێنەی ژمارە (٣) دەبینین لە ڕێگای هەڵکەندراوەکانەوە کە لەسەر دیواری ئەشکەوت و بەردەکان داتاشراون یان هەڵکەندراون زۆر بەڕوونی وێنە و شێوەی بەکارهێنانی ئامێرە ڕیتمییەکان ئاماژەی بۆکراوە، هەرچەندە ئامێرەکان وەک خۆیان بە بەرجەستەکراوی نەماونەتەوە، ئەمەش زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم ئامێرە ڕیتمییانە زیاتر لە پێستە و میوەی وشککراوە دروست کراون بۆیە مانەوەیان بۆ چەندین هەزار ساڵ زۆر ئاستەم بووە.







٣ ٢ ١

دواتر بۆ مەبەستی زیاتر ڕوونکردنەوە و پشتبەستن بەم بیر و بۆچوونانە، زانایان توانییان لە ڕێگای هەردوو زانستی (أنترۆبۆلۆجی)[٢] و (أثنۆموزیکۆلۆجی)[٣] خزمەتێکی زۆر بەزانینی سەرەتاکانی هونەری موزیک بکەن، ئەویش بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوە لەسەر ئەم کۆمەڵگا و گەلانەی کە لەنزمترین پلەی شارستانین و خاوەنی گۆرانی و موزیکی خۆیانن، بەبێ ئەوەی هیچ شتێک دەربارەی موزیک و ئامێری موزیکی بزانن.

بەڵگەیەکی تری بوونی گۆرانی و موزیک لە ناوچەکەدا ئەوەیە کە مێژوونووس و زاناکان و ڕۆژهەڵاتناسەکان لە ڕێگای چەند نووسینێکی بزماری لە قوڕ هەڵکەندراوی سۆمەرییە کۆنەکان سەلماندوویانە کە بابلییەکان، لەکاتی ئیشکردن و هەموو بۆنەکاندا گۆرانییان چڕیوە و گۆرانی خۆشەویستی و عەشقیش هەرلەلای ئەمانەوە سەری هەڵداوە، هەروەها لایلایەی مناڵ پێش نوستنی و بەگۆرانی نواندنی و گۆرانی گوتن بۆ خواوەندەکانیان و بەسەرداهەڵگوتنی دادوەر و دەوڵەمەندەکان و گۆرانی جەژنەکان وەک سەری ساڵ و ژن هێنان و گۆرانی بۆ باران بارین و بۆ ناشتنی مردووەکانیان و لەکاتی جەنگ گۆرانییان چڕیوە، هەروەها ئەگەر سەیری زەردەشت و ئاینەکەی (ئاڤێستا)[٤] بکەین کە ئاینی سەرەکی کوردەکان بووە لە سەدەی (١٨ پ.ز) ی دا، دەبینین کە زۆرترین باس و ئاماژەی گۆرانی و موزیک و ئامێرە موزیکییەکان

لەناو ئەم ئاینە بەدی دەکرێن، وەک: ئامێرە موزیکییەکانی (تەنبوور و چەنگ و شمشاڵ و عوود و چەقەوانە). ( محەمەد حەمە باقی، ٢٠١١، ل١٢٩٧).

سەبارەت بە وشەی (گاتا)ش، کە بەمانای سروود دێ، بەڵگەیەکی تری گۆرانی و موزیکە، کە لەکاتی ڕێوڕەسمی ئاینیدا دەخوێندرا، واتا گاتا کۆنترین گۆرانییە کە بۆمان ماوەتەوە، هەروەها وشەی (گاتا) لە پەهلەویدا بۆتە (گاس) و لە فارسی (گاهـ)، کە لە مەقامە موزیکییەکاندا بەکارهاتوون وەک: (دوو گاهـ) (سێگاهـ) (چوار گاهـ) (پێنج گاهـ)[٥]. تادوایی، کە لە پەرستگاکان بەم مەقام و ئاوازانە ڕێوڕەسمەکانی زکر و پاڕانەوە ئەنجام دراون. هەروەک هیرۆدۆت (Hirodot) دەڵێت: (( موغەکان،[٦]. لەکاتی نوێژ و سوپاسی یەزدان، ئاوازیان دەژەنی و گۆرانیان دەوت)). کاتێکیش زەردەشت بەرەو ئاویدەر (ئاوشی دەرینە) کە خۆرئاوای شاری سنەی ئێستایە، بەڕێدەکەوێ بەهۆی دژایەتیکردنی ئاینەکەی، دواتر روو لە کرماشان دەکات، لەوێ بەدواوە کە شا (گۆشتاسپ)ی شای هەخامەنشینییەکان باوەڕبە ئاینەکەی دێنێ و دەبێتە پاڵپشتێکی سەرەکی بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی کە ئاڤێستایە، ئەم ئاینە زۆر بەهێز دەبێت و بەناو گشت ناوچەکاندا بڵاو دەبێتەوە، بەهۆی گرینگیدان و پیرۆزیی گۆرانی و موزیکیش موزیکمەندان و گۆرانیبێژان ڕێز و پایەی بڵندیان پێدەبەخشری، تا ساڵی (٣٣٤ پ. ز) کاتێک هێلینییەکان بەسەرکردایەتی ئەسکەندەری مەقدۆنی هێرش دەکەنە سەر ئێران دەستی بەسەردادەگرن، فەرمانی لەناوبردنی ئاین و کتێبی ئاڤێستا دەدرێت، لەم ماوەیەدا کە ٣٠٠ ساڵی خایاند، پێگە و پایەی موزیک و گۆرانی و موزیکمەندان ڕوو لە دارمان و ونبوون دەکات، بەڵام دوای دەرکردنی هێلینییەکان لەلایەن ئەشکانییەکانی دەوڵەتی ساسانی بەسەرپەرشتی (ئەردەشێری پاپەک) ٢٢٦- ٢٢٧ز، تواندرا جارێکی تر کتێبی ئاڤیستا[٧]. کۆبکرێتەوە و کاری پێبکرێت و پێگەی موزیک و گۆرانی بەهێزبێتەوە، دوای ئەویش (بەهرامی گۆر) کە خۆی ئارەزوومەندێکی گۆرانی و

موزیک بوو (٤٣٨ ـ ٤١٧ ز)، زیاتر پایەی گۆرانی و موزیکی بەرز کردەوە. واتا کورد توانی جارێکیتریش لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ساسانییەکانیدا،[٨]. گۆرانی و موزیک پیادە بکات و خاوەنداریەکەی بۆ بگەڕێندرێتەوە، کە ئەمە بە مێژووی ١٠٠٠ ساڵەی زێڕینی گۆرانی و موزیک ناوزەد دەکرێت لەناو کوردەکاندا، گۆرانی و موزیکی کوردی خاوەن بنەمایەکی راست و دروست و واقعێکی دوور و درێژی مێژوویی هەیە، ئەمەش بەهۆی ئەم ناوچە جوگرافی و ئاوەدانی و کەش و هەواو بە پیتیی ناوچەکەوە بووە کە شوێنی سەرەتای دروستبوونی مرۆڤایەتی و جێگای ژیانی مرۆڤی نیاندەرتاڵ بووە. جا لەبەرئەوەی شارستانیەتی کوردی بەشێکی جیانەکراوەیە لە شارستانیەتی گەلانی عێراقی کۆن (بلاد مابین النهرین) و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، بۆیە لەکۆتاییدا لەژێر ڕۆشنایی ئەم بەڵگانەی سەرەوە دەتوانین بڵێین کورد نەک هەر خاوەنی گۆرانی و موزیکی خۆیەتی بەڵکو دروستکەر و دامەزرێنەر و داهێنەری موزیکە لەسەرەتای دروستبوونی تا ئەمڕۆ و داهاتوو . (محەمەد حەمە باقی، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٣-٢٠٢).

**تەوەری دووەم: موزیک و ئامێرە موزیکییەکان:**

دروستکردنی ئامێری موزیکی لەلایەن مرۆڤی سەرەتایی لەڕێگای کەرەستە سادە و سروشتیەکانەوە وەک ئامێرەکانی ڕیتم (تەپڵ) ئینجا ئامێرە هەوایییەکان (شمشاڵ و نای)، دواتریش ئامێرە ژێدارییەکانی وەک قیسارەی سۆمەرییەکان کە ٤٧٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا دۆزراوەتەوە لە عیراق (بلاد مابین النهرین)، بەڵگەیەکی ترە کە لەم ناوچەیەدا گۆرانی و موزیک بوونی هەبووە و گرینگی پێدراوە. لە هەزارەی دووەمی پێش زاینی قوتابخانەی سەربەخۆ و دوور لە کەڵێسە و کۆشکی پادشا لەلایەن سۆمەرییەکان بەدیارکەوتن کە تایبەتبوون بە موزیک و گۆرانی، هەروەها نووسینە بزمارییەکان ئاماژە بەوەش دەدەن کە لە نێوان ئەم قوتابخانانە و باوکی قوتابیەکان گرێبەستی یاسایی هەبووە،

ئەم گرێبەستە یاسایییە لە سەردەمی بابلی نوێ ( ٥٣٠ – ٩٥٠ پ. ز) دەگەڕێتەوە بۆ گرینگی بوونی مامۆستای موزیکی بە هۆی پێشکەشکردن و فێربوونی گەنج بە گۆرانی و وەرگرتنی پسپۆڕی لەم بوارەدا، باوکی قوتابیەکان ناچارکراون کە بڕە پارەی دیاریکراو بدەن لەبری خوێندن و فێرکردنی ڕۆڵەکانیان بە گۆرانی و موزیک کە سێ مانگی دەخایاند. هەروەها جۆریکی تری گرێبەستی فێرکردنی موزیک، کە ئەویشیان بە شێوەیەکی زۆرەملێ بووە بوونی هەبووە لە سەردەمی حامورابی، کە مامۆستای هونەری پابەندکراوە بە فێرکردنی ئافرەت بە گۆرانی و موزیک لەم سەردەمەدا، کەواتە گرینگیدانی بابلییەکانیش بە هونەر و گۆرانی و هەڵسەنگاندنیان بۆ بەها جوانەکانی و شارستانیەتیان و بەشداریکردنی ئافرەتی سۆمەری لە ژیانی موزیکیان لە گۆرانی و ژەنین بەڵگەیەکی تری گرینگیپێدانی گۆرانی و موزیکە لە ناوچەکەدا. ئەم پێشکەوتنانەی گۆرانی و موزیک بووە هۆی ئەوەی ئاستی گۆرانی و موزیک پەرە بسەنی و لەکارێکی تاکلایەن بگۆڕێ بۆ کارێکی بەکۆمەڵ و جیاکردنەوەی جۆرەکانی دەربڕین بۆ هەر ئاهەنگ و بۆنەیەک، کە لەڕێگای ئەم جیاکردنەوە شێواز و فۆڕمی نوێ و جیا هاتە کایەوە، ئینجا یاسا و ڕێسای تایبەتی دانرا بۆ دەربڕینی هەر شێوازێک لە شێوازەکان، ئینجا ناونانی جۆراوجۆر بۆ گۆرانییەکان بەپێی شێواز و یاساکان وەک گۆرانی ( العصري ) کە لە شارەکان دەوتران، گۆرانی ( البدوي ) کە لە ناو گەڕۆکەکان دەوتران، هەروەها گۆرانی ( الريفي ) کە لە گوندەکان دەوتران، سەری هەڵداوە. (هنری جورج فارمر،١٩٤٠، ل٢٢).

سەبارەت بە موزیک و ئامێری موزیکیش بیروڕا و بۆچوونی جیاواز هەیە لەوانە، دەڵێن: ((لامک)، کە بەچەند پشتێکی کەم دەگاتەوە باوکە ئادەم، ئەو یەکەم کەسە کە ئامێری عوودی دروستکردووە). وە (یۆپاڵ و تۆپاڵ ، کە کوڕی لامکن ئەوان موزیکیان دۆزیوەتەوە و ئامێری عوود و تەپڵ و دەفیان دروست کردووە. بۆ پاڵپشتیکردنی ئەم

بۆچوونانــەش ئــەبینین، موســا پێغەمبــەر (د.خ) دەفەرموویــت: (تۆپــاڵ لــەپێش تۆفانەکـەدا ژیـاوە و ئـەو بـاوکی هـەموو نـەیژەن و عوودژانێک بووە). هەروەها بۆچوونێکی تر هەیە دەڵێت (( نووح ، یەکەمین کەسـە کە موزیکی دۆزیوەتـەوە، ئەو عوودی دروست کردووە و ئاوازی تیا دەرهێناوە، بەڵام لە تۆفانەکە ئەم عوودە بزر بووە و لـەناوچووە، دواتـر لە ڕۆژگاری ( داود پێغەمبەردا د.خ) دۆزراوەتەوە و چاک کراوەتـەوە و لێدراوە)). ( هنری جورج فارمر، ١٩٤٠ص٥-٦).

بــەڵام شــتاودەر (Shtewdir) شوێنەوارناســی ئــەڵمانی جیــا لــەم بۆچوونانە، سـەبارەت بـە سـەرهەڵدانی ئامێری عـوود، لێکۆڵینـەوەی، لـە نەخش و نیگارە دێرینـەکان و بەردینییـەکان کـردووە و سـەلماندوویەتی کە ئامێری موزیکی عوود،[٩]. یەکێکە لەم ئامێرە موزیکییانەی کە تایبەتـە بە چیا نشـینەکان و بەتایبـەتیش بـە خوورییـەکان، کـە هۆزێک بـوون لـە ناوچەی گۆمی وان، تادەگاتە باکووری عیراق نیشتەجێ بوون لـە ١٥٠٠ سـاڵ پـێش لـەدایکبوونی عیسـا (سـەلامی خـودای لەسـەربێت). دەشـڵێت کە ئەوان ئەم ئامێرەیان داهێناوە و لە عیراقدا بڵاویان کردۆتەوە. (هنری جورج فارمر، ١٩٤٠ص٤٤).

ئەگەر ئاوڕێکی خێراش بەنێو فۆلکلۆر و پەندی پێشینان و ئـەدەبی کوردیدا بدەینەوە دەبینین زۆرێک پەند و قسـەی نەستەق لـە باپیرانـەوە ماونەتـەوە ئامـاژەن بـۆ بـوونی گـۆرانی و موزیـک لـە ناوچەکـە، وەک دەڵـێن: (( دەنگـی دەهـۆڵ لـە دوورەوە خۆشـە))، یـان (( لـە تـەپڵی سـەر ئەدەم چەنگ و خەیاڵ دەنگی دەف ناکەم)))، تادوایی. شاعیرانیش لـەناو کـوردا زۆرن کـە دەربـارەی موزیـک و گـۆرانی و ئـامێرە موزیکییـەکان شیعریان داڕێشتووە و گوتوویانە وەک: وەفایی دەڵێت: ( دەنگی مـن و سـەوتی تـۆ، بـۆ (بـەزمی خوسـرەوی) چـەنگ و نـەی و عـوود و تـار شــانازن)، هــەروەها (گــۆران)ی شــاعیر دەڵێــت: ( گــوێبگرە (دەهۆڵــە) (زوڕنایـە) (شمشـاڵە). ئەمانـەش بەڵگەیـەکی تـری حاشـا هەڵنـەگرن کـە میللـەتی کـورد هەرلـە دێـر زەمانـەوە ئـەم ئامێرانـەی بـەکار هێنـاوە و

ئاشـنایەتی لەگـەڵیان هـەبووە، هەربۆیـەش ڕۆژهـەلاتناس و مێـژوو نووسەکانیش دەڵێن: ( کوردەکان لەکاتی ژن هێنان و زەماوەند ئاهەنگ سـاز دەکـەن و بـە ئـاوازی (دەهـۆڵ) و (زورنـا) شـایی دەکـەن و ژن و پیاو، کچ و کوڕ، دەسـتی یـەکتری دەگرن و هەڵدەپـەڕن.....). هـەروەها (لایـار) کاتێـک باسـی گـۆرانی یەزیدییـەکان دەکـات، دەڵێـت لـەکاتی سەردانیکردنی یەزیدییەکان بۆ گۆڕی پیرانیان جۆرە ئاوازێکی ئەوەندە بـە هەسـت و نەسـت و چێژ دەچڕن بـە زوڕنـا کـە لـە هـی هیـچ گـەل و هۆزێکی تر ناچێ، ناوە ناوەش دەوەستن و گوێبیسـتی دەهـۆڵ و سـەنج دەبن لەهـەمان بۆنـەدا. ئەمـەش بـەواتای ئـەوەی کـە گـۆرانی و موزیـک نەک تەنها لە بۆنە و ئاهەنگەکانـدا بـەکارهاتبێ و ڕۆڵـی دیبێـت بـەڵکو لـە ناخۆشی و بۆنە کۆمەلایەتی و جـەنگیش بـەکارهاتووە و ڕۆڵـی گرینگـی بینیـوە لـە نـاو کۆمـەڵگای کـوردەواری. بـۆ ڕاسـتی و دروسـتیی ئـەم بابەتەش (مەلا مەحمودی بایەزیدی) دەڵێت: ( کوردەکـان لـەکاتی جـەنگ بـۆ ئاگادارکردنـەوەی یـەکتری دەهـۆڵ و دەفیـان بـەکاردەهێنا و هەرکـە گوێبیستی ئەم دەنگە دەبوون لە نیوە شەوان ئەوا ڕاسـتەوخۆ دەسـتیان دەدایـە دار و کەرەسـتە جەنگییـەکانیان و ژن و پیـاو بـەرەو گۆڕەپـانی جەنگ بەڕێ دەکەوتن). ( جان توماس، ١٩٩٨، لا١٦-٢٣).

**تەوەری سێیەم: گۆرانی و موزیکی کوردی و ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی:**

باسـکردنی گـۆرانی و مـوزیکی کـوردی هـەروا کـارێکی ئاسـان و سادە و ساکار نییە، ئەمەش لەکاتێکدایە کە نووسـین دەربـارەی موزیـک و گـۆرانی کـوردی لەکۆنـدا هـیچ سـەرچاوەیەکی ڕوون و ئاشـکرامان بەدەستەوە نییە کە ڕاستەوخۆ وەک کورد ناوی هێنابێ، ئەمەش چونکە کورد لە چارچێوەی عیراقی کۆن کە وڵاتـی نێوان دوو رووبـارە ژیـاوە، دواتریش لەژێر کاریگەریی ئاینی ئیسلام و نەتەوەی ئیسلام هەرکارێکی کردبێ لەسەر ناوچەکە بەگشتی هەژمارکراوە.

بەڵام لە هەندێ بابەت و وتارەکانی ڕۆژهەڵاتناسەکانی کە لە سەردەمانی زوودا سەردانی ناوچەکەیان کردووە و توێژینەوەیان لەسەر ئەم ناوچە کوردنشینانە کردووە، ئەم راستییانەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لە سەرەتادا باسمانکردن، هەروەک کە (گەزنەفون) لەکاتی تەواوکردنی گەشتەکەی و گەڕانەوەی بەناو خاکی کوردستانی ئەمڕۆ بۆ وڵاتەکەی، ساڵی ٤٠١ پ. م، دەڵێت: ((کوردەکان سەیریان کرد، بەشێکمان لە ئاو پەڕیونەتەوە، بەشەکەی تریشمان لەمبەری ئاوەکەن، بەسروود خوێندن لە شاخەکانەوە هاتنە خوارەوە و پەلاماریان داین)). لێرەدا بۆمان ڕووندەبێتەوە کە کوردەکانیش وەک بابلییەکان و هەر میللەتێکی تر خاوەن گۆرانی و موزیکی تایبەت بەخۆیان بوونە و لەکاتی بۆنەکان و بەرگریکردندا جۆرێک لە گۆرانی چڕینیان بەکارهێناوە. (حەمدوڵلای مستەوفي، ١٣٣٩، ص ٣٧).

بۆ پشت ڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونەش، کە پەیوەستە بەبوونی هونەر و موزیکی کۆنی کوردی، (تۆما بوا) دەڵێت: ((لە کۆندا موزیکی کوردی کاری کردۆتەسەر گۆرانی گەلە دراوسێکانی و لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ساسانییەکانیش کورد موزیکێکی یەکجار بەرزو پێشکەوتوویان هەبووە )). ئەم وتەیەش راستی و دروستیی ئەوەمان بۆ دەردەخات کە گۆرانی و موزیکی کوردی ڕەنگدانەوەی هەبووە و کاریگەری کردۆتە سەر گۆرانی و موزیکی فارسی و تورکی، نەک پێچەوانەکەی. ( احمد فقی رسول، ١٩٨٥، ل٨٠).

هەروەک مەلا مەحموودی بایەزیدی دەڵێت: (( لە شایی دەوڵەمەندەکاندا تەپڵ و نای و کەمانچە و دەف و جنگر (هارپ) و شمشاڵ، لێدەدران و ئەوانەی ئەم ئامێرانەشیان دەژەنی گۆرانیبێژ بوون)).

هەروەها موزیکژەنی بەتوانا (زریاب)* کە لە بنەماڵەیەکی کوردە و خەڵکی موصڵە و ژیانی هونەری لە بەغدا دەست پێکردووە، زۆر بەچاکی و هۆشیارانە لە دیوەخانی (عەبدولڕەحمان) دا لە ناوچەی

کوردۆ، پەیمانگەیەکی موزیکی دامەزراندووە، ئەم ئاوازە ڕۆژهەڵاتییەی کە خراوەتە پەیمانگاکەوە سروشتێکی ڕەسەنی هەبووە، لە چەند بەڵگەیەکی مێژووییشدا لە سەدەی نۆیەمدا ناوی خێزانێکی موزیکی کوردی تۆمارکردووە کە (ابراهیم کوڕی مەهدی) و (اسحاق موصلی) کوڕیەتی. ئەمانە هەمووی ئەم بەڵگانەن کە بوونی گۆرانی و موزیکی ڕەسەنی کوردی پشت ئەستوور دەکەن لە سەردەمانی زۆر زوودا. (جان توماس، ١٩٩٨، ١٦-٢٣).

دەربارەی ئەم زانا و ئەدیب و پێشەوا و هونەرمەندانەی کورد لە کۆندا کە خزمەتی گەلانی دراوسێکانی خۆیانکردووە و دەربارەی نەتەوەکەی خۆیان کارێکی ئەوتۆیان نەکردووە یا شوێنەوارێکیان بەجێ نەهێشتووە بۆی کە شایەنی باس بێ، چەندین تێبینی و لێکدانەوەی جیاجیا هەیە و هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کوردەکان هەر لە زووێکەوە هونەرەکەیان کەوتۆتە بەر چاوی تالانکردن، وەک چۆن خاکەکەشی بێبەش نەبووە لەم دەستدرێژیانە و بەتالانبردنی، ئەمانەش بە چەند ڕێگەیەک کراون، وەک:

١- کۆکردنەوەی کورد لەژێر ناوی وڵاتی عیراق و یەکپارچەیی خاکی عیراق و فرە نەتەوەیی.

٢ - دەستەمۆکردنی لەژێر ناونیشانی ئیسلام و ئاینەکەی و کارکردن بۆی بە باوەڕە ئاینییەکەی نەک نەتەوەییەکەی.

٣- پشتبەستن بە ڕۆژئاوا وەک داکۆکیکارێک بۆ وەرگرتنەوەی خاک و ماف و هونەر و کەلتوور و داب و نەریت...هتد، ناساندنی وەک وڵاتێکی سەربەخۆ و خاوەن کەلتوور و هونەر و ڕۆشنبیری تایبەت، کەچی ئەمانیش بەشێک بوونە لە چاوتێبڕین و تالانکردنی ئەم سەروەت و سامانە کەلتووری و هونەرییەی لە ناوچەکەوە هەبووە. ئەمانەش گشتی بۆ سادەیی و دڵسافی میللەتی کورد و بێ پشتیوانیکردنی دەگەڕێتەوە، کە هەمیشە باوەشی بۆ هەموو ئەو کەسانە کردۆتەوە کە بە هەر ناوێکی بریسکەدار هاتوونە و مەبەستەکانی خۆیان تیا جێبەجێ کردووە.

ئەم سادەییە و ئەم دڵسافبوونەش بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە باو و باپیرانمان لەم ڕۆژهەلاتەدا بە نەزانی و هەڵەی یەک لەسەر یەک و متمانەکردن بە هەموو کەسێک بێ، بەڵکو ئەمە دەگەیەنێت کە ئەوان خاوەنی ئەدەب و زانیاری و هونەر و خووڕەوشتی بەرز و متمانە بوونە و خاوەنی گفت و بەڵێنەکانی خۆیان بوونە، هەروەها زانایان هاوڕا و کۆکن دەربارەی بوونی موزیک و پسپۆڕی مقام و ئاوازخوان و موزیکژەن لەناو کوردەکان، باشترین بەڵگەشیان بۆ ئەم بابەتە ئاواز و مقامی ( کورد )ە کە سەرچاوەیەکی گرینگە بۆ پێکهێنان و داهێنانی ئاواز و ڕێی تێناچێت بێگانەیەک ئەم ئاواز و مقامەی ناونابێ بەکورد، بەڵکو ئەم شاکارە لەم هونەرەدا لەداهێنان و ناونانی کورد خۆیەتی و شوێن پەنجەی کوردی پێوە دیارە، هەروەها مامۆستا (عەبدولقادری مەراغی) کە یەکێک بووە لە مامۆستا گەورەکانی کورد و خاوەنی ناوبانگێکی بێ هاوتا بووە لە بواری موزیک لە وڵاتی ئێران و هەموو پارچەکانی کوردستان، لە پەڕاوەی (کۆ ئاوازە) باس لە بوونی گۆرانی و موزیکی کوردی و بڵاوبوونەوەیان بەناو وڵاتانی دراوسێ و دەوروبەری دەکات، کە ئەمەش دەتواندرێت وەک بەڵگەیەکی تری بەهێز لە بوونی گۆرانی و موزیکی کوردی هەژمار بکرێت.

لەبارەی ئەم خزمەتکردنەی گەلی کوردیش بەنەتەوە و میللەتانی تر (ئی، ئەی، ئوربیلی) دەڵێت : ((کورد زۆرلە ڕۆڵەکانی لەدەست داوە و لێی بزر بوون لە شاعیر و موزیکژەن و پێشەوای مەزن، کە ناویان مێژووی گەلانی دیکەی ڕازاندۆتەوە))، هەروەها کۆمەڵەی (أخوان الصفا) کە هەزار ساڵ پێش ئەمڕۆ لە بەسرە سەریان هەڵداوە لە نووسراوەکانیاندا ناوی گۆرانی کوردییان هێناوە و دەڵێن: ((هەرگەلێک بۆخۆی خاوەنی ئاواز و گۆرانی تایبەتی خۆیەتی، کە تامی لێوەردەگرن و پێی دڵخۆش دەبن، کە گەلێکی تر بەم جۆرە پێی دڵشاد نابن وەکو گۆرانی دەیلەم و تورک و عەرەب و کورد و ئەرمەن و زنجی و فارس و ڕۆم)). (هنری جورج فارمر، ١٩٤٠، ص٢٩٥).

سەبارەت بەمێژووی گۆرانی و موزیکی کوردی لە ناوچەکەدا، مامۆستا ناجی عەباس دەڵێت : ((هەموو ساڵێک لەمانگی موحەڕەمەوە تا مانگی ربیع الاول لە بەغداد و موسڵ و جەزیرە و شەنگاڵ و عەجەم، لە وڵاتانی دوور و نزیکەوە پۆل پۆل شاعیر و زانا و گۆرانیبێژ و قورئان خوێن ڕوویان ئەکردە ئەربیل (هەولێر). ئەربیل دەبووە قیبلەی هەموو شاعیر و زانا و گۆرانیبێژێک، بە فەرمانی ئەمیر (سولتان موزەفەرالدین)، بیست (٢٠) کەپری زل دروست دەکرا کەپرێک بۆ خۆی و ئەوانیتر بۆ ئەمیر و زانایانی بانگهێشتکراو، لەهەموو کەپرێکدا کۆمەڵێک گۆرانیبێژ و موزیکژەنی دائەنا، ئەم کەپرانە هەر لەدەرگای قەڵاوە تا خانەقا ڕێزی ئەبەست، خەڵکی ناوشار هەمووی وازیان لەکار و کاسبی دەهێنا و خەریکی بەزم و سەیران ئەبوون، (سوڵتان موزەفەر الدین)، هەموو ڕۆژێک پاش نوێژی عەسر دەهاتە خوارێ و یەکە یەکە لەسەر کەپرەکان ڕادەوەستا و گوێی لە گۆرانی ئەگرت و ئەچووە خانەقا لەوێ ئەمایەوە تا نوێژی بەیانی، بەم چەشنە دەیگوزەراند تا شەوی مەولوود، ڕۆژێک پێش مەولوودیش مێگەلێک مەڕ و مانگا کۆدەکرایەوە و بە دەهۆڵ و زوڕنا بۆسەر شەقامی ناوشار و لەوێ سەرئەبڕان و دەکرانە قوربانی، بەم چەشنە ئاهەنگەکە کۆتایی ئەهات و هەموو بانگهێشتکەران ئەگەڕانەوە بۆ وڵات و ناوچەکانی خۆیان. ( ئازاد حەداد، ١٩٧٩، ل٢٦).

هەرلەم بارەیەوە مامۆستا گیویی موکریانی، پێیوایە کە نەبوونی نووسینەوەی نۆتەی موزیک و ئەرشیفکردنی وێنەکان و هەڵکەندراوەکان و دواکەوتوویيان لەم ناوچەیە بووەتە هۆی ئەوەی کە نەتواندرێ بە ئاسانی لە ڕابردووی کورد ورد بینەوە و بچینە بنج و بناوانی، هۆی ئەم دواکەوتنەش دەگێڕێتەوە بۆ سەرەتای ئاینی پاکی ئیسلام کە کورد هەرخۆی بە موسڵمان زانیوە و ئەوەندە دڵپاک بووە بۆ ئاینەکە، ڕۆژێک لەڕۆژان بەبیریدا نەهاتووە شتێک بەناوی کورد بکات، هەربەناوی ئاینی ئیسلامەوە کارەکانی ئەنجام داون، لەلایەکی

